# کۆچ ١٦

کۆچ بەرەو مەعریفە

وەرزە گۆڤارێکی رووناکبیرییە
گرنگی بە بواری لێکۆڵینەوە دەدات


**خاوەنی ئیمتیاز**

**عەلی عەبدوڵلا کاکە ئەحمەد**

**سەرنووسەر**

**حەبیب محەمەد دەروێش**

٠٧٧٠١٥٨٢٧٣٨ — ٠٧٥٠١١٩٩٦٩١

habeblawyer@yahoo.com
govarikoch@yahoo.com

**دەستەی نووسەران**

**ئەرسەلان تۆفیق**

arsalantofiq@yahoo.com

**سەلام عەبدولکەریم**

salam_80jornalist@yahoo.com

**دیزاینی ناوەرۆک**

**حیکمەت مەعروف / ئالین دیزاین**

**دیزاینی بەرگ**

**هەرێم عوسمان**

**نرخ: ٣٠٠٠ دینار**




**بۆ خوێندنەوەی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری کۆچ، سەردانی ماڵپەڕی کۆچ بکە:**
www.govarikoch.com

**سەرنج:**

هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە بۆچوونی نووسەرەکانیان دەردەخەن.

**بۆ ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابە تمان بۆ بنێرن،**
**تکایە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:**

١. بابەتەکان ئەگەر دەستنووس بوون، با لەسەر لاپەڕەی (A4) بێت و لەسەر یەك دیوی بە خەتێکی جوان بنووسرێت.

٢. پەراوێزەکان لە کۆتایی بابەتەکەوە بنووسرێن.

٣. سەرچاوەکان لە کاتی پێویستدا دیاری بکرێن.

٤. ئەگەر تایپکراو بوو لە رێگەی سیدی و فلاش میمۆری، یان رێگەی ئیمایلانەوە بۆمان بنێرن.

goavrikoch@yahoo.com , arsalantofiq@yahoo.com
salam_80jornalist@yahoo.com

٥. لە کاتی تایپکردندا تکایە بۆ زمانی کوردی فۆنتی (Ali_K_Sharif) و بۆ زمانی عەرەبی (Ali_A_Sharif) بەکاربهێنن.

٦. دوای بڵاوبوونەوەی هەر بابەتێك نووسەر یان وەرگێڕ پاداشت دەکرێت.

– – –

**ئاگاداری:**

**خوێنەرانی خۆشەویستی گۆڤارەکەمان ئاگادار دەکەینەوە کە فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر (دەوڵەتی کوردی لە نێوان خەون و واقیعدا)یە و دەتوانن بە بابەتەکانیان گۆڤارەکەمان دەوڵەمەند بکەن.**

**ناوەڕۆك**

١. دەق و زمانی نووسین، لە دەقە کوردییەکانی مەولانا خالید ... دارا حەمید محەممەد ٤
٢. تێگەیشتنی چەمکی دەوڵەت .... حەبیب محەممەد دەروێش ٢٣

٣. پایەکانی فەرهەنگی دیموکراسی ... ن: د. عەبدولکەریم سروش، و: موسعەب ئەدهەم ٢٩
٤. کۆمەڵناسی سیاسی پارتەکان ... شۆڕش محەممەد ٣٣

٥. کورد و چیا ... محەممەد بەکر ٤٣
٦. کاریگەری جوگرافیای رادیکاڵ لەسەر پلاندانانی شار ... عەلی ئەحمەدی ٥٧

٧. پرسە ئەزەلییەکانی فەلسەفە و وەڵامە جۆربەجۆرەکان ... حەمە غەریب حەمە تۆفیق ٧٧
٨. مێژوو و فەلسەفەی یارسان ... ن: ت. تاهیری، و: بیهزاد خۆشحاڵی ٩٥

٩. کەسایەتی قازی محەممەد و رۆڵی لە دامەزراندی کۆمار ... ئا: هاوار حەمید ١٤٥
١٠. ئافرەت و ئازادی، خوێندنەوەیەکی ... ئا: سەلمان نادر عەبدولڕەحمان ١٦١

١١. رێکخستنە سیاسییەکانی باکوری کوردستان ١٩٦٠ -١٩٨٠ ... ماجد خەلیل ١٩٩
١٢. هونەری سۆمەرییەکان و کورتە مێژوویەك ... خالید دۆستی ٢٥٥

— — —

**فایلی ژمارە ( شێخ رەزای تاڵەبانی)**

١. شێخ رەزای تاڵەبانی کێیە؟ ... هێمن ئیبراهیم ئەحمەد ٢٧٠
٢. هاوکێشەکانی دەسەڵات ... ع. باخانی ٢٨٢

٣. شێخ رەزا، شایەتحاڵێکی وریای سەردەمی خۆی ... ئەمین شوان ٢٩٩
٤. باسوخواسێکی شێخ رەزا لە هەڵەبجەدا ... حەکیم مەلا ساڵح ٣١١

٥. چاکشوێنی و بەدشوێنی شێخ رەزا ... لەتیف فاتیح فەرەج ٣١٩
٦. مژمۆری چاوی شێخ رەزا و دیدەی رۆشنی مەولەوی ... همایۆن ساحیب ٣٢٣

٧. ئاوڕێك لە دیوە شاراوەکەی شێخ رەزا، خوێندنەوەی غەزەلێك .. ع. قەرەداغی ٣٤٧
٨. ئەرکی وێنەی شیعری لە دوو هەجوی کوردیی شێخ رەزادا ... عەبدوڵڵا قەرەداغی ٣٥٤

٩. چەند باسوخواسێکی شێخ رەزای تاڵەبانی لە زاری .... ئا: جەمال لولو ٣٨٥





# دەق و زمانی نووسین لە دەقە کوردییەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیدا

**دارا حەمید محەممەد**

**پێشەکی:**

یەکێك لە بنەماکان بۆ ساغکردنەوەی قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو کەلتور و شارستانێتی هەر کۆمەڵێك لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا (دەق)ی نووسراوە، ئینجا ئەو دەقە ئەدەبی بێت (شیعر یان پەخشان) یان زانستی، چونکە لە بۆتەی ئەو دەقانەدا دەکرێ ئاستی رۆشنبیری و دابونەریت و کلتور و زمان و ئەدەب مێژووی کۆمەڵێك بەپێی قۆناغە جیاوازەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵە هەڵاوێردە بکرێت، ئیتر ئەو دەقانە هەرجۆرێك بن: (ئایینی، مێژوویی، زانستی، فەلسەفی، شیعر پەخشان.. هتد) گرنگی بەرچاوی خۆیان دەبێت، بەتایبەتی بۆ میللەتێکی وەك میللەتی کورد کە تائێستاش گەلێ لە لاپەڕەکانی مێژووی لە زۆر رووەوە چ (ئەدەبی بێت یان شارستانی یان کۆمەلاّیەتی.. هتد) چاوەڕوانی تروسکاییەکن لە نووسراوێکدا، دەقێکدا لەسەر پێستێك یان تاشەبەردێك بدۆزرێتەوە و لاپەڕەیەك یان چەند لاپەڕەیەکی مێژووی ژیانی ئەم میللەتەی پێڕووناکبکرێتەوە.

لێرەوە مەبەستمانە کە ئاماژە بەگرنگی مێژوویی دەقە کوردییەکانی مەولانا خالید بکەین، چونکە چ لەڕووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە چ لەڕووی مێژووییەوە گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە لەڕووی فۆرمەوە بە کوردی نووسراون کە کەرەستەیەکی بەهادار پێکدێنن، بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی قۆناغێکی پڕهەستیاری مێژووی زمانەکەمان، لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە ئەوا ئەو دەقانە یەکێکن لە دەقە ئەدەبییە کۆنەکانی کورد، بەتایبەتی پەخشانەکانی کە لەڕووی مێژووییەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی شکۆداری ژیانی میللەتی کورد کە سەردەمی بابانییەکانە ئەمەش بۆخۆی گرنگییەکی تایبەت بەو دەقانە دەبەخشێت بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی و مێژوویی سەبارەت بە سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی.

هەرلێرەشەوە دەمانەوێت ئاماژە بۆئەوە بکەین کە باسەکەمان سەبارەت بە تەوەرێکی زێدە گرنگی میللەتی کوردە، ئەویش ناسنامەی کوردە کە (زمان)ە، بەمشێوەیەش باسەکەمان سەبارەت بە زمان دەبێت لە دەقە کوردییەکانی مەولانا خالیددا، ئاشکراشە کە باسکردن لە زمانی نووسینی هەر نووسەرێك شاعیر بێت یان ئەدیب یان توێژەر، زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە لە چەند لاپەڕەیەکدا مافی خۆی پێبدرێت، چ جای ئەگەر مەبەست لەو نووسەرە زاتێکی وەکو مەولا نابێت ئەوا بێگومان ناکرێت لەمەودا و دەرفەتێکی واکورتدا بوترێت مافی تەواوی خۆی پێدراوە، لەبەرئەوە بەناچاری هەوڵمانداوە باسەکەمان بەپێی توانا چڕبکەینەوە، سەرەتاش داوای لێبوردن لە کەموکوڕی باسەکە دەکەین و هەموو سەرنج و تێبینی و رەخنەیەکیش بە چاوی رێز و سنگی فراوانەوە وەردەگرین.

**ئەم باسە لە دوو بەش پێکهاتووە کە بەمشێوەیەن:**

بەشی یەکەم لە دوو تەوەر پێکدێت، تەوەری یەکەم باس لە دەق و چەمك و پێناسەی دەق دەکات، تەوەری دووەم باسی نوری دەق بەپێی بۆچوونی هەندێ زمانەوانی دەقسازی لەخۆدەگرێت.

بەشی دووەم زمانی نووسینی دەقە کوردییەکانی مەولانا دەخاتەبەر باس و لێکۆڵینەوە، لە کۆتاییشدا ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەمان خستووەتەڕوو بەو هیوایەی کە تەوانیبێتمان خزمەتێکی بچووکمان بە زمانەکەمان کردبێت و بەئەمەکییەکیشمان بەرامبەر بەو پیاوە گەورەیە نواندبێت.

### بەشی یەکەم

### ١. چەمك و پێناسەی دەق

هەرچەندە دەق لە ئەدەبدا بابەتێکی کۆنە و لێکۆڵینەوە لە دەقی ئەدەبی مێژوویەکی دێرینی هەیە، بەلاّم لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لە دەق زۆر کۆن نییە و دەتوانین بیگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی ئەرکییەکان، کاتێك بۆ یەکەمجار لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لە لێکۆڵینەوە زمانەوانەییەکانیاندا بانگهێشتی





ئەوەیاندەکرد کە پێویستە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی سنووری رستە ببەزێنێت و لە سەرووی رستە بکۆڵرێتەوە کە بێگومان (دەق)ە.

مەبەست لە دەق وەك کەرەستەیەکی زمانەوانی تەواو جیاوازە لە دەق وەك کەرەستەیەکی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، هەربۆیە پێناسە و چەمکی دەق لە زمانەوانیدا تەواو جیاوازدەبێت لە پێناسە و چەمکی دەق لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا، بەگشتی هەندێ هەوڵی روونکردنەوەی چەمك و پێناسەکردنی (دەق) دراوە لەوانە:

دەق وەك زاراوەیەکی زمانەوانی دانەیەکی سیمانتیکییە کە پەیوەندی بە فۆرمەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە واتاوە هەیە، لەوانەیە دەق نووسرابێت یان نەنووسراو پەخشان بێت یان شیعر (قەیس کاکل، لـ٢٩).

ڤان دایك سەبارەت بە (دەق) دەڵێت: ((دەق یەکەیەکی زمانییە، کە واتا و مەبەستی رستەکانی پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە و پشت بەیەکتر دەبەستن و دەق زیاتر لە ئاستی پراگماتیکدا بەدەردەکەوێت)) ڤان دایك، ١٩٧٧، لـ٣.

بەمپێیە دەتوانین سەبارەت بە دەق بڵێین دەق لەڕووی زمانەوانییەوە یەکەیەکی زمانیی سیمانتیکی یەکگرتووە کە رستەکانی پەیوەندییەکی پتەویان بەیەکەوە هەیە و واتای یەکتر تەواودەکەن و گەلێ جۆری پەیوەندی وەك (بریتیخستن، کرتاندن.. هتد) کەرەستە پێکهێنەرەکانی دەق بەیەکەوە دەبەستێتەوە، دیارە مەبەستیش لەپێکەوەبەستنی کەرەستە پێکهێنەرەکانی دەق، رۆنانی یەکەیەکی زمانیی گەورەیە کە بتوانێ گوزارشت لە بیرێك بکات، کە لەلای نووسەر یان قسەکەر گەلاڵەبووە، دەق لەڕووی زمانەوانییەوە ئاستی سیمانتیك دەبەزێنێت و دەچێتە ئاستی پراگماتیکییەوە، چونکە دەکرێ رستە پێکهێنەرەکانی لە واتای سەرەکی خۆیان لابدەن و واتا و مەبەستی نوێ بەپێی پەیوەندییان بە رستەکانی دەوروبەریانەوە لە هەمان دەقدا بگەیەنن کە ئەمە بۆخۆی بنەمایەکی پراگماتیك پێکدەهێنێت (محمد صلاح الدين الشريف، ص٩٩) بۆنموونە مەولانا لە دەقێکدا کە وەسفی پێغەمبەر (د.خ) دەکات دەڵێت: ((بەحەققەت ئەو محەممەدە ئادەمییە، روومەتی زەڕیفە، نەزۆر نەوییە نەزۆر بڵندە، لە هەموو ئەولادی ئادەم زەریفترە، بێسێبەرە، لەبەر نازکی و لەتیفی یان دیوار لە روومەتدا دیارە)) (محەممەدی مەلا کەریم، گۆڤاری کۆڕ، لـ٢٠٧).

لەو دەقەی مەولانادا ئاشکرا دیارە، کە واتا و مەبەستەکانی رستەکان لە واتای سەرەکی خۆیان لایانداوە و نووسەر مەبەستی تەنها پیاهەڵدان و بڵندکردنی پایەی پێغەمبەری خوایە (د.خ)، چونکە بۆنموونە لە دەقەکەدا هاتووە کە محەممەد ئادەمییە، بەڵام لەهەمانکاتدا ئاماژە بۆئەوە دەکات، کە سێبەری نییە، ئاشکرایشە مرۆڤ نییە لەسەر زەویدا سێبەری نەبێت لێرەدا ئەوە بە بیری خۆمان دەهێنینەوە کە لە چەمك و پێناسەی دەقدا وتمان دەق و رستە پێکهێنەرەکانی دەق لە ئاستی پراگماتیکەوە نزیکترن، وەك لە ئاستی سیمانتیکەوە، بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵێین دەکرێ بۆنموونە مەبەستی مەولانا لەو دەربڕینە یەکێك لەم حاڵەتانە بێت:

أ. مەبەستنی خستنەڕووی ئەوپەڕی ناسکی و جوانی بێت، بۆ پێغەمبەری خوا(د.خ) کە بگاتە رادەی ئەوەی لە ناسکیدا سێبەری نەبێت.

ب. یان دەکرێت مەبەستی مەولانا ئاماژەبێت بۆ ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ( یوم لا ظل الا ظله ) واتە ئەورۆژەی کە هیچ سێبەرێك نییە جگەلە سێبەری پەروەردگار، واتە مەولانا دەیەوێ ئاماژە بۆئەوە بکات کە هەرچەندە محەممەد نێردراوی خوایە، بەڵام مرۆڤە و لە رۆژی حەشردا لەپاڕانەوە زیاتر دەسەڵاتێکی نییە و هیچ سێبەرێکی نییە خەڵکی لەپاڵیدا بحەوێنەوە.

ئەوەی مەبەستی ئێمەبێت ئەوەیە، کە لە هەر دوو حاڵەتدا واتە لە هەر دوو لێکدانەوەکاندا بۆئەو دەقە مەبەست و ناوەڕۆکێکیتری بەدواوەیە کە خستنەڕووی لەڕێی پەیوەندی نێوان رستەکانی دەقەکە و کاریگەری ئەو رستە پێکهێنەرانەی دەقەکە بەسەریەکەوە دروستدەبێت.

ئاشکرایە کە نموونە و بەڵگە بۆ زیاتر پشتراستکردنەوەی ئەم بۆچوونەمان لە ئەدەبیاتی کوردیدا گەلێك زۆرن، بەتایبەتی لە قۆناغە دژوار و سەختەکانی ژیانی میللەتەکەماندا کە زۆرجار رێی گوزارشتکردن لە واقعی ژیانی پڕلەئێشوئازار و مەینەتییەکانی ئەم میللەتە لەلایەن ستەمکارانەوە لە شاعیران و نووسەران دەگیرا و پەنادەبرایە بەر بەکارهێنانی دەقی ئەدەبی، بەڵام بۆ ناوەڕۆك و مەبەستی تەواو جیاواز لە رواڵەت و فۆرمی دەقەکە یان لە واتای ئەو رستانەی کە دەقەکەیان پێکدەهێنا، بۆنموونە: لەتیف هەڵمەت لە کورتە چیرۆکی (بەشەکانی دۆزەخ)دا





دەڵێت: (منداڵێك لە خەونیدا باوکی خۆی دەبینێت و لێیدەپرسێت؟

- باوکەگیان بۆ دیارنیت؟ بۆ نایەیتەوە ماڵ؟ تۆ ئێستا لەکوێیت؟

- رۆڵەگیان من ئێستا لە بەهشتدام.

- منداڵەکە: باوکە یەکسەر رەوانەی بەهەشتکرای؟ .. ئەی لە دۆزەخدا هیچ نەمایتەوە؟

- باوکە بزەگرتی و وتی: بەرلەوەی رەوانەی بەهەشت بکرێم نزیکەی چوار مانگ لە دۆزەخدا هەڵیانواسیم و بە حەیزەران و گورزی ئاسنین هەنجنهەنجیانکردم و هەموو نینۆکەکانیان لەبندەرهێنام و هەر سیودوو دانەیان هەڵکێشام و هەر دوودەستیان لەبنبڕیم و هەردوو قاچیان بزمارڕێژکردم و شەوێ لە شەوان بۆ بەهەشتیان ناردم ئیتر لەوساوە لە بەهەشتم.

- منداڵەکە وتی: ئەی باشە باوکە دۆزەخ لەکوێیە؟

- باوکەکە وتی: ((رۆڵە دۆزەخ لە زەویدایە و بریتییە لە چەند هەزار بەشێکی گەورە و بچووك دڵنیام با خۆت گەورەبیت ناوی هەموویان فێردەبی و بۆ کوڕەکەی خۆت باسیدەکەیت)).لەتیف هەڵمەت لـ٦٤.

لەم دەقەدا نووسەر هونەرمەندانە بە نووسین و دەربڕینەکان بەبێ ئاماژەکردنی راستەوخۆ بۆ مەبەستی راستەقینەی نووسەر خۆی وێنەی ئەو دۆزەخەی بۆ کێشاوین کە دوژمنانی میللەتەکەمان بۆ رۆڵەکانی گەلەکەمانیان دروستکردبوو، سەدان هەزار رۆڵەی بێتاوانی ئەم میللەتە لەو دۆزەخانەدا بێسەروشوێن دەکران.

مەستی ئێمە زیاتر خستنەڕووی ئەو راستییەیە کە نووسەر لە پشتی واتای پەیڤەکانی ئەو دەقەوە واتا یەکیکە و مەبەستێکی شاراوەی دەربڕیوە کە رستەکان راستەوخۆ ئەو واتایانە نادەنبەدەستەوە، بەڵکو لەڕێی واتای دەوروبەرەوە ئەو واتایانە هەڵەهێنجرێت کە ئەمە دیاردەیەکە دەکرێت لە دەقدا بەڕوونی ببینرێت.

### ٢. سنووری دەق

ئاشکرایە کە دەستنیشانکردنی سنووری دەق کارێکی زۆر سەخت و گران نییە (قەیس کاکل،لـ٢٨)، بەڵکو خوێنەر دەتوانێت بەسانایی دەق و نادەق

لێکجیابکاتەوە و دەتوانرێت درکبەوەبکرێت کە چ پەیڤ و وتە و دەربڕینێك دەقە و کامە دەربڕین و پاراگراڤێك دەق پێکناهێنێت، بەڵام لە زمانەوانیدا زانایان چەند مەرج و بنەمایەکی زمانییان بۆ پەیڤ و وتەیەك داناوە هەتاوەکو دەق سەیربکرێن و بوونیان لە دەقدا بەپێویست دەزانرێت، دیارترین ئەو مەرج و بنەمایانە کە بەلای زانیاریی زمانەوە پێویستە لە دەقدا هەبن برتینلە:

دەق بە کورتی و درێژی نییە، واتە مەرج نییە دەق لە چەند رستەیەك پێکهاتبێت، بەڵکو دەکرێت دەق لە رستەیەك پێکهاتبێت، بەڵام دەبێت بوترێت کە ئەوجۆرە دەقانە پێویستە واتایەکی زۆر فراوانتر لە پێکهاتە سینتاکسییەکەی بگەیەنێت یان واتاکەی زۆر لە واتای کەرەستە پێکهێنەرەکانی دەقەکە فراوانتربێت، هەروەها دەشکرێت دەق لە چەند رستەیەك پێکبێت بۆنموونە ئەم وتەیەی مەولانا کە دەڵێت: ئولولعەزمیش پێنج شەخسن (محەممەدی مەلا کەریم، لـ٢١٥)

دیارە ئەو دەربڕینە لە تەنها رستەیەك پێکدێت، بەڵام لە ڕاستیدا دەقێکی تەواو پێکدەهێنێت، چونکە لەو دەربڕینە کورتەدا دەرگا بەڕووی دەیان زانیاری زۆر گرنگی ئایینییە ئاسمانییەکاندا والادەبێت، دەروازەیەکە کە لێوەیدەچییە ناو بابەتی زۆر ئالۆزی ئایینییەوە و لێکدانەوەکانی دەیان و بگرە سەدان دەق پێکدەهێنێت و دەیان پرسیار دروستدەکات کە هەریەکەیان چەندین دەق پێکدەهێنن.

ئاشکرایە کە نموونەی ئەمجۆرە دەقانە لە ئەدەبیاتی کوردیدا زۆرن، بەتایبەتی پەندیپێشینان و قسەینەستەق کە بەشێکی گرنگی فۆلکلۆر و کلتور و سامانی ئەدەبی نەتەوەییمان پێکدەهێنن کە هەریەکەیان هەڵگری واتایەکی زۆر فراوان و دەچنە قاڵبی فەلسەفە و داناییەوە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانی کوردەوارییان گرتووەتەوە، کەچی لەڕووی پێکهاتەی ڕێزمانییەوە وشەگەلێکی کورتن بۆنمونە:

- شەر لە بەتاڵی چاکترە
- حازرخۆری بەرسێبەرە
- دوو شووتی بە دەستێك هاڵناگیرێت.
- ئیشکەری خۆیەتی خۆشەویستی خەڵکییە.

د. شوکریە رەسوڵ، ل٨٠ ــ ٨١.





وەك دەبینین ئەو وتانە لەڕووی فۆرم و پێکهاتەوە کورتن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا واتایەکی فراوان زۆر لە واتا فەرهەنگییەکانی ئەو وشەگەلە زیاتر دەگەیەنن کە ئەو وتانە پێکدەهێنن، هەروەها دەشکرێت دەق لە رستەیەك زیاتر پێکبێت وەك مەولانا دەفەرموێت:

ئەسڵی دووەم ئەمەتە باوەڕبکەی بە مەلائیکەی خودای تەعالا کە هەموو جیسمی لەتیفن نورانین دەتوانن خۆیان بنوێنن بە گەلێك شکلاَن، هەموو عەبدی خودان نەوەلەدنشی نەکچنی قسەی کافران درۆیە هەموو دۆستی خودان، لە ئەمری ویدان، هیچ گوناه و نافەرمانی و مێی و نێری و ژن و مێردایەتییان نییە.

(محەممەدی مەلا کەریم، لــ٢١٠)

ئەم دەربڕینە کە لە رستەگەلێك پێکهاتووە دەقێکی تەواو لەڕووی ڕێزمان و واتاوە پێکدەهێنێت.

٢. بەلای ڤان دایکەوە پێویستە دەق هەموو ئەو زانیارییانەی تێدابێت کە بۆ گوێگر پێویستن نابێت هیچ خاڵێکی شاراوەی تێدابێت و گرێیەك لای گوێگر یان خوێنەر دروستبکات، کە بۆینەکرێتەوە، چونکە بەوشێوەیە ئەو پەیڤ و دەربڕینە دەقێتی لەدەستدەدات و دەبێتە نادەق (قەیس کاکل، لــ٢٦)، بۆنموونە ئەم چەند بەیتەی مەولانا دەق پێکناهێنن:

**وە ئەودالْ نــــەکەم .. وە ئەودالْ نــــەکەم**
**تاکەی خۆم چوون قەیس وە ئەودالْ نەکەم**
**بازووی دەروێشیم پڕ خڕخالْ نەکەم**
**پۆشاکیْ جەلۆنگ شادەسمالْ نەکەم**
**چەنی دەیرییان مالْ بەچۆلْ نەکەم**
**تەحسیلی رۆزی بە کەشکۆلْ نەکەم**
**فەنابیم بە خاك سەحرای بەڕ نەکەم**
**بەو کانی و سێلاو دیدەم تەڕ نەکەم**

(یادی مەردان، لــ٦٢١).

یان کە دەڵێت:

**بە مووقەڕەبان بارەگای عیزەت**

**بە پەردەداران سەریر وەحدەت**

**بە عەرش و کورسی بە لەوح و قەڵەم**

**بە مەلائیکان خـــــاسەی موحتەرەم**

(یادی مەردان، لـ٦٢٨).

دیارە ئەو بەیتانە لەبەرئەوەی هەموو ئەو زانیارییانەی تێدانییە کە بەلای خوێنەرەوە پێویستن، لەبەرئەوەی ناچنە خانەی دەقەوە، بەڵکو بەتەواوبوونی هەموو هۆنراوەکە کە واتا و مەبەستەکان هەمووی ڕووندەبێتەوە، ئینجا دەقێك پێکدێت.

٣. ئەگەر دەق فراوانبوو پێویستە ڕستەکانی دروست و ئاسایی بەپێی پەیوەندی و کارلێکیان ڕیزبکرێن، بەشێوەیەك کە واتای یەکتر تەواوبکەن و کاریگەرییان لەسەریەکتر ئاشکرابێت و گە ڕستەیەکیان لەجێی خۆیدا نەبێت، ئەوا یان دەقەکە دەشێوێت یان واتا و مەبەستی سەرەکی خۆی لەدەستدەدات، بێگومان لەم حاڵەتانەشدا بۆ ئەو شوێن و مەبەستە شیاونابێت کە تێیدا بەکارهێنراوە، کەواتە ئەوەی لە دەقدا ڕۆڵی کارادەبینێت، ڕۆنان و تایبەتمەندی ڕۆنانی دەقە، چونکە ((دەق تەنها لە کۆمەڵێك ئاماژە پێکنەهاتووە، بەڵکو ڕێکخستنی ناوە و ڕۆنانی دەق بەپێی پێوەندی ئاسۆیی نێوان کەرەستە پێکهێنەرەکانی دەق پێویستییەکی بنەڕەتین بۆ ڕۆنانی دەق، هەروەها پێویستە دەق دیاریکراوبێت لەڕووی ناوەڕۆکەوە، واتە ناوەڕۆکێکی واتایی تەواوی هەبێت و مەبەستێکی تەواو بگەیەنێت بەڕادەیەك کە جیاکردنەوەی کەرەستە پێکهێنەرەکانی کارێکی مەحاڵبێت، چونکە گەر ئەو مەرجەی تێدانەبێت ئەوا واتا و مەبەستی خۆی لەدەستدەدات))

(د. سعید حسن بحیری، صـ١٠٥).

بۆنموونە مەولانا دەفەرموێت: (کرام الکاتبین) چوار شەخسن، چوار تایفەن، یەکێك لە چوار شەخسەکان جیبرەئیلە (علیە السلام) هەرچی خودا پێیفەرمووە گەیاندوویە بە پێغەمبەران بە ئەمینی، دووەمیان حەزرەتی میکائیلە (علیە السلام)





ڕزق و ڕۆزی تەنگانی و فراوانی و مەخلوقی ڕووی ئەرزی بەدەستە، سێهەمینیان حەزرەتی ئیسرافیلە (علیە السلام) نەفخی سوری بەدەستە، دووجار فووی پێدادەکات، بە جاری ئەوەڵ هەرچی زیندووە دەمرێت غەیری خودا نەبێت، بە جاری دووەم هەرچی مردووە زیندوودەبێتەوە، چوارەمین عیزائیلە (علیە السلام) ڕۆحکێشانی بەدەستە.

(محەمەدی مەلا کەریم، لـ٢١١)

ئەگەر لەو دەقەی مەولانا وردبینەوە دەبینین، یەکەیەکی زمانی یەکگرتووە کە ناکرێت چنینی کەرەستە پێکهێنەرەکانی دەستکاریبکرێت، چونکە لە ئەنجامی ئەوجۆرە ڕیزکردنە کەرەستە پێکهێنەرەکانی پەیوەندی سینتاکسی نێوان کەرەستەکان دروستبووە و یەکەی زمانی گەورەتر پێکهاتووە و بەپێکەوەبەستنی ئەو یەکە زمانییە گەورانە و لەڕێی پەیوەندی نێوانیانەوە دەقێك ڕۆنراوە کە خاوەنی پێکهاتەیەکی سینتاکسی تەواو و واتا و مەبەستێکی دروستە، هەر گۆڕانێك لە بەکارهێنان یان چنینی کەرەستە پێکهێنەرەکانی ئەو دەقەدا دەکرێت واتا و مەبەستی دەقەکە بشێوێنێت، ئاشکرایشە کە ئەوەی ڕۆڵی دیار دەبینێت لە ڕۆنانی دەقدا کەرەستە زمانییەکان و چۆنییەتی ڕیزکردنی کەرەستە زمانییەکانن ئەمەش باشترین بەڵگەی گرنگی زمانە لە ڕۆنانی دەقدا.

٤. یەکێك لە تیۆرییە زمانییەکان کە گرنگییەکی زۆری بە دەق داوە، تیۆریی ئەرکییە، بەلای یەکێك لە زمانەوانانی قوتابخانەی زمانیی (هالیدای)ەوە کە یەکێکە لە قوتابخانە ئەرکییەکان پێویستە تەنها لەڕووی زمانەوانییەوە لە دەق بکۆڵرێتەوە و نابێت لە چوارچێوەی زمانەوانی دەربچین، بۆ دەستنیشانکردنی دەق، پێویستیشە لە زمانەوانیدا لەگەڵ کەرەستە پێکهێنەرەکان و یەکە زمانییەکانی ناودەقدا گرنگی بە ئەرکی ئەو یەکە زمانییانە بدرێت، لە گەیاندن و ڕوونکردنەوەی واتای دەقدا، هەروەها پێویستە ئاماژە بۆئەوە بکرێت، کە پێکهاتەی جیاواز لە دەقدا واتە ڕۆنانی جیاواز و ڕۆنانی جیاوازیش ئەرکی جیاواز کە مەبەستی سەرەکی دەربڕینەکانی

ناودەقە، چونکە بەپێی تێڕوانینی ئەرکییەکان هەموو دەربڕینێك ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەش کە رۆڵدەبینێت لە دەستنیشانکردنی ئەرکی دەربڕینەکاندا کەرەستەی زمانییە پێکهێنەرەکانی ئەو دەربڕینانەیە.

## بەشی دووەم

## زمانی نووسینی مەولانا خالید

١. پێش ئەوەی بێینە سەرباسی زمانی نوسین لە دەقەکانی مەولانادا، بەپێویستی دەزانین تیشکێ بخەینەسەر بارودۆخی سیاسی و ئەدەبی و رۆشنبیری کوردستان لە سەردەمی بابانەکاندا، چونکە پەیوەندی راستەوخۆی بە نووسینی مەولاناوە هەیە، لەبەرئەوەی مەولانا لەهەمان چاخ و سەردەمدا دەستی بە نووسین و بلاّوکردنەوەی تەریقەتەکەی کردووە.

زیاد لە سەدەونیوێك پێش لەدایکبوونی مەولانا خالید لە قەلاّچوالان میرنشینی بابان لەلایەن بابانەکانەوە دامەزرا و دواتر لەبەر فراوانبوونی پایتەختەکەی گوێزرایەوە بۆ سلێمانی و بۆئەو مەبەستەش شاری سلێمانی بنیادنرا، هەرچەندە ئەم میرنشینە بەبەردەوامی لە ململانێدا بوو لەگەڵ هەردوو ئیمپراتۆری (عوسمانی و سەفەوی)دا و هەمیشە ئەو ئیمپراتۆرییەتانە خەریکی پلانگێڕی و دەسوەردانە کاروباری میرنشینەکەبوون، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینە کە زیاد لە دوو سەدەی خایاند، گرنگی بە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەلاّیەتی و ئابووری و سیاسی و ئەدەبی و رۆشنبیری دەدا، بۆنموونە لەڕووی ئابورییەوە گرنگییەکی زۆریان بە پیشەسازی دەدا، لەو سەردەمەدا کالاّی کوردستان گەیشتبووە تەنانەت ئەوروپاش بەتایبەتی (سابوون) ئینجا ئاژەڵ و بەروبوومی ئاژەڵداری کوردستان دیسانەوە دەنێردرایە دەرەوە و لەبەرامبەریشدا کەلوپەلی پێویستی کوردستان لە شەکر و چاو پێلاّو و قاوە و قاپوقاچاغ و پێویستیەکانی ناوماڵ.. هتد، دەهێنرایە کوردستانەوە (بەرهەمی ماڵەکان لە سابوون هەمووی کۆدەکرایەوە، ئینجا بە کاروان بۆ دەرەوە دەنێررا، لەدوای فرۆشتنی بە پارەکەی شەکر و چاو و.. هتد، هەر بەو کاروانانە دەیانهێنایەوە بۆ شار.

(د. مارف خەزنەدار، لـ١٧).





ئاشکرایە کە بزووتنەوەی ئەدەبی و رۆشنبیری تاڕادەیەکی باش پەیوەندی بە باری ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسییەوە هەیە، هەر لەبەرئەوەیە دەبینین لەپاڵ ئەو بزووتنەوە بازرگانی و سیاسییەدا بزوتنەوەیەکی ئەدەبی رۆشنبیری پایەبەرز لە میرنشینی باباندا هاتەئاراوە کە بەپاڵپشت و پشتگیری بابانەکان بوو، دیارە لەو سەردەمەدا مزگەوت و حوجرەکان تەنها مەڵبەندی فێربوون و خوێندن بوون، لەبەرئەوە دەبینین میرەکانی بابان گرنگییەکی زۆریان بە مزگەوت و خانەقاکان داوە و مامۆستا و مەلای شارەزایان لە شوێنەکانیتری کوردستانەوە بۆ ناوشاری سلێمانی هێناوە و لە گەنجینەی میرنشینەکە خەرجیانداوە بە مەلا و فەقێکان وەك هاندانێك بۆ خوێندن و فێربوون (هەر لەرۆژی پەیدابوونی ئەم میرنشینەوە شێوەی خواروی زمانی کوردی بووە بە زمانی رەسمی میرنشینەکە، بۆ یەکەمجار شاعیرانی کورد لە کوردستانی خواروود بەزاوای ئەم ناوچەیە هەڵبەستی نیشتمانیان بەسەر گەلی کورد و تێکۆشانی و میرنشینی بابان و ئامانجەکانیدا هەڵدا)

(د. کاوس قەفتان. لـ٢١).

لە سەردەمی میرنشینی باباندا دوو تەریقەتی ئایینی سۆفیزم لە کوردستاندا پەیدابوون، تەریقەتی (قادری) کە لەلایەن شێخ مارفی نۆدێییەوە و تەریقەتی (نەقشبەندی) کە لەلایەن مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە هێنرانە کوردستانەوە، مەولانا خالید دوای خوێندن و گەڕان بەدوای زانست و زانیندا چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی کوردستاندا توانی مەعریفە و زانیارییەکی زۆرباش کۆبکاتەوە و دوای گەڕانەوەی لە سەفەری هیند کە بۆ خوێندن و فێربوون ئەنجامیدابوون تەریقەتەکەی لە کوردستاندا بلاّوکردەوە کە ململانێیەکی باشدەکرا لەلایەن تەریقەتی قادرییەوە و ئەنجام بووە مایەی ئەوەی کوردستان تەنانەت عێراقیش بەجێهێڵێت و رووی بکاتە شام و لەوێ مایەوە تا کۆچیدواییکردنی.

بزووتنەوەی ئەدەبی سەردەمی بابانییەکان خاوەنی چەند سیما و تایبەتمەندییەکی دیاربوو، بەرهەمی مەولانایش چ پەخشانبێت یان شیعر لەو تایبەتمەندییانە بەدەرنییە، چونکە هەردوو بەرهەمی مەولانا و شاعیرانی قوتابخانەی

بابان بەرهەمی یەك سەردەمی ئەدەبی كوردی پێكدەهێنن، ئاشكرایشە كـە مەولانـا لــە نووســینە كوردییەكانیــدا ئەوەنــدەی مەبەســتی خزمــەتكردن و گەشــەپێدانی تەریقەتەكەی و لەڕێی تەریقەتەكەیشیەوە خزمەتكردنی ئایینی ئیسلام بووە، هەرگیز ئەوەندە مەبەستی زمان و ئەدەبی كوردی نەبووە، بەلاّم بەكارهێنانی زمـانی كـوردی بۆ نووسینەوەی هەندێ لە تێكستەكانی چ شیعربێت یان پەخشان خۆیلەخۆیدا هێمای هەسـتی نەتەوایەتییــە، چـونكە مــەولانا گۆشـكراوی نـاو مزگـەوت و خانـەقاكان و سەرقالّبووی زانسـتە ئایینـەكان و تەریقەتـە سۆفیزمییەكان بـووە، ئاشكرایـشە كـە كەرەستەی زمانی هەموو ئـەو زانـستانە زمـانی عـەرەبی بـووە لەبەرئـەوە بلّێـن كـە مەولانا هەنگاوی زۆر بوێرانەی لـەوبوارەدا نـاوە كـە توانیویـەتی زمـانی كـوردی بـۆ نووسینەوەی هەندێ دەق و تێكستەكانی بەكاربهێنێت بۆ گەیاندنی پەیامەكەی.

٢. شیكاری زمانیی لە زمانی نووسینی مەولانادا.

شــیكاری زمــانی دەقــی بریتییەلــە شــیكردنەوەی دەق لــەڕێی رونكردنــەوەی پەیوەندی نێوان رستەكانی ناودەق و ئینجا بابەتی دەقەكە، چونكە دەق پێكهاتەیەكە لە هەندێ پەیوەندی كە لەنێوان كەرەستە زمانییــە پێكهێنەرەكانیـدا هەیـە، ئەگـەر ئەو پەیوەندییانە بەشێوەیەكی دروست و لـەبار نـەبن، ئـەوا بابـەتی دەق دەشـێوێت و ئــەنجامیش دەق پێكناهێنرێــت و رۆنانرێــت. كــلاوس برینكــەر بــۆ روونكردنــەوەی شیكاری زمانیی لە دەقدا دوولایەنی زۆر گرنگ بەپێویست دەزانێت كە بریتینلە:

پێكهاتەی سینتاكسی و پەیوەندی نێوان یەكە زمانییەكانی ئەو پێكهاتە سـینتاكییە كە بێگومان رۆلّێكی سەرەكی هەیە لە بەیەكەوەبەستنی رسـتە پێكهێنـەرەكانی ئـەو دەقە.

بابــەتێتی لــە دەقــدا ئەمــەش پەیوەنــدی بــەو هەســتەوە هەیــە كــە دەق فەراهەمیدەكات، لەڕێی ئەو رستانەوە كە دەقەكە پێكدەهێنن.

(كلاوس برینكر، صـ٣٤).





بەمشێوەیە ئەم دوو بنەمایە دەبنە كەرەستەی هەرەگرنگ لە كردەی شـیكاری زمانی دەقدا، چونكە لە بۆتەی ئەو دوو بنەمایەدا گەلێ بابەتی رێزمانی بـە هـەموو بەشـەكانی وەك (وشەسـازی و رستەسـازی و سـیمانتیك)و (شـێواز) كـە لەچـۆنیەتی چـنینی وشـەكانی زمـان بـۆ پێكهێنـانی یەكەیـەكی زمـانی گـەورەتر كـە بتوانـرێ بــەكاربهێنرێت بــۆ گوزارشــتكردن لــە بــیر جێیدەبێتــەوە، بەمــەش هــەموو یەكــە رێزمانییەكان دەبنە بنەما بۆ روناكی دەقێكی دروسـت لـەڕووی واتـا و رێزمانـەوە، چونكە رۆنانی گەورەترین یەكەی زمانی كە (دەق)ە، پێویستی بە بچووكترین یەكـەی زمانییە كە دەنگە، دەكرێ ئەم بۆچوونە لەڕێی هێلّكارییەكەوە بخەینەڕوو.

(وریا عمر ئەمین، لـ١٩٨).




وەك لـەو هێلّكارییــەی سـەرەوەدا دەردەكـەوێت، رۆنـانی گـەورەترین یەكـەی زمـانی بـە بچووكترین یەكە زمانییەكان دەستپێدەكات، ئینجا پێویستە بۆ رۆنـانی دەقێكـی تـەواو لـەڕووی واتا و رێزمانەوە رەچاوی پەیوەنـدی واتـایی نێـوان كەرەسـتە پێكێنـەرەكانی رسـتەكان و ئینجـا

پەیوەندی نێوان رستەکان کە پەیوەندییەکانی ناو دەق پێکدەهێنن و رێککەوتنی واتایی و رێزمانی نێوان کەرەستە پێکهێنەرەکان بکرێت بۆئەوەی شێوازێکی جوان فەراهەمبێت، کە لەباربێت وەك دەقێك و بتوانێت ئەو بیرە بگەیەنێت کە لە مێشکی نووسەردایە و ئەمەش بێگومان بابەتی دەقەکەیە.

لەبەر رۆشنایی ئەو لێکدانەوە زمانەوانییانە دەچینەسەر شیکاری زمانی لە زمانیی نووسینی دەقە کوردییەکانی مەولانادا و بەپێویستیشی دەزانین، کە سەرەتا کورتەیەکی زمانی نووسینی مەولانا بەبەڵگەوە بخەینەبەرچاو:

١. زمانی نووسینی مەولانا وەك لە دەقەکانیدا دەردەکەوێت، زمانێکی کوردی تێکەڵە واتە لەگەڵ بەکارهێنانی زمانی کوردیدا وشە و زاراوەی زمانانیتری وەك عربی و فارسی بەکارهێناوە، ئەمەش وەك دیارە یەکێکە لە سیما و خەسڵەتەکانی زمانی نووسینی قوتابخانەی شیعری بابان کە هاوسەردەمی مەولانایە یان دەشتوانین بڵێین مەولانا بە ماوەیەکی کەم لە نووسیندا پێش ئەو قوتابخانە ئەدەبییە کەوتووە، ئەم راستییەش دەروازەی گەلێ بابەتیتر وەك سەرچاوەی قوتابخانەی شیعری بابان دەکاتەوە کە کەرەستەی ئەم توێژینەوە نییە. نموونەی زمانی نووسینی مەولانا بەکوردییەکی تێکەڵ:

**پاشا جە دەرگات ئێدمەن رەجا**
**ببەخشی گونای بەندەی رووسیا**
**من کە سەرحەلقەی گوناکارانم**
**سەرتۆق جەرگەی شەرمەسارانم**
**سەرتاپا غەریق لوجەی عصیانم**
**سفتەی نائیرەی ناحیرمانم**
**نیازم ئێدەین یاحەی یاقەیووم**
**(خالید) جە دەرگات نەکەری مەحروم.**

(یادی مەردان لـ٦٣٤)





٢. سیمایەکی دیاری نووسینی مەولانا بەتایبەتی تێکستە شیعرییەکانی ئەوەیە کە چ لە ڕووی وشە و زاراوەوە و چ لەڕووی شێوازی داڕشتنەوە شێوەی ئەدەبیاتی گۆرانی گرتووەتەبەر بۆنموونە سەرەتای نووسینی شیعرەکە واتە نیوەدێڕی یەکەم بە دووبارەبوونەوەی یەك دەستەواژە دەسپێدەکات کە ئەمە فۆرمێکی بەرچاوی ئەدەبیاتی گۆرانە ئینجا زاراوەگەلێکی زۆری شێوەزاری گۆران لە شیعر و نووسینەکانیدا بەکارهاتوون (د. مارف خەزنەدار،ل٢٦) بۆنموونە:

**میرزام وەفاتەن.. میرزام وەفاتەن**
**قەدەم رەنجکەر وادەی وەفاتەن**
**شەهەنشای شادیم مات ناماتەم**
**بتپەرست، ئاسا ئەڕۆم جەلاتان**
**وادەی ئاماتەن ئامان سەدئامان**
**رێزەی رازانت شیفان پەی زامان.**

(یادی مەردان لـ٦٣٥)

هەردوو بنەمای شیکاری زمانی کە (پێکهاتەی سینتاکی)و (بابەتی) دەقە لە دەقە کوردییەکانی مەولانادا بەوردی بەدیدەکرێت، بۆنموونە:

((ئەسڵی سێمین ئەوەتە باوەڕ و یەقین بکەی بە هەموو کوتوبی خودای تەعالا کە رەوانەی کردوونە خوارەوە ئەسەر هەندێك لە پێغەمبەری خۆی بەئەمەکە هەموو کەلامی قەدیمن، سیفەتی قائیمن بەزاتی خودای تەعالاوە، مەخلوق نین، هەموو حەقن، هەرچی لەوانەدا هەیە راستە، هیچی درۆنییە، قورئان هەمووی بردووەتە پاشەوە، لە هەمووان چاترە))

((گۆڤاری کۆڕ – ٢١٣)).

لەو دەقەی سەرەوەدا بەئاشکرا دیارە کە بیرۆکەی نووسینەکە کە بابەتی دەقەکە پێکدەهێنێت لەئەنجامی دروست بەکارهێنانی وشەگەلی دەقەکە لەپێناو رۆنانی رستەدا هاتووەتەئاراوە، وەك: (باوەڕ و یەقین بکەی بە هەموو کوتوبی خودا) رەوانەیکردوونە خوارەوە ئەسەر هەندێك لە پێغەمبەری خۆی لەو رستانەدا تەواوی یاسای رێزمانی کوردی بەرجەستەبووە ئینجا رستەکان، بەشێوەیەك لەڕووی رێزمان و واتاوە بەیەکەوەبەستراون گەر لێکبترازێن واتاکە

دەشێوێت یان لەناودەچێت، بۆنموونە واتای رستەی یەکەم زیاتر لەرێی رستەی دووەمەوە روونده‌بێتەوە کە ئەمە بابەتێکی سینتاکسی پێکدەهێنێت کە پێیدەوترێت (رستەی ئاوێتە) ئینجا رێککەوتنی رێزمانی نێوان ناوکردار و جێناوەکان لە رستە پێکهێنەرەکانی دەقدا روون و ئاشکراو دیارە، بۆنموونە:




٣. پەیوەندییەکانی ناو دەق یەکێکە لە بناغەکانی رۆنانی دەق، ئەوەی بەرچاودەکەوێت مەولانا زۆر شارەزایانە ئەو پەیوەندییانەی کە پێویستن بۆ جوانکردن و رێکخستنی دەق بەکارهێناون، بۆنموونە پەیوەندی بریتیخستن کە بریتییەلە (( لەجێگرتنەوەی کەرەستەیەکی زمانی بە کەرەستەیەکیتر لە چوارچێوەی دەقدا)) (قەیس کاکل، لـ٩٧) لەمجۆرە پەیوەندییەدا پێویستە کەرەستە جێگرەکە واتە لەجێبەجێکار هاتووە کە کورتتربێت لە کەرەستەی زمانییە لابراوەکە، لەراستیدا ئەمجۆرە بەکارهێنانە بەروونی لە دەقەکانی مەولانادا بەدیدەکرێت، بۆنموونە:
(( ئەسڵی دووەم ئەمەتە باوەڕبکەی بە مەلائیکەی خودای تەعالا کە هەموو جیسمی (لەتیفن) نورانین دەتوانن خۆیان بنوێنن، بە گەلێك شکلاْن، هەموو عەبدی خودان، نەوەلەدشنی نەکچنی، قسەی کافران درۆیە هەموو دۆستی خودان، لەئەمری ویدان، هیچ گوناهـ و نافەرمانی و مێی و نێری و ژن و مێردایەتییان نییە)). (محەممەدی مەلا کەریم، لـ٢١٠).

لە رستەی یەکەمی ئەو دەقەی سەرەوەدا ناوی (مەلائیکە) هاتووە، ناوەرۆکی دەقەکە باس لەپێویستی بڕواپێبوونی دەکات، لە رستەی دووەمی هەمان دەقدا لەجێی ناوی مەلائیکە جێناوی نادیاری (هەموو) بەکارهاتووە، واتە لەجێی ئەوەی بوترێت (مەلائیکە جیسمی لەتیفن) وتراوە (هەموو جیسمی لەتیفن) لێرەدا هەموو جێی مەلائیکەی گرتووەتەوە و لە وشە جێگیراوەکەش کورتترە کە ئەمەش مەرجێکی جێگرتنەوەیە.





جۆرێکیتری پەیوەندی ناو دەق پەیوەندی کرتاندنە کە زۆر لەبریتیخستنەوە دوورنییە، بەڵاْم جیاوازییەکەی لەوەدایە کە کەرەستەیەك لادەبرێت لە رستەیەکی دەقدا و هیچ کەرەستەیەکیتری ناخرێتەجیْ. (قەیس کاکل، لـ١٥٤).

ئەمجۆرە پەیوەندییەش لە دەقەکانی مەولانادا زۆر بەرچاودەکەوێت، ئەگەر سەیری هەمان دەقی پێشوو بکەین ئەمجۆرە پەیوەندییە لە دەربڕنەکانی (ئەسڵی دووەم ئەمەتە باوەڕبکەی بە مەلائیکەی خودای تەعالا) (کە هەموو جیسمی لەتیفن) (نورانین) لە رستەی یەکەمدا باسی مەلائیکە کراوە، لە رستەی دووەمدا جێگرتنەوە روویداوە وەك پێشتر رونمانکردنەوە، بەڵاْم لە دەربڕینی سێیەمدا کرتاندن بەکارهێنراوە، چونکە مەلائیکە باسکراوە بێئەوەی ئاماژە بە ناوەکە بکرێت یان کەرەستەیەکی لەجێدابنرێت، جگەلە جێناوی لکاوی کە بەمەبەستی رێکەوتن لە دەربڕیندا پێویستە.

هەموو ئەم بابەتە رێزمانیانە لە دەقەکانی مەولانادا بەرچاومانکەوت، لەپێناو جوانکردن و رێکخستن و کورتکردنەوەی دەربڕینە بەپێی توانا و پێویست لەپێناو فەراهەمکردنی دەقێکی لەبار و جوان کە تێیدا بیری نووسەرەکە بگەیەنرێتە خوێنەر یا گوێگر کە بەبۆچوونی ئێمە مەولانا زۆر سەرکەوتووبووە تێیدا.

٤. هەروەها لە دەقە کوردییەکانی مەولانادا گەلیْ بابەتی فۆنەتیکی و دەنگسازی بەدیدەکرێت کە بەڕاستی بۆ لێکۆڵینەوەی ئیتمۆلۆژی گرنگییەکی زۆر و کەرەستەیەکی بەهادار پێکدەهێنن لەوانە:

أ. لە پەخشانی عەقیدەی کوردی مەولانادا مۆرفێکی (دە)ی کاتی داهاتوو بەکارهاتووە و بە هیچ جۆرێك ئەلۆمۆرفی (ئە)ی کاتی داهاتوو بەکارنەهاتووە وەك (شەڕان دەنووسێت) (بەشیریان پێدەڵێن) (وەلەدیان دەبێت).. هتد، کەچی لە شیعرەکانیدا مۆرفێکی (ئە) بۆ کاتی داهاتوو بەکارهاتووە وەك (ئەڕۆم جەلاتان).

ب. لە زۆر شوێندا لەجێی دەنگی (پ) دەنگی (ب) بەکارهاتووە.

پ. لە زۆر شوێندا لەجێی دەنگی (هـ) دەنگی (ح) بەکارهاتووە.

(محەممەدی مەلا کەریم، لـ٢٠٢).

لەڕاستیدا ئەمجۆرە بەکارهێنانە لە دەقەکانی مەولانادا بەرچاودەکەوێت گرنگی مێژوویی خۆی هەیە، بۆ ساغکردنەوەی گەلێ لایەنی شاراوە لە قۆناغە جیاوازەکانی بەکارهێنانی ئەم زمانە شیرینەدا و ئینجا دەستنیشانکردنی تایبەتمەندییەکانی هەر قۆناغێك، کە ئەنجام دەگەینە قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی زمانەکەمان.

## ئەنجام

لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا گەیشتووینەتە ئەم ئەنجامانەی لای خوارەوە:

مەولانا لە سەردەمێکی زۆر هەستیاردا دەستیداوەتە نووسینی کوردی کە نووسینی کوردی لەو بارودۆخ و سەردەمەدا زۆر دەگمەن بووە، لەبەرئەوە بۆئەو سەردەمە گرنگی بەرچاوی خۆی هەبووە.

دەقەکانی مەولانا لەڕووی زمانەوانییەوە دەقگەلێکی دروستن چ لەڕووی پێکهاتەی ڕێزمانییەوە بێت یان لەڕووی واتاییەوە.

هەموو مەرجەکانی دەق و سنووری دەق مەرجەکانی ڕۆنانی دەق بەپێی تیۆری شیکاری زمانیی دەق لە دەقە کوردییەکانی مەولانادا بەدیدەکرێت.

گەلێ دیاردە و حاڵەتی ڕێزمانی لە دەقەکاندا هەن کە بۆ دراساتی ئیتمۆلۆژی گرنگی خۆیان هەیە و لەوڕووەوە پێویستییەکی زمانەوانین.

***





## ژێدەر و سەرچاوەکان

**سەرچاوە کوردییەکان:**

- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەغدا، ١٩٧٩.
- د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی ٣، هەولێر ٢٠٠٧.
- د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکیتری زمانەوانی، هەولێر ٢٠٠٤.
- د. کاوس قەفتان، بابان، سۆران، بۆتان، بەغدا، ١٩٨٥.
- سدیق بۆرەکانی، مێژووی وێژەی کوردی.
- د. شوکریە ڕەسوڵ، پەندیپێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، هەولێر ١٩٨٤.
- محەمەدی مەلا کەریم، عەقیدەی کوردی مەولانا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژ٨، بەغدا،١٩٨١.
- قەیس کاکل تۆفیق، پەیوەندییەکانی نێو دەق، نامەی دوکتورا، هەولێر، ٢٠٠٢.
- ڕۆلان بارت، چێژی دەق، و. ئیسماعیل زراعی، هەولێر، ٢٠٠٧.
- محەمەد ئەحمەد محەمەد، ڕۆحی مەولانا، و. پیرەمێرد، بەغدا، ١٩٨٧.
- عبدالوهاب کانەبی شەریف، فەرهەنگی ئیدیۆم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- لەتیف هەڵمەت، بەشەکانی دۆزەخت، گۆڤاری نووسەری کورد، ژ١، خولی ٣، ١٩٨٥.
- محەمەدی مەلا کەریم، بلاّوکراوەکانی ڕۆڤار، ژ١٢.

**سەرچاوە عەربیەکان:**

- **كلاوس برينكر، التحليل اللغوي للنص، ترجمة: د.سعيد حسن بحيرى، مصر، ٢٠٠٥.**
- **د. سعيد حسن البحيرى، علم اللغة النص، مصر، ٢٠٠٤.**
- **محمد صلاح الدين الشريف و اخرون، أهم المدارس اللغوية، تونس، ١٩٩٠.**

**سەرچاوەی ئینگلیزی:**

- A.Van Dijk.Text And Context. ١٩٧٧

# تیگەیشتنی چەمکی دەوڵەت

حەبیب محەممەد دەروێش

دەوڵەت بونەوەرێکی گرنگ و پڕ بایەخە بۆ ژیانی مرۆڤەکان، لەگەڵ ئەوەدا دەوڵەت شتێکی ئەبستراکتە و کەس بە شێوەیەکی واقیعی و بەرجەستەیی دەوڵەتی نەبینیوە، بەڵام کەسیش ناتوانێ ئینکاری بوونی دەوڵەت بکات، یان نکوڵیی لەو پانتاییە فراوانە بکات کە دەوڵەت لە ژیانی ئێمەدا داگیریدەکات بە شێوەیەك بە هەرەسهێنان و نەمانی دەوڵەت ئیمکانی ژیانی و زیندەگیمان زۆر مەترسیدار دەبێت.

ئێمە ناچینە ناو پێناسە جیاوازەکان کە بۆ دەوڵەت کراوە، بەڵام ئەوەی گرنگە لە شیکردنەوەی بیری دروستکردنی دەوڵەتدا ئەوەیە کە مرۆڤ دەوڵەتیَ دروستکرد بۆئەوەی ملکەچی مرۆڤێکیتر نەبێت، دەوڵەتیان کرد بەئەو سەنتەرەی کە هەست بە پێویستی و پێگەی قورسایی بکەن، ئەوکاتە ملکەچی و گوێڕایەڵیکردنی ئەو ئیرادەیە بەلایانەوە پێویستییەکی بەردەوامی ژیانە بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك هەستبکات کە ئەو ملکەچە یان لەژێر گوێڕایەڵی ئیرادەیەکی بەشەریدایە، کەواتە دەوڵەت فۆرمێکە بۆ دەسەڵات، گوێڕایەڵکردنیشی جۆرێکە لە گوێڕاڵییەکی پیرۆز، بەو مانایە بوون و مانەوە و بەردەوامی خودی مرۆڤەکانی پێوەبەندە، بۆیە لێرەدا پەیوەندییەکە، واتە پەیوەندی نێوان حاکم و مەحکوم لەسەر بنەمای هێز دانەمەزراوە کە ئەو بنەمایە دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی بونیادنانی دەوڵەت کە تاکە رایەڵەی پەیوەندییە بۆ رێکخستن و ملکەچکردن، گوێڕایەڵی بریتیبوولە هێز، هێزی ناچارکردن کە لەلایەن مرۆڤێکەوە پیادەدەکرا بەسەر مرۆڤێکیترەوە یان سەپاندنی ئیرادەی مرۆڤێك بەسەر مرۆڤەکانیترەوە، کەواتە فۆرمی دەسەڵاتی دەوڵەت ئیرادەیەکی تاکەکەسی نییە، بەڵکو ئیرادەیەکی ئەبستراکتە، بۆیە لەکاتێکدا هاووڵاتییەك گوێڕایەڵی پۆلیسێکی هاتووچۆ دەکات، ئەوە گوێڕایەڵی دەنگی شاوری مرۆڤێکی نەکردوە، بەڵکو ئەوە گوێڕایەڵییە بۆ دەسەڵاتێك کە ئەو پۆلیسە نوێنەرایەتی دەکات، واتە گوێڕایەڵی نییە بۆ ئیرادەی ئەو کەسە کە لەوەدەچێ برادەر یان ناسیاوی خۆشی بێت، بەڵکو ئەوە





رێزگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەتە و ئەو پۆلیسەش هیچ نیە بێجگە لە یەکێك لە میکانیزمەکانی دەوڵەت، بەڵام میکانیزمێکی ئەکتیڤ. بەهەمانشێوە کاتێك کەسیك پارەکەی دەخاتە بانکێکەوە ئەوە پێدانی متمانە نییە بەو خەزنەدارەی کە پارەکەت لێوەردەگرێ بەڵکو دانانی پارەیەکە لەلای قەوارەیەکی گەورە کە دەوڵەتە، کە بە نەمانی پارەکە ئەو قەوارەیە تۆمەتباردەکەیت بە دزی، یان کاتێك حکومەتێك یان وەزارەتێك تۆمەتبار دەکەیت بە گەندەڵ، ئەوە تۆمەتبارکردنێکە رووبەڕووی کەسێك نابێتەوە لەبەرئەوەی بێتوانایە، بەڵکو ئەوە بەکارهێنانی دەسەڵاتە بۆ بەرژەوەندی شەخسی و بەلارێدابردنی دەسەڵاتە بۆ غەیری ئەو مەبەستەی کە بۆی دورستبووە، لەو کاتەدا ئەو رەفتارە رەهەندێکی تاوانکاری وەردەگرێ لەبەرئەوەی ئەو کەسە لەو پێگەیەدا بە سیفەی شەخسی پیادەی دەسەڵاتی فەردی ناکات بەڵکو پیادەی دەسەڵاتی هێزێکی زەبەلاح دەکات کە دەوڵەتە.

بەبێ ئەم تێڕوانینە بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت، هەر تێڕوانینێکیتر بۆ دەوڵەت لە هەموو روویەکەوە هەرەسدەهێنێ، چونکە گوێڕایەڵی و ملکەچی لەو جۆرە نییە بۆ کەسێکی بەهێز بەڵکو ئەو گوێڕایەڵی و ملکەچییە بەردەوامە، چونکە دەسەڵاتداران دێن و دەڕۆن بەڵام ئەوە دەسەڵاتە ئەبستراکتەکەی دەولەتە بەردەوامە و هەموانیش ملکەچی و گوێڕایەڵییەکەیان بەردەوامدەبێت، لەبەرئەوەی گوێڕاڵییەکە بۆ کەسەکان نییە، بەڵکو بۆ ئیرادەیەکی گشتییە لەپێناو چاکەی گشتیدا، بەڵام مانەوەی دەسەڵاتداران بۆ ماوەیەکی زەمەنی زۆر و بەردەوامی لە حوکمداریدا بەبێ گۆڕانی حوکمدارەکان شەرعییەتی ئەو دەسەڵاتە دەخاتە ژێر پرسیارەوە و دەبێتە مایەی پرسیارکردن لە بنەماکانی درستبوونی دەوڵەت و چەند یێك مانەوەی ئەو کەسانە لەگەڵ فۆرمی دەسەڵاتی دەوڵەتیدا دەگونجێ، داکیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەلایەن کۆمەڵێ کەسەوە، دەبێتە هۆی دەبێتە هۆی خاڵیبوونەوەی ماناکانی دەسەڵاتی دەوڵەت، لەم حاڵەتەدا دەوڵەت نامێنێت، بەڵکو دەوڵەت و یاساکانی دەوڵەت دەبن بەو بەهانەیەی کە کۆمەڵێ کەس بەناویانەوە مەیل و ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانی خۆیان و تاقمەکانیان پێپیادەدەکەن، ئەوکات دەسەڵات دەبێت بە پرۆژەیەکی ستەمکاری، هەروەك چۆن مارکس دەوڵەتی بە میکانیزمێك دادەنا بۆ سەرکوتکاری، لێرەدا دەوڵەت خاڵیدەبێتەوە لە بێلایەنی و دەوڵەت لە کەسێکدا یان لە بنەماڵەیەکدا یان لە حیزبێکدا بەرجەستەدەبێت و دەبێت بە قەوارەیەکی نامۆ بە هاونیشتمانیان.

دەسەڵات لە فۆرمی دەوڵەتدا کاتێك گەیشت بەم ئاستە هەروەك هێگڵ دەڵێ ئەوکاتە تاك هیچ بەرژەوەندییەکی خۆی لەگەڵ دەوڵەتدا نابینێتەوە، تاك ئەوکاتە لە دەرەوەی دەوڵەت ئیشدەکات، بەڵکو دژ  بە دەوڵەتیش ئیشدەکات، چونکە بەرژەوەندییەکانی خۆی دەبینێ لەگەڵ میکانیزمی کارکردنی دەسەڵاتدا یەکناگرێتەوە، دەوڵەت ئەوکاتە هەروەك هێگڵ دەڵێ بەرجەستەی ئیرادەی گشتی و حەقیقەتی بابەتی و ئەخلاقی جەوهەری ناکات، دەوڵەت بە مانا جەوهەرییەکەی نامێنێ، بەڵکو فۆرمێکیتری دەسەڵات دروستدەبێت کە هیگڵ بە دەوڵەتی نادەوڵەت ناویدەبات بەپێچەوانەی دەوڵەتی راستەقینە کە دەوڵەتی دەوڵەتییە کە گوزارشت لە بەرژەوەندییەکانی خەڵك دەکات.

## دەسەڵاتی دەوڵەت  - هوشیاری سیاسی

بە هەموو کۆمەڵگایەکی سیاسی رێکخراو ناوترێت دەوڵەت، بوون و پیادەکردنی دەسەڵات بەڵگەی بوونی دەوڵەت نییە، چونکە دەسەڵات دیاردەیەکی گشتگیر و جیهانیە و فۆرمیشی زۆرە، بوون و پیادەکردنی جۆرێك لە دەسەڵات لە کۆمەڵگاشدا دەوڵەت دروستناکات، کەواتە تاکە پەیوەندی لەنێوان دەسەڵات و دەوڵەتدا بریتینییەلە پیادەکردنی دسەڵات، چونکە سیماکانی دەسەڵاتی دەوڵەت جیاوازە لە فۆرمە جۆربەجۆرەکانیتری دەسەڵات، ئامانجی دەوڵەت جیاوازە و بە شێوازێکە دوورە لە پیادەکردنی ئیرادەی تاکایەتی دەسەڵاتداران و پیادەکردنی خودی دەسەڵاتی دەوڵەتیش بەپێی کۆمەڵێ یاسا و رێسایە کە مرۆڤەکان دەپارێزێ لە درِندەیی ئەو بوونەوەرەی کە پێیدەوترێت دەوڵەت.

کۆمەڵگای سیاسیش تەنها گردبوونەوەیەکی فیزیکی تاکەکان نییە،  بەڵکو دەبێت هۆشیارییەکی هاوبەش پێکەوەیان ببەستێ و هەست بە ئینتیمابکەن بۆ کۆمەڵگاکەی خۆیان، کەڵکەڵەی کۆبوونەوەی کەسەکانیش پێویستی مانەوە و بەردەوامی ژیان دروستیدەکات، ئەو هەستکردنە بە زەرورەتی ژیانێکی بەکۆمەڵ و هاوبەش هۆشیارییەك دروستیدەکات کە دەتوانین بە ژێرخانی سەرەتایی کۆبوونەوەی مرۆڤەکانی دابنێین، کەواتە دەسەڵات بە مانا جەوهەرییە قووڵەکەی بریتییەلە بەرجەستەکردنی ئەو وزەیەی لە کۆبوونەوەی کەسەکانەوە دروستدەبێت کە ئایدیایەك دەیخولقێنێ لە شێوەی سیستمێکی کۆمەلایەتیدا. ئەو هێزەش هۆشیارییەکی بە کۆمەل دروستیدەکات کە گرەنتی مانەوە بەردەوامی ژیانی بەکۆمەڵە.





ئەوەی گرنگە لە فۆرمی دەسەڵاتی دەوڵەتدا، بریتییەلە بوونی سیستمێکی یاسایی کە پایەکانی دەسەڵات و تۆڕی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتداران و کۆمەڵگای لەسەر بونیادنراوە، بوونی سیستمێك لە بەڕێوەبردن و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگا ئەو خاڵە گرنگەیە دەسەڵاتی دەوڵەت جیادەکاتەوە لە دەسەڵاتی تاکەکەس و دەسەڵاتی فیودالی خێڵەکی و بنەماڵەیی و بە تێکەڵاوکردنی دەسەڵاتی تاکایەتی بنەماڵەیی کەسە دەسەڵاتدارەکان، قسەکردن لەسەر دەوڵەت بە چەمکە نوێیەکەی زۆر زەحمەت دەبێت، چونکە دەسەڵات بوونەوەرێکی ئەبستراکتە و مەعنەوییە و بەردەوامە و ئەوانەش  بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی ئەو دەسەڵاتەیان لەدەستدایە، دەسەڵاتی خودیەتی بنەماڵەیی خۆیان پیادەناکەن، بەڵکو دەسەڵاتێك پیادەدەکەن کۆمەڵگا پێیبەخشیون، بۆیە تێکەڵاوکردنی ئامانجە شەخسییەکانی خۆیان و بنەماڵە لەگەڵ دەسەڵاتی گشتی دەوڵەتدا رەهەندێکی تاوانکاری وەردەگرێ کە بریتییەلە بەکارهێنانی پایەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت کە لادانی جەوهەری دەسەڵاتە لە بەرژەوەندی گشتییەوە بۆ بەرژەوەندی شەخسی و بنەماڵەیی، کەواتە ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت پیادەدەکات خاوەنی دەسەڵاتەکە نییە بەپێچەوانەی سیستمی دەرەبەگایەتی کە لەیەککاتدا ئەوەی پیادەی دەسەڵاتی دەکرد خۆی خاوەنی دەسەڵاتەکە بوو، بە موڵکی شەخسی خۆی دەزانی، لە سیستمی دەرەبەگایەتیدا خودی خۆی و قەوارەکەش لەیەککەسدا کۆدەبوویەوە، پەیوەندییەکە لە دەرەبەگایەتیدا پەیوەندییەکی ئیمانی و شەخسی بوو لەنێوان تاکی دەسەڵاتدار و کەسی دەسەڵات لەسەر پیادەکراو. لە هەر کوێیەك دەسەڵات کۆکرایەوە لە شەخسێکدا و پەیوەندییەکە گۆڕا لە پەیوەندییەکی سیستماتیکەوە بۆ پەیوەندییەکی ئیمانی شەخسی، لەوێدا سیستمی دەرەبەگایەتی بەڕێوەدەچێ، بۆیە دەرەبەگایەتی سیستمێك نییە لە مێژوودا مردووبێت بەڵکو هەندێجار لە بەرگێکی سیاسی مۆدێرندا خۆی بەرجەستەدەکات، ئەوکاتەش کەسەکانی ناو دەزگاکانی دەسەڵات خزمەتی سیستمی دەسەڵاتی دەوڵەت ناکەن و بۆ چاکەی گشتی کارناکەن، بەڵکو خزمەتی تاکەکەسێك دەکەن و تاکەکانی کۆمەڵگاش گوێڕایەڵی بوونەوەرێکی ئەبستراکت ناکەن کە دەسەڵاتی دەوڵەتە، بەڵکو گوێڕایەڵی تاکەکەسێك دەکەن کە لە هەرەمی دەسەڵاتدایە. لێرەدا گەورەترین مەترسی دەردەکەوێت لەسەر سیستمی دەسەڵاتی دەوڵەت کە داگیرکردنی دەوڵەتە لەلایەن کەسەکانەوە کە بەجێهێنانی ئەو دەوسەڵاتەیان پێسپێردراوە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی دروستبوونی دەوڵەتدا.

لە دەسەڵاتی دەوڵەتدا دەسەڵاتێك دادەمەزرێت جیاکارییەك دروستدەکات لەنێوان پایەی دەسەڵات و ئەوکەسەی کە مومارەسەی دەسەڵات دەکات، واتە دەسەڵات بەرجەستەنابێت لەوکەسەی کە مومارەسەیدەکات، بەڵکو ئەوە پێویتسییە وایکردووە کەسێك ئەرکی پیادەکردنی دەسەڵات بگرێتەدەست، ئەگەر وانەبێت واتە گرتنەئەستۆی دەسەڵات وەك ئەرکی رێکخستنی کۆمەڵگا و بەرێوەبردنی لەپێناو ئامانجێکدا کە چاکەی گشتییە، ئەوا ژیانی کۆمەڵگا تووشی چەقبەستن و راوەستان دەبێت، دەسەڵاتی دەوڵەت دەبێت دامەزراوەیی بێت، بەو مانایەی ئەوانەی لە دەسەلاتدان بێجگەلە بەجێهێنانی ئەرکێك هیچیتریان نییە، گواستنەوەیە لە کەسی دەسەڵاتدارەوە بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت کە تاکەخاوەن و چەقی دەسەلاتی گشتییە. لێرەوە تێدەگەین دەسەڵاتی دەوڵەت جیاوازە لە فۆرمەکانیتری دەسەڵات

## دەوڵەت و بەدەوڵەتبونی هەریمی کوردستان

- دەسەڵاتی دەوڵەت گواستنەوەیە لە دەسەڵاتی تاکەکەس و تاکەبنەماڵە و خێڵەوە بۆ دەزگایەکی موجەرەد کە سەنتەری دەسەڵاتە کە گوزارشت لە ئیرادەی گشتی دەکات و ئەم دەسەڵاتەش بەردەوام لە گۆڕانی بەردەوامی ئەوانەدایە کە ئەرکی بەجێهێنانی دەسەڵاتەکەیان لەدەستدایە، پرسیار ئەوەیە ئەگەر هەرێمی کوردستان بەرەو دەوڵەت بوون بڕوات کەوا چاوەڕواندەکرێت، دەبێت بپرسین دەسەڵاتی سیاسی لە هەرێمی کوردستان لە ماوەی حوکمڕانی خۆیدا چەندێك توانیویەتی دەسەڵات بەم مانایە بەرجەستەبکات و ئەو گواستنەوەیە پیادەبکات و ئایا کەسە دەسەڵاتدارەکان لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و گەشەسەندنی پرۆسەی بەرەو دەوڵەتبوون توانیویانە دەستبەرداری دەسەڵاتی شەخسی خۆیان بن، بەبێ ئەوەی وەڵامی بدەینەوە.. دەزانین دەسەڵات لەنێو خودی حزبە سیاسییەکانی کوردستان لە چەپەوە بۆ راست و لە عەلمانییەوە بۆ ئیسلامی دەستاودەستناکرێت، ئیتر چۆن چاوەڕوانی ئەوە بکەین ئەو گواستنەوەیە لەنێو دەسەڵاتێکی گشتی پڕ بەرژوەنیدا روویدات.

- ئەگەر دەسەڵاتی دەوڵەتی بریتیبێتلە بەدامەزراوەییکردنی دەسەڵات و دەرهێنانی دەسەڵات بێت لە دەست شەخس و بنەماڵە و خێڵ و چەند حزبێکی دیاریکراو، چەندێك دەسەڵاتی سیاسی ئێمە توانیویەتی ئەو قۆناغە ببڕێ و ئامادەبێت دەسەڵات بە عەقلانی بکات، کە وەك ماکس ڤیبەر دەڵێت: لە هەرکوێیەك دەوڵەت هەبوو دەبێت عەقلانییەتی لەگەڵ خۆیدا





هەڵگرتبێت، ئەوەش هاتنەدەرەوەیە لە هەناوی دەسەڵاتی شەخسی و بنەماڵەیی و حیزبی، بەڵام دەبێت ئەم بە عەقلانیکردنەش گشتگیر و بەردەوامبێت، بەعەقڵیکردنێکی جوزئی هەمیشە لەژێر رەحمەتی بەرژەوەندییە شەخسی و حیزبییەکاندا کە لەپڕ دەردەکەوێت و دوای ماوەیەکی کەم وندەبێت، بەڵام عەقلانییەتی گشتی هەموو بوارەکان دەگرێتەوە و بەردەوامیشە لە گەشەسەندن و بڵاوبوونەوە، تا لە زیهنییەت و سایکۆلۆژیای هەموو کەسێکدا دەبێت بە پرینسیپی ژیانی سیاسی، لە ماوەی دەستەلاتداریێتی هەرێمی کوردستاندا کە بە قسەی سیاسییەکانی ئێمە هەموو بنەماکانی دەوڵەتی تیادایە، تەنها دانپیانانێکی نێودەوڵەتی ماوە، ئایا عەقلانییەت بەو مانایە باسمانکرد پرینسیپێکە لە سیستەمی سیاسی ئێمە و هەموو بوارەکانی گرتووەتەوە و بەردەوامیش لە گەشەسەندندایە یان ئێستاش دەسەلاتی سیاسی لەسەر بنەمای پاوانکاری ناوچەیی و حیزبی دەبڕێتبەڕێوە، نووسەری گەورەی تورك و دۆستی گەلی کورد ئیسماعیل بێشکچی پێیوایە، هەموو حیزبە کوردییەکان بە عەقڵییەتی شوانکارەیی کاردەکەن، بەداخەوە دوای قۆناغی شۆڕشیش شۆڕشگێڕە دەستەلاتدارەکان نەیانتوانیوە ئەو فۆرمە دواکەوتووە تێپەڕێنین کە دەبوایە لە قۆناغی شۆڕشی شاخدا تەجاوزیان بکردایە نەك گواستنەوەی ئەو فۆرمە بۆ ناو چەقی دەسەلاتی شارەکان، بۆیە دەسەلاتی کوردی کەی بە شێوەیەکی جدی کاردەکات بۆ بونیادنانی دەسەلاتێکی عەقلانی کە گونجاوبێت بۆئەوەی لە ئاییندەدا ببێت بە دەسەلاتی دەوڵەتی.. کەواتە حەقە بپرسین بۆچی دەسەڵاتی هەرێم نەیتوانیوە هەلومەرجێك بسازێنێ بۆ بونیادنان و دروستکردنی دەوڵەتێك بۆ ئاییندەی کورد لە کالتێکدا زۆربەی پێویستییەکانی بونیادنانی دەوڵەت بەردەستبووە.

- ئەگەر ئێمە لەبەردەم هەوڵێکی نوێدابین لەپێناو بونیادنانی پرسی دەوڵەتی کوردی لە باشووری کوردستان، پێویستە تێڕوانینێکی رەخنەیی وردمان هەبێت لەسەر شێوازی دەوڵەتداری و حوکمداری و گۆمەڵگا و نەتەوە، پێویستیشە تیشکێك بخەینەسەر ئەو ئەزموونەی کە نەیتوانیوە بونیادێکی دەسەڵاتداری دروستبکات کە پایەکانی دەوڵەتی تیادابێت کە خۆی لە دەسەڵاتێکی باڵا و دروستکردنی یەك دەسەڵات و یەك نیشتمان بێت، لەبری دەسەڵاتی حیزبی و سیاسی و عەشایەری.

❊❊❊



# پایەکانی فەرهەنگی دیموکراسی

نووسنی: د. عەبدولکەریم سروش
و. لە فارسییەوە: موسعەب ئەدهەم

دیموکراسی بەپێی یەکێك لە پێناسەکانی، کۆمەڵێك دامەزراوەیە کە ئامانجی گەیاندنی هەڵەکانی ئیدارەی سیاسی کۆمەڵگەیە بۆ کەمترین لە ڕێگەی گەیاندنی بەشداری گشتی بۆ زۆرینە و کەمکردنەوەی ڕۆڵی تاك لە وەرگرتنی بڕیارە سیاسییەکاندا.

دیموکراسی تیۆرییایەکە زانستی و مرۆیی بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و ڕێگە و شێوازێکی کاریگەرە بۆ گۆڕینی شۆڕشەکان بۆ چاکسازییەکان یان بەدەستەواژەیەکیتر شێوەیەکی ڕێکخستنی کۆمەڵگەیە بەجۆرێك کە بتوانێت هەموو گۆڕانکارییە پێویستەکان بەبێ بەکارهێنان و دەستگرتن بە شۆڕشە توندوتیژئامێزەکان و جێگای وەرگرتن و قبوڵکردنبێت.

دیموکراسی دابەشکردنی ڕاستی دەسەڵاتی لە کۆمەڵگەدا لەبەرچاوە، لەکاتێکدا سۆشیالیزم دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامانی لەبەرچاوگرتووە، سۆشیالیزم بانگەشەی ئەوەدەکات کە تیۆرییایەك "یان بزاوتێك" بۆ دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان، لەکاتێکدا دیموکراسی دابەشکردنی ڕاستی دەسەڵاتی لە کۆمەڵگەدا لەبەرچاوە. هەرچەندە لە سەرەتادا نوێنەرانی سۆشیالیزم، دیموکراسیان بەدروستکەر و یارمەتیدەر و هاوکاری بورجوازی دەزانی بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەمەندان، بەڵام دواتر بۆیاندەرکەوت کە هەریەکێکیان بەبێئەویتریان وەهمێکی رووتە. لەڕاستیدا هەردووکیان سەروکاریان لەگەڵ دیکتاتۆریدا هەبوو، دیکتاتۆری سەرمایە و دیکتاتۆری رۆحانییەکان یان فەرمانڕەوایان. هەردووکیشیان لەگەڵ عەدالەت و مافی مرۆڤدا سەروکاریان هەبوو. لەوەش گرنگتر لیبرالیزم کە زادگای دیموکراسی بوو، ناچاربوو بۆچوونی نوێ لەبارەی خوا، مەزهەب، مرۆڤ، جیهان و پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودادا پەروەردەبکات تاکو بتوانێت زەمینە بۆ دیموکراسی ئامادەبکات.





توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی وردی لیبرالیزم ئەوە پیشاندەدات کە لیبرالیزم پشتی بە تیۆرییایەکی ناسین بەستووە کە نەك تەنها خۆگونجاندنی لۆژیکی دابیندەکات، بەڵکو زامنی هێنانەدیشیدەکات.

" تیۆرییای ناسین" لیبرالیزم: تیۆرییای ڕێگەدان بەهەڵەبوونی مرۆڤ. ریگە بەهەڵەبونی مرۆڤ بینا لەسەر ئەو تیۆرییایە، حەقیقەت ئاشکرانییە، مرۆڤەکان بوونەوەری لەناچوو و فانی و هەڵەکەرن کە دەبێت بەدوایدا بچن و بەشێوەیەکی گشتی بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت هەوڵ و کۆشش بکەن. هیچ تاکێك یان تەنها دامەزراوەیەك ناتوانێت بانگەشەی ئەوەبکات کە حەقیقەت موڵکی ئەوە و سنووردارییبکات. حەقیقەت موڵکی دیاری هەمووانە و هەمووان دەبێت لە ئازادی و فرسەتی گەڕان و دۆزینەوەی حەقیقەتدا بەشداربن.

- بنەماکانی فەرهەنگی دیموکراسی، گوتەزای وەکو سامان، دەسەڵات، عەدالەت، زانست، مرۆڤ و خودان. لەم پێشەکییە کورتەدا پەیوەندی و پەیوەستییەکانی نێوان دیموکراسی و گوتەزای فەرهەنگی وەکو سامان، دەسەڵات، عەدالەت، زانست، مرۆڤ، خودا و سروشت دەردەهێنرێت.

بەبێبوونی تیۆرییای تەواو و روون لەبارەی ئەم گوتەزایانەوە، دیموکراسی وەکو منداڵێکی بێگیانی رووت لە ژیان و بێجووڵە دەبێت. ئەم گوتەزایانە بنەمای فەرهەنگی دیموکراسین.

بزاوتن و جووڵە لە بواری دابەشکردنی سامان و دەسەڵات یارمەتی درێژەدان بە ژیانی دیموکراسی دەدات. عیشقی زۆر رۆچوو بۆ دەسەڵات یان تینوویەتی سامان بە ڕێگری زیانبار لەسەر دیموکراسی دەژمێردرێن و لەبەرئەوە دیموکراسی لەنێوان ئەو خەڵکانەدا بەباشترین شێوە گەشەدەکات و دەپشکوێت کە خۆشبەختی ئامانجیان بەپێی دەسەڵات یان سامان پێناسەنەکرێت. دەبێت سامان یان دەسەڵات بە هۆکارێك دابنرێت نەك ئامانج هەرلەبەرئەمەش، نەفیکردنی سامان نەفیکردنی دەسەڵات و لە وشەیەکدا زەمکردنی دونیا، دەتوانێت هاوکاری و یارمەتیەکی گەورەبێت بۆ گەشە و جوانی دیموکراسی.

یەکێك لە پێداویستییە گرنگەکانی دیموکراسی ئەوەیە کە نابێت کارێکبکرێت و لەوکارەدا پێویست بە سامانێکی گەورە یان دەسەڵاتێکی گەورە هەبێت، هەروەها زەمکردنی دونیا و تەنانەت نەفیکردنی سۆفیانەی دەسەڵات و سامان ئەم تایبەتمەندییە چاکەی هەیە.

هەرلەبەر ئەم هۆیەش زەمکردنی دونیا لە پایە و بنەماکانی فەرهەنگی دیموکراسییە.

ئەم گەوهەرە فەرهەنگییە دەبێت ئەمڕۆ دەربهێنرێت و بپاڵێورێت و لە غوبارەکان و پیسیەکانی پێشوو پاکبکرێتەوە و بەشێوەی توخمێکی جووڵا و کارساز، بەهرەی سیاسی چاکی لێوەربگرێت.

زۆرجار رەخنە لە سوننەتە سۆفیانەکان دەگرن بەوەی کە گوێنادەنە کاروبارە جیهانییەکان و سامان و دەسەڵات بە شتانی نارێك و خراپ دەژمێرێن . دروستە کە بە زەحمەت دەتوانرێت عاریفانە ژیان لەگەڵ سیاسەتی سەردەمی ئێمە سازگاربکرێت، بەم وەسفە ناتوانرێت ئینکاری لەوەبکرێت کە گوێنەدان بەم دوو هۆکارە لەسەرووی ئاساییەوە مەزنن. دەتوانێت لەرێگری یان رێگریخستنەبەردەم دیکتاتۆرە زبرەکان، رۆڵێکی زۆر گرانبەهای هەبێت.

بێگومان هەردیاردەیەکی کۆمەڵایەتی هۆکارێکی کۆمەڵایەتی هەیە و ناتوانرێت بەتەواوی بەپێی گوتە و چەمکە دەروونناسییەکان روونبکرێتەوە. بەڵێ، بەڵام هۆکارە دەروونناسییەکانیش خۆیان لەکۆی هۆکارە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و رووداوە کۆمەڵایەتییەکانن.

لە پرسیاری دەسەڵات یان حەز بەکۆکردنەوەی سامان یان پارەدۆستی کەمتر ئامادەیی دادپەروەری و کۆمەڵایەتی و دیموکراسین. گرنگی رێزگرتنیش لە زانست کەمنییە لەلایەکەوە ئەوانەی خوێندنیان تەواوکردووە هەرگیز بەرگەی سوڵتەی کوێری فەرمانڕەوای نەزان ناگرن و لەلایەکیدیکەوە. لێکۆڵینەوەی زانستی تەنها لە کۆمەڵگەی ئازاددا دەپشکوێت و گەشەدەکات، کۆمەڵگەیەك کە تیایدا بیروباوەڕی و پێچەوانەی یەکتر بەشێوەیەکی یەکسان لەم مافە بەشدارن کە باسیانلێوەبکرێن یان رەتبکرێنەوە. بەمشێوەیە لەنێوان رێزگرتن لە دیموکراسی و پەیماندان بۆ دەستخستنی زانست یان برەوپێدانی هاوپەیوەندی ئەرێنی هەیە. لە کۆمەڵگەی دیموکراتیدا دەستگرتن بەزانستەوە بەسەر هەر دەستگرتنێکیتردا زاڵدەبێت و دیکتاتۆری بەڵگە بەهێزتر، جێگرەوەی دیکتاتۆری ئیرادە خۆویستەکان دەبێت.

- بەبێ دیموکراسی زانست بوونی نابێت و بەبێ زانستیش دیموکراسی بوونی نییە.

هەریەکێکیان، پێویستی ئەویدیکەیانە لەڕووەوە رێزگرتن فەرهەنگی سوننەتی زانست و زانا نەك تەنها بەهای دیموکراسییە بەڵکو زەمینەی یارمەتیدەرە بۆ گەشەی دیموکراسی. هەر ئەم پەیوەندییەش شێوە و وێنابەخشەری لایەنگیرییەکان و رەفتارەکانی ئیماندارانە لەگەڵ یەکتر. باوەربوون بە خودای میهرەبان (رەحیم) جۆرێك رەفتار دروستدەکات و پەرستنی خودایەکی





نائەخلاقیش رەفتارێکیتر. رەتکردنەوەی ئاینی یەهوود لەلایەن هیگڵەوە کتومت لەسەر ئەم خاڵە بینابووبوو . هیگڵ بیریدەکردەوە کە لە ئایینی یەهوددا پەیوەندی نێوان خودا و ئیماندران پەیوەندی ئەرباب و بەندەیە کە زۆر نامرۆییە. بە بۆچوونی ئەو مەسیحییەت لەمڕووەوە دۆخێکی باشتری هەیە.

دیموکراسی راستەقینە نیازمەندی پێوەرە باڵا ئەخلاقییەکانە و لەمڕووەوە لە سوننەتە مەزهەبییەکاندا کە خودایان رەچاوکردنی ئەم پێوەرانە بەپێویستناژمێرێت، ئەوا دیموکراسی دەستناکەوێت. ئەمەش پیشاندەری گرنگی رۆڵی تێڕوانینە مەزهەبییەکانە لە بەرز و نزمی و هەوراز و نشێوی دیموکراسی.

جوانی و چەند لایەنبوونی ژیانی دیموکراسی لەڕووی رێساییەوە دەبێت تاکو ئێرە روونبووبێتەوە. هەبوونی پەرلەمان یان دامەزراوەی هەڵبژاردن بەهیچ جۆرێك دیموکراسی دابیناکات بۆئەو مەبەستە چاکسازی روانین و لایەنگری لەمەڕ بەهاکان و حەقیقەتگەلی وەك: (خودا)، (مرۆڤ)، (زانست)، (عەدالەت)، (دەسەڵات)، (سامان).. هتد، سەرووئاسی گرنگە.

### دوو کەموکوڕی دیموکراسی

قسەی کۆتایی ئەوەیە کە پێدەچێت دیموکراسی.. دەسەڵات زیاترە هەستیاری هەیە تاکو بە... سامان ەوە هەروەها واپێدەچێت کە ئاسانکاری و کۆدەنگی باڵاتر لە حەقیقەت دادەنیشێت. ئەگەر ئەم کەموکوڕییە بە شێوەیەکی کاریگەر لابرێت، مرۆڤ خۆشەبەختدەبوو.

***

وەرگێرانی وتارێکە لە "تریبوونی نێودەوڵەتی فەرهەنگی و دیموکراسی" پراگ ساڵی ١٩٩١، لە کتێبی "فربەتر از ایدئولۆژی"یەوە وەرگیراوە.

# کۆمەڵناسیی سیاسی پارتەکان

شۆڕش محەممەد

دەرکەوتنی پارتەکان دیاردەیەکی گرنگی سیاسیە لە سەردەمی مۆدێرندا و پارت partyهەروەکو لە ناوەکەیدا دیارە دەیەوێت لە ژیانی گشتیدا بەشدارییەك بکات و خۆی بەبەش دەزانێ، نەك گشت. ئەم دیدەش بڕوایەکی دیموکراتییە کە ئەو هێزانە خۆیان بە (بەش) زانیوە و خۆیان بە نوێنەری (گشت) زانیوە، بەڵام کارکردن و کاریگەری پارتەکان و دیدی ئایدۆلۆجی زۆربەشیان بەوشێوەیە نەبووە، ئەوان هەمیشە بەناوی گشتەوە بانگەوازیانکردووە و هەمیشەش وەکو گشت رەفتاریاننواندووە هەرچۆنێك بێت ئێستا ئێمە لەدوای چەند سەدەیەك بۆماندەردەکەوێت کە یەکێك لە کارە نامۆ دێرینەکانی بیر و فەلسەفەی مۆدێرنیزم. هەروەکو چۆن حیزبەکانیش بەرهەمی مۆدێرنەن کە بانگەواز و رەفتاری وەکو یەك نییە و بەردەوام مۆدێرنیزم گرفتاری ناکۆکی نێوان گفتار و کرداریەتی. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەولاوە دووجۆر بزووتنەوەی دژی رژێم لە ئەوروپا و شوێنەکانیدیکەی جیهان پەیدادەبن کە لە سەرچاوەی کۆمەڵایەتی (چینایەتی یان نەتەوایەتی) ئیلهاموەردەگرن. بزووتنەوەی یەکەم بزووتنەوەی چینایەتییە کە باس لە سەرکوتی پرۆلیتاریا و هەژارانیان بە دەستی بۆرژوازی دەکرد و ئەوانەی جۆری دووەمیش واتە بزووتنەوەکانی نەتەوایەتی لە چەوسانەوەی خەڵکی ستەمدیدە و (نەتەوەکان و کەمایەتییەکان) بە دەستی دەسەڵاتە بێگانەکان، سەرچاوەی بوونی خۆیان و خەباتیان دەسەلماند. هەردوو بزووتنەوەکە بانگەوازی بەدیهێنانی یەکسانیان دەکرد و لە سێ زاراوە گرنگەکەی شۆڕشی فەرەنسی (ئازادی-یەکسانی-برایەتی) رەوایی خۆیان بەدیدەهێنا، ئەم بزاڤانە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیست لە هەموو جێگاکاندا پێکهاتە و پارت و رێخراویان بۆئەو مەبەستە پێکهێنا و ئەو پارتانە کاری یەکەمی خۆیان بەوە دانا کە دەبێت دەسەڵات بەدەستەوەبگرن و سەرلەنوێ دەوڵەتی لەسەر بناغەی رەوای چینایەتی یان نەتەوایەتی بونیاتبنێنەوە.





ئەم بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانە (چینایەتی یان نەتەوایەتی) هەوڵیاندەدا لە رێگای شۆڕش یان پەرلەمان دەسەڵات بەدەستبهێنن، بەڵام ئەوەی زۆر جێگای سەرنجە ئەوەبوو کە ئامانجی یەکەم و گرنگی خۆیان تاڕادەی چارەنووسساز بەدەستهێنانی دەسەڵات بوو. هەر لەسەر شێوەی دەسەڵات و بەپێی بیرۆکراتیزمی دەسەڵات چەندین حیزبیان بۆئەم مەبەستە پێکهێنا، لەکاتێکدا کە بۆچوونی زاڵ لەوسەردەمەدا بۆ دەوڵەت. دیکتاتۆری و بیرۆکراتی بوو هەربۆیە چەندەها پارت بەشێوەی دەوڵەت، بەڵام بچووکتر پێکهاتن، بەڵام کاریگەری دیموکراتی و ئازادی وایکرد کە پەراوێزی دیموکراتی بەخۆیانەوە ببین و سەرئەنجام پرەنسیپی یەکەمی هەموو پارتەکان دەبێتە ناوەندێتی دیموکراتی دەخرێتە خزمەتی دەسەڵاتی دەسەڵاتی ناوەندی یان روونتر بڵێین تاکە ناوەندی ناو ئەو پارتانە کە سەرکردایەتییەکەیانە تاساڵی ١٩٤٥ سێ جۆری رۆشن و جیاواز لەو حیزبانە لە سەرتاسەری دنیا پێکهاتن پارتەکانی سۆسیال دیموکراتی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم. پارتە کۆمۆنیستەکانی نێونەتەوەیی سێهەم و حزبەکان یان بزاڤەکانی نەتەوەی رزگاریخوازی نەتەوەکان.

قۆناغی یەکەمی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان کە بەتوندی گرێدرابوو بەو پارتانە (چینایەتی یان نەتەوایەتی) بۆ ماوەی زیاتر لە سەدساڵی خایاند و لە ئەنجامی دەسەڵات و گیروگرفتەکانی ئەم پارت و دەسەڵاتانە. جۆرێکیدیکە لە بزووتنەوەکان پەیدابوون کە لە ناوەڕاستی دەهەی ١٩٦٠ بەدواوە لە ئەوروپا و ئەمەریکا و ئاسیا و ئەفەریقا توانیان گومان و پرسیاری گەورە لەڕەوایی کارای بزاڤ و پارتەکان قۆناغی یەکەم پێکبهێنن. بزاڤەکانی قۆناغی دووەم یان دەهەی شەست کە زیاتر لە دەوری تاك و داخوازییەکانی تاك کاردەکرد بەجۆرێك بوو کە واقیعییەتی ئابووری - سیاسی دیموکراتی وایلێهاتبوو، کە ئەو بزووتنەوە تازانە، بتوانن چەند رەوتێکی نوێ و دیدی نوێ بۆ بوون و سەرچاوە و زەمینە و ئامانجەکانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان و ژیانی سیاسی و حیزبایەتی بەدیبهێنی، هەروەکو باسمانکرد، ئەگەرچی پارتەکان لە زەمینەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکاندا پەیدابوون، بەڵام چەند سیفات و تایبەتمەندی خۆیان هەیە کە جیایاندەکاتەوە لە زەمینەی کۆمەڵایەتی و بزاڤی گشتی.

**یەکەم:** پەیوەندی بەشداری لە بزووتنەوەکاندا پێویستی بەپابەندبوونی تەواو بەجۆرێك لە بیروباوڕی تایبەتی نییە، بەڵام بەشداربووان و ئەندامێتی لە پارتەکاندا وادەخوازێت کە پابەندبوونی تەواو بیروباوەڕ یەکێك بێت لە مەرجەکانی بنیاتنانی ئەو پارتانە.

**دووەم:** سیفەتی ڕێكخراوەی حیزبەكان، واپێویست دەكات كە لایەنی توند تۆڵ و ئاستەكانی ڕێكخستنی هەردەمی بوونی هەبێت و شێوەیەك لە شێوەكانی بیرۆكراتی) دیوان سالاری (بەناوی) ناوەندێتی دیموكراسی)یەوە لە هەموو پارتەكاندا هەیە. لە پارتدا حاڵەتی ڕێكخستن و فەرمان و ئاستەكانی سەرەوە و خوارەوە بەئاشكرا دەبینرێت، لەكاتێكدا بزووتنەوەكان زیاتر حاڵەتی ئازادی و كۆبونەوە و بەشداریكردن لە كار و چالاكیدا بەخۆوەدەبینیّ.

**سێهەم:** ئامانجی یەكەم و پیرۆزی حیزبەكان بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتە و هەر بۆئەمەش گومانكردن لە دەسەڵات و بونیادی پێشوو دەبێتە یەكێكیدیكە لە كارەكانی. ئامانجە زۆر و درێژماوەكانی حیزب. بەردەوام دوادەخرێت بۆ سەردەمی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات و گۆڕینی دەسەڵاتی كۆن.

**چوارەم:** بەڕادەیەكی كە پارتەكان، سەربیروباوڕ و ئایدۆلۆژیای تایبەتن. هەر بەوئەندازەیەش دەیانەویّ یەكێتی ریزەكانی حیزب و پاشان یەكێتی ریزەكانی كۆمەڵ لە دەوری بەرنامە و دیدی خۆیان بەدیبهێنن. بەجۆرە یەكەم كاری حیزب، تەنانەت پێش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتیش، هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی یەكێتی لە دنیا و ژیانێكی پڕ لە جیاوازی و فرەیی. پارتەكان بە یەكێتی ناو خۆیان دەچن بەگژ و دژی ئەوانەی كە وەكو خۆیان نین و سەرئەنجام یەكێك لە پرەنسیپی بنەماكانی پارتەكان دەبێتە (یەكێتی و دژایەتی).

**پێنجەم:** قەتیسمانی كاری حیزبەكان تەنها لە كار و مەیدانی سیاسی و كردنی پارت و سیاسەت بە ناوەڕۆك و سەركردەی بەشەكانیدیكەی كۆمەڵ و رای گشتی. یەكێك لە كارە دژوارەكانی حیزب هەوڵدانە بۆ دروستكردن و بەهێزكردنی ناوەندێتی سیاسی و بەجۆرێك كە بەشەكانیدیكەی خەبات و كۆمەڵ و ڕێكخراوەكان دەكرێنە پاشكۆی حیزب.

**شەشەم:** لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا جیاوازی ئاشكراو تەواو لەنێوان پارتەكان و بزاڤە كۆمەڵایەتییەكاندا نییە، چونكە بەدەستهێنانی ژیانێكی سیاسی گشتی و ئازاد، وادەخوازێت كە هەموو (ڕێكخراوەكان، پارتەكان و بزووتەنەوەكان) لە پەیوەندی و كاریگەرییان لەسەریەكتر، ڕەوش و دەسەڵات و كۆمەڵێكی باشتر بنیاتبنێن. واتە دەبێت ئەوە پەسەندبكەین كە بوونی پارتەكان كارێكی پێویستە، بەڵام دەبێت كەموكوڕی و لاوازی حیزبەكان بەپێی پێوەر و پێداویستییەكانی ئازادی و دیموكراتی نەهێڵرێت.





## پارتەكان و دیموكراسی نویّ

دیموكراسی بەبیّ سیستمی نوێنەرایەتی كە دەسەڵات ئەقڵ و زۆربەیە، بوونی نییە. هەڵبژاردنی ئازاد و نوێنەران و دەسەڵاتداران لەلایەن خەڵكەوە، دەبێتە كارێكی بێمانا. ئەگەربێتو ئەم خەڵكانە نەتوانن داواكاری و كاردانەوە و پێداویستییەكانی خۆیان بەشێوەیەكی یاسایی و ڕێگاپێدرا و نەخەنەڕوو. یەكێك لە كەناڵەكانی شێوەسازكردنی ئەم داواكاری و كاردانەوانە لە ڕێگای حیزبەكانەوە دەبێت و تائێستا پارتەكان دەتوانن یاریزانێكی گۆڕەپانی دیموكراتی بن، مەرج و زەمینەی دەوروكارای حیزبەكان لەبەدیهێنانی دیموكراسییەتی باشتردا پێویستی بەوە هەیە كە زەمینەكانی كاری حیزبەكان و ئەو ڕەخنانەی لە خەباتی ئەوان دەگیرێت و ئاسۆی چاككردنی ئەم كارانە بەرەو هەلومەرجێكی باشتر بەرین:

**زەمینەی یەكەم:** ئەگەر ژیان و بەرژەوەندییەكان جیاواز و فرەن، ئەگەربێتو هەركەسێك (یان هاوڵاتییەك) رستێك پێداویستی و داواكاری هەبێت كە پەیوەندییان هەیە بە ژیان. كار و خێزان و پەروەردەی منال و ئاسایش و بیروباوڕییەوە، بۆیە دەبێت ئەوە پەسەندبكەین كە محاڵە بتوانین سیاسەتی گشتی و دیاریكراو پەیدابكەین كە هەموو ژیان، بەرژەوەندی و ئاسایشی هاوڵاتیان لەخۆبگرێت و سیاسەتێكی باش و گونجاویش بێت بۆ زۆربەی كۆمەڵ و هەموو لایەنە سیاسی و كەمایەتیە ئایینی و فەرهەنگی و نەتەوەییەكان تیایدا بەهرەمەندبن. بۆئەوەی ئەم پێداویستی و داواكارییانە سیفەت و ڕەوشی نوێنەرایەتی و یاسایی وەربگرن، پێویستی بەكۆدەنگی و هاوبەرژەوەندی هەیە و دەبێت نوێنەرانی ئەم داواكارییانە، لە هەموو ئاستەكاندا، لەگەڵ یەكتری گفتوگۆبكەن و سەرئەنجام بتوانن لە شێوەیەك لە پێكەوەیی و كۆدەنگی بۆبەدیهێنانی ئەم پێداویستیانە پەیدابكەن. پارتەكان دەتوانن لەم زەمینانەدا (پێداویستی داواكاری و كاردانەوەكان) راوایەكی باشتر بۆ بوون و گەشە و بەردەوامبوونیان پەیدابكەن. ئەم ڕەوشە دوو خاڵی گرنگی لێپەیدادەبێت:

١- حیزبەكان دەتوانن لەكۆی داواكاری و بەرژەوەندی هاوڵاتییان، لە حاڵەتی تاكە بەرژەوەندی و بەرژەوەندی چینایەتی و تاكە بیروباوەڕ بەرەو حاڵەتی فرەیی بچن و دیسان خۆیان نوێبكەنەوە. لەمزەمینەیەدا گرنگیدان بە ئازادی سیاسی بۆ بەشی هەرەزۆری كۆمەڵ لەلایەن پارتەكانەوە دیموكراسی دەباتە بەرزترین رادەی. كاتێك كاردانەوە و نەیاری كۆمەڵایەتی لە ئاستێكی فراواندا بەرهەمدێت، دیموكراسی ڕەوشێكی جێگر و ئازادییەكی زیاتر بەخۆوەدەبینیّ.

ئەو وڵاتەی کە زۆرترین بەرجەستەبوونی ئازادی و فراوانترین ئازادی سیاسی (یان بە شێوە کلاسیکییەکەی خەباتی چینایەتی و کۆمەڵایەتی) لەخۆدا بەرهەمهێناوە، واتا بەریتانیا. لەووڵاتەدا دیموکراسی جێگیرترین رەوشی سیاسی بەخۆوەگرتووە. هەروەك چۆن سۆسیال دیموکراسی ئەوروپای باکوور ئاسۆ و هۆشی بەرەو سەرکەوتن برد کە هەمیشە هەلومەرجێکی کراوەی بۆ خەباتی ئازادی سیاسی (یان چینایەتی) لەنێوان پارتەکانی کریکاران و بۆرژوازییەکاندا یاساییکردبوو.

ب- حیزبەکان دەتوانن لە حاڵەتی کۆمەڵایەتی (چینایەتی) دیسپلینکراو خۆیان رزگاربکەن و بتوانن لەکۆی بەرژەوەندییەکان، بەرژەوەندی گشتی دیموکراسی لە پارتەکانیاندا نوێنەرایەتیبکەن. هەرچی زیاتر حیزبەکان بتوانن لە تاك بەرژەوەندی دووربکەونەوە، زیاتر دەتوانن لە هاوپەیمانی بەرژەوەندی تایبەت و لە رەوشێکی کەمایەتی بیروکراتی دووردەکەونەوە. یەکێك لە دوژمنە گەورەکانی ئازادی و دیموکراسی. بوونی هەڵاواردن و ئیمتیازاتی ئابووری و سیاسی و دەسەڵاتی کەمایەتی بیرۆکراتییە. زۆربەی پارتەکانی دنیا و ولاتی خۆمان تووشی ئەم نەخۆشییە بوون لەو رێگایەشەوە کارەساتیان بەسەر خەڵکاندا هێناوە.

**زەمینەی دووەم:** ئەگەر پارتەکان بتوانن، ببنە قسەکەر و نوێنەری سیاسی فرەداواکاری و فرەبەرژەوەندی، هەر بەوڕادەیە دەتوانن لە زەمینەی فەرهەنگی و تیۆریشدا رەوشێکی ئازادتر و فرەتر بەرهەمبهێنن و سەردەمی تاك بیروباوڕی و یەکێتیخوازی بیروباوڕەکان بەسەردەچێت. حیزبەکان ئەگەر بتوانن لەکۆی بیروباوڕەکانی (دیموکراتی، لیبراڵی، سۆسیالستی، نەتەوایەتی، مۆدێرن و فرەمۆدێرن) ئەڵتەرناتیڤێکی باشتر بەرهەمبهێنن، چاکتر دەتوانن لە داخوازی و بەرژەوەندییە گشتییەکانی خەڵك باشترتێبگەن و سەرئەنجام حاڵەتی ناوەندێتی و بیرۆکراتی بەسەردەچێت. زەمینەی مادی و کۆمەڵایەتی، ئەم فرەییە لە بیروباوڕدا جگەلە کۆی بەرژەوەندییەکان تێگەیشتنی هەلومەرجی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە) بزاڤەکانی ئافرەتان، لاوان، مناڵان، کەمایەتییەکان، پارێزەرانی ژینگە و بزووتنەوەی چینایەتی و داواکارییەکانی).

دەبێت یاسایی و دیموکراتی و حیزبە سیاسیەکان رێگابدات بە توێژە کۆمەڵایەتییەکان بۆ خۆرێکخستن و بەدیهێنانی بزووتنەوەی داواکاری یاسایی، هەروەها بتوانن لە رێگەی نوێنەرەکانیانەوە بەشداری لە ژیانی سیاسی و پەرلەمانیدا بکەن (یان لە رێگەی نوێنەرانی پارتەکانەوە، یان راستەوخۆ سەندیکا و کۆمەڵە و n.g.oو رێکخراوە ناحیزبی و ناحکومییەکان





بتوانن لە ژیانی سیاسی و پەرلەمانیدا بەشداربن). لەم رەوشە واتا نوێنەرایەتی سیاسی و یاسایی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، لە بیروباوڕی رۆژئاوادا بەباشترین شێوە بەرهەمهاتووە. ژیانی سەندیکایی لە فەرهەنگی سۆسیال دیموکراسیدا زەمینەیەکی زۆر بەهێزە بۆ سەرهەڵدانی پارتە کرێکارییەکان یان سۆسیالیستەکان کە توانییان ببنە باسکی سیاسی ژیانی سەندیکایی. دامەزراندنی پارتی کاری بەریتانیا لە سەرچاوە و زەمینەی یەکێتی سەندیکاکانی tuc یان پەیوەندی بەڵێنی نێوان یەکێتی کاری سویدی loو پارتی سۆسیالست دیموکرات. ئەم هەلومەرجە لە ئیتاڵیا و ئیسپانیاش هەر بەوشێوەیە کە خەباتی کرێکاری زەمینەیەکی بەهێزە بۆ هێز و توانای پارتە کرێکاری و سۆسیالستەکان.

**زەمینەی سێیەم:** پەیوەندی نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی سیاسی هەرتەنها راستەوخۆ نییە. واتە پەیوەندی نێوان پارتەکان. حکومەتەکان و پەرلەمانەکان کە نوێنەرانی ژیانی سیاسین لەگەڵ سەندیکا و رێکخراوی جەماوەردا کە بەرجەستەبوونی ژیانی کۆمەڵایەتین. ئەو پەیوەندییە بەهۆی هەندێك هۆکاری ناوەنجی و بەهۆی کاری ئەوانەی دەبنە کارکەری ناوکۆیی نێوان ئەم دوو ژیانە. یانەکان، رۆژنامە و گۆڤارەکان، یەکێتی و سەندیکا پیشەییەکان و گروپە روناکبیرییەکان و تەنانەت کۆڕ و کۆمەڵە ئابوورییەکان ئەو هۆکار و پەیوەندییانەن کە لە پانتایی و قووڵایی کۆمەڵدا دەتوانن زەمینەی دیموکراتی فراوانتربکەن و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەو زەمینەیدا باشتر گەشەبکەن. کاری ئەم ناوەندانەی پەیوەندی لەنێوان سیستمی سیاسی و ژیانی کۆمەڵایەتی، چەندین رێگا و هەڵبژاردنی جیاوازی سیاسی بەدیدەهێنێت. ئەم هۆکارانە دەتوانن ببنە زەمینەیەکی باش بۆ سەرهەڵدانی پارتە نوێیەکان یان ریفۆرم و چاککردنەوەی رەوشە کۆنەکان ئەم روانگەیە تێبگەین کە حیزبەکان ئەڵتەرناتیڤی ئەو ناوەندانەی پەیوەندی و کاریگەرین.

تەسککردنەوە و گورزلێدانی دیموکراسی، لە یەکێك لە مەیدانەکاندا، هەوڵدانە بۆ کەمکردنەوەی ئەم هۆکارانەی پەیوەندی و کاریگەری لە ئەوروپا و ئەمەریکا و جیهانی سێ. زۆربەی پارتەکان لەدوای دەسکەوتنی دەسەڵات، پەیوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ بازاڕ و کەسانی دەوڵەمەندا دروستکرد و ئابووری و بازاڕ راستەوخۆ لەگەڵ دەسەڵاتدارانا بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ دەوڵەمەندبوونی زیاتریان و زەمینەی بەدیهاتنی (فەساد) گەندەڵی بە شێوەیەکی رەسمی و پاڵپشتکراو هاتەئاراوە بۆ پاراستنی ئەم پەیوەندییە راستەوخۆیە (ئابووری و بازاڕ لەگەڵ

دەسەڵاتداران و کاربەدەستان). پشتکردنی لە خواستەکانی جەماوەر و بەهێزکردنی بیرۆکراتی دەبێتەئەنجام. پەیوەندی نێوان پارتەکان و ڕێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکان، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەك لە ڕێگای ناوەندەکانی پەیوەندی و کاریگەری، دەبێتە هۆی پاشکۆیەتی سیاسی ئەو ڕێکخراوانە و سەرئەنجام کزبوون و بێدەسەڵاتی ئەو ناوەندانە و بۆ پاراستنی ئەم پاشکۆیەتییە، بێگومان پێویستدەبێت کە خودی ئەو ڕێکخراوانە بکرێتە بەشێك لەو حیزب و دەسەڵاتانە. ئەزموونی وڵاتانی سێ بۆ پەیداکردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ڕێگای ئەو ڕێخراوە بەناو جەماوەرییانەوە.

**زەمینەی چوارەم،** بەڵام سەرەڕای بوونی ناوەندێك لەنێوان ژیان و بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان و سیستمی سیاسیدا یان بە شێوەیەکی گشتی ژیانی سیاسی، نابێت وا تێبگەین کە پارتەکان سەربەخۆن لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان هەرەسی ڕژێم و بیروباوەڕە سۆسیالیستەکان هەر لە کۆمۆنیزمی لینینیزمەوە تادەگاتە هەندێك لە سۆسیال دیموکراتەکان پێش هەموو شتێك لەبەر سەربەخۆیی و دابڕانی ئەو حیزبانە بوو لە ژیانی کۆمەڵایەتی کە سەرەنجام پاشکۆکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان کرایە ئامانج دیموکراسی ئازادیخواز و بەشداری و ڕاوێژکاری وا پێویستدەکات کە هەموو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی ناوەندەکانی پەیوەندی و کاریگەرییەوە ڕێگای کار و بەشداری سیفەتی نوێنەرایەتییان هەبێت، بەجۆرێك بێت بتوانێ مانایەکیدیکە و جیاواز لە حیزبەکان بۆخۆیان و بۆ بەشداری لە ژیانی دیموکراسیدا بەرهەمبهێنێ. چی ڕوودەدات کاتێك هێزە سیاسییە چالاکەکان واتە حیزبەکان گوێنەدەن بە داواکاری هێزە کۆمەڵایەتییەکان؟ چی ڕوودەدات کاتێك پارتەکان بیانەوێ ڕاستەوخۆ لە ڕێگای خۆیانەوە بۆچوون و ڕێگاچارەی سیاسی پێشکەشبکرێت واتە ڕێگانەدرێت بەبوون و کاری ئەو ناوەندانەش پەیوەندی و کاریگەری؟ یەکەمین شت ئەوەیە کە سیفەتی نوێنەرایەتی لەو هێزە کۆمەڵایەتی و ناوەندانە دەسەنرێتەوە و تەنها حیزبەکان دەبنە دمڕاستی کۆمەڵ و دەخرێتەپەراوێزەوە ئەم ڕەوشە ئەم بەرهەمە خراپانەی دەبێت: هاوسەنگی نێوان هێز و ناوەند و حیزبەکان تێدەچێ یەکێك لە سیفەتە گرنگەکانی دیموکراسی و یەکەمین مەرجی دیموکراسی ئازادیخواز واتە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوە و سنووردارکردنی دەسەڵات لەنێودەبرێت ئەم هەلومەرجە دەبێت سەپاندنی دەسەڵاتی حیزبەکان و دیموکراسی تاڕادەی دەسەڵاتی پارتێك یان چەند پارتێك کەم و تەسکدەکرێتەوە.. ئالان تۆرین کۆمەڵناسی پۆستمارکسیزم ئەم هەلومەرجە ناودەنێت ( partiocraty) پارتیۆکراتی(٤).





**زمینەی پێنجەم:** کەس ناتوانێ دیموکراسی بەبێبوونی حیزبەکان وێنابکات، دیموکراسی بەبێ هێز و توانای هێزە سیاسییە کارامان، بەمانای ڕاستەقینەبوونی نییە ئەگەر ئەوە پەسەندبکەین کە دیموکراسی دەبێت نوێنەرایەتی بەرجەستەبکات، هەربۆیە دەبێت هێزە سیاسیەکان و پارتەکان کە مەرجێکی گرنگی دیموکراسین پێویستە لەپێناوی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵدا کاربکەن نەك تەنها لە خزمەتی خۆیاندا لەگەڵ ئەمەشدا دیموکراتی دەبێ هەمیشە حاڵەتی ڕاپرسی (استفاء) بەخۆوەبگرێ کە لە هەموو ئاستەکانی پارتەکان و ڕێکخراوە جەماوەری و دیموکراتییەکان و ناوەندەکانی پەیوەندی کاریگەری نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سیاسی بەئەنجامبگات، بەڵام بەتەنها دەسەڵاتی پارتەکان یان بارتۆکراتی دیموکراسی لەناودەبات و سیفەتی نوێنەرایەتی لێزەوتدەکات یان دەسەڵات و هەژموونی بازاڕ و ئابووری زاڵ دەسەپێنێ و هەموو ئەمانەش دەبنە زەمینەیەك بۆ دیکتاتۆری مەترسی پارتۆکراتی بەرەو زیادبوون دەچێ، کاتێك هێزە کۆمەڵایەتییەکان دەکەونە ڕەوشی پەراوێزی دابڕان.

## نەوەی دووەمی پارتەکان

پارتەکان قۆناغی دووەمی بزووتنەوەی کۆمەڵاتیەکان لە ئاسۆ و زەمینە گەشەکردنی واقیعییەتی ئابووری، کۆمەڵایەی و سیاسی و فەرهەنگی دیموکراسیدا و لە دەوری (تاك)و داخوازییەکانی تاك پەیدادەبن. لەو پارتە تازانە کە چەند ناوی جیاوازیان هەبوو، بەڵام زۆربەیان بە پارتە سەوزەکان دەناسرانەوە. لەبەرئەوەی کە تاك و ماف و داخوازییەکانی تاك دەبێتە زەمینە و ئامانجی ئەم پارتانە. هەروەکو چۆن ڕەوایی دەوڵەت و یاسا و دەستوریش لە زەمینەی تاکدا گەشەدەکات و هەتادێت مافەکانی تاك دەبێتە ئامانجی وڵات و پارت و دەوڵەتەکان. وێڕای ئەوەی کە دیدی سەرەکی لەو پارت و بزاڤانەدا ڕەوشی تاك و مافەکانیەتی، بەڵام تایبەتمەندی و سیفاتی ئەو پارتانە یان نەوەی دووەمی پارتەکان زۆر و فرەن و ئەوان لە سەلماندنی جیاوازی و فرەیی دنیایەکی فراوان ئاڵووالآیان بۆ پارتەکان هێنایە ئاواکردن:

**یەکەم:** پێکهێنانی ئەم پەرتانە کاردانەوە نییە بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگا و پارتەکانیدیکە، بەڵکو ئەمان دەیانەوێت لە زەمینەی ئاسۆی گەشەکردووی دیموکراسی کارێکیدیکە و بەرنامە و ئامانجێکی بەرهەمبهێنن. بەهانەی بوونی ئەمانەن پەرچەکردار نییە

بەرامبەر بەئەوانیدیکە، بەڵکو کارێکی نوێیە و ئەم پارتانە لەم روانگەیەوە رەوایی خۆیان لە دژی ئەوانیدیکە پەیداناکەن و دەیانەوێ لە دید و بڕوا و فەلسەفەی نوێ رەوایی و بەشداری خۆیان بسەلمێنن ئەگەر بزانن کە ئەم پارتانەن بەتەواوی دیدی (گشت)و نوێنەرایەتی و پێشڕەوایەتی (گشت)یان وەلانەوە و دەیانەوێ لەڕاستیدا (پارت)ێك یان (بەشێك)بن لەکۆی تاکەکان و سەرئەنجام دیدی فەلسەفەیان دەبێتە (بوون کۆی تاکەکان)ە.

**دووەم:** هەر بەوپێیەی خۆیان بە (بەش) دەزانن نەك (گشت) هەربۆیە میکانیزمی کارکردنیان لە دەوری چەمکی پەیوەندی و کاریگەری دەسووڕێتەوە و ئەمان روانگەی فەلسەفی (یەکێتی و دژایەتی)یان بەتەواوی رەتکردووەتەوە و نایەوێ بانگەوازی ئەوە نەکەن کە کۆمەڵ و وڵات لە دەوری بەرنامەی ئەوان (یەك)بگرێ و بیانکات بە دژ و گژی ئەوانیدیکە و سەرئەنجام ئەوان دەیانەوێ گفتوگۆی نێوان بیروباوڕەکان، پارتەکان، بەشەکان و تاکەکانی ناوکۆمەڵگە بکەنە باشترین رێگا بۆ نزیکبوونەوە لەڕاستی و لەورێگایەشەوە پلورالیزم و گفتوگۆی نێوان جیاوازی و فرەیی دەبێتە زەمینە و ئاسۆیەکی گونجاوتر و ئازادتر بۆ دیموکراسی نوێ.

**سێیەم:** هیچ بیروباوڕێك یان فەلسەفەیەك نابێتە ناوەندی نەوەی دووەمی پارتەکان، بەڵکو لەبەر خاتری ژیان و بەرژەوەندییەکانی گەشەکردنی ژیان پەنادەبەنەبەر هەموو بیروباوڕەکان و هەر لە روانگەی پێداویستی و بەرەوپێشەوەچونی ژیان رەخنە لە هەموو بیروباوڕەکان دەگرن و نوێیاندەکەنەوە. بیروباوەڕ و فەلسەفەی پارتە نوێکان فرەییە و زیاد لە ناوەندێك یان چەند ناوەند و مینبەرێك لەو پارتە خەبات و گفتوگۆدەکەن.

**چوارەم:** هەروەکو چۆن یەکێك لە سیفەتەکانی دیموکراسی خوێندنەوەی بەرامبەر یان مەرجی یەکەمی دادپەروەری رێز و خوێندنەوەی بەرامبەرە، هەروەها نەوەی دووەمی پارتەکان خوێندنەوەی بەرامبەر تاڕادەی (پەیوەندی کاریگەری) دەکەنە رێباز و بیرکردنەوە، بەس نییە کە دانبنێن بە بەرامبەرەکاندا، بەڵکو هێزی بەرامبەر بخوێنێتەوە کە رێگا بە کارایی و کاریگەری ئەو بەرامبەرانە لەسەر یەکتریش پەسەندبکەین.

**پێنجەم:** پارتی نوێ لە کاروکردەوەیدا ریفۆرمیستە. واتە نە شۆڕشگێڕە و نە کۆنەپەرێزە، ئەوان شۆڕشگێڕیش نین بەومانایەی کە هەتا دنیا و بەرهەمی نوێ پەیدا نەك واز لە دنیا و بەرهەمی کۆنەپارێزیش نین، چونکە هەمیشە لە هەوڵی گۆڕانکاریدان و رازی نین بە دنیای کۆن و کاریگەرییەکانی.





**شەشەم:** نوێنەرایەتی بەشەکان، بیروباوڕەکان و تاکەکان و نەوەکان لەناو پارتی نوێدا بەجۆرێك نییە کە ئەوان نوێنەری حزب و سیاسەتبن لە شوێنی کار و ژیانیان، بەڵکو نوێنەری توێژ و بەش و بیروباوڕەکانی خۆیان لەناو پارتەکاندا، واتە پارتەکان زەمینە و سەنگەرێکە بۆ بەدیهێنانی ئامانج و ئاواتی ئەو خەڵکانە.

تاك، پارت دەکاتە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی، نەك پارت، تاك بکاتە ئامڕازی دەستی لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا. لاوان منداڵان و ئافرەتان پارتەکان دەکەنە سەنگەرێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان. دیارە لەکۆی بەرنامە، بیر و ئامانجەکان پارتەکانیش دەتوانن ژیان و دنیایەکی تازەتر و باشتر بنیاتبنێن و جارێکیدیکە ژیان و بوون دەبێتە کۆی تاکەکان.

**حەوتەم:** هەروەکو چۆن ئێستا پارتە سەوزەکانی ئەوروپا، یان نەوەی دووەمی پارتەکانی ئەوروپا زۆرترین داکۆکی دەکەن لە ئازادبوونی کورد و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان و رزگاربوونی هەموو پارچەکانی، هەر بەوجۆرە نەوەی دووەمی پارتەکان لە کوردستانیش دەتوانن باشترین خەباتکارانی رزگاری و ئازادی کوردستانبن تاڕادەی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ و یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان.

**هەشتەم:** پارتی نوێ و نەوەی نوێ دەتوانێ و دەبێ داکۆکی لە هەموو بزاڤەکانی ژنان، منداڵان، لاوان، ژینگەپارێزان و کەمینەکان بکات و دیموکراسی و سیاسەت و حزبایەتی لە نوێنەرایەتی و حکومی زۆربەوە بگاتە پارێزگاری و زەمانەتی کەمایەتییەکان. لە کوردستاندا کەس هێندەی لاوان، ئافرەتان و منداڵان بێماف نین و ئەم هەموو بەشە زۆرانەی کۆمەڵگا کەمترین ماف و ئازادییان هەیە و بەرهەمی ئازادی و سەرەتاکانی دیموکراسی تائێستا بەرئەوان نەکەوتووە. هەر لە روانگەی تاك و ئازادییەکانەوە دەبێ بەشێکی گرنگی پارتی نوێ و نەوەی نوێ بێتە بەدیهێنانی ژیانێکی ئازاد و بە هرەمەند بەئەوان.

❊❊❊

# کورد و چیا

محەممەد بەکر

ئەگەر جوگرافیا رەگەزێکی بونیادنەرانەی مێژوو بێت، ئەوا بۆ تێگەیشتن لە مێژوو دەبێت لە جوگرافیا تێبگەین، چونکە هەریەك لە جوگرافیا و مێژوو لە کارلێك و پەیوەندی بەردەوامدان، ئەم پەیوەندییەش لە چوارچێوەی هەوڵەکانی مرۆڤ وکارکردنی لەسەر سروشت دێتەبوون، هەرچەندە مرۆڤ لەئەمڕۆدا توانیویەتی بەسەر زۆر لە کۆسپەکانی شوێندا زاڵبێت و هەنگاوی گەورەشی هەڵگرتووە، بەڵام رابردووی مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارە گەواهی لەسەر رۆڵی شوێن و رەگەزەکانی دەدا لەسەر رەوتی مێژووی میللەت و کۆمەڵگا جیاوازەکان، هەربۆیە ئەم نووسینە هەوڵێکە بۆ نیشاندانی رۆڵی یەکێك لە رەگەزەکانی جوگرافیا (تۆپۆگرافیا) لەسەر مێژووی میللەتی کورد، خوێندنەوەیەکیدیکەیە بۆ رۆڵی چیاکان لە ژیان و مێژووی کوردەکاندا، سەرەتا پێویستە ئەوەش بڵێم ئەم نووسینە بەهیچ شێوەیەك ناچێتە خانەی بانگەشەکەرانی قوتابخانەی حەتمییەتی جوگرافیاوە، هەوڵێکیش نییە بۆئەوەی شکستەکانی مێژووی کورد بخەینەئەستۆی جوگرافیاکەی، چونکە جوگرافیا رەگەزێکی بونیاتنەری مێژووە نەك رەگی جەبری مێژوو بێت.

### تۆپۆگرافیا (بەرزونزمی)

دەرکەوتەی بەرزونزمی رووی زەوی یەکێکە لە رەگەزەکانی جوگرافیا، کە رۆڵ و کاریگەری خۆی لەسەر رەوتی مێژووی میللەتان و نەریت و رەوشتی نەتەوە جیاوازەکان داناوە. جا چی بەسلبی بێت یان بەئیجابی، چونکە ئاشکرایە ئەم زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین لەڕووی ئەم رەگەزە جوگرافییەوە (تۆپۆگرافیا) وەك یەك نییە، بەڵکو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیدیکە جیاوازی هەیە، هەر ئەم جیاوازیەش وایکردووە، پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە و تواناى وەڵامدانەوە و رووبەڕووبونەوەی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە جیاوازبێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە لەسەری بووەستین، شیکردنەوەی ئەم رەگەزەو دیارخستنی کاریگەرییە باش و خراپەکانیەتی لەسەر مرۆڤی کورد یان بەگشتی لەسەر نەتەوەی کورد.





### کوردستان لەڕووی بەرزونزمییەوە (چیا)

جوگرافیای وڵاتی کوردان بەدرێژایی مێژوو گۆڕانی بەسەرداهاتووە، هەربۆیە ئاسان نییە دیاردە و رەگەزە جوگرافییەکانیش بەدیاریکراوی دەستنیشانبکەین، بەڵام ئاشکرایە کوردستان هەر لە کۆنەوە بە وڵاتی چیا ناسراوە، زیاتر لەنیوەی تۆپۆگرافیای ئەم وڵاتە لە چیا پێکهاتووە.[١] ژمارەی چیاکانی بەپێی هەندێك سەرچاوە (١٢٢) هەندێکیدیکە بە (٢٢٠) چیا ئەژماریدەکەن، ئەم چیایانە لەئەنجامی بزووتنەوەی ئەلپییەوە لە چاخە مێژووییە کۆنەکاندا دروستبوون، کە ئەم جووڵە بەهێزە فشاری بۆسەر چینە نەرمەکانی ژێر دەریای (تیس) بردووە، جا لەبەرئەوەی ئەم چینانە کەوتبوونە نێوان تەپۆڵکەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی لە رۆژئاوا و تەپۆڵکە رەقەکانی ئێران لە رۆژهەڵات و تەپۆڵکەکانی ئاسیای بچووك لە باکوور، ئەمانە هەموویان پێکەوە بەهۆی یەکەمی بەرزبوونەوەی چیاکان دادەنرێن.[٢]

چیاکانی کوردستان چەند خەسڵەتێکیان هەیە وەك: (بەزۆری روویان لە باکووری رۆژئاواوە بەرەو باشووری رۆژهەڵاتن، هەروەها بەرزیان لە (٥٠٠)م دەستپێدەکات، تادەگاتە (٥٠٠٠)م، زۆر ئاڵۆزن و لوتکەی چیاکان زۆر بڵند و قەدەکانیان زۆر رك و پێچاوپێچن، هەروەها پرۆسیسی رووتانەوەی زەوی لە چیاکاندا، زۆر بەتوندی روویداوە[٣]، بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگەی گرنگیپێدانە رۆڵی ئەم چیایانەیە لەسەر ژیان و مێژووی نەتەوەی کورد، چونکە چیا رووبەرێکی گەورەی وڵاتی کوردانی داگیرکردووە، وەك مینۆرسکی دەڵێت: "بەگشتی دەتوانین بڵێین، کورد و چیا لێکجیانابنەوە، هەرکە دەشتایی دەستپێدەکات ئەوا کورد زەوییەکە بۆ عەرەب و فارس و تورك بەجێدێڵێت، لە دەوروبەری وانیش بۆ ئەرمەنەکان[٤].

ئەم چەند دێڕەی مینۆرسکی ئاماژەن بۆ نیشاندانی زۆری ژمارەی چیاکان لەو رووبەرەی کە نێوی وڵاتی کوردانە، هەروەها ئاماژەشە بەوەی کە چیا کەوتووەتە نێوەندی وڵاتی کوردانەوە، ئەم خەسڵەتەش خۆی بۆخۆی گێروگرفتی گەورەی دروستکردووە، هەرچەند لە زۆر حاڵەتدا (جەنگ) نەتەوەی کوردی پاراستووە لە هێرشی دوژمنان، بەڵام بەنێوەندبوونی چیا و کاریگەرییەکانی خوێندنەوەی جیاوازی بۆدەکرێت، بۆیە پێویستی بە هەڵوێستەیەك هەیە بۆئەوەی بتوانین شرۆڤەیەکی زانستییانەی بۆبکەین.

## چیا وەك ڕەمزی مانەوە و ئازادی

هەر لەکۆنەوە چیا لای کوردان ڕەمزی ئازادی و سەرکەوتن و چۆکدانەدان بووە، وەك دەبینین هەمان مانا و دەلالەت لە شیعری شاعیرەکانی کورد زماندا بۆ چیا بەرچاودێت، بەتایبەتی لە حاڵەتی شۆڕش و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی، هەربۆیە زۆرجار وشەی چیا وەك پاشکۆی زاراوەی کوردستان دێت لە حاڵەتی دەربڕیندا، کوردان چیا بە قەڵای سەختی بەرگری ناودێردەکەن، هەر کاتێك هەستیانکردبێت لەلایەن نەتەوە و دەوڵەتانی دەوروبەرەوە زوڵمیان لێدەکرێ، ئەوا ڕاپەڕینیان بەرپاکردووە و ڕاستەوخۆ لانکەی ڕاپەڕین وشۆڕشیان چیاکان بووە، هەربۆیە مێژوویەکی دووردرێژە کە ئەم نەتەوە لە حاڵەتی جەنگ و بەرگریدان بەرامبەر بە هێرشی دوژمنان و بەهۆی سەختی تۆپۆگرافیای کوردستانەوە کە زۆرینەی چیایە زۆرکەم دوژمن توانیویەتی کۆنترۆڵی تەواوی کوردستان بکەن، هەربۆیە هەندێك چیا وەك پارێزەری لەمێژینەی کورد دەزانن و تەنانەت مانەوەی کورد و زمانەکەشی تائێستا بۆ سەختی چیاکان دەگێڕنەوە کە هەمیشە لانکەی شۆڕش و قەڵای بەرگری کوردان بووە. لەم سۆنگەیەوە چیاکان ڕۆڵی ئیجابییان هەبووە و هەمیشە پشتوپەنای کوردان بووە لەبەرامبەر مەترسی دوژمناندا و هەر لەمێژە کوردان بۆ پارێزگاری لە خۆیان پەنایان بۆ بردووە.

ئەوەتا گەزنەفۆن سەرداری بەکرێگیراو کە بۆ یارمەتی ڕاپەڕینەکەی "کۆرشی بچووك" بەسەر ئەردەشێری برایدا هاتبوونە ناوچەکە، لەکاتی گەڕانەوەیدا، بە وڵاتی (کاردۆخی) کوردانداباس لەو چەرمەسەرییانە دەکا کە لەو ناوچە بەسەریاندا هاتووە، دەڵێ: "کاردۆخییەکان (کوردەکان) لە دەڤەرێکی پڕ لە شاخ و کێودا دەژین، خەڵکێکی شەڕکەر و ئازان، تەنانەت ملکەچی پادشاکانیش نابن ".. لە دێڕێکیتردا دەڵێ: "کاردۆخییەکان منداڵ و ژنەکانیان بردبووە چیاکان و لەکاتی تێپەڕبوونماندا لەدواوە پەلاماریانداین"[٥].

ئەم چەند دێڕە نیشاندەری ئەو ڕاستیەیە کە کوردەکان هەمیشە جۆرێك لە سەربەخۆییان هەبووە و ملکەچی پادشاکان و دەسەڵاتەکانی ناوچەکە نەبوون، بەدرێژایی مێژووی دەسەڵات و ئیمپراتۆرە گەورەکانی دواتری ناوچەکە کوردان و هەرێمی چیا هەمیشە لانکەی شۆڕش و یاخیبوون بوون لە دەسەڵاتی ناوەندی، وەك لە مێژووی هاوچەرخ و ئەمڕۆشدا چیاکان پشتوپەنای شۆڕشەکانی گشت پارچەکانی کوردستانە، تەنانەت هەندێك نووسەر ناوەندبوونی چیاکانی





کوردستان بە قولایی بەرگری دادەنێن، ئەگەر هاتوو لە داهاتوودا بوو بە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ کە ئەمەش بە فاکتەری هێز دێتەئەژمار[٦].. کەواتە چیا (پەناگەیەك بۆ بەرگری) وەك هێزێکی سروشتی بەدرێژایی مێژوو شانبەشانی هێزی مرۆیی ئینسانی کورد، نەتەوەی کوردی لە هێرشی دوژمنان پاراستووە، ئەمەش کە بۆ دنیای ئەمڕۆی پێشکەوتوو لە بواری تەکنەلۆجیای جەنگدا تاڕادەیەك بایەخی کەمبێت، ئەوا لەو ڕەوتە دووردرێژەی مێژوودا کە مەبەستی باسەکەمانە، هەمیشە چیاکان ئەو قەڵا سەختەبوون کە دوژمن نەیتوانیووە کۆنترۆڵیبکات، وەك دەبینین لە مێژووی هاوچەرخماندا ڕژێمی بەعسی عێراقی پاش ئەوەی نەیتوانی پێشمەرگە و شۆڕش لە چیاکاندا سەرکوتبکات، هەستا بەئەنجامدانی پرۆسەی چۆڵکردنی گوندەکان و دواتریش پرۆسەی ئەنفال بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە هەرەس بە شۆڕشگێڕان بێنێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.. بۆیە لەم سۆنگەیەوە ڕاستییەکی بینراو و بەرچاوە کە چیاکان هەمیشە لانکەی شۆڕش و بەرخودان بوون و هۆکارێکی سەرەکی مانەوەی کورد و زمانەکەشی بووە، هەربۆیە مرۆڤی کورد وەك ڕەمزی ئازادی و چۆکدانەدان لە زهنیاندا نەخشیگرتووە.

## چیا وەك هۆکاری پارچەپارچەبوون:

لە باسی پێشوودا چیامان وەك قەڵای بەرگری کوردان شرۆڤەکرد و ئەوەشمانزانی چیا وەك دیاردەیەکی سروشتی پارێزگاری لە مانەوەی کورد و زمانەکەشی کردووە، بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا دەبێت بیرماننەچێ چیا فاکتەرێکی کاریگەریش بووە بۆ پارچەپارچەکردنی نەتەوەی کورد و پەرتەوازەیی زمانەکەی، شانبەشانی دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی دەوروبەر.. هەروەك هیگڵ دەڵێت: "چیاکان خەڵکان دابەشدەکەن، بەڵام ڕووبار و دەریاکان نزیکیاندەکەنەوە لەیەکتری" [٧].

لەڕاستیدا یەکێك لە هۆکارەکانی پەرتەوازەیی کورد و مانەوەی بەدرێژایی مێژوو لەنێو سیستەمی خێڵایەتیدا چیا بووە، چونکە چیاکانی کوردستان تاڕادەیەك دەکەونە نێوەندی وڵاتەوە، ئەمەش بووەتە هۆی پچڕانی پەیوەندی لەنێوان خێڵە کوردەکاندا، چونکە هەبوونی ئەو زنجیرە چیایانە لەنێوەندی سەرزەمینی کوردستاندا، ڕێگربووە لەبەردەم دروستبوونی شار، هەربۆیە ئەگەر تێبینیبکەین زۆربەی شارە گەورەکانی کوردستان کەوتوونەتە سنوورەکان و نزیك سنوورەکان، بۆنموونە (سنە، کرماشان، خانەقین، کەرکوك، ماردین، ئورفە، قامیشلی)و تەنانەت دیاربەکریش[٨]. ئەمەش لایەنێکی سلبی چیاکانە، چونکە بوونی شاری گەورە لەو نێوەندەدا

راستەوخۆ دەبووە مەڵبەندێکی گرنگ بۆ لێکنزیککردنەوەی خێڵەکان و تێکەڵبوونیان بەیەکتر، هەروەها سەنتەرێکی گرنگیش دەبوو بۆ بەستنەوەی هەموو بەشەکانی ولاّت و دروستبوونی بنەمای هاوبەش و رۆشنبیرییەکی یەکگرتوو کە گرنگییەکی بەرچاویان هەیە لە مەسەلەی ناسنامەدا، بەدەرلەمەش بوونی چیا لەونێوەندەدا گرفتی لەبەررۆشتنی ئابووری خولْقاندووە، بەو مانایەی کە ئەو بەرهەمە کەمەشی کە هەیەتی بەرەو دەرەوە بڕوات، چونکە بوونی چیا لەونێوەندەدا پەیوەندی بازرگانی گرانکردووە لەنێوان خێڵەکان یان پارچەکاندا بەتایبەت لە وەرزی زستاندا کە وەرزێکی درێژە لە ناوچەکەدا و بەدرێژایی چەندین مانگ بەهۆی بارینی بەفر و دروستبوونی دیاردەی تەمومژەوە کارەکە سەختتر دەبێت، رۆژهەلاّتناس و کوردناسی روسی خاتوون "ی. ئی. ڤاسیلیەڤا" سەبارەت بەسەختی تێپەڕین بەنێو چیاکانی رۆژهەلاّتی کوردستان دەنووسێت: "گەلێ کیولاّن و چیای بەرز بەرزی لێیە و دیوارێکی راستەقینەیان پێکهێناوە، رووبارەکان لەوێدا رێگەی خۆیان دەکەنەوە، بەزەحمەت ریزە چیاکان دەبڕن و دەربەند و کەنداوی قووڵ "تەنگ" دروستدەکەن، شاخەکان نیمچە ستونی هەڵچوون و ترۆپکەکانیشیان بەفریان بەسەرەوەیە، بۆئەوەی خەڵکەکە بتوانن لە دۆڵێکەوە بچن بۆ دۆڵێکیتری هاوتەریبیان دەبوایە بە دەربەندەکاندا بسوورێنەوە و سەفەری سەدان کیلۆمەتر دوور ئەنجامبدەن."[٩]

وەك دەبینین چیاکان کۆسپن لەبەردەم ئاسانی گواستنەوە و پەیوەندییە جۆربەجۆرەکان کە ئەمەش هۆکارە بۆ لێکترازان و تۆخکردنەوەی جیاوازی لەنێوان خێڵە کوردەکانی ئەم دیودیوی زنجیرە چیاکاندا، هەربۆیە چیاکان کارێکیانکردووە کە نەك هەر نەتەوەی کورد بەڵکو زمانەکەشی پەرتەوازەکردووە، چونکە ئەم کۆسپە سروشتییە رێگربووە لە تێکەڵبوونی خێڵەکان و پەیوەندییە جۆربەجۆرەکان بەشێوەیەك چەندین شێوەزاری جیاواز لە زمانەکەیاندا دروستبووە کە تێگەشتنیان لەیەکتری ئاسانییە بۆنمونە ئەوکەسەی کە بە شێوەزاری سۆرانی دەدوێ بەئاسانی لە کەسێکی کرمانجی ناگات و بەپێچەوانەشەوە بۆ کەسە کرمانجییەکەش بەهەمانشێوەیە کە ئەمەش گرفتێکیدیکەیە لە مەسەلەی ناسنامەی کورد و زمانێکی یەکگرتوودا، تەنانەت مەسەلەی زمان هەنووکە گرفتێکی گەورەیە بۆ کوردەکان، تارۆژی ئەمڕۆش زمانێکی یەکگرتوویان نییە، لەکاتێکدا زمان یەکێکە لە ماکەکانی نەتەوە[-أ-].

وەك ئاماژەمانپێدا تۆپۆگرافیای کوردستان (چیا) رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەدابەشکردنی خێڵکان و مەودای دووری نێوانیان، ئەمەش وایکرد کە نەیاندەویست بێنە ژێر چەتری نەتەوە،





چونکە ئەو دەسەلاّتە سەربەخۆیی (دەسەلاّتی خێڵ) کە هەیبوو بەهۆی دروستبوونی نەتەوەوە لەدەستیدەدا کە ئەمەش فاکتەرێکی سەرەکی دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی بووە لەگشت قۆناغەکانی مێژووی ئەم نەتەوەیەدا کە راستەوخۆ ئەمەش فرەدەسەلاّتی دروستکردووە[-ب-].

سەبارەت بەدابەشبوونی دانیشتوان لە چیاکاند و پەیوەندییان (د. محەممەد عەبدولغەنی) دەڵێت: "یەکێتی سیاسی لە ناوچە دەشتاییەکاندا ئاسانتر بەدیدیت لەچاو ناوچە شاخاوییەکاندا، زۆرێك لە ناوچە شاخاوییەکان بەدەست گرفتی کەمی دانیشتوانەوە دەناڵێنن، لەم ناوچانەدا زۆرتر دانیشتوان لە دۆڵەکاندا کۆدەبنەوە و لەچیاکاندا بلاّودەبنەوە، پەیوەندی نێوانیشیان ئاساننابێت، بۆیە یەکەکە لێرەدا هۆزە، گەر گەشەیکرد و پەرەیسەند دەبێتە کانتۆن، یان ویلایەت، گەر ئەو ویلایەتانە یان ئەو کانتۆنانە یەکیانگرت دەوڵەتیان لێپێکنایەت، هەتا ماوەیەکی زۆر بەسەر گەشە و پێشکەوتنیاندا تێنەپەڕێت، وەك حاڵەتی دەوڵەتی سویسرا"[١٠].

هەرچەندە کورد توانیویەتی میرنشین دروستبکات، کە زۆرجار چەندین خێڵ لەژێر سایەی حوکمیدا بوون، بەلاّم سنووری دەسەلاّتی هەریەك لەم میرنشینانە لە جوگرافیایەکی بەرتەسکدا بووە و چیاش زۆرجار وەك کۆسپێکی سروشتی لێکیدابڕیون، بۆنمونە میرنشینی بابان کە نێوەندی دەسەلاّتیان (سلێمانی) بووە و میرنشینی ئەردەلاّن کە نێوەندی دەسەلاّتی (سنە) بووە ئەو زنجیرە چیایانەی کە ئەمڕۆ سنووری (عێراق-ئێران)ی پێدەوترێ لەگەڵ چەند چیایەکیدیکەدا لێکیدابڕیون، بەهۆی بەفر و تەمومژەوە پەیوەندیکردنیان ئاسانەبووە سەرەڕای ئەم دابڕانەش هەمیشە لەگەڵ یەکتر لەشەڕدابوون هەریەکەیان پاڵیاندەدا بە دەوڵەتەکانی عوسمانی و ئێرانییەوە دژی یەکتر، هیچ یەکیان نەیانتوانیوە ئەویتر لەنێوبەرن جا چی بەهۆی سەختی ناوچەکەوە بێت یان ویستی دەوڵەتانی ئێرانی و عوسمانی بۆ راگرتنی هاوسەنگی هێزەکان و پاراستنی سنوورەکانیان، ئەم شەڕ و ململانێیەش زادەی ئەو پەرتەوازەیی و لێکترازانەی کوردە کە چیا فاکتەرێکی سەرەکی بووە، ئەمەش ئەو هەستەی لەلای تاکی کورد دروستکردووە کە هێندەی لە بیری سەرفرازی خێڵدا بووە، هێندە نەتەوەی بۆ گرنگنەبووە، هەربۆیە سیستەمی خێلاّیەتی هەمیشە مۆرکی دیاری کۆمەڵگەی کوردی بووە و هیچ یەك لە خێڵەکانیش ئامادەنەبووە یەکتر قبوڵبکەن و چەتری نەتەوە پێکبهێنن، هەربۆیە تاکی کورد هەمیشە پابەندی سەرۆك خێڵەکەی بووە، هێندە هۆشیاری سەبارەت بە نەتەوە نەبووە، ئەمەش کۆسپێکبووە لەبەردەم فیدراسیۆنی خێڵەکان.

سەبارەت بە چیاکان و رۆڵی لەدواخستنی پرۆسەی هۆشیاربوونەوەی کورد، بۆچوونەکانی ئازاد قەزاز رۆشنکەرەوە و یارمەتیدەرن کە دەنووسێت: "تاکی کورد ناهۆشیاربووە، چی سەبارەت بەخودی خۆی (نەتەوە) چی سەبارەت بەدەرەوەی خۆی، هەمیشەش کاتێ دوژمن مافەکانی زەوتکردووە و هێرشیکردووەتەسەر، تەنها پەرچەکرداری نواندووە، هەمیشە پشتی بە شاخ قایمبووە، کورد کاتێك پشتی بە شاخ قایمبووە راستەوخۆ بۆ وەڵامدانەوە پەنادەباتەبەر شاخ یان سروشت، بتەوێ و نەتەوێ دۆخێکی سایکۆلۆژی بۆ سازکردووە، هۆشیاربوونەوە لەم دۆخە کە مرۆڤی تێدەکەوێ پرۆسەیەکی سایکۆلۆژی دەخوازێت، وەڵامدانەوەیەکی سادە و بێبیرکردنەوەیە، واتا بە ئاستێکی هۆشیاری و بیرکردنەوەیەکی بەرزەوە وەڵامی ئەو هەڕەشەیە نەدراوەتەوە[11].

ئەم پەرچەکردارە زۆرجار لە مێژووی کورددا دووبارەبووەتەوە، لەکاتێکدا کە هێرشیدەکرێتەسەر لەلایەن دوژمنانەوە راستەوخۆ پەنادەباتە شاخەکان، لێرەدا جێگەی خۆیەتی بپرسین ئاخۆ ئەمە رۆڵی جوگرافیا نییە لە دووبارەبوونەوەی مێژوو لای کورد؟ وەك جەمال حەمدان دەڵێت: "ئەگەر مێژوو خۆی دووبارەکردەوە-کە رەنگە بیشیکات - ئەو دووبارەبوونەوە جوگرافیایە، بەمە جوگرافیا دەبێتە رەگی جەبری مێژوو، لەوەش زیاتر هەندێك دەڵێن مەگەر مێژوو جوگرافیایی جولاو نییە؟ بەڵام جوگرافیا مێژووی راوەستاوە. "[12]

ئازاد قەزاز پێشیوایە: "کە سەختی و بەرزی شاخەکانیش دانێکی سروشتیتر بووە بۆ کورد رۆکراوە، تابتوانێت لەوێدا خۆی پەنابدات، ئەم دوو فاکتەرە واتا دانی سروشتی"چیا"و دانی سیاسی دەوڵەتانی دەوروبەر، وای لە کورد کردووە کە زۆر عەقڵ بەکارنەهێنێت، لەبری جەنگ و ململانێی خوێناوی کە کۆتایەکەشی هەمیشە و تاهەنووکەش بە شکستی کورد کۆتاییهاتووە. [13]

ئەمەش بەومانای کە کورد هەرکات دوژمن پەلاماریدابێت پەنای بۆ چیاکان بردووە، هەوڵینەداوە چارەسەرێکی عاقلانە بدۆزێتەوە، دەکرێت لەم حاڵەتەدا وێنەی نەتەوەی کورد وەك مرۆڤێك نیشانبدەین کە لە سارایەکدا (چۆڵەوانی) گورگێك پەلاماریدەدات و درەختێکیش لە نزیکێتی راستەوخۆ دەچێتەسەر درەختەکە بۆ ئەوەی گورگەکە لەنێوی نەبا، ئەو درەختە هەمان رۆڵی چیا دەبینێت، هەروەك چۆن مرۆڤەکە جورئەتناکات لە درەختەکە دووربکەوێتەوە، چونکە ئەگەرهاتو دووركەوتەوە و گورگەکە پەلامارییدات ئەوا ناتوانێت خۆی رزگاربکات لە دەستی. دیسان وێنەکە هەمان وێنەی کوردە، تارادەیەك کوردیش بۆئەوەی پارێزگاری لە مانەوەی خۆی





بکات هەمیشە لە دامێنی چیاکاندا ژیاون و کەمتر تێکەڵ بە دەسەڵاتەکانی دەوروبەر بوون، لەهەمانکاتیشدا هەمیشە لە پەراوێزی شارستانییەتەکانی ناوچەکەدا بوون. خاڵێکیدیکە لەبابەت چیاوە گرنگە لەسەری بوەستین، ئەوەیە کە ئەو زنجیرە چیایە تاچەند لەگەڵ سنوورە سیاسییەکەدا گونجاوە؟"چونکە بەرزایی ئەو فاکتەرە سروشتییەیە کە تارادەیەك کاریگەری لەسەر چارەنووسی سیاسی ولاتان هەیە، هەر کاتێك سنووری سیاسی ولاتێك لەگەڵ سنووری سروشتیدا بەگشتی و بەرزایی بەتایبەتی هەماهەنگ بوو، ئەوا هەلومەرجی لەبارتری بۆ بەرگری بۆدەڕەخسێت. [14]

بەپێچەوانەوە چیاکانی کوردستان زیاتر لەنێوەندی ولاتدان و سنوورەکانیشی دەشتن، لەبارێکی وادا دوژمن توانیویەتی بەئاسانی تانزیك قوولایی خاکی کوردستان بێتەپێش، بەڵام ئەگەر هاتباو چیاکان هەماهەنگبان لەگەڵ سنوورە سیاسییەکانی دەوڵەتانی دەوروبەردا، ئەوا چیاکان فاکتەر نەدەبوون بۆ پەرتەوازەیی نەتەوەی کورد، بەڵکو وەك دیواری قەلایەك لە دوژمن دەیپاراستن، هەروەها هەمیشە دەوڵەتان و ئیمپراتۆرەکانی ناوچەکە چیاکانیان وەك کۆسپێکی سروشتی کردووە بە سنوور، وەك دەبینین بەدرێژایی مێژووی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی چیاکانی کوردستان سنووری نێوان ئەم دوو دەسەڵاتە بوون و بەمەش کوردستان سەرەڕای دابەشبوونی ببووە هەرێمێکی بەربەست لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتە و مەیدانی جەنگەکانیان.. سەبارەت بە دەوڵەتی بەربەست د. عەبدوڵلا عەتەوی دەنووسێ: "دەوڵەتە بەربەستەکان هەمیشە شوێنی ناکۆکی و کێشەن، دەبنە پرد بۆ پەڕینەوەی هێزە سەربازییەکانی هەرکام لەو دەوڵەتە گەورانەی دراوسێی، ئەوەشی وایکردووە ئەو رۆڵە بەربەستە بگێڕێ، هەبوونی فاکتەری سروشتییە وەك ئەوەی بەرزونزمی زۆر ئاڵۆزی هەبێت، یان.. چەندین فاکتەریتر. [15]

وەك دەشزانین چیا هەمیشە کۆسپبووە لەبەردەم هێزە سەربازییەکاندا، بەتایبەت لە کۆندا، "بۆنموونە بەرزاییەکانی (پیرنە) کەوەك دیوارێکی مەزن دەکەوێتە نێوان فەرەنسا و ئیسپانیاوە، لە سەدەی حەوتەمدا بوونە رێگر لەبەردەم دزەکردنی ئیسلام بۆ ناو فەرەنسا و لەبنەڕەتەوە دوو کلتوری بەتەواوی لێکجیاوازیان لە هەردوولا پێکهێنا. [16]

لەحاڵێکدا بە بەڵگەی زۆر سەلمێنراوە کە زنجیرە چیاکان دەبنە سنوورێکی سیاسی باش. بۆنمونە چیاکانی (ئالپ)ی نێوان ئیتالیا و دراوسێکانی یان چیاکانی (تبت)ی نێوان هیند و چین یان چیا ئەسکەندەنافییەکانی نێوان سوید و نەرویج.. هتد. [17]

## ڕۆڵی تۆپۆگرافیا له ئاراستەکردنی مێژوودا لای فەرنان برودیل

فەرنان برودیل (١٩٠٠-١٩٨٥) بەرابەر و پێشەنگی ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت کە پێیدەوترێت "قوتابخانەی مێژووی نوێ" واتە مێژوویەك لەچەند گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە دەنووسرێتەوە، (ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی.. هتد)[18].

برودیل دەڵێت: "شتێکی هەڵەیە پێمانوابێت مرۆڤ مێژوو دروستدەکات، بەپێچەوانەوە ئەوە مێژووە مرۆڤ دروستدەکات، ئیرادەی مرۆڤ لە دروستکردنی مێژوودا، جگەلە دڵۆپە ئاوێك لە زەریایەکدا هیچیدیکە نییە.

برودیل لە کتێبە بەناوبانگەکەی (ناوەڕاست و جیهانی ناوەڕاست لە سەردەمی فلیپی دووەمدا)دا کە بەشی یەکەمی بۆ جوگرافیا و ڕۆڵی لە مێژووی ئەو ناوچانەدا تەرخانکردووە. لەم بەشەدا پاش ئەوەی باسی پێکهاتەی ناوچەکە و پێدراوە جوگرافیاکانی کردووە، دوای ئەمە کاریگەری ئەم جوگرافیانەی بەسەر ڕەوتی مێژووی ناوچەکەوە باسکردووە و ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە چۆن هەر دیاردەیەکی جوگرافی کاریگەریدەبێت لە مۆرکرێژکردنی مێژووی مرۆڤ،، دەسپێکی کارەکانی بەیاساییکردنی ڕۆڵی تۆپۆگرافیا لەسەر مۆرکرێژکردنی مێژوو و شارستانییەتی ئەو ناوچە باسکردووە کە بە چیا دەستیپێکردووە، چونکە چیا بەلای ئەوەوە کرۆکی ژیان لەو ناوچانە پێکدێنێت. [19]

سەبارەت بە چیا برودیل پێیوایە: سروشتی چیا بەردەوام کۆمەڵگایەکی پەرتەوازە پێکدێنێت، چونکە سروشتی چیا ژیانی داخراو دەسەپێنێت و وادەکات دانیشتوانەکەی ناچاربن خۆیان پێداویستییەکانی خۆیان پێکبێنن کە ئەمەش وادەکات لە کۆمەڵی بچووك بچووك پێکبێن، (ئەو بۆچوونەی برودیل واقیعیدیتەوە لەگەڵ ژیانی کوردەکاندا، وەك باسمانکرد کوردەکان میللەتێکی پەرتەوازەن، چیاش یەکێك بووە لەو هۆکارانەی ئەم پارچەپارچەبوونەی دروستکردووە، هەروەها کوردستان دانیشتوانەکەی توانای"خۆبژێوی"یان هەبووە، خێڵەکانیش وەك کۆمەڵی بچووك بچووك دەرخەری ڕاستی ئەم بۆچوونەی (برودیل)ن.

دواتر برودیل دەڵێت: "ژیان بەشێوەی کۆمەڵی بچووك بچووك وادەکات کە نەتوانن شاری گەورە دروستبکەن، بەمەش هەمیشە لە پەراوێزی شارستانییەتەکاندا دەمێننەوە کە لە پێدەشتەکاندا دروستدەبن، سەبارەت بەم بۆچونەی برودیل پێشتر ئاماژەمانپێدا کە چیا کۆسپبووە





لەبەردەم دروستبوونی شاری گەورە لە نێوەندی وڵاتی کوردانددا، هەربۆیە زۆربەی شارەکان کەوتوونەتە سنوورەکانەوە کە دەشتن. وەك (کەرکوك، خانەقین، سنە، کرماشان، ئورفا، تەنانەت دیاربەکریش).

سەبارەت بەوەی کە دانیشتوانی چیا دەکەونە پەراوێزی شارستانییەتەکانەوە، وەك برودیل پێیوایە، ئەوا بۆ کوردەکانیش کە وڵاتەکەیان چیایە ڕاستە هەر سەبارەت بەم پەراوێزبوونەی کورد و بەشدارینەکردنی لە شارستانییەتەکانی ناوچەکەدا، "ئازاد قەزاز" دەڵێت: "هەرکاتێك مرۆڤ یان نەتەوە ناهۆشیاربێت، جوگرافیا یان جیۆپۆلۆتیك ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەئاراستەکردنی ئەو مرۆڤەدا، شاخاویی ئەو ناوچەیە کە کوردی تێداجێگیربووە و پشتئەستوریيان بەو کەژ و کێوانە یەکێك بووە لە هۆکارەکانی دواکەوتنی کورد، لەچاو نەتەوەکانی دەوروبەریدا، هەمیشە بۆ خۆپاراستن لە دەسەڵاتی ناوەندی پەنایبردوەتەبەر شاخەکان، ئەمەش وایلێکردووە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ نەتەوەکانی ناوچەکەدا (عەرەب و تورك و فارس) بەشدارییەکی بەرچاوی نەبووە. [20]

برودیل هەر لەسەر ناوچە "چیاکان" دەڵێت: "سروشتی سەختی چیاکان وایکردووە، ژێردەستەکردنی چیانشینەکان ئاساننەبێت، هەربۆیە ئەو ناوچانە دەبنە حەشارگەی یاخیبوان و ڕاپەڕیوان، بەمەش ناوچە چیاییەکان شوێنی بەپیتن بۆ کەمینە جۆراوجۆرەکان[21]. سەبارەت بەوەی ئاسان نییە چیانشینەکان ملکەچبکرێن پێشتر باسمانکرد، بەڵام بۆچونی برودیل سەبارەت بە کەمینەکان دیسان ڕاستە و دەکرێت بڵێین نیشتمانی شاخاوی کوردەکان بەدرێژایی مێژوو لانکەی ڕاپەڕینەکان و شوێنێکی بەپیتبووە بۆ کەمینەکان، تاهەنووکەش هەروایە چونکە جگەلە کوردەکان کە زۆرینەیان سوننە مەزهەبن، کەمینەیەکی جوولەکەشی تیادابووە کە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل، پاش ئەوەی توانیان دەوڵەتی سەربەخۆ دامەزرێنن، هەروەها مەسیحی و یەزیدی و کاکەییش تاڕۆژی ئەمڕۆ ئامادەییان هەیە، جگەلەمانەش کوردە عەلەوییەکانی باکووری کوردستان و شیعەکانی ناوچەی کرماشان و کوردستانی ئێران و خانەقین، هەموو ئەمانە و نەتەوەکانی ئاشور و تورکمان و کلدانیش تاڕۆژی ئەمڕۆ لەم جوگرافیایەدا دەژین، بەدەرلەمانەش چەندین کۆمەڵی بچووك بچووکیدیکەش هەن.

بۆچوونەکانی برودیل زۆری لەگەڵ واقیعی کوردستاندا دێتەوە، بەتایبەت ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت: "چیاکان دروستکەری ئەو پیاوانەن کە خزمەتی ئەوانیدیکە دەکەن". [22]

ئەگەرچی ئەمە واقیعێکی مێژوویی تاڵە بەڵام، هەمیشە کوردەکان بەهۆی فاکتەرە جوگرافی و جیۆپۆلۆتیکی و پەرتەوازەیی خێڵەکانەوە لە خزمەتی ئەوانیدیکەدا بوون، هەرئەمەشە وایکردووە کە کوردەکان نەتوانن فیدراسیۆنی خێڵەکی پێکبێنن، چونکە سەرەڕایی ئەوەی لە خزمەتی دەسەڵات و میللەتانی ناوچەکەدابوون، جێگەی داخە دژبەیەکتر بۆ بەرژەوەندی ئەوانیدی لە شەڕدا بوون.

کۆی ئەو باسانەی کە لەبارەی چیاوە لەسەری هەڵوێستەمانکرد، بۆدەرخستنی هۆکارە ئیجابی و سلبییەکانی چیا بوو، دواتریش بۆئەوەی باسەکە زانستیتربێت، بۆچوونەکانی (فردنال برودیل)مان لەسەر چیا وەرگرت، لە رۆشنایی بۆچوونەکانی برودیلدا، جارێکیدیکە مێژووی کوردستانم شرۆڤەکرد.

کورتەی مەبەستم نیشاندانی کاریگەری جوگرافیا بوو لەسەر رەوتی مێژوو و ئاراستەکردنی و دەتوانین وەڵامێکیش لە باسەکە هەڵگۆزین بۆ پرسیاری "ئایا بۆ کورد لە مێژوویەکی دوورودرێژدا نەیتوانیوە دەوڵەت دروستبکات؟ یان ئایا بۆچی پەرتەوازەیی و شەڕی یەکترکوشتن لەناو کورددا، مێژوویەکی دوور و دووبارەبووەوەی هەیە؟

### دەرئەنجام و راسپاردە:

لەدەرئەنجامدا دەتوانین بڵێین ئەگەرچی چیا هەمیشە لانکەی راپەڕین و قەڵای بەرگری کوردان بووە و بۆ خۆپاراستن لە ستەمی دەسەڵاتی دەوڵەتانی دەوروبەر پەنایان بۆبردووە و لە چیادا کورد هەمیشە جۆرێك لە سەربەستی هەبووە، بەڵام لەهەمانکاتدا چیا هۆکارێك بووە بۆ پەرتەوازەیی کورد و کلتورەکەی، کوردی تووشی داخرانکردووە بەسەرخۆیدا، هەروەها هۆکارێکیش بووە بۆ دواکەوتنی پرۆسەی هۆشیاربوونەوە و مانەوەی لەنێو سیستەمی خێڵەکیدا، گرفتەکەش زیاتر لەوەوە سەرچاوەیگرتووە کە چیاکانی کوردستان ناکەونە سنووری ولاتی کوردانەوە، بەمانایەکیتر دابەشبوونی کورد لەنێوان زنجیرە چیاکان و ئەمدیوئەودیوی چیاکاندا هۆکاری دابڕان و لێکترازانی کوردە، لەم بارەشدا چیاکان بوونەتە سنووری سروشتی نێوان ئیمپراتۆر و دەوڵەتانی دەوروبەر کە ئەمەش دووبارە دابەشبوونی کوردە، دابڕانێك کە سروشت (چیا) هۆکاریبووە، دابڕانێکیتری کورد بەهۆی سنووری سیاسی دەوڵەتانەوە کە پارچەپارچەیکردوون کە ئەمەش ناراستەوخۆ چیا هۆکاریبووە.





ئەوەی مابێتەوە بیڵێین: جوگرافیا ئەگەرچی جێگیرە و چیاکان هەرهەمان ئەو چیایانەن کە نەتەوەی کورد مێژوویەکی دوورە لە بنارەکانیدا دەژین، بەڵام مێژوو جووڵاوە و دەکرێت بە ئاراستەیدیکەدا ببرێ، ئاشکرایە لە چوارچێوەی هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ زاڵبوون بەسەر سروشتدا، لەم زەمەنی تەکنەلۆجیایەدا مرۆڤایەتی گەشتووە بەئاستێك لە پێشکەوتن لە گشت بوارەکاندا، کە چیدی هیچ رەگەزێکی جوگرافی ئەو رۆڵەی نابێت کە لە رابردوودا هەیبووە، هەربۆیە پێویستە کورد لە گشت پارچەکان شێوازی خەباتی خۆیان بگۆڕن لەبەرامبەر ستەمی دەوڵەتانی داگیرکەر، بۆبەدەستهێنانی مافەکانیان پێویستە پێبەپێی گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە و جیهان هەنگاوی گەورە هەڵگرن، چونکە چیدی چیاکان نابنە قەڵای بەرگری و پاراستنی کورد، چونکە ئەو پێشکەوتنەی لە تەکنەلۆجیای چەك و هونەری جەنگدا هاتونەتەئارا، بوونەتە هۆی لاوازکردنی رۆڵی لەمێژینەی چیاکان وەك قەڵایەك بۆ بەرگری و خۆپاراستن، لەئەمرۆدا کورد دەتوانێت لە رێگەی ئەو تۆڕە پەیوەندییەی جیهانی تەنیووە و هاوکات سوودوەرگرتن لە پێشکەوتنی هۆیەکانی راگەیاندن و گواستنەوە کار لەسەر یەکخستنەوەی پارچەکان و کاڵکردنەوەی کلتوری خێلایەتی بکات، دواجار سەر رێگەخستنی ئەو ئیرادە گشتییەی کە کوردانی هەموو پارچەکان هەیانە بۆدروستبوونی دەوڵەتی کوردی، کە ئەمەش پێویستە کاری بۆبکرێت و نەك تەنها لە مەیدانی سیاسەتدا بەڵکو لە هەموو بوارەکانی ئەدەب و هونەر و سینەما و.. هتددا رەنگ بەم **ئیرادەیە بدرێت.**

❊❊❊

**پەراوێز**

أ. سەبارەت بە کێشەی زمان بڕوانە (کورد و بنیاتنانی ئومەت) مارتن ڤان برۆسن.

ب. بڕوانە (کۆمەڵگەی کوردی و پەرەسەندنی ناسروشتی) عەتا قەرەداغی.

**سەرچاوەکان:**

١. د. عەبدوڵلاّ غەفور، جوگرافیای کوردستان، چاپی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٥.
٢. د. عەبدوڵلاّ غەفور، هەمان سەرچاوە. ل٢٥.

٣. د. عەبدوڵلاّ غەفور، هەمان سەرچاوە. ل ٢٦.
٤. تاریق محەممەد عەبدولڕەحیم، مینۆڕسکی و نووسینەکانی لەبارەی کورد" لە سەردەمی ئیسلامەتی تا سەردمی خەلافەتی عوسمانی". و: ئازاد عوبێد سالّح، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ١٠٤.

٥. حەبیبولاّی تابانی، هاونەتەوەیی قەومی کورد وماد. و: جەلیل گادانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٤، ل ٢٦١.
٦. فەرید ئەسەسەرد: جیوپۆلۆتیکی کوردستان، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژ:٢ی ساڵی دووەم، تەموزی ١٩٩٣ ل٤٩.

٧. رەحیم سابیر: کوردۆلۆجی، چاپی دووەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ١١٨.
٨. عەتا قەرەداغی: کۆمەڵگەی کوردی و پەرەسەندنی ناسروشتی، چاپ یەکەم، چاپخانە: دانـاز، سلێمانی٢٠٠١، ل٧٠.

٩. ی. ئی. ڤاسیلەیڤا: کوردستانی خوارووی رۆژهەلاّت، و: د. رەشاد میران، چاپی دووەم، لە بلاّوکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩، ل٣٧.
١٠. محەممەد عەبدولغەنی سعودی: جوگرافیا و پەیوەنییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، وەرگێڕانی: جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٦٤.





١٠. ئازاد قەزاز: رۆحی کورد لە بندەستی (ناسیۆنالیزم، مارکسیزم، ئیسلامیزم)، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی ٢٠٠٨، ل ٥١-٥٢.
١١. عەبدوڵلاّ عەتەوی: دەوڵەت و کێشە نێودەوڵەتییەکان، وەرگێڕانی: جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد، چاپی دووەم، چاپەمەنی: گەنج، سلێمانی ٢٠٠٧. ل٤٧.

١٢. ئازاد قەزاز: سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.
١٣. عیزەتوڵلاّ عیزەتی: جیۆپۆلۆتیك، وەرگێڕانی: کەمال رەشید، چاپی یەکەم، لە بلاّوکراوەکانی سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی، سلێمانی ٢٠٠٤، ل١٠٥.

١٤. د. عەبدوڵلاّ عەتەوی: سەرچاوەی پێشوو. ل٢٧٨.
١٥. عیزەتوڵلاّ عیزەتی: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٦.

١٦. عەبدوڵلاّ عەتەوی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٦.
١٧. مسعود زاهیر: ڤەرنان برۆدیل و قوتابخانەی مێژووی نوێ، وەرگێڕانی: شوان ئەحمەد، گۆڤاری سەردەم، ژ:٦١ی ساڵی ٢٠٠٩. ل١٣١.

١٨. سامان حسێن ئەحمەد: رۆڵی تۆپۆگرافیا لەئاراستەکردنی مێژوو، گۆڤاری کۆچ، ژمارە ( ١١-١٢) پایز و زستانی ساڵی ٢٠٠٩، ل٦٣٣.
١٩. ئازاد قەزاز: سایکۆپۆلەتیك، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی ٢٠٠٧، ل ٤٥.

٢٠. سامان حسێن ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣٣.
٢١. سامان حسێن ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣٣.

# کاریگەری جوگرافیای رادیکاڵ لەسەر پلاندانانی شار

**عەلی ئەحمەدی**

**بەشی جوگرافیای زانکۆی گەرمیان***

هیچ زانستێك بەبێ پشتیوانییەکی تیۆری ناتوانێ بیروبۆچوون و روانگەی خۆی جێبەجێبکات. لەبەرئەوەی لایەنی تیۆری و پراکتیکی پێوەندییەکی لێکدانەبڕاویان هەیە و هەرچەشنە کردارێك لە روانگەیەکی فیکری یان تیۆری سەرچاوەدەگرێ. جوگرافیاش لە دیدگەی زانستەکان جیاواز نییە و ناتوانێ بەبێ بنەمای فیکری و تیۆری پلانەکانی خۆی جێبەجێبکات، لەلایەکیتریشەوە لەهەموو ولاتان و ناوچەکانی جیهان ئایدیا فەلسەفی و سیاسییەکان، کاریگەریان لەسەر زانستە جۆراوجۆرەکان هەبووە. لەڕاستیا لەهەر ولاتێك زانستەکان لەژێر کاریگەری ئابووری سیاسی ئەو ولاتەدان. بە واتایەك شێوەی ئەنجامی پلانەکان وەك پلانە شارییەکان لەژێر کاریگەری تێڕوانینی زاڵی ئەو ولاتانە بۆ پلان و پلاندانان بووە. ئایدیا جۆراوجۆرەکان هەرکامە و بەپێی هەڵسەنگاندنی لە بارودۆخی ئێستا و داهاتوو ئەوەی هەیە و ئەوەی دەبێ ببێ، پلاندانانە شارییەکانیان خستووەتەژێر کاریگەری خۆیان. بۆیە پلاندانانی شار بەپێی هەر ئایدیایەکی فیکری تایبەت بەوجۆرە بیرکردنەوە و تێڕوانینە دارێژراوە. لەم ناوەدا بیرۆکە رادیکاڵەکانیش بەپێی بیروبۆچوون و شێوەی بیرکردنەوەیان هەوڵیانداوە بەپێی روانگەیەکی یەکسانیخوازانە پلاندابنێن و بە شێوازێکی شۆڕشگێڕانە هەوڵی گۆڕینی بارودۆخی ئێستایان داوە تا نایەکسانییەکان لەناوببەن.

وشە کلیلییەکان: جوگرافیای رادیکاڵ، جوگرافیای ئانارشیستی، جوگرافیای رەخنەگرانە، جوگرافیای فێمێنیستی، پلاندانانی شار.





## پێشەکی

بەشە زانستییە جۆراوجۆرەکان لەژێر کاریگەری بیرۆکە فیکری و فەلسەفییەکاندا گەشە و پەرەیان بە خۆوە دیوە و گۆڕانکارییان بەسەراهاتووە. لەڕاستیا تێڕوانینە فەلسەفی و سیاسییەکان زەمینەیان بۆ پەیابوونی پلانە جۆراوجۆرەکان لە کۆمەڵگاکان رەخساندووە. بۆیە پێوەندییەکی لێکدانەبڕاو لەنێوان تیۆرە فیکری و فەلسەفییەکان و کرداری پلاندانان هەیە. جوگرافیاش وەك زانستێك کە لە پێوەندی لەگەڵ ژینگە و مرۆڤدایە و لە بیری بنیاتنانی جیهانێکی باشترە بۆ مرۆڤ، لەگەڵ تیۆرە فیکری و فەلسەفییەکان تێکەڵدەبێت. لە دەوروبەری ساڵەکانی ١٩٣٠ هاتنەناوەوەی تیۆرە فەلسەفییەکان بۆ ناو جوگرافیا لە ولاتانی ئەورووپا و ئەمریکا دەستپێدەکات. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٣٠ - ١٩٦٠ باسە فەلسەفییەکان لە جوگرافیادا زۆرتر لەبارەی سروشت و بەرجەوەندە[٢] جوگرافیاییەکان پێوەندی جوگرافیا لەگەڵ زانستەکانیتر باسیلێوەدەکرێ و نموونەی بەرچاوی لە کتێبی (ناوەڕۆکی جوگرافیا (١٩٣٩) نووسراوی ریچارد هارتشۆرن) دەبینرێت (شکۆیی، ١٣٧٨:٢٠)، هاتنی تیۆرە فەلسەفییەکان بۆ ناو جوگرافیا بوو بە هۆکاری ئەوەی کە بەشە جۆراوجۆرەکانی جوگرافیا بکەونەژێر کاریگەری ئەمجۆرە بیرۆکانە و پاش ئەوە خاوەن بنەمایەکی فیکری و فەلسەفی بن و بەوپێیە بۆ شوێنەکان و ژینگەکان بڕوانن و پلاندابنێن. بەمشێوە جۆرێك لە فەلسەفەی بیرکردنەوەی جوگرافیایی هاوکات لەگەڵ بیرۆکەی زانستەکانیدیکە لە جوگرافیاشدا دەردەکەوێت. لە ساڵی ١٩٧٤ەوە ئیدئالیسم، رێئالیسم و گەشبینی یۆتۆپیایی شاری مارکس دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرکام لە جوگرافیناسان بکەونەبەر کاریگەری بیرۆکەیەکی فیکری و فەلسەفی و فیکری ئایدیالیستی، دیالکتیك، زانستی جوگرافیا نەك تەنیا وەکو زانستێکی وەسفیکردن بەڵکو وەك زانستێکی بیرکردنەوە کە مرۆڤ هاندەدا بیربکاتەوە، لەبارەی شێوەی ژیانی تاقمە مرۆییەکان دابڕێژێتەوە (سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٢.).

ئەگەرچی ئەو فیکرە فەلسەفییانە کە دەهاتنە ناو جوگرافیا خاوەن بۆچوونی جیاوازبوون، بەڵام لەڕاستیدا هەموو ئەو بیرۆکانە چ ئەو بیرۆکانەی لە پێوەندی لەگەڵ ئیمپریالیسمدابوون و چ بیرۆکە دیموکرات و پلۆرالیستی و رادیکاڵ و یەکسانیخوازەکان هەموویان بناغەیەکی بەهێزیان بۆ جوگرافیا پێکهێنا. لەم رێگەوە جوگرافیا دەبێتە زانستێکی شیکار و خاوەن بیرکردنەوە و لەهەمانکاتدا زیندوو. لەم پێوەندیەدا کەسانێك وەك تەیلۆر جانستۆن، مایکل جی واتس، دەیوید

هاڕویی و مانۆئێل کاستێلز پێیانوایە کاپیتالیزم (مەودا)ی لاوازکردووە و تێڕوانینی ئەوانی بۆ سەر مەودای گۆڕیوە. بەمشێوە فەزایەکی نوێ لە ئابووری جیهانیی پێکدەهێنێت کە کاپیتالیزمی جیهانی رۆڵی تیادادەگێڕێت (تەیلۆر، جانستۆن و واتس، ١٣٨٣:٣١).

لەم قسە دەردەکەوێ فەزا (ژینگە) ناوەندی گۆڕانکاری لە روانگەی جوگرافیای رادیکاڵە و بەمپێیەش فەزا شارییەکان لەژێر کاریگەری پلاندانانی شاری رادیکاڵ، خاوەن شێوە و فۆڕمی تایبەتین.

**بنەمای تیۆری**

جوگرافیای رادیکاڵ، هەڵقوڵاوی بیروڕای پێشڕەوانی رادیکاڵیزمە کە هاتووەتە ناو جوگرافیا و بووەتە هۆی دەرکەوتنی بەشێکی جیاواز لەناو جوگرافیا بەناوی جوگرافیای رادیکاڵ. لەڕاستیدا جۆرێك بیرکردنەوەی ماتریالیزمی مێژوویی لەگەڵ بیرۆکە بنچینەییەکان، گۆڕانخواز و یەکسانیخواز لەژێر کاریگەری بیرۆکە مارکیستییەکاندا هاتووەتە ناو جوگرافیای سەدەی بیستەم و بووەتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم بەشە لە جوگرافیا. بەشێکی زۆر لە جوگرافیزانان بدرێژایی زیاتر لە سەدەیەك شوێنکەوتووی ئەم بیرۆکەیە بوون و بەپێی بیرۆکە رادیکاڵەکانی سەردەمی خۆیان بەشەکانی جوگرافیای رادیکاڵییان داڕشتووە و رۆڵیان لە خولقاندنە جوگرافیاییەکان، شیکردنەوە جوگرافیاییەکان، وەسفیکردنەکان، پلاندانانەکان و.. هتد، لە زۆربەی شوێنەکانی جیهان هەبووە، هەندێك لە جوگرافیاناسە ئانارشیستەکان وەك ئێلیزە ریکلۆس[١] پێتێر و کرۆپۆتکین[٢] بە یەکەمین جوگرافیناسانی ئانارشیست دادەنرێن و کەسانێکیش ژان بروونی[٣] فەڕانسی بە یەکەمین جوگرافیزانی رادیکاڵ دەزانن، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کرۆپۆتکین و ریکلۆس کاریگەری زۆر زیاتریان لەسەر جوگرافیای رادیکاڵ هەبووە و بیرۆکەکانی ئەوان بووەتە بنەمایەکی بەهێز بۆ ئانارشیسم وەك بەشێك لە جوگرافیای رادیکاڵ. بڵاوکردنەوەی گۆڤاری ئانتی پۆد[٤] لە ساڵی ١٩٦٩ لە زانکۆی (کلارك) سەرەتای ئەو گۆڕانکاریانە بوو لە جوگرافیادا. لە ساڵی ١٩٧٤، یەکیەتی جوگرافیزانانی رادیکاڵ لە شاری تۆرێنتنۆ دامەزرا و لە ساڵی ١٩٧٨ لە کۆنفرانسی ساڵانەی رێکخراوی جوگرافیزانانی بەریتانیا یەکیەتی جوگرافیزانانی رادیکاڵ لەو وڵاتە دەستبەکاربوو (شکۆیی: ١٣٨٢: ١٧٩). رەنگە بتوانین هۆکاری جۆراوجۆر بۆ سەرهەڵدانی جوگرافیای رادیکاڵ باسبکەین، بەڵام دەتوانین ئاماژە بە هەندێك نایەکسانی نەتەوەیی، رەگەزی و ئایینی لە ئاستی کۆمەڵگاکان، وڵاتان و جیهان و هەروەها زۆربوونی جیاوازی هەژار و





دەوڵەمەند لە ئاستی جیهان و زۆربوونی ئایدیا رەگەزپەرستییەکان بکەین کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی بیرۆکە رادیکاڵەکان لەبەرامبەردا. بەگشتی بارودۆخی نالەباری ژیانی مرۆڤ، ناعەدالەتی و نایەکسانی و چەوساندنەوە و داگیرکردنی وڵاتان و ژێرپێخستنی مافی مرۆڤ لە شوێنەکان جیهان، جوگرافیای لە حاڵەتێکی پۆزیتیویستی و ئەزموونگەرانە کردە زانستێکی رادیکاڵ کە خوازیاری لاچوونی نایەکسانی بوو. بەواتایەك سەرهەڵدان یان گەشەی رادیکالیزم لە کۆتایی ساڵەکانی ١٩٦٠ وەك دژ کردەوەیەك لە بەرامبەر بارودۆخی داخراوی سیاسی و جوگرافیای نامرۆیی و چەندایەتی و ئاواتی ئەنجامی گۆڕانکاری بنچینەیی بوو لە رێکخراو و پێکهاتەی کۆمەڵگەکاندا. لەلایەکیترەوە جوگرافیای رادیکاڵ تیۆرییە مارکسیستییەکانی بۆ پێکهێنانی جوگرافیایەکی مرۆیی نوێ بەکارهێنا: (Fuller & Kitchin ٢٠٠٤)). سەرەڕای ئەوە جوگرافیا دەریخستووە کە لەبەرامبەر ئەو رووداوانەی جیهان بێهەڵوێست نییە و نابێ ببێ، بەڵکو زانستێکی بزۆك و روولەگەشەیە و لەژێر کاریگەری رووداوەکان، کار و سیاسەتەکانی دەرەوەی زانکۆکانە (بلانت و ویلس، ١٣٨٥: چهاردە). جوگرافیای رادیکاڵ لە سەرەتادا بیرۆکەی ئانارشیستی و مارکسیستی لە خۆدەگرت، بەڵام ئەمڕۆکە بیرۆکەیدیکە وەك فێمێنیزم، جوگرافیای کلۆنیالیزم، ئازادییە سێکسییەکان و هتد، هاتووەتە ناوی. دایان پێڕنسانس[٥] بەمشێوە جوگرافیای رادیکاڵ پێناسەدەکا: ((جوگرافیا نە مێژوو نە ئابووری و نە زانستی زەوییە، بەڵکو جوگرافیا لێکۆڵینەوە لە فۆڕمە فەزاییەکان و ئەو پێکهاتانایە کە لەناو بارودۆخێکی مێژوویی پێکهاتوون و بەپێی شێوازی بەرهەمهێنان دیاریکراون (شکۆیی، ١٣٨٢: ١٨٤). لەناو چوراچێوەی جوگرافیای رادیکاڵ بەشی جۆراوجۆری تیادایە کە هەرکامەیان خوازیاری چارەسەری کێشە بنەڕەتییە جوگرافیاییەکانن. وەك جوگرافیای ئانارشیستی، جوگرافیای رەخنەگرانە و جوگرافیای فێمێنیستی کە باسیانلێدەکرێ. جوگرافیناسە رادیکاڵەکان بیروبۆچوونی خۆیان بەمشێوە دەردەخەن:

**ئاوات و هیواکانی ئێمە بۆ داهاتووی مرۆڤ لەسەر سێ ئاڕاستەیە:**

- لابردنی نایەکسای لەنێوان نەتەوەکانی جیهان
- پەرەی هاشێوەی نەتەوەکان
- مرۆڤەکان بەشێوەیەکی راستەقینە گەشەبکەن (٧٢ - ٧٥: ١٩٩٧، Peet).

هاوکات لەگەڵ گەشەی بۆچوونە رادیکاڵەکان لە جوگرافیا، ئەم بیرۆکانە لە بەشە جۆراوجۆرەکان لەسەر شار و پلاندانانی شار کاریگەریان هەبووە و هەوڵیانداوە بارودۆخی ئێستای شارەکە بگۆڕن. لە روانگەی جوگرافیزانە رادیکاڵەکانەوە، وەك جوگرافیزانە مارکسیستەکان شار شوێنی کۆبوونەوە و هەڵسوڕانی سەرمایەیە. لە شار چینە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان دروستدەبن و هەندێکجار نایەکسانی چینایەتی پەیادەبێت و ئامانجی جوگرافیناسە رادیکاڵەکان لابردنی ئەم نایەکسانییەیە. دەیوید هارڤیی وەك کەسێکی بەرچاوی جوگرافیای رادیکاڵ پێیوایە: پرۆسەی شاری، جیا لە هەموو شتێك، ژێرخانە ماددییەکان بەمەبەستی بەرهەمهێنان، هەڵسووڕان، ئاڵوگۆڕکردن و بەکارهێنان دەخولقێنێ. بۆیە خاڵی سەرەتا بینینی ئەو شێوەیە کە ژینگەی دەستکردی دروستکردبێ و هەروەها بەشێك لە بەها مرۆییەکان دێنەخزمەت بەرهەمهێنانی بەهای زێدە.. هەروەها دەبێ بەکارهێنانی داهاتووی بورجوازی و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی وزەی کار لەبەرچاوبگیرێ. چون بەکارهێنانی داهات لەلایەن بورجوازییەوە کاریگەری زۆری لەسەر پرۆسە شارییەکان هەیە (هارڤیی، ١٣٨٧: ٤١ - ٤٦). بەڕای ئەو بەکارهێنان لەلایەن بورجوازی، دووبارە بەرهەمهێنانی وزەی کار و جوڵەی سەرمایە، پێوەندییە پێکهاتەییە گرنگەکان بۆ تێگەیشتن لە پرۆسەی شار لە سیستمی سەرمایەداری دەخاتە بەردەم ئێمە.

جوگرافیای رادیکاڵ جەخت لە دوو فاکتەری بنەڕەتی دەکا کە بریتینلە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان و فۆڕمە فەزاییەکان. ئاشکرایە کە ئەم دوو چەمکە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریش بەکاردێن، بەڵام لە جوگرافیای رادیکاڵدا بەپێی ماتریالیزم دێنەبەرباس و لێکۆڵینەوە (شکۆیی، ١٣٨٢: ١٩٥). بەمشێوە ئەم دوو چەمکە هاتوونەناو پلاندانانی شاریش و کاریگەرییان لەسەرداناوە. دەیوید هارڤیی دەڵێت: هەر ستراتیجێکی گشتی کە مەبەستی پلاندانان بۆ سیستمە شارییەکان بەکاردێت ئەبێ دوو جۆر سیاسەت لە خۆ بگرێ و پێکەوە رێکیان بخات، تاقمێك ئەو سیاسەتانەن کە بۆ گۆڕینی شێوە و فۆڕمی فەزایی شار (مەبەست، دیاریکردنی شوێنی هەندێك دیاردە وەك چەم و رووباری ناوشار، هێڵە گواستراوەکان و.. هتد) بەکاردێن و ئەویتریش ئەو سیاسەتانەن کە بۆ کاریگەریدانان لەسەر پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان لەناو شارەکان بەکاردێن (هارڤیی، ١٣٧٩: ١٣٧). دیارە جوگرافیای رادیکاڵ هەوڵدەدا لە پلاندانانی شاردا فۆڕم و پرۆسە کۆمەڵایەتیەکان بخاتەبەرباس و بیانگۆڕێ. بەو هۆیەی کە ئەم بیرۆکە خاوەن تێڕوانینێکی ماتریالیستە، بۆیە یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی لەناو کۆمەڵگا و پلاندانانی





شارەکاندا ئامانجە ئابوورییەکان و گۆڕینی بارودۆخی ئابووری چینی هەژاری کۆمەڵگا و باشترکردنیەتی. هەرچەندە ئامانجیدیکەش وەك ئامانجی ژینگەیی، رەگەزی، نەژادی و نەتەوەییەکانیشی هەیە و هەوڵی لابردنی هەرچەشنە نایەکسانییەك دەدا. مەسەلەیەك کە لە ئەرکی ئەخلاقی رادیکالیستی پلاندانەرەکان سەرچاوەدەگرێت و وەك دەیوید هارڤیی دەڵێت مەبەستی ئەوان تێگەیشتن و ناسینی بارودۆخی ئێستا نییە، بەڵکو مەبەست گۆڕینی ئەو بارودۆخەیە.

**جوگرافیا و پلاندانان:**

لەسەرەتادا پێویستە پێناسەیەکی جوگرافیا بکەین کە یەکێکە لە پێناسە گرنگەکانی جوگرافیا. ((جوگرافیا بریتییەلە زانستی رێکخستن و باشترکردنی شوێنی ژیان)) لەوناوەدا پلاندانان شار هەوڵدەدا تا ئاسایشی مرۆڤ دابینبکات و ژینگە بپارێزێت.. کەوابێت هەم جوگرافیا و هەم پلاندانان هەردووکیان پێوەندییان لەگەڵ مرۆڤ و کۆمەڵگا و ژینگە هەیە و پێوەندی ئەوان بناغەی ئەم دوو زانستە دادەڕێژێت، ئەڵبەت هەندێکجار ئەم دوو زانستە تێکەڵدەبن. ئەمڕۆکە لە چوارچێوەی جوگرافیادا چوار جۆر پلاندانان هەیە:

- **پلاندانانی شار**
- **پلاندانانی هەرێمی**
- **پلاندانانی ژینگە**
- **بەڕێوەبەری سامانە سروشتییەکان. (شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٦٥).**

بەپێی وتەی فریمەن، پلاندانان بنەمایەکی جوگرافیایی هەیە، جوگرافیا ئەساس و بنەمای پلاندانەرەکانە، لەبەرئەوەی پێش ئەوەی پلاندانەر کارەکەی بۆ دارشتنی شار و لادێ یا چاکسازی ناوشار و لادێکان دەستپێبکات، پێویستە بارودۆخی بەرجەوەندەکان[٦] بناسن (Freeman، ١٩٦٧: ١٣). ئێدگار رۆز[٧] بەمشێوە پلاندانان پێناسەدەکات: پلاندانان کردارێکی چەند لایەنەیە کە هەوڵی یەکدەستکردن و هاوئاهەنگکردنی شوێنە نیشتەجێبوونەکان دەدات. ئەم کارە لایەنی کۆمەڵایەتیی، ئابووری، سیاسی، دەروونناسی، ئانترۆپۆلۆجی و تەکنەلۆجیاییەکان لەخۆدەگرێت و جەخت لە رابردوو و ئێستا و داهاتوو دەکات (Rose، ١٩٨٤: ٣١). بەپێی قسەی رۆز

ئەمڕۆکە پلاندانان یەك لایەن و فیزیکالٚ نییە، بەڵکو رواڵـەتێکی مرۆیـی بەخۆیـەوە گرتـووە کـە هەموو تاکەکان لەبەرچاودەگرێت و مرۆڤ و ژینگەش هاوکات لە ناوەندی پلاندانانداندان ئـەو شـتەی کـە جوگرافینـاس و پلاندانـەرە رادیکاڵـەکان باوەڕیـان پێیـەتی، بـەڵام پلانـدانانی شـار بـەواتای ((زانست))[٨] بەشێکی زانستی نییـە، بـەڵکو بەشـێکی نێـوان زانـستەکانە[٩] کـە لـەجیاتی یاسـا نەگۆڕ و هەمیشەییەکان لەگەڵ مەسەلە گۆڕاوە کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵـە (مهـدی زادە، ١٣٨٥: ٦٤). لەم نێوەندەدا پێویستە باسی رۆڵی تیـۆرە جگرافیاییـەکان لـە گـۆڕان و گەشـەی پلانـدانان بکەین. لەڕاستیا بەهۆی مێـژووی زیـاتری جوگرافیـا لەچـاو پلانـدانانی شـار و هـەروەها بـەهۆی ناوەڕۆکی جوگرافیا و بەهۆی بارودۆخی زانستی و تیۆرە زاڵـەکانی، توانـی رۆڵێکـی بەرچـاوی لـە گەشەی پلاندانانی شار هەبێت.. بۆنموونـە، بـەهۆی دامەزرانـدنی پلانـدانانی شـار وەك بەشـێکی زانستی لە ١٩٠٧، پێویستی زۆری بەکەڵکوەرگرتن لە بیروڕای جوگرافیناسانی هاوچـەرخی خـۆی بوو. لەلایەکیشەوە بیروڕا جۆراوجۆرەکانی ئەو سەردەمە رۆڵێکی بەرچاویان لە پرۆسەی گۆڕانکاری پلانـدانانی شـار هـەبوو. لـە سـەردەمی جیـاواز بەتایبـەت لـە سـەرەتای سـەدەی بیـستەم و دەستبەکاربوونی پلاندانانی شار، بیرۆکەی جۆراوجۆری جوگرافیایی کاریگەرییان لەسەری هـەبووە و لە گەشەی ئەودا رۆڵیان هەبووە. لەڕاستیدا بەپێی بیرۆکە جۆراوجۆرە فەلسەفی و سیاسییەکانی هەر وڵاتێك وەك: لیبراڵیزم، ئانارشیزم، مارکـسیزم و.. هتـد، پلانـە شـارییەکانیش جیـاوازبوون. بەواتایـەکیتر هـەر یـەك لـەم بیرۆکانـە لـە پێکهێنـانی جۆرێکـی تایبـەت لـە فـەزا شـارییەکان رۆڵیانبووە. لە بیرۆکەی جوگرافیایی رادیکاڵ کە خۆی بەشی جۆراوجـۆری لـەخۆی گرتبـوو بەپێـی بارودۆخی کاتی هەرکامیان لە سەردەمێکا سەریانهەڵدەدا. پلاندانانی شـار وەك بەشـێکی نێـوان زانستی کە دەبێ بواری بەدیهاتنی یەکسانی کۆمەڵایەتی لـەناو کۆمەڵگـەدا ئامادەبکـا جەختـی لەسەر ئەکرا. ئەم بیرۆکانە بەشێوەیەك لەگـەڵ ئـابووری سیاسـی گرێنـەدران و بـەپێی بیروبـاوەڕی خۆیان شارەکانیان پێکنەهێنا. ئامـانجی سـەرەکی ئـەم بیرۆکانـە هـەروەك باسـکرا بەدیهێنانـی یەکسانی کۆمەڵایەتی و لابردنی نایەکسانی لەناو کۆمەڵگادا بوو. ئەوان ئەم نایەکسانییانەیان بە هـەڵقوڵاوی سیـستمی سـەرمایەداری و دەسـەڵاتی لیبراڵـیزم و چەوسـاندنەوەی زۆری هێـزی کـار (کرێکار)و سروشت دەزانی. لە ساڵەکانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ رادیکاڵەکان لـە پلانـدانانا کۆمەڵێـك تیۆری نوێیان خستەڕوو کە لەناویاندا پرۆسەی گەشـە لـە ئاسـتی هـەرێم و شـار بـەپێی شـێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بەشێوەیەکی نوێ باسکرابوو.





ئـەم بیرۆکـە (رادیکـاڵیزم) پێیوایـە لـە سیـستمی لیبراڵـدا، ئەگـەر پلانـدانان کێـشەیەك چارەسـەربکات، لەهەمانکاتـدا کێـشەیەکیتر دروسـتدەکات و بـەردەوام دژایـەتی لـەنێوان پاشکەوتکردنی تایبـەت و کـردەوەی گـشتی هەیـە (شـکۆیی، ١٣٨٢: ٢٧٥). بـەپێی بۆچـوونی رادیکاڵەکان ئەوان نەك (ریفۆرم) یا هێشتنەوە و پاراستنی بارودۆخی ئێستا (چـونکە ریفـۆرم بـە پاراستنی دەسەڵات و هێشتنەوەی دەزانن) بەڵکو لە بیری گۆڕینی ئـەو بـارودۆخ و دەسـەڵاتەدان. لەبەرئـەوەی بـارودۆخی نالـەباری ئێـستا بـوو بـە هۆکـاری سـەرەکی کێـشەکان دەزانـن و بـۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە پێویستە بارودۆخی ئێشستا بگۆڕێت. لەم بابەتدا باسـی سـێ بیرۆکـەی جوگرافیای رادیکاڵ و رۆڵـی ئـەوان لـە پلانـدانانی شـار و بنیادنـانی فـەزا شـارییەکان دەکرێت. بیرۆکەی جوگرافیای ئانارشیستی، جوگرافیای رەخنەگرانـە و فێمێنیـستی لـەو بیرۆکانـەن کـە لـە چوارچێوەی پلانـدانانی شـار هەوڵـدەدەن بـەپێی روانگـە فیکرییـەکانی خۆیـان کێـشەی شـارەکان چارەسەربکەن.

### جوگرافیای ئانارشیستی و پلاندانانی شار:

جوگرافیای رادیکاڵ بەکەڵکوەرگرتن لـە شـێوازی رەخنەگرانـەی رادیکـاڵیزم، رەخنەیەکـی توند لە جوگرافیناسە لیبراڵە ئەوروپی و ئەمریکییـەکان دەگرێـت کـە نـەیانتوانیوە بەشـێوەیەکی بنەڕەتی لە مەسەلە جوگرافیاییـەکان بکۆڵنـەوە. رەنگـە بتـوانین بڵێـین یەکـەمین دامەزرێنەرانـی جوگرافیای رادیکاڵ، جوگرافیناسانی ئانارشیست بووبن. وەك ئێلیزە رێکۆڵس و پێتر کرۆپـۆتکین. وتاری ((جوگرافیا دەبێ چۆن بێت))ی کرۆپۆتکین کە لە گۆڤارەکانی سەدەی نـۆزدەدا بڵاوبـووەوە، نیشاندەری گرنگی کۆمەڵایەتی زانستی جوگرافیا لە کۆمەڵگای مرۆییدا بـوو کـە بـە هەسـتێکی مرۆییانەوە نووسرابوو (شکۆیی، ١٣٨٢: ١٧٩). وشەی ئانارکۆز[١٠] بە مانای بێیاسـایە و وشـەی ئانارشی زۆرتر بۆ پێناسەی بێنەزمی، توندوتیـژی و پـشێوی کۆمەڵایـەتی بـەکاردێت و لەڕاسـتیا داواکاری هەڵوەشانی دەسەڵات و دژایەتی یاسایە. ئانارشیستەکان خوازیاری ئەوەن کە دەسـەڵات نـەمێنێ وەك هـەنگاوێکی ئـەرێنی بـۆ بنیادنـانی کۆمەڵگایـەکی نـوێ، کـە لەگـەڵ رێبازەکـە و سروشتدا هاوئاهەنگبێت. لە روانگەی ئەوانـەوە ئانارشـی نـەك دەسـتەواژەیەکی نـەرێنی، بەڵکـو پێـشکەوتنێکی کۆمەڵایـەتی نەرێنییـە کـە ئیجـازە بـە تـاك دەدات بێبەربەسـت و بەرتەسککردنەوەکانی دەسەڵات و یاسا بەرەوگەشە هەنگاوبنێت (بلانت و ویلس، ١٣٨٥: ٢٠١)

، بەڵام ئانارشیزم تەنیا بە مانای تێکدەر و بێیاسا و دژی نەزم نییە، بەڵکو مانایەکیتر کە هەیەتی و لێرەدا بە مانای یەکسانیخواز و پشتیوانی مافی خەڵك و چینەکانی خەڵك لەناو کۆمەڵگا شارییەکانە. ئەو شتانەی لە روانگەی ئانارشیزمەوە باشن بریتینلە:

گرنگیدانی زۆر بە شارەکان، ململانێ و پێشبڕکێی ئابووری، ریزبەندی لە کۆمەڵگا وەك دروستبوونی چینە کۆمەڵایەتییەکان (شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٠).

بە رای کرۆپۆتکین دەبێ دیاردە جوگرافیاییەکان وەك سیستمێکی ریکوپێك و هاوسەنگ باسیانلێوەبکرێت کە لەوەدا هەموو بەش و پێکهاتەکان کە سیستم دروستدەکەن، پێوەندی دوو لایەنەیان هەیە، هەروەها مرۆڤ بەشێکە لە هاوسەنگییە ژینگەییەکان. بۆیە پێویستە خەڵك لە چوارچێوەیەکی ئۆرگانیك وەك سیستمێك لێکۆڵینەوەیان لێبکرێ. لەلایەکەوە لە شوێنە جوگرافیاییەکان، نەبوونی هاوسەنگی ئیکۆلۆجیکی، نەتیجەی نەبوونی هاوسەنگی لە پێوەندییە مرۆییەکانە. سەرەڕای ئەمانە کرۆپۆتکین باوەڕی بە هاوکاری و هاوسۆزی و هاوخەمی بە رێگەچارەیەکی گونجاو بۆ گەیشتن بە ژیانێکی گونجاوی مرۆیی دەزانی (شکۆیی، ١٣٧٨: ٩٠). بەمپێیە لە ئانارشیزمی کۆمەڵایەتی و جوگرافیای ئانارشیستی، جەخت لە چەمکی عەدالەتی کۆمەڵایەتی، بەشداریکردنی چینەکانی خەڵك لە بەڕێوەبردنی وڵات، هاوکاری و یارمەتیدان و سڕینەوەی ململانێ دەکرێت. هەربۆیە دەبێ ئەم فاکتەرە لە پلاندانانی شار و جۆرەکانیدیکەی پلاندانان بەکاربێت. لەڕاستیا ئەم بیرۆکە وەك بیرۆکەیەکی رادیکاڵ و شۆڕشگێڕانە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی بنەڕەتی لە کۆمەڵگەدایە و ئەوەش یەکسانی لەنێوان هەموو چینە مرۆییەکان و سوودوەرگرتنی هەموویان لە قازانجەکانی پلاندانانی شارییە. لەڕاستیدا لەم بیرۆکەدا پلاندانان بووە بە زانستێکی مرۆیی و هاوکات هەوڵدەدات بەرژەوەندی هەموو چینەکانی کۆمەڵگە لەبەرچاوبگرێ و پلان بۆ هەموویان دابڕێژێت. لەلایەکیترەوە ئانارشیزم جەخت لە هەرێم و شارە سەربەخۆکان دەکات. لەم شارانەدا بازاڕی دراو نابێت، لە سەنتەری بازرگانی شارەکان بانك و رێکخراوەکانی بیمە، ترمیناڵەکان و تاوەرەکان لادەبرێن. شەقامەکان ریکلامی بازرگانیان تیانابێ. زەوییەکی زۆر لەناو شارەکان دەدرێ بە هۆڵی شانۆکان، کۆبوونەوە گشتییەکان یاری منداڵان و رێکخراوە کەلتورییەکان. سەنتەری شار، ئەرکی دابەشکردنی خۆڕایی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان لەئەستۆدەگرێت. لەبەرئەوەی زەوییەکانی شار، بیناکان و ئۆتۆمبیلەکان دەگەڕێتەوە بۆ حکومەت قەرەباڵغی و پیسبوونی شارەکان کەمدەبێتەوە (شکۆیی،





١٣٨٢:٢٤٤). لەڕووی ژمارەی دانیشتوانیشەوە ستانداردێك بۆ شارەکان دادەنرێ تا رێژەی دانیشتووان لە رادەیەکی تایبەت زیاترنەبێت. لەبەرئەوەی پێیانوایە رێژەی زۆری دانیشتووان لە شارەکان، دەبێتە هۆی قوڵبوونەوەی کێشەکانی شارەکان و پیسبوونی ژینگە و بێبەشبوونی خەڵك لە خۆشگوزەرانی گشتی. ئانارشیستەکان پێیانوایە شارەکانی یۆنانی کۆن، بە ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٠٠ - ٥٠٠٠ کەس، باشترین شێوەی دیموکراسی و هاوکاری دوو لایەنەیان بووە. لەلایەکیشەوە جەخت لە ریزبەندی دەکات و پێیوایە هەرکام لە شوێنە نیشتەجێبوونەکان وەك شار، شاری ناوەندی، شاری بچووك و لادێ دەتوانن رۆڵێکی نەرێنییان لە گەشەی شوێنە دەستکردەکان و گەشەی مرۆڤ و کۆمەڵگە هەبێ. بەمپێیە جۆرێك بیری یۆتۆپیایی (شاری ئیدئاڵ) لە تێڕوانییەکانی ئانارشیستەکان هەیە کە لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەوجۆرە تێڕوانینە یۆتۆپیاییە هەڵقوڵاوی بارودۆخی نالەباری کۆمەڵگە شارییەکان و ئەوانی خستووەتە بیری ئەوەی شارێکی ئیدئاڵ لە خەیاڵیانا داڕێژن کە کێشە هەمیشەییەکانی شارەکانی ئەم سەردەمەی نەبێت.
بە رای ریچارد پیت (١٩٧٥) ئانارشیزم دەتوانێ بناغەیەك بۆ تێڕوانینێکی نوێ لە تیۆری لێکۆڵینەوە و فێرکردنی جوگرافیایی بێت. جوگرافیای رادیکاڵ بەپێی نووسراوەکەی کرۆپۆتکین و لە ەرچاوگرتنی تێڕوانینی ئەو بۆ ناوەڕۆکی پڕشانازی مرۆڤ، بەگوێگرتن لە ئارەزووی ئەو بۆ پەرەپێدانی زۆرترین هاوکاری، کەڵکوەرگرتن لە شانازییە زانستییەکان بۆ نیشاندانی هەرشتێك کە بەهۆی ئەوەوە هاوکاری دوولایەنە وەك هێزی رێکخەری مێژووی داهاتوو بەرگری لێبکرێ، دەتوانێ کاربکات (بلانت و ویلس، ١٣٨٥: ٧٨). بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەم باسانەی کە کران ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئانارشیزم بەتەواوی لە بارودۆخی ئێستای ناوشارەکان بێزارە و بەتەمای گۆڕینی ئەوانە. لەم روانگەوە لە شارەکانا چ لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە و چ لە رووی ئابووری و پلاندانانی شاریشەوە کەموکوڕی هەیە و دەبێ چارەسەربکرێ و باشترین رێگە گۆڕانکاری لە سیستمی ئێستای شارەکانە و بۆ ئەو مەبەستە هاوکاری و بەشداریکردنی هەموو چینەکانی خەڵك پێویستە و دەبێ پلاندانان لەگەڵ خەڵك ئەنجامبدرێت و شارێك بنیادبنرێت ئاسوودەیی و یەکسانی کۆمەڵایەتی بۆ هەمووان بەدیبێنێت.

## جوگرافیای ڕەخنەگرانە و پلاندانانی شار:

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کە مارکس بانگی لە بێبەشان و سەرکوتکراوان و چەوسێنراوان کرد تا هۆشیاربن و مژدەی لەناوچوونی چینە دەسەلاتدارەکانی کۆمەڵگەیدا، تا ئەمڕۆ بەرهەمە فیکرییەکانی بەپێی بۆچوونی جیاواز بەشێوازی جۆراوجۆر شیکراونەتەوە. شوێنکەوتوانی بیرۆکەی فرانکفۆرتیش لەو کەسانە بوون کە بەشێوازێکی تایبەت قسەکانی مارکسیان هەڵسەنگاند، هەرچەند هەندێکیان لەگەڵ چەمکە سونەتییەکانی مارکس هاودەنگ نەبوون. بەپێی تێڕوانینی شوێنکەوتوانی بیرۆکەی فرانکفۆرت، تیۆری ڕەخنەگرانە دروستبوو بە مارکسیزمی ڕۆژئاوا یا نیئۆمارکسیزم ناودەبرێ. بیرمەدانی بیرۆکەی فرانکفۆرت، بەشێکی گرنگیان لە زانستە جۆراوجۆرە فەلسەفی - کۆمەلایەتییەکان بنیاتنا. ڕەخنە لە پۆزیتیویسم وەك تیۆری ناساندن و فەلسەفەی زانست ڕەخنە لە تەکنەلۆجیا، هۆشیاری تەکنەلۆجیك،گرنگیدان بە لایەنی کەلتور، گرنگیدان بە تاك وەك ناوەندی ئەندێشە و کردار و کاریگەری لەسەر ئازادی تاك لە سیستم، هەموویان لە میراتی بەجێماو لە ئەندامانی بەرەی یەکەمی بیرۆکەی فرانکفۆرتن (نجف زادە/١٣٨١: ٧).

یۆتۆپیا بەردەوام لە تیۆرە رادیکالە جوگرافیاییەکان بووە، لەڕاستیا لەو شتانەی بەردەوام لە تیۆرە رادیکالەکان باسیلێدەکرێت یۆتۆپیایە کە هۆکاری بیرکردنەوەی یۆتۆپیایی و بیرکردنەوە لە یۆتۆپیا نارەزایی لە بارودۆخی ئێستایە و بەردەوام باسی شارێکی گونجاو بۆ خۆشگوزرەانی زۆرتری دانیشتوان کراوە. جوگرافیای ڕەخنەگرانەش بەهۆی کاریگەری بیرۆکەی فرانکفۆرت، تیۆرییەکی ڕەخنەگرانە لەبارەی نالەباری ئێستە پێشکەشدەکات. بەهۆی باردوخێگ وەك لەناوچوونی ژینگە، هەژاری و نایەکسانی و.. هتد. زۆربەی جوگرافیناسەکان و بەتایبەت جوگرافیناسە رادیکالەکان بەهەستکردن بە بەرپرسیارێتی لە بواری جوگرافیای ڕەخنەگرانە دەستیانداوەتە هەولێکی بێوچان و بەربلاو تا لێکۆڵینەوە جوگرافیەکان نەك بەپێی جوگرافیای تەکنۆکراتیۆ، بەڵکو لەسەر بنەمای تیۆری ڕەخنەگرانە دارێژن. لەبەرئەوەی جوگرافیای تەکنۆکراتێك پێماندەڵێ شوێنی دامەزراندی نەخۆشخانە و فریاکەوتنەکان لەکام بەشەی شاربێت، تا خەڵك بەئاسانی دەستیان پێیبگات، بەلام لەبەرامبەردا جوگرافیای ڕەخنەگرانە باسلەوەدەکا کە بەگشت جۆرە بارودۆخێك و هۆکارێکی کۆمەلایەتی و ئابووری دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ





تەندروستی خۆی لەدەستبدات و تووشی نەخۆشی بێت و لەمڕووەوە دژی تیۆرییە پۆزیتیویستەکان (ئەزموونگەرییەکان) دەوەستێتەوە (شکویی،١٣٨٢: ٢٥٢). بەواتایەك لە بیرۆکەی ڕەخنەگرانەدا لە جێی بایەخدانی تەنیا بە بابەتە فیزیکاڵ و ئۆپژێکتیویەکان بەکەڵکوەرگرتن لە شێوازە ئامارییەکان بۆ چارەسەی کێشەکان هەوڵدەدات بەشی کردنەوەی بناغەیی کێشەی شارەکان، هەست بە گیروگرفتەکان بکات و شێوازی ئاماری و چۆنییەتیش هاوکات بۆ باشترکردنی ژیانی مرۆڤ بەکاربێنێت، بەمپێیە بەهۆی هاتنەناوەی ئەم روانگەیە بۆ ناو جوگرافیا، هاتووەتەناو پلاندانانی شاریش هەوڵدەدات تا فەزا و شوێنی مرۆیی و نوێ و دوور لە کێشەکانی جیهانی مۆدێرن و پیشەسازی بنیاتبنێ، لە ڕاستیدا تیۆری ڕەخنەگرانە لە پلاندانانی شاردا وەك شیکردنەوەیەکی بەهادار (نۆرماتیڤ) دەردەخات و لەگەڵ ناوەڕۆکی پلاندانان رووبەڕووە. لە هەڵسەنگاندنی ئۆبژێکتیڤ و دوورلە بایەخی بۆچوونی پۆزیتیویسم، دووریدەکات و بە هۆشیاری بە شوێن رێگای تێپەڕین لە بارودۆخی ئێستا و نەهێشتنیەتی (دانش پور، ١٣٨٢: ٤٦). بەواتایەك باشترکردن و گۆڕینی بارودۆخی ئێستا لە ئامانجەکانی جوگرافیای ڕەخنەگرانەیە. لەبەرئەوەی بارودۆخی ئێستا بەباش نازانن. بەمشێوە بیرۆکەی ڕەخنەگرانە وەك بیرۆکەیەکی یەکسانیخواز دەناسرێت. ئەم رێبازە بە ناسینی بەرژەوەندە گشتییەکان لە کۆمەڵگادا، دەسەلاتی زیاتر بەو بەشە لە کۆمەڵگا دەدات کە بێبەشن یا بێبەشکراون (هەمان سەرچاوە، ٤٨).

## جوگرافیای فێمینیستی و پلاندانانی شار:

یەکێکیدیکە لە بیرۆکە رادیکاڵەکان کە لە چوارچێوەی جوگرافیا و پلاندانانی شار لەم سالانەی دواییدا سەریهەڵداوە فێمینیزمە. جوگرافیای فێمینیستی گرنگی بەلایەنی پڕاکتیکی دەدات، پرسیاری بنچینەیی لە پەیوەندی لەگەڵ ئۆنتۆلۆجی[11]، ئێپیستێمۆلۆجی[12] میتۆدۆلۆجی[13] دەپرسێت. لە سەرەتای سالانی ١٩٨٠ و ١٩٩٠ رێگەی زانین، پرسین، لێکدانەوە و نووسینیان هێنایەبەرباس (Fuller & Kitchen، ٢٠٠٤: ٣). لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم بیرۆکە گەیشتن بە یەکسانی بەتایبەت لە روانگەی رەگەزییەوەیە. ڕەخنەی فێمێنیستەکان لەلایەنی تیۆری و کرداری پلاندانان لانیکەم پاش سالانی ١٩٧٠ لە لوتکەی باسە پێوەندیدارەکان لەگەڵ شار و پلاندانانی شاردا بوون. لە ساڵی ١٩٨٧ (گۆڤاری

لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی شاری و هەرێمی) چوارچێوەی روولەپەڕەی لێکۆڵینەوە فێمێنیستەکانی لە ژمارەیەکی تایبەتدا بنیادنا. لە ساڵانی ١٩٨٠ کتێب، شومارە تایبەتەکانی گۆڤار و نووسراوە و بابەتەکان لەناو زانکۆکانی وڵاتە ئینگلیزی زمانەکاندا بە رێژەیەکی زۆر بڵاوبووەوە. لەم نووسراواندا بەهۆی لەبیرکردنی رەگەز، گرنگینەدان بە داواکارییە ناوچەییەکان و ئاراستەی تەکنیکی - زانستی پلاندانان لە نووسراوە و پلانەکانی پێشووتردا رەخنە لە پلانەکانی پێشوو گیرا (هاکسلی، ١٣٨٧: ١٨٣). ئەم روانگە لە پلاندانانی شار، خوازیاری داڕشتن و بنیادنانی جۆرێك لە شارە کە گرنگی زیاتر بە ژنان درابێت و پێداویستییەکانی ئەوانیش لەبەرچاوگیرابێت. لەلایەکیدیکەوە گرنگی بە رۆڵی بەڕێوەبەری ژنان دەدرێت.

جوگرافیای فیمێنیستی ئاماژە بەو رێگایانە دەکات کە لەواندا رەگەزەکان و فەزا جوگرافیاییەکان بەشێوەی دوولایەن دروستدەبن و لەو رێگایانە دەکۆڵێتەوە کە لەناویاندا فەزاکان دەبن بە فەزای تایبەتی رەگەزێك و هەروەها رەگەزەکان تایبەتمەندی فەزایی دەگرن (بلانت و ویلس، ١٣٨٥: ١٦٩). لەلایەکیدیکەوە لەڕووی دەسەڵاتەوە، جوگرافیای فێمێنیستی جەخت لە ناهاوسەنگی لە پێوەندیەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگا دەکات، بەڵام نەك هەر لە پەیوەندییە باوکسالاراکاندا هەروەها لایەنی فێمێنیستی نەك هەر لێکۆڵینەوە لەو پێوەندییانە، بەڵکو ئەوان دەخاتەژێر پرسیار و گومان (Fuller & Kitchen، ٢٠٠٤: ٣). لەڕاستیدا لەناو شارەکاندا، بەرەگەزیبوونی فەزاکان و نایەکسانی ژنان و پیاوان لەبەکارهێنان و کەڵکوەرگرتن لە فەزا شارییەکان و دەسەڵاتی باوکسالارانە بووەتە هۆکاری بەرهەمهێنانی فەزای لەباری شاری بۆ پیاوان. ئەم فاکتەرە بووەتە هۆکارێك بۆ دوورخستنەوەی بەشێکی زۆر لە ژنان لە فەزا شارییەکان کە لەبەر هۆکاری وەك هەستکرن بە نەبوونی ئاسایش و نەبوونی پێداویستی پێویست بۆ ئەوان دێتەپێش. بۆیە لە ئامانجە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی فێمێنیزم لە جوگرافیا و پلاندانانی شار، لابردنی شێوازی باوك سالارانە لە پلاندانانی شارە تا بەمشێوە پێشگیریبکرێت لەوەی فەزا شارییەکان رەگەزی بن. ئەمڕۆکە بزووتنەوەی ژنان و پەرەی بەردەوام[١٤] لە جیهاندا سەلماندوویەتی کە بێ هەبوونی رۆڵی ژنان گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی بەردەوام و عادلانە مومکیننابێت، هەروەها یەکێك لە مەسەلە گرنگەکانی پلاندانانی شار ئەوەیە کە شارێکی باش و گونجاو دەبێ هەرچی زیاتر بتوانێ پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی هاووڵاتییانی خۆی دابینبکات





(مهدی زادە، ١٣٨٧: ٦). بۆیە شار یەکێکە لەو گۆڕەپانانە کە بووەتە جێی سەرنجی بزووتنەوەی ژنان و بەپێی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لە شارەکان و گەشەی شارنشینی، گرنگیدان بە ژنان لەناو شارەکان لە رابردوو زیاترە و بزووتنەوەی ژنان لە شارەکان و پلاندانانە شارییەکان بەشێوەیەکی چالاك هەوڵ بۆ باشترکردنی فەزا شارییەکان بەمەبەستی خزمەت بە ژنان دەدات. ئێستاش دەتوانین بڵێین یەکەمین رەخنەکانی فێمێنیزم دژی مۆدێرنیتە گەیشتووەتە ناو پلاندانانی شاریش (مهدی زادە، ١٣٨٧: ١٠). بۆیە هەوڵدراوە تا بوارە جۆراوجۆرەکانی شار وەك گواستنەوە، دامەزراندنی پارکینگ، داڕشتنی بینا نیشتەجێبوونەکان، یاسای دابەشکردنی ناوچە شارییەکان[١٥] دۆزینەوەی شوێنی تایبەت بۆ خزمەتگوزارییەکانی شار، گرنگی بە ژنان و پێداویستییەکانی ئەوانیش بدرێت و شاری ئارامتر بۆ ژنان دروستبکرێت. لەلایەکیدیکەوە، ئەنجامی رۆڵی تایبەت وەك بەڕێوەبردنی شارەکان لەلایەن ژنانەوە یەکێکە لەو مەسەلە گرنگانە کە بەتایبەت لە روانگەی حوکمڕانی شارەوە لەم ساڵانەی دواییدا باسکراوە. لەڕاستیدا ئەنجامدانی ئەرکی تایبەت لە بواری حوکمڕانی شار لەلایەن ژنانەوە وەك یەکێك لە ئەکتەرە گرنگەکانی ناوشارەکان لە بەدیهاتنی حوکمڕانی لەبار و باشی شار کاریگەرە (تاجدار و اکبری، ١٣٨٧: ٢٩). بەواتایەك ژنان وەك نیوەی کۆمەڵگای شار، دەبێ وەك نیوەکەیدیکەی کۆمەڵگاش گرنگیانپێبدرێت و پێداویستییە فیزیکاڵ، فەزایی، بەڕیوەبەری، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیان دابینبکرێت. لەبەرئەوەی بزووتنەوە رادیکاڵەکان لەسەر عەدالەت بنیادنراون. لە پلاندانانی شاریشدا کاتێك عەدالەت بەدیدێت کە ژنان وەکو نیوەی کۆمەڵگا مافی یەکسانیان لەگەڵ پیاواندا هەبێت لەبەکارهێنان و کەڵکوەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی شار. بیرۆکەی بەشداریکردن و بەهێزکردنی ناوچەیی و دەرفەت و رەخساندن بۆ دەربڕینی بیروڕای چینە بێبەشەکان و بەشداریکردن لە بیرۆکەی فێمێنیستەکانەوە سەرچاوەیگرتووە. ئەنجامدانی کار بەپێی جۆرێك لە سیاسەت، باوەڕ بە گۆڕانکاری پێشکەوتنخوازانە و لایەنی هاوبەش لەگەڵ شێوازی تیۆری و پراکتیکی رەخنەگرانە، پەیوەندی پێویست و حاشاهەڵنەگری تیۆری و کرداری بوو (هاکسلی، ١٣٨٧: ١٨٣).

**دەرەنجام:**

لە هەر زانستێکدا لایەنی تیۆری بە بنەمای ئەو زانستە ئەژماردەکریت. لایەنی تیۆری کۆمەڵە بیرۆکەی ریکخراو لەبارەی بابەتێکی تایبەتە و لە کاتی کاری پراکتیکی، بەرهەمی ئەندێشەیە. بەواتایەکیدیکە لایەنی تیۆری وتارێکی گشتی لەبارەی جیهانی واقیعەوەیە (دانش پور، ١٣٨٢: ٤٤). لە زانستی جوگرافیاش، لایەنی تیۆری و بیرۆکە فیکرییە جۆراوجۆرەکان بنەمای ئەم زانستەیان پێکهێناوە. ئەم تیۆرییانە هەرکامەیان گرێدراوی ئابوورییەکی سیاسی و جۆرێکی تایبەت لە پلاندانانن و لەکۆتاییدا جۆرێکی تایبەت لە فەزاکانی پێکهێناوە. بەپێی ئەو شتانەی لەم بابەتەدا باسیانلێکرا، تیۆرییە رادیکاڵەکان و بەتایبەت ئەوانەی لێرەدا باسیانلێکرا رۆڵێکی بەرچاویان لە بنیادنانی فەزا شارییەکان هەیە. بەواتایەك هەر روانگەیەك و بە رادیکاڵیزمیشەوە جۆریك پلان و ئەندێشەی هەیە و دایاندەرێژێت. لەکۆتاییدا کاریگەری جیاوازیش بەجێدەهێڵێت، بەڵام ئامانجی هەر پلانێکی شاری گەیشتنی مرۆڤ بەخۆشگوزەرانییە، هەرچەند بەتەواوی بەدینەیەت و بۆیە بیرۆکە فیکری و فەلسەفییەکان لە بیری پڕکردنەوەی بۆشایی پلانەکانیدیکەن. ئەو شتانەی لە جوگرافیای رادیکاڵ دێتەگۆڕێ وەك: ژینگەی سروشتی و مرۆیی، پیسبوون[١٦]، هەژاری، نایەکسانی و چەند فەزاییبوونی شارەکان، نایەکسانی رەگەزی، زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان و.. هتد. لەڕاستیدا ئەم بیرۆکە فیکرییانە لە بیری بەدیهێنانی ئەوجۆرە جیهانەن کە ئەو گرفتانەی





باسکران تیانەبێ و لە پلانەکانی خۆیاندا جۆرێك لە یۆتۆپیاکان لەبەرچاودەگرن کە وەك رێژەی گونجاوی دانیشتوان لەبەرچاوبگیرێت و هەڵقوڵاوی باوەڕ بە فەلسەفەیەکی ئیدئالیستییە. لەهەمانکاتدا جیهانی سەرمایەداری (کاپیتالیستی) ئایدۆلۆجیا لیبراڵ و پۆزیتیویستەکان بەپێکهێنانی نایەکسانی زیاتر لە کۆمەڵگا، پیسکردنی ژینگە و زۆربوونی هەژاری تاوانباردەکەن، هەروەها رەخنە لەو بیرۆکانە دەگرن کە خوازیاری گۆڕانی بارودۆخی ئێستا نین. لەبەرئەو رواڵەتە شۆڕشگێڕانەی بیرۆکە رادیکاڵەکان هەیانە و خوازیاری گۆڕینی بارودۆخی ئێستان. پلاندانانی شاری رادیکاڵ سەرلەنوێ پێوەندی ژینگە و مرۆڤ لەگەڵ ژینگە پێناسەدەکات و هەوڵدەدات ئەم پێوەندییە لە پێوەندی دەسەڵاتدارانەوە بۆ پێوەندییەکی یەکسان بگۆڕێت. ئەم پلاندانانە باوەڕی بە پلانی دێمۆکراتیك و بەشدارییپێکردن هەیە و باوەڕی بە بەشداری هەموو چینە مرۆییەکان لە پلاندانانایە، بەکارهێنان و بەهرەوەرگرتن لە سروشت بەشێوەیەکی کلۆنیالیستی و چەوسێنەر رەتدەکاتەوە و لەمڕووەوە دژی پیشەسازی و تەکنەلۆجیایە، بۆیە بیرۆکە و کرداری پلاندانان کە بەردەوام هەڵقوڵاوی ئابووری سیاسی و فەلسەفەی سیاسی حاکم لەسەر کۆمەڵگایە، پێکەوە جۆرێکی تایبەت لە شاکارەکان پێکدێنن کە نیشانەی ئەو بارودۆخە ئابووری و سیاسییەیە. لە خشتەی ژمارە (١) ئەو سێ بیرۆکەی لێرەدا باسکران لەگەڵ یەك بەراوردکراون. هەرچەندە ئەم بیرۆکانە لێکنزیکن بەم لێکچوون و جیاوازییەکانیان بەوشێوە دەتوانین نیشاندەین.

**خشتەی ژمارە (١) بەراود لەنێوان بەشەکانی جوگرافیای رادیکاڵ**

| جوگرافیای ئانارشیستی | جوگرافیای ڕەخنەگرانە | جوگرافیای فێمێنیستی | سەرچاوە |
|---|---|---|---|
| یەکسانیخواز، عەدالەتخواز، دژی تۆتالیتاریزمی حکومەتی، دژی ریزبەندی لە کۆمەڵگەدا | یەکسانیخواز، دادپەروەریخواز، دژی ریزبەندی | یەکسانیخواز، عەدالەتخواز، دژی دەسەڵاتی پیاو سالارانە لەناو شارەکان و لە پلانە شارییەکاندا | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٢ – ٢٦٠ و مهدیزادە، ١٣٨٧: ٧ |
| لامەرکەزی، پشتیوانییەگەر | بەشدراریکردنی چینەکانی خەڵك لە پلاندانان | دیمۆکراتیك - بەشدراریکردنی چینەکانی خەڵك | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٢ و ٢٥٨ |
| بڕوای بە سیاسەتی پۆستمۆدێرنیزم هەیە | بڕوای بە سیاسەتی پۆستمۆدێرنیزم هەیە | بڕوای بە سیاسەتی پۆستمۆدێرنیزم هەیە | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٣ |
| بەرەو فەلسەفەی ئیدئالیزم دەڕوات | بەرەو فەلسەفەی ئیدئالیزم دەڕوات | بەرەو فەلسەفەی ئیدئالیزم دەڕوات | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٣ |
| تەنیا لەسەر بنەمای ئابووری چینەکان پێناسە ناکا، بەڵکو بنەمای نەتەوە-رەگەزیشی پێدەدا | تەنیا لەسەر بنەمای ئابووری چینەکان پێناسەناکا | تەنیا لەسەر بنەمای ئابووری چینەکان پێناسە ناکا بەڵکو لەسەر بنەمای رەگەزیش (نێر و مێ) پێناسەیدەکا | شکۆیی، ١٣٨٢ و بلانت و ویلس ١٣٨٥: ١٧٠ |
| خوازیاری گۆڕانی بارودۆخی ئێستایە | خوازیاری گۆڕانی بارودۆخی ئێستایە | خوازیاری گۆڕانی بارودۆخی ئێستایە | هاروی، ١٣٧٦: ٣٧ |
| دژی ئەزموونگەرییە (پۆزیتیویسم) | دژی ئەزموونگەرییە (پۆزیتیویسم) | دژی ئەزموونگەرییە (پۆزیتیویسم) | Fuller & Kitchen، ٢٠٠٤: ٢٠ |
| بڕوای بە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی ناو شارەکان هەیە | بڕوای بە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی ناو شارەکان هەیە | بڕوای بە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی ناو شارەکان هەیە | بلانت و ویلس ١٣٨٥ |
| داڕشتنی فەزا شارییەکان بەپێی پێداویستی چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی شار | داڕشتنی فەزا شارییەکان بەپێی پێداویستی چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی شار | داڕشتنی فەزا شارییەکان بەپێی پێداویستی چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی شار | شکۆیی، ١٣٨٢: و مهدیزادە، ١٣٨٧: ٧ |
| خاوەنداریێتی گشتی زەوی و بیناکانی شار (دەوڵەتی) | خاوەنداریێتی گشتی زەوی و بیناکانی شار (دەوڵەتی) | خاوەنداریێتی گشتی زەوی و بیناکانی شار (دەوڵەتی) | شکۆیی ٢٤٠ - ٢٦٠ |





| | | | |
|---|---|---|---|
| لابردنی بینا بەرز و تاوەرەکان و ناوەندە ئابوورییەکان لە سەنتەری شارەکان پەیڕەوکردنی زۆنینگ (Zoning) | بنیادنانی فەزا گشتییەکان بەپێی پێداویستی خەڵك | دروستکردنی فەزا گشتییەکان تایبەت بە ژنان بەمەبەستی بردنەسەری ئاستی ئاسایشی ژنان لە شارەکان و پەیڕەوکردنی سیاسەتی زۆنینگ بەپێی پێداویستی ژنان | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٤ و مهدیزادە، ١٣٨٧: ٨ |
| جەختکردن لەسەر فەزای کراوە و ئازاد و پێشگرتن لە چڕی زۆری بینا لەناو شارەکان | جەختکردن لەسەر فەزای کراوە و ئازاد و پێشگرتن لە چڕی زۆری بینا لەناو شارەکان | جەختکردن لەسەر فەزای کراوە و ئازاد و پێشگرتن لە چڕی زۆری بینا لەناو شارەکان | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٢ - ٢٦٠ |
| دژی گرنگیدانی زۆر بە شارەکان | بنەمابوونی شار لە پلاندانان | بنەمابوونی شار لە پلاندانان | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٢ |
| هەوڵدان بۆ پاراستنی ژینگە | هەوڵدان بۆ پاراستنی ژینگە | هەوڵدان بۆ پاراستنی ژینگە | شکۆیی، ١٣٨٢: ٢٤٢ |
| کورتکردنی دەستی دەوڵەت لە پلاندانان | کۆنترۆڵی دەوڵەت لە پلاندانان | لابردن و سڕینەوەی لایەنی باوکسالارانە و دەسەڵاتدارانە لە پلاندانانداندا | شکۆیی، ١٣٨٢: و مهدیزادە، ١٣٨٧: ١٠ |
| گرنگیدان بە چینی هەژار و بێبەش لە پلاندانان | گرنگیدان بە چینی هەژار و بێبەش لە پلاندانان | گرنگیدان بە ژنان لە پلاندانان | شکۆیی، ١٣٨٢: و مهدیزادە، ١٣٨٧: ١٠ |
| جەختکردن و گرنگیدان بە شاری بچوك | جەختکردن لەسەر شاری بەردەوام[١٧] و لەسەر بنەمای عەدالەت | جەختکردن لەسەر شاری بەردەوام و ئەمن بۆ ژنان | شکۆیی، ١٣٨٢: و مهدیزادە، ١٣٨٧: |
| سەرنجدان بە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان و شێوە فەزاییەکان لە شاردا | سەرنجدان بە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان و شێوە فەزاییەکان لە شاردا | سەرنجدان بە رۆڵی ژنان لە بەڕێوەبردنی شارەکان | شکۆیی، ١٣٨٢: ٩٠ |
| پەرەدانی گواستنەوەی گشتی بۆ پشتیوانی لە چینی هەژار و کەمکردنی تێچوونی ئابووری و ژینگەیی گواستنەوە | پەرەدانی گواستنەوەی گشتی بۆ پشتیوانی لە چینی هەژار و کەمکردنی تێچوونی ئابووری و ژینگەیی گواستنەوە | پەرەدانی گواستنەوەی گشتی بۆ پشتیوانی لە ژنان و بردنەسەری ئاستی ئاسایش لە کاتی سەفەرەکانی ناوشار | Fuller & Kitchen ، ٢٠٠٤: ٢٠ |

***) ئەم بابەتە پێشتر لە کۆنفرانسی جوگرافیزانانی ئێران لە زانکۆی بەهەشتی تاران لە ١٨ ی سیپتێمبەری ٢٠١١دا بە هاوکاری د. حسێن حاتەمی نژاد، مامۆستای بەشی جوگرافیای زانکۆی تاران بڵاوبووەتەوە و ئێستا کراوەتە کوردی.** ahmadi_2009@live.com

**فەرهەنگ**

١ Elise recluse.
٢ - Peter kropotkin
٣ - Jean Brunhe
٤ - Antipode
٥ - Diane Perrsans
٦ - Landscape
٧ - Edgar rose
٨ - Science
٩ - Interdisciplinary knowledge
١٠ - Anarchos
١١ - Ontology**بابەتێکە لە خوێندنی فەلسەفە کە پێوەندی لەگەڵ سروشتی ژیان هەیە**
١٢ - Epistemology**زانستی بەرهەمهێنانی مەعریفە**
١٣ - Methodology**بەکارهێنانی شێواز و میتۆدی تایبەت لە کاتی لێکۆڵینەوەی شتێك یا ئە نجامی کارێك**
١٤- Sustainable development
١٥- Zoning
١٦- Pollution
١٧- Sustainable

**سەرچاوەکان**


١.بلانت، الیسون و جین ویلز: دگراندیشی در فلسفه جغرافیا، ترجمه حسین حاتمی نژاد، انتشارات دانشگاه تهران، ١٣٨٥.

٢. تاجدار، وحید و مصطفی اکبری: زنان و حکمروایی خوب شهر، فصلنامه جستارهای شهرسازی، سال هفتم شماره ٢٤ - ٢٥، ١٣٨٧.

٣. جانستون، ار، جی، تیلور پیتر و مایکل جی واتس: جغرافیاهای تحول جهانی، ترجمه نسرین نوریان، تهران







انتشارات دوره عالی جنگ، ١٣٨٢.

٤.دانش پور زهره: درامدی بر پایه های نظری و گونه بندی نظریه های برنامه ریزی باتأکید ویژه بر برنامه ریزی شهری، نشریه هنرهای زیبا، دانشگاه هنرهای زیبا دانشگاه تهران شماره ١٥، ١٣٨٢ ص ٤٢- ٥٧.

٥. شکویی، حسین: اندیشه های نو در فلسفه جغرافیا، جلد اول انتشارات گیتاشناسی، تهران ١٣٧٨.

٦. شکویی، حسین: اندیشه های نو در فلسفه جغرافیا، جلد دوم انتشارات گیتاشناسی، تهران ١٣٨٢.

٧. مهدیزاده، جواد: در جستجوی شهرهای انسانی تر، فصلنامه جستارهای شهرسازی سال هفتم، شماره ٢٤ - ٢٥، ١٣٨٧.

٨. مهدیزاده، جواد: برناه ریزی راهبردی توسعه شهری، تهران معاونت معماری و شهرسازی، ١٣٨٥.

٩. نجف زاده، رحا: مارکسیسم غربی و مکتب فرانکفورت، تهران، نشر قصیده سرا، ١٣٨١.

١٠. هاروی دیوید: شهری شدن سرمایه، چرخه دوم انباشت سرمایه در تولید محیگ مصنوع، ترجمه عارف اقوامی مقدم، انتشارات اختران، تهران ١٣٨٧.

١١. هاروی دیوید: عدالتی اجتماعی و شهر، ترجمه فرخ حسامیان، محمد رحا حائری و بهروز منادی زاده، شرکت پردازش و برناه ریزی شهری تهران، ١٣٧٩.

١٢. هاکسلی، مارگو: امریت گرایی، جنسیت، برنامه ریزی، چشم انداز فوکویی، (کتاب اینده برنامه ریزی ترجمه عار اقوامی مقدم، انتشارات ادرخش، ١٣٨٧.

١٣- Duncan Fuller and Rob kitchin,(٢٠٠٤), Radical theory/ critical praxis: Academic geography beyond the academy, available At: www.praxis-epress.org/rtcp/dfrk.pdf

١٤- Edgar Rose, (١٩٨٤), Philosophy and purpose in planning. in the spirit and purpose of planning. Huchinson

١٥- Richard Peet, (١٩٩٧), Social theory, postmodernism and the critique development. In space and social theory , edited by George Banko and Uts strohmayer, Blackwell

١٦- Freeman, T.W, (١٩٦٧), Geography and planning, Hutchinson University Library, U.S.A

# پرسە ئەزەلییەکانی فەلسەفە و وەڵامە جۆربەجۆرەکان

حەمە غەریب حەمە تۆفیق

چۆن دەست بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفە بکرێت؟ لە مێژووی فەلسەفەدا چەندین دیدگای هەمەجۆر و چەندین ڕێچکە و ڕێبازی فەلسەفی هەن کە هەموویان بە شوێن لێکدانەوەی ئەم جیهانەوەن، هەموویان دەیانەوێت وەڵامی راستودروست بۆ کێشە فەلسەفییەکان پێشکەشبکەن.. وەك دەبینین ڕێبازە مادیگەراکان بەهەموو لقەکانیەوە، ئایدیالستییەکان بەهەموو روانگە جیاجیاکانیەوە، فەلسەفەی رەخنەگرا و فەلسەفەی گەشەسەندوو فەلسەفەی ئەقڵگرایی و هتد.. وایانکردووە فەلسەفە وەکی دەریایەکی بێبنی لێبێت و هەر کەسێك شارەزا و مەلەوان نەبێت نەوێرێت خۆی لێنزیکبکاتەوە، ئەم هەموو روانگە فەلسەفییە دژەیەکترە، وایانکردووە وەڵامی گرفتە بنەڕەتییەکانی فیکر و فەلسەفە، چەندانجار ئاڵۆزتربن، چەندانجار گرفتە فەلسەفییەکان زیادبن و راستییەکان لەونێوانەدا حەشاربن، بەڵام دەکرێت ئەو هەموو وێنا و فەلسەفانە لە دوو روانگەی سەرەکیدا کۆبکەینەوە کە ئەوانیش دوو روانگەی جیاواز و دوو دیدگای دژەیەکترن و هەریەکەیان بە جۆرێکی زۆر جیاواز، وەڵامی گرفتە فەلسەفییەکان دەداتەوە. ئەم دوو فەلسەفەیە یەکێکیان ئایدیالیستی Idealism و ئەویتریشیان فەلسەفەی ماتریالیستییە Materialism "جۆرج پۆلیتزەر" وەك گەورە بیریارێکی فەلسەفەی ماتریالیستی، ئەم دوو روانگەی ناو ناوە وێناکردنی زانستانە و وێناکردنی نازانستانەی جیهان، دیاریشە مەبەستی لە یەکەمیان فەلسەفەی ماتریالیزمییە و دووەمیش فەلسەفەی ئایدیالیزمییە.

دواتر ئاماژە بەئەوەدەکات کە کاتێك فەلسەفەکاران دەستیانداوەتە راڤەکردنی جیهان و سروشت و مرۆڤ و هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەری مرۆڤن، دەبوو شتەکان لەیەکدی جیابکەنەوە، ئێمەش دەتوانین ئەم جیاوازیکردنە بکەین لەنێوان شتەکاندا، ئەوەتا هەندێکیان مادەن و دەکرێت بیانبینین و دەستیانلێوەبدەین، هەندێکیشیان رووداوگەل و وەقائیعن و هەرگیز نەدەتوانین بیانبینین، نەدەشتوانین دەستیانلێوەبدەین، نەدەشتوانین بە هەرجۆرە پێوەرێك مامەڵەیان لەتەکدا بکەین، ئەمانەش وەکی بیر و فیکری خۆمان. ئیدی ئێمە شتەکان بەجۆرە





دابەشدەکەین کە لەلایەك شتە مادییەکان هەن، لەلایەکیدیکەشەوە شتە نامادییەکان بوونیان هەیە کە جیهانی رۆح و فیکرن. بەمجۆرە فەلسەفەکاران خۆیان لەبەردەم کایەی رۆح و کایەی مادەدا بینیوەتەوە،.

### مادە چییە و رۆح چییە؟

بینیمان شتەکان دەبنە دوو بەشەوە، لایەك شتە مادییەکان ولایەکیش شتە نامادییەکانە، بەڵام دەبێ ئەوە روونبکرێتەوە کە ئەم جیاوازییە لە دیدگاکان و لە روانگە فەلسەفییەکاندا بە گۆتە و وشەگەلی جیاواز تەعبیریان لێکراوە. هەرچۆن دەکرێت قسەلە سەر رۆح بکرێت، بەهەمانجۆر دەکرێت قسەلەسەر فیکریش بکرێت، قسەلەسەر ئاگایی و وشیاری و بیرۆکەکان بکرێت، باس لە دەروون بکرێت، هەرچۆن کاتێکیش باس لە سروشت و جیهان و زەمین و بوون – وجود- دەکرێت ئەوا لەبەردەم کایەی مادەداین و قسەلەسەر مادە دەکەین. ئەوەدەمەش کە "ئینگلز " لە کتێبی: (لۆدڤیگ فیۆرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی) **(لودفیك فیورباخ ونهایة الفلسفة الكلاسیكیة الالمانیة)** باسی لە بوون و فیکر کردووە ئەوا مەبەستی لە بوون مادە بووە و مەبەستیشی لە فیکر رۆح بووە[١].


**فیورباخ**

بۆ پێناسەکردنی فیکر یان رۆح، یان بوون - وجود - یان مادە دەڵێین: فیکر ئەوەیە کە لەسەر شتەکان گەڵاڵەدەبێت، هەندێك لەو بیرۆکانە لە هەستەکانمانەوە پێماندەگەن و پەیوەستن بە بابەتە مادییەکانەوە، هەندێکیشیان وەکی بیرۆکەی خوا و فەلسەفە و ناکۆتایی و خودی فیکر، هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتی مادییانەوە نییە، ئەوەی بنەڕەتییە لێرەدا ئەوەیە کە ئێمە بیروڕا و فیکر و هەستمان هەیە دەربارەی شتەکان، چونکە ئێمە شتەکان دەبینین و دەستیان لێوەدەدەین. مادە یان بوون - وجود- ئەوشتەیە کە لێماندەردەکەوێت و لە رێگەی هەستەکانمانەوە یان دەرکپێکردنەکانمانەوە بۆمان ئاشکرادەبن، مادە و بوون (المادە والوجود) بەگشتی ئەوشتانەن کە دەوریانداوین و ئێمە بە جیهانی دەرەکی ناوزەدیاندەکەین. بۆنموونە دەڵێین کاغەزەکەی من سپییە، ئەم مەعریفە و ناسینە کە کاغەزەکەی من سپییە، بیرۆکەیە، ئەم فیکرەش لە رێگەی هەستەوە دەستکەوتووە، بەڵام خودی کاغەزەکە مادەیە و هیچیتر.

بۆیە کاتێك فەلسەفەکاران باسی پەیوەندی نێوان فیکر و مادەیان کردووە  یان باسی نێوانی مادە و رۆحیان کردووە، یان قسەیان لەسەر وشیاریی و مێشك کردووە، ئەوا قسەیان لەسەر هەمان پرسیار کردووە کە داخۆ کامیان لەپێش ئەویدیکەوە بووە؟ مادە یان رۆح ؟ بوون یان فیکر؟ ئەم دووە کامیان لەپێش ئەویترەوەیە؟ ئەمە پرسیاری بنەڕەتییە لە فەلسەفەدا. دیسان مەسەلەی بنەڕەتی لە فەلسەفەدا چییە؟ هەریەکێك لە ئێمە ئەم پرسیارەی دێت بەزەیندا کە داخۆ چارەنووسی چییە پاش مردنی؟ یان ئەم جیهانە لەکوێوە هاتووە؟ ئەمەش ئاسان نییە بڕوا بە بوونی ئەزەلییانەی ئەم گەردوونە بهێنی، زۆرجار دەبینی ئەم مەیلە هەیە کە لە ساتەوەختێکدا  هیچ شتێك بوونی نەبووە.

لەبەرئەمەشە کە ئاسانە رێنماییەکانی دین قبوڵبکرێت، چەندین رێگەش هەیە بۆ پێشنیارکردنی پرسیارەکان، پرسیارەکان وەکی ئەوەی کە بپرسیت: چ جۆرە پەیوەندییەك هەیە لەنێوان ئیرادە و توانادا، ئیرادەلێرەدا رۆح یان فیکرە و تواناش بریتییەلە ئەوشتەی کە ئیمکانە و دەکرێت ببێت کە بێگومان ئیمکان بوون یاخود مادەیە. دەکرێت پرسیارەکە ساناتربکرێت، پرسیاری پەیوەندی رۆح و مادە بکرێت، وەڵامەکانیش جیاوازدەبن و "جۆرج پۆلیتزەر" وەك مادیگەرایەك، گوتویەتی هەموو وەڵامەکان دەکرێن بە دوو وەڵام یان دوو روانگە کە یەکێکیان روانگەی زانستانە و ئەویدیکەشیان وەڵامی نازانستانەیە[٢].


جۆرج پۆلیتزەر

جرج پۆلیتزەر وەك فەلسەفەکارێکی مادیگەرا و لە روانگەی مادییانەوە روونکردنەوەیەکی داوە لەسەر هەڵوێستی فەلسەفەکاران دەربارەی ئەو پرسانە کە لەدێرزەمانەوە بیر و هۆشی مرۆڤی داگرتووەتەوە. ئەم دەڵێ: نەشارەزایی بیریارانی کۆن دەربارەی سروشت و جیهان  و خۆشیان و پشتبەستنیان بە ئامێرە سەرەتاییەکان لەوەدا کە لێکۆڵینەوەی جیهانی پێبکەن، ئەمانە وایکردووەکە هەر شتێك بووەتە مایەی سەرسوڕمانیان و تووشی سەرسامی کردوون





یەکسەرە پەنایان بۆ هۆیەکی نادیار بردووە، پەنایان بۆ کائینەکانی پشتەسروشت بردووە. بەهۆی خەیاڵلێدانیانەوە گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامەی کە مرۆڤ پێکهاتەکەی لە دوو شتە یەکێکیان جەستە و ئەویتریش نەفس یان رۆحە و هەموو ئەو بیرۆکە و هەستانەی مرۆڤ بەهۆی رۆحەوەیە، بەهۆی ئەو دەروونەوەیە کە لەنێو جەستەی هەر مرۆڤێکدایە و دوای مردن لێیجیادەبێتەوە. ئیدی بەمجۆرە بیرۆکەی نەمری رۆح سەریهەڵداوە، بیرۆکەی ژیانێکیدیکەش لەدوای ئەم ژیانە هاتووەتەئاراوە کە لە دەرەوەی مادەوەیە، هەروەها لاوازی مرۆڤەکان و ڕاڕایی و دوودڵبوونیان لەبەردەم هێزە سروشتییەکاندا، لەبەرامبەر دیاردەکاندا ئەوانەی کە نەیانتوانیوە لێیان حاڵیبن و زیاتریش بوونەتە هۆکاری پەرتبوونی زەینیان، وەکی زاووزێکردن و پەیدابوون و گەردەلول و لافاو و.. هتد، ئەمانە هەموو فاکتەر بوون بۆ ئەوەی کە بیرۆکەی بوونی هێزگەلێکی بەتواناتر لە دەرەوەی سروشت گەڵاڵەببێت لایان. هێزگەلێك کە دەتوانێ لە خراپە و زیانەکانی ئەو دیاردە سروشتییانە مرۆڤەکان بپارێزێت.

ئەو هێزانەش لە بەرگی خواوەند یان رۆحەکان، چاکەخواز یان شەڕەنگێزدا بوون، هەروەها بڕوایان بە فرەخوداییش هێناوە یان بڕوایان بە کائینگەلێك هێناوە کە لە مرۆڤ بە هێزتر و بە توانا و دەسەڵاتتربێت، بەڵام وێنای ئەوانەشیان هەروەکی مرۆڤ یان گیاندارانیتر یان (تەنە) مادییەکان کێشاوە، بیرۆکەی دەروون یان خواوەندەکان و هەروەها تاکەخودایەك بەم درەنگانە هاتووەتە شوێنی ئەو بیرۆکانەی پێشەوە[٣].

دواتر جۆرج پۆلیتزەر ئاماژە بەئەوەدەکات کە لای فەلسەفەکاران بیرۆکەی ئەفراندنی جیهان هاتووەتەئاراوە کە پرسەکەش ئەمەیە ئایا خوا ئەم جیهانەی خولقاندووە یان جیهان هەر لە ئەزەلدا بۆخۆی هەبووە؟ لێرەدا فەلسەفەکاران دەبنە دوو بڕەوەو دوو سەربازگەی دژەیەکتر پێکدەهێنن کە یەکێکیان سەربازگەی ئایدیالیزمییە و لەم فەلسەفەیەدا بەشێکیان پێیانوایە خودا ئەم جیهانەی خولقاندووە لەکاتێکدا سەربازەگەکەیدیکە سەربازگەی ماتریالیزمەکانە و بەپێچەوانەی ئەم روانگەی ئایدیالیزمییەوە پێیانوایە جیهان هەربووە و ئەزەلییە[٤].

دیدگاکانی جۆرج پۆلیتزەر لە چوارچێوەی فەلسەفەی ماتریالیستی دیالیکتیکی تێناپەڕێت، بۆیە هەر لەبنەڕەتدا ئەم فەلسەفەیە کەوتووەتە ژێر پرسیارەوە لە سەردەمی ئێستادا لە دۆخێکی لاوازدایە و هەڵگرانیشی بەشەرمەوە باسیلێوەدەکەن، ئەوەی کە پۆلیتزەر پێیوایە، ماتریالیزمی زانستانەیە و ئایدیالیزمیش نازانستانەیە، بڕیارێکی پێشوەختە و فەلسەفەیەك لە

ریشووە هەڵدەتەکێنێت. لەکاتێکدا ئەو فەلسەفەی کە ئەو پشتی پێبەستووە بۆ هەڵتەکاندنی ئایدیالیزمییەت بۆخۆی لەمێژە لە قەیرانی بەکۆتاگەیشتندا دەیگوزەرێنێت . نابێت وا لە فەسەفە تێبگەین کە پرۆسیسی تێڕامانە لە رەها، بەڵکو فەلسەفە بیرکردنەوەیە لە کایە هەمەچەشن و هەمەجۆرەکانی تیۆرییایی و پراکتیکانەش، واتە لەلایەکەوە باسوخواسە لەسەر رەها و لەسەر ئەبیستراك abestract(المجرد)، بەڵام لەلایەکیتریشەوە پێڕەوێکی تەواوەتییە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی و لەهەموو لایەنە بچووك و بەشەکییەکانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسیشدا دەخالەتدەکات، گەر وانەبێت ئەوا لەکات فێڕۆدان بەولاوە هیچیتر نابێت.

فەلسەفە بیرۆکەیەکە خۆی بەرەو وشیاری پەلکێشدەکات، بیرێکە بەخۆیەوە سەرقاڵە، فەلسەفەش بەهەمانشێوەی زانست پەرەسەندنی بیرێکی ئازادە، فەلسەفە ئەو شێوە مەعریفەیە کە کۆسەکان ناتوانن پێشپێبگرن و تەگەرەی بخەنەپێشدەم، بەڵکو هەر بەردەوامدەبێت لە چالاکییەکانیدا، فەلسەفە سیستەمە ststem سیستەمێکی سەراپاگیری و هەمەکییانەشە. دەشێت گرفتێکی لەمێژینە هەبێت کە وەڵامێکی پڕاوپڕی نەدرابێتەوە یان وەڵامێکی سەرانسەری وا پێشنیارنەکرابێت کە هەوادارانی فەلسەفە و کۆی خەڵکیش بەدڵیانبێت، ئەمەش ئەو گرفتەیە کە گوتراوە کە مێژووی دوورودرێژی فەلسەفە وەکی زنجیرەیەك کاتیگۆریا و زنجیرەیەك بابەتی پرشوبڵاو و نارێکخراو دێتەئەژمار کە ئەمە لە ئەودوای لقەکانیدیکەی زانست و مەعریفەدا نییە، راستییەکەی ئەمەیە وەکی "هیگڵ " بۆیچووە و ئەم گۆتە و وێناکردنە بەمجۆرە دەرەنجامی هەمە چەشنەیی و زۆرێتی فەلسەفەکان و بیروڕایە دژەیەکەکانی نێو رێبازەکانی فەلسەفەیە.

ئەگەر وادابنێین مێژووی فەلسەفە لای هەندێك وەکی مۆزەخانەیەکی لێهاتووە بۆ ژمارەیەك بیروڕای هەمەجۆرە، ئەمەش بووەتە فاکتەرێکی بێزارکەر بۆ مرۆڤ و هیچ سوودێکی لێوەنابینێت، وەك هیگڵ دەڵێ گەر ئەمە بەمجۆرە بێت، ئەوا هیچ لەوە زیاتر هەیە کە مرۆڤ خۆی ببەستێتەوە بە کۆمەڵێك راوبۆچوونی نارێك و رووت، هیچ لەمە بێزارکەر و نارەحەتتر هەیە، هیچ لەوە نارەحەتتر هەیە تۆ خۆت لەبەردەم کۆمەڵێك بیروبۆچوونی لاوازدا ببینیتەوە. ئێمە لە روانگەی فەلسەفییانەوە دەمانەوێت لە دەورانی یەکەمینی فەلسەفەدا وەڵامی پرسە ئەزەلییەکان وەربگرین بەهەمانشێوەی کە لە سەردەمی ئیستاماندا هەیە، ئەمە وێناکردنێکی تاکوڕادەیەك مەحاڵ و نەشیاوە وەکی هیگڵ دەڵێ، فەلسەفە لە بیرۆکە هەمەکی و پەتییەکان و ئەبیستراکەکان








(المجرد) و کاتیگۆرەکانەوە یەکەمین هەنگاوی هەڵگرتووە، بەڵام لێرەدا یەك گرفت هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەمەکییەت و ئەبیستراك و هەروەها کاتیگۆر تەنها لە ئاستی تێگەیشتنی هەڵبژاردەی کۆمەڵگەدان یان دەکرێت ئەمانە لە ژیانی رۆژانە و تاکەکەسیدا نموونەگەلیان هەبێت و هەموومان لەنێو ئەو ژەمکانەدا بژین بەبێ ئەوە هەستبکەین ئەو تێڕوانینەی کە پێیوایە فەلسەفە بەگشتی تەنها بە شوێن پەتییەکاندا دەگەڕێت و لەگەڵ شتە گشتییە بەتاڵەکاندایە.

ئەمەش بەمانای ئەوەدێت کە کەشفکردنی هەستییانە و وشیارانەی خودی ئەزموون و تەنانەت غەریزەکانیش کە سروشتین و هەست و ژیانی رۆژانەی هەریەکێکمان پێکدەهێنن، ئەمانە دەکەونە گۆڕەپانی بەرامبەر فەلسەفە، چونکە وەك دیارە فەلسەفە بەمتێڕوانینە هیچ مانا و واتایەکی دیاریکراو نابەخشێت، لەکاتێکدا ئەو دۆخی هەستکردن و ئەزمونکردنانەی مرۆڤ شتگەلێکی دیاریکراو و عەینین، ئەمەش وەك ئەوەیە دووشتی دژەیەك بەیەکتر بگەیەنین، بەڵام دەبێت جۆرێکیدیکە سەرنج لە فەلسەفە بدەین، ئەو رایەی پێشەوە لەگەڵ گەورەیی فەلسەفەدا وێکنایەتەوە، چونکە فەلسەفە هاوتای شتە بەتاڵەکان نییە. هیگڵ ئاماژە بەئەوە دەکات کە پێویستە وا دیقەتبدەین کە هەردوو تێرمی عەینی و پەتێتی(المجرد) هەردووکیان وەکی یەك دەلالەتیان هەیە و هیچیان بەتاڵنین، تەنها ئەوەندەیە کاتێ دەگوترێت پەتی ئەوا مەبەست ئەوەیە




کە مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا کایە و لایەنێك یان توخمێك هەڵدەبژێرێت و ئیدی کاری بە ئەودوای توخمەکانیدیکەوە نییە، هیگڵ لە گەڵ سپینۆزا Spinoza هاوڕایە کە هەردووکیان پێیانوایە بیرە پەتییەکان ئەو بیرانەن کە لەناو توێیە گونجاوەکەی خۆیان دوورەپەرێزن. ئیدی دەگوترێت خەڵکی لە ژیانی رۆژانەیاندا لە گەورەترین جۆری پەتییەتدا دەژین، چونکە لەناو ئەو هەموو جۆر و فرەڕەهەندەدا تەنها لەسەر یەکلایەن دەکەنەوە. لای هیگڵ عەینی

هەستەکی یان دیاریکراو نییە، وەك ئەوەی کەواتای وشەکە دەیگەیەنێ، بەڵکو لای هیگڵ ئەوەیە کە کۆمەڵە رەگەزێکی جۆراوجۆر دەگرێتەخۆی و لەناوەڕۆکەکەشیدا دەوڵەمەندە. هەر لەبەرئەمەشە کە رێبازە بەراییەکانی لە فەلسەفەدا گوزارشت لە پەتیەتی دەکەن، بەڵام رێبازە دواییەکانی بیرێکی عەینی دەنوێنێت کە بیرە بنچینەییەکانی ناو رێبازە پێشووەکانی گرتووەتەخۆی.

هیگڵ دەڵێت: فەلسەفە دەکەوێتە ناو چوارچێوەی بیرەوە، هەر لەبەرئەمەشە دەبێت لە هەمەکییەکان بگەڕێت، لەوانەیە ناوەڕۆکەکەی پەتیبێت، بەڵام ئەمە تەنها لەڕووی شێوەوە وایە، چونکە بیرۆکە لە خۆیدا عەینییە، هەروەها گوزارشتیش لەیەکبوونی نێوان دیاریکردنە هەمەچەشنەکان دەکات، ئالێرەشەوەیە کە ناسینی ئەقڵ لە ناسینی تێگەیشتن جیادەکرێتەوە.

لێرەشەوە کە ئەرکی فەلسەفە بەوەی کە زانینێکی ئەقڵی و دژبەتێگەیشتنە لەوەدا دەبینین، ئەوەمان بۆ روونبکاتەوە کە حەقیقەت یان بیرۆکە لە کۆمەڵە گشتییەك پێکنایەت، بەڵکو خۆی هەمەکییە و لە هەناوی خۆیشیدا بەشەکی دەگرێتەوە و لەو تاکانەش جیانابێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کاتێك حەقیقەت پەتیبوو ئەوا هەردەبێت ناڕاستەقینەبێت، واتە بەتاڵبێت. ئەقڵی مرۆیی تەندروستیش بەرەو ئەوە دەڕوات کە عەینییە، بەڵام تێگەیشتن لە سەرەتای رێگاکەدا دەردەکەوێت و پەتیدەبێت و جەختیش لەسەر پرۆسەکانی پەتیەتی دەکاتەوە، کە لەڕاستیدا ئەرکە سەرەکییەکەی جیاکارییە لەنێوان لایەتەکانی شتێك و جەختکردنەوە لەسەر هەر لایەك لە لاکانی بەپێی خۆی و دانانی بە توخمێکی سەربەخۆ لە توخمەکانیتر کە بەبێ ئەو هیچ بوونێکیان نییە، گەر زیاتر سەرنجبدەین و لێیوردببینەوە ئەوا دەردەکەوێت کە کایە و پرۆسیسی پەتییەتی بۆ راستکردنەوەی پێویستی بەپشتیوانیکردنی ئەقڵە یان لانیکەم لە رێگەی بیری تیۆرییەوە پشتڕاستبکرێتەوە، هەر ئەم بیرە تیۆرییەشە کە دەبێتە زانێکی فەلسەفییانە. لێرەوە دەبینین فەلسەفە زیاتر لە ئەودوای کایەکانی زانین و مەعریفە رووبەڕووی پەتییەتی و ئەبیستراکبوون دەبێتەوە هەروەك رووبەڕووی حاڵەتی دوورەپەرێزبوون و تاکلایەنیش دەبێتەوە بەلامەکی فەلسەفە رێنوێنی مرۆڤ دەکات بەرەو عەینی[٥].

لەڕاستیدا فەلسەفە یەکەمینجار واخۆی دەنوێنێت کە پەتی و گشتی و ناڕاستەوخۆیە کە چاوەڕانی ئەوەی لێنەکرێت بەرەوپێشەوە هەنگاوهەڵبگرێت و پەرەبسێتێت، بەڵام ئەو فەلسەفەی یەکەم لەڕووی دیاریکردنەکانەوە هەژارترینیانە، واتە لەورووەوە کە دەکرێت لە هەناوی خۆیدا





بیرۆکەی فەلسەفەی هەڵگرتبێت، هەژارترینیانە، دوای ئەمە ئەو فەلسەفانەی کە دەوڵەمەندترن، دەردەکەون، وادەردەکەوێت ئەم رەوتە تەواو پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەبێت کە یەکەمجار لەلای ئێمە هەیە، بەڵام شتێکی ئاساییە بیرە فەلسەفییەکان راستەوخۆ دژی بیرە باوەکانن[٦].

### ئامانجدار بوون لە فەلسەفەدا

ئامانجداربوون (الغائیە) End- purpose بەو مانا و مەبەستەیە کە چەند کایەیەك لە گەڵ یەك مەبەستدا وێکبێنەوە، بۆنموونە ئامانج لە جەستەی مرۆڤ وێکهاتنەوەی ئەندامەکانیەتی لەگەڵ یەکدی بەمەستی رێکخستنی ژیانی تایبەتی یان دەگوترێت هۆکاری کۆتایی و ئامانجی تەواوەتی بریتییەلەوەی کە ئەو شتە بەهۆی ئەوەوە پەیدابووە یان ئەو شتە دەرەنجام و بەهۆی ئەوەیە، وەك ئەوەی کە مەبەست لە دانانی باج بەدەستهێنانی ئەو بڕە پارەیە بێت کە دەوڵەت پێویستی پێیەتی، یان هۆکار و ئامانج لە فێربوونی زانست رۆشنبیرکردنە، زیاتر دەسەلاّت پەیداکردنە بەسەر ئەم گەردوون و سروشتەدا لەلایەن مرۆڤەوە[٧].

ئامانجداربوون لەڕووی فەلسەفییەوە ئەوەیە کە وێنا و تەسەوری ئامانجدارێتی بکەین لەم دیاردە و گەردوونەدا، واتە ئەم شتانەی کە هەیە لە جیهاندا تەنها هەر بوونێك نییە، بەڵکو ئەم شتانە بەمەبەست و ئامانجی هەمەجۆر هەن، هیچ شتێك نییە کە مەبەست و ئامانجێك لە بوونەکەیدا نەبێت. هەندێجار تەعبیر لە ئامانجدارێتی بە هۆکاری کافی دەدەرێت، واتە هۆکاری تەواوەتی پشت (بوونی- وجود) شتەکان ئەوە بۆخۆی ئامانجە لە بوونەکەیاندا، روونتر ئەوەیە کە دیقەتیلێبدەین دەبینین هەموو شتێك هۆکاێکی لەپشتەوەیە، هیچ شتێك بەبێ هۆکارێك روونادات، (لایحدث شیء بدون سبب)




"لیبنتز" لەو کتێبەیدا کە بە زمانی فەڕەنسی نووسراوە بەناونیشانی ( principles de la nature et de gace7-8) لەمەڕ پاساوی هەبوونی هەرشتێك لەم دونیا و گەردوونەدا بەم دەستەواژەیە ئاماژەدەکات کە پێویستە هۆکارێکی تەواو و کافی هەبێت تاکو ئەو شتە ببێت، واتە بۆئەوەی شتەکە ببێت ئەوا دەبێ هۆکاری تەواو هەبێت، بەدەرلەوە نابێت تەسەوری هیچ بوونێك

بکرێت و ئەمەش مانای وایە هیچ شتێك بەبێ هۆیەکی تەواو نابێ و هەموو شتەك ئامانجێکی لەپشتەوەیە کە لیبنتز بە سەبەب و هۆکاری تەواوەتی تەعبیری لێکردووە. ئەمەش دەستەواژەکەی لیبنتزە کە دەڵێت: ( existe une raison suffisantepoour qu ,une chose ) ئەم دەستەواژەی لیبتنز بەواتای ئەوەیە: هۆیەکی تەواو تاکو شتەکە ببێت.

لە کتێبی مۆنۆدۆلۆجیادا روونکراوەتەوە کە دەڵێ: هەرگیز هیچ واقیعەیەك و هیچ هەبوونێك و هیچ حوکم و بڕیارێك دروستنابێت مەگەر کاتێ هۆکارێکی تەواو هەبێت کە روونیبکاتەوە بۆچی ئەو شتە بەوجۆرەیە و بەجۆرێکیدیکە نییە.

"کانت" Kant پێیوایە کە پرەنسیپی هۆکاری تەواوەتی (العلە الکافیە) بنەڕەتی ئەزمونکردنی ئەو شتەیە کە لەتوانادا بێت، مەبەست لە ئەزمونکردنی شتێك کە توانای ئەزمونکردنی هەبێت ئەمەیە کە پرەنسیپی هۆکاری تەواوەتی هەرشتێك لەم جیهانەدا کە هیچ شتێك بەدەر لە هۆکار نییە بۆ روودان و بۆ پەیدابوونی، مەبەست لەم گۆتەیە ئەوەیە کە زانینی هۆی شتەکان لە کایەی مەعریفەی بابەتیانەدا دەبێت دەربارەی ئەم دیاردانەی جیهان و دەربارەی رووداوەکانیشی.

دیاریشە کە ئەزمونکردن لەو شتانەدا دەبێت کە دیاردەگەلێك دەبن لە زەمەندا رووبدەن، دەنا هەرشتێك لە دەرەوەی زەمەنەوە بێت ئەوا نەشیاوە بۆ ئەزمونکردن و هەرگیز ناتوانین هۆکاری تەواوتیشی بزانین.




لای کانت پرەنسیپی ئامانجدارێتی لەم جیهانەدا کە دەبێتە بنەما بۆ ئەزمونکردنی هەر کایەیەك کە شیاوی ئەزمونکردن بێت، ئەمەش لەو مەسەلانەدا دەبێت کە وەك گوترا لە کایەی مەعریفەی بابەتییانەی ئەو دیاردانەدا دەبێت کە لەنێو کاتدا روودەدەن. بە دەستەواژەیەکیدیکەش روونیکردۆتەوە کە مەبەستی ئەوەیە کە ئەم پرەنسیپە بۆ هەرشتێك راست و دروستە کە ئەو





شتە یان ئەو دیاردە و رووداوە دیاردەیەك بێت کە لە شوێن کاتدا (فی الزمان والمکان) دابێت و بەدەرلەوە کە لەشوێن (المکان)و کات (الزمان) دابێت، ئەوا هەرگیز نە ئەزموون دەکرێت و نە ئەوەشە کە ببێتە بابەتی مەعریفەش.

چەمکی ئامانجدارێتی (مفهوم الغائیە) لە سەردەمی ئەرەستۆوە داکەوتووەتەوە، ئەو تێڕامانەی ئەرەستۆ تاکو سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست لەنێو هەردوو فەلسەفەی ئیسلامی و مەسیحیدا بوونی هەبووە، بەڵام لە هەردوو سەدەی شانزە و حەڤدەدا بەهۆی پێشکەوتنی زانستی فیزیا و ژیانناسییەوە، شاڵاوکراوەتەسەر بنەمای ئامانجدارێتی، ئەویش بۆ بەرژەوەندی زانست و پرەنسیپی میکانیکا Mecanice لە سروشتدا.

ئەم شاڵاوە لەلایەن دیکارتەوە دەستیپێکردووە و بەتایبەتی لە بواری فیزیادا ئەم شاڵاوەی ئەنجامداوە، مەبەست ئەوەیە کە فیزیا ئامانجداربوون لە جیهاندا ناسەلمێنێت. دواتر لە کایەی زانستی حەیاتیشدا "بۆنیە" Boneو " هالەر" Haller هەمان شاڵاویان کردووەتەسەر ئەم بنەمایە، گوتوویانە ژیان ئەوە پیشاننادات کە هیچ ئامانجێکی لە پشتەوەبێت، دواتر چەند زانایەکی بایۆلۆژیدیکەش پشتگیری ئەم دیدگایەیان کردووە لەوانە هارفی Harveyو ستاڵ stahl، بەڵام لەژێر کاریگەرێتی رێبازی پۆزەتیڤیستیدا (المذهب الوضعی) Positivism زاناکان روویان لە وتنی ئامانجدارێتی وەرگێڕاوە و رێبازی گەشەکردن (مذهب التطور) Evolutionism هاتووە بەتەواوەتی کایە و بنەمای ئامانجدارێتی لە زانستی حەیاتی دوورخستووەتەوە، لێرەوە دیدگای ئامێردانە (الالیە)و ماتریالانە زاڵبووە. ئەم دیدگای مادییەتە لای کەسانی وەکو "رۆ" Rouxو"هەکڵ" Haeckel و"لۆب" Loeb و "رابۆ" Raboud بەتەواوەتی جیبرکراوە[٨].

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا "دریش" Drieschو "ریچە" Richetو "رینان" Rignanoو " کوین" Cuenotهاتوون، لە شوێنی ئامانجداربوون بنەمایەکیدیکەیان داناوە ئەویش بریتییەلە میتۆد و پرەنسیپی ژیانی و حەیەوییەت (الحیویە) vitalism یان ئەنیماسیزمییەت Animism[٩]، ئەم روانگەیە مامناوەندە لەنێوان ئالییەتی مادییانە و نامادییەتیدا، چونکە بڕیاری ئەوەیانداوە کە بەپێی بنەمای زینوویەتی و حەیەوێتی جیهان گیاندار و زیندەوەرەکان هەرگیز نابێت بەتەنێ دەرەنجامی فاکتەر و توخمە میکانیکایی و کیمیایی و فیزیاییەکان بێت. رێبازی ئامانجدارێتی (مذهب

الغائیة)Finalism بەرامبەرە بە ڕێبازی ئالییانە و میکانیك Mecanism، ئەم ڕێبازە بۆ هەموو ئەو جۆرە بیرکردنەوە و بیرۆکانە بەکاردەبرێت کە دیاردەکانی بوون و ئەم جیهانە بگەڕێنێتەوە بۆ هۆکار و فاکتەری ئامانجدارانە (العلل الغائیە)، بەلاّم گەرهاتو ڕاڤەکردنەکە بەتەنێ لەو ئاستەدا ڕاوەستابوو کە دیاردەکان ئەوەندە لێکبداتەوە کە دیوی دەری پیشانبدات و ڕۆنەچێتە نێو وردەکارییەکان و بە شوێن هۆکارەکاندا نەگەڕێت، ئەوا بێگومان ئەم جۆرە ڕاڤەکردنە دەچێتە خانەی ڕێبازی حەیەوی و زیندەگییەتی (المذهب الحیوی) Vitalism چونکە ئەم ڕێبازە پێیوایە هەڵسوکەوتەکانی کائینە زیندووەکان بە ئاراستەی ئامانجێکدا هەنگاوهەڵدەگرن، ئەمەش تەنها نموونەی کائینێکی زیندوو یان فۆرمی ئەو کائینە پیشاندەدات و بەرجەستەیدەکات، هەروەکو ڕفتاری هەریەکێك لە ئێمە کاتێ مامەڵەیەکدەکەین یان هەڵدەچین یان خوا دەپەرستین، ئەمانە تەنها ڕفتارگەلێکن کە نموونەی بەرجەستەکردنن بۆ هەر ئامانجێك کە دەکەوێتە پشتی ئەم هەڵسوکەوت و ڕفتارانەمانەوە، بەلاّم کاتێ هۆکار باسکردن یان ڕۆچوون بەنێو هۆکارەکاندا باسکرا بۆ هەموو دیاردەکانی ئەم گەردوونە، ویسترا هۆ و ئامانجەکانی پشتی ڕوودانی شتەکان بناسرێت و بزانرێت، ئەوا ئەوەدەمە دەگوترێت کە ئێمە لەنێو کایە و لەنێو ڕێبازی ئامانجداریداین (المذهب الغائی) ئەم ڕێبازەش هەنگاوێك هەورازتر دەڕوات و دەبێتە ڕێبازی ئامانجداریێتی هەمەکییەت (المذهب الغائی الکلی)Telelogy . مەست لەم فەلسەفەیە یان ساناتر مەبەستی ئەم ڕێبازە ئەوەیە کە جیهان بەشێوەی گشتی و سەرانسەر بریتییەلە کۆمەڵێك پەیوەندی گرێدراو بەیەکدییەوە کە بەپەیوەندییەکانی نێوان هۆك ڕو ئامانجەکان ناسراوە.

پرەنسیپی ئامانجدارێتی ئەوەیە کە هەموو هەبووەکان –الموجودات- کار بۆ ئامانجێك دەکەن، ئامانجە بەشەکییەکان (الغایات الجزئیە) پەیوەستن بە ئامانجە هەمەکییەکانەوە ( الغایات الکلیە) . ئەمە ئەو پرەنسیپەیە کە کراوە بە بەڵگە بۆ سەلماندنی بوونی خوا، واتە سەلماندنی خوا بە بەڵگەی ئامانجدارێتی غایەتئامێز (الدلیل الغائی) Indication purposeچونکە گەر گوترا هەموو مەوجود و هەبوویەك ئامانجی هەیە، هەموو شتەکان ڕێکخراون و بەپێی ئامانجەکانیان ڕیزبەندی ڕێکخستنەکەیان بۆکراوە، ئەوەدەمە پێویستدەکات کە هەبوویەکی خاوەنئەقڵ و سەلیقە هەبێت کە ئاراستەکانی ئەم جیهانە بکات و بەڕێوەیبەرێت و هەر شتەو بەرەو ئەو ئامانجە بنەڕەتییە ئاراستەبکات کە بۆیدیاریکراوە یان ساناتر بۆیدروستبووە. ئەو





هەبووە خاوەنئەقڵ و سەلیقەیەش هەر خودایە. فەلسەفەکاران لەمەڕ هزری ئامانجدارێتی لەم جیهانەدا بوونەتە دوو دەستەوە یەکێکیان پێیوایە ئامانجداربوون بۆ زانست پێویستە و ئەوانیدیکەشیان پێیانوایە کە پێویست نییە جگەلە کارەکانی مرۆڤ[١٠].

واتە تەنها لە کارەکانی مرۆڤدا ئامانجدارێتییان بەپێویست زانیوە و ئەودوای سروشت و ڕووداو و هەڵسوڕانی گەردوونیان لا گرنگنییە کە دەشێت هەروا بەڕێکەوتبێت.

فەلسەفەی ئامانجدارێتی بە مانای ئەوەدێت کە باس لە ئامانجە کۆتاییەکانی جیهان و هەموو هەبووەکان وەك تاك دەکات، ئەم فەلسەفەیە لەسەر بنەڕەتی ئەوە دروستبووە کە گەردوون یان هەندێك لە بەشەکانی بەئاراستەی ئامانجێکی دیاریکراودا گوزەردەکەن.

هەرچەندە تێرم و زاراوەی تیلۆلۆژیا Teleology زاراوەیەکی نوێیە و "فۆڵف" لە سەدەی هەژدەدا دایهێناوە، بەلاّم واتاکەی زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەفلاتون کە لە گوفتوگۆی (فیدۆن)دا بەکاریهێناوە. دیسان ئەرەستۆش ئاماژەی بەئەوە کردووە کە گەردوون بەرەو ئامانج دەڕوات. واتە گەردوون لەسەر بنەمای ئامانج تێدەپەڕێت و لەم هەڵسووڕانەیدا ئامانجێك هەیە. گەر سەرنجبدەین لای ئەرەستۆ هەر وەك لای ئەفلاتونیش وابووە، جیهان دەرەنجامی عیشقی بۆ یەکەمین جووڵێنەری خۆی بەمجۆرە ڕێدەکات و دەجووڵێ[١١]، غایەت و ئامانج هەستی هەموو ئەوانەیە کە لەم گەردوون و سروشتەدا ڕێدەکەن و لەجەرەیاندان.

ئەرەستۆ گوتویەتی نە شەنگس و نە بەخت هۆی ئەوەنین کە وەك فاکتەر ببنە هۆی ڕووداوە سروشتییەکان و ئەوەی بەم ژیان و دونیایەدا دەگوزەرێت. لەبەرامبەر ئەفلاتون و ئەرەستۆوە کە هەردووکیان دووپاتیانکردووەتەوە کە لەم گەردوون و ژیان و جیهانەدا ئامانجدارێتی هەیە، نەك ڕێکەوت و شەنگس، دەبینی کەسانیدیکەی وەکو "دیموکریتس"و "ئەبەیکور"و "لۆکرکبۆس" نکولییان لەوەکردووە کە هیچ جۆرە ئامانجدارێتییەك لەم گەردوونەدا بوونی هەبێ. ئەمانە پێیانوایە گەردوون بۆ هیچ ئامانجێك هەنگاونانێت و هیچ هۆکارێکی وا نییە لەپشت ڕووداو و دیاردە سروشتییەکانی ئەم جیهانەوە.



ئەمانە پێیانوایە جگەلە رێکەوت (الصدفە)و بەخت نەبێ هیچ شتێکیدیکە نییە، بەلاّم دواتر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە فەلسەفەی مەسیحی و ئیسلامیدا کایەی ئامانجدارێتی گەڕاوەتەوە و بووەتە یەکێك لە بەڵگە سەرەکییەکانی پێسەلماندنی خوا. ئەمەش بەتەواوەتی لە دیدگای فەلسەفی "فارابی"و "ئیبن سینا"دا لە فەلسەفەی ئیسلامیدا رەنگیداوەتەوە.

لای "تۆما ئەکوینی" لە فەلسەفەی مەسیحیدا بەڕوونی بەدیارکەوتووە، لای تۆما ئەکوینی نەك هەر زیندەوەرەکان بەرەو ئامانج هەنگاودەنێین بەڵکو شتە بێگیانەکانیش بەهەمانشێوە بە ئامانجەوە هەنگاودەنێین و جەرەیانەکانی ئەم گەردوون و جیهانە سروشتییە هەروا بەڕێکەوت نییە، بەلاّم دواتر" ولیەم ئۆکام" Ocam هاتووە و گوتویەتی بەتەنێ گیاندار و کائینە زیندووەکان ئامانجیان لەپێشە نەك بێگیانەکان.

لە سەردەمی راپەڕیندا (عصر النهضة)دەبینی "چیۆردانۆ برۆنۆ"و " کامبانیلا" دووپاتیدەکەنەوە کە ئەم جیهانە ئامانجی لەپێشە و لەسەر بنەما و پرەنسیپەکانی ئامانجدارێتی دەڕوات نەك هەروا بەڕێکەوت لەجەرەیاندابێت، بەلاّم دواتر هەریەك لە "فرانسیس بیکۆن"و "دیکارت" هاتوون و گوتویانە مەسەلەی ئامانجدارێتی لە جەرەیانی ئەم سروشتەدا پەیوەستە بە ئیمانەوە، نەك بە فەلسەفە و زانستەوە، هەر لەبەرئەمە داوایانکردووە کە فاکتەرە ئامانجدارێتییەکان (العلل الغائیە) cause finle لە راڤەکاری زانستی بکەنەدەرەوە.

"بارۆخ سپینۆزا"ش لەسەر هەمان ریتم و لەسەر هەمان دیدگا وێنای جیهانی کردووە، دووپاتیکردووەتەوە کە سەرجەمی هۆکارە غایەتدارەکان بریتینلە خەیاڵی مرۆڤەکان. بەپێچەوانەی ئەم دیدگایانەوە دواتر" لیبنتس" دووپاتیکردووەتەوە کە جەرەیانەکانی ئەم دونیا و سروشتە هەروا لەخۆڕانییە، بەڵکو ئامانجی لەپشتەوەیە. واتە هەموو رووداو و جووڵە و هەنگاوەکان فاکتەریان لەپشتەوەیە و بەڕێکەوت نییە و بەئامانجی تایبەتیش روودەدەن. بەمجۆرە تیوریای ئالییەت و ئامێرێتی (النظریة الالیة)ی پێملی تیوریای غایەتئامێز و ئامانجدارێتیکردووە و بیرۆکە بەناوبانگەکەی خۆی پیشانداوە کە گوتویەتی گونجانی ئەزەلی (الانسجام الازلی) Eternl and Harmony هەیە لەم گەردوونەدا کە بەگوێرەی ئەم ئامانجدارێتییە خواوەند لەپێشتردا گونجانی دروستکردووە لەنێوان هەموو ئافەریدەکاندا لەم گەردونەدا، بڕیاری ئەوەشیداوە کە ئەم جیهانە باشترین جیهانێکە کە ئیمکانبێت، کە لەدواساتدا ئەم گەردوونە هەڵگری ئامانجدارێتیەکی رەهایە یان ساناتر دەرەنجامی ئیرادە و ویستی ئیلاهی و ویستی خێر و توانای ئەو بۆ داهێنان و دروست کردن، ئەم گەردوونە پەیدابووە.





سەبارەت بە"ئەمانۆیل کانت" ئەوا بە زەقی بەرگری لە ئامانجدارێتی دەکات و پێیوایە ئەم فاکتە پێویستی بە مشتومڕ لەسەرکردن نییە، ئەمانۆیل کانت ئەم کایەی بۆ سەلماندنی خوا بەکارهێناوە.

لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا جارێکیدیکە مشتومڕی بیریاران دەستیپێکردووەتەوە و شالاّوێکی لەڕادەبەر کراوەتەسەر بیرۆکەی ئامانجدارێتی لەلایەن "شۆپەنهاوەر"و "ئادۆرد فۆن هێرتمان"ەوە(١٢).


ئین سینا

لای ئیبن سینا ئامانج یەکەمینی هەموو هۆکارەکانیدیکەیە و گوتویەتی (والغایة بما هی شیء فانها تتقدم سائر العلل) دواتر گوتویەتی (وهی علە العلل).. واتە هۆی هەموو هۆیەکانە، چونکە هۆیەکانیدیکە بۆ ئەوەن کە ئامانج لەو مەسلە پیشانبدەن و روونیبکەنەوە، هەر لەبەرئەم ئامانجەشە کە بە هۆکار دەناسرێن، واتە هۆکار بۆخۆی بە ئامانجی ئەوەیە کە شتێك بسەلمێنێت، ئیدی ئەمە روونە کە ئامانجدارێتی غایەتێکی سەرەکی و بنەڕەتییە.

گوتوویەتی یەکەم بکەر و یەکەمین (فاعل) لەهەموو شتەکاندا ئامانجە(١٣). زۆربەی فەلسەفەکاران گوتویانە سەرجەمی دیاردەکانی جیهان بەشێکن لە نەخشەی دارێژراوی گشتی کە لەلایەن خواوەندێکی دانا و لێزانەوە دارێژراوە، هەندێك لە دیاردەکانی ئەم جیهان و گەردوونە کار لەسەر بەرجەستەکردنی ئامانجێك دەکەن، هەندێکیدیکەیشیان بەشێوەیەکی زۆر ورد و رێکخراوە دەجوولێن.

هەندێك لە دیاردەکانی ئەم جیهان و گەردوونە کار لەسەر بەرجەستەکردنی ئامانجێك دەکات، هەندێکیدیکەیشی بەشێوەیەکی زۆر ورد و رێکخراوە، واتە بەجۆرێك رێکخراوە کە بەدەرە لە هەرجۆرە کەموکورتییەك، هەروەکو ئەوەی ئامانجی ئەم سیستماککردنەی جیهان بریتیبێت لە بەرجەستەکردنی خێری گشتی. هەر چەندە "هینری بریجسۆن" پێیوایە ئەمە زیادەڕەوییە کە مرۆڤ وا بیربکاتەوە ژیان بەپێی ئامانج رێکخراوە، چونکە گەر وا بیربکەیتەوە کە

ئەم گەردوونە و ئەم دیاردە و رووداوانە هەر هەموویان ئامانجدارن، واتە تۆ لەپێشدا بڕیاری ئەوەتداوە کە شتەکان بەپێی ئەو ئامانجانەی بۆیاندیاریکراوە، هەر بەوجۆرە و هەر لەسەر هەمان ئەو ریتمە دەڕۆن و شتەکان بەدڵنیاییەوە روودەدەن. ئەمەش بەواتای ئەوەیە کە هەر لە سەرەتادا دەکرێت ئێمە ئایندە بخوێنینەوە و پێشبینی شتەکان بکەین، دیسان ئەم دیدگایە بەواتای ئەوەیە کە بگوترێت ئەم جیهان و گەردوونەش رێك وەکی ئەقڵی ئێمە کاردەکات، لەکاتێکدا دیقەت دەدەیت ئەقڵ بۆخۆی فاکتێکی ئارام و بێدەنگ و کپە و دەرەنجامەکان لەم ژیانەوە هەڵدەهێنجێ [١٤].

**فەلسەفە چ جۆرە مەعریفەیەك ئەبەخشێت**

گومان لەوەدا نییە کە فەلسەفە مەودا دوورایيەکی زۆر قووڵی هەیە لە بیری مرۆڤایەتیدا، بابەتەکانیشی ئەوەندە هەمەچەشنە و فرەڕەهەندن کە بالآی ئەودوای لقەکانی زانست و مەعریفەیە بەگشتی، هیچ کام لە لقەکانیدیکەی زانست و مەعریفەش ناتوانێت ببێتە ئاڵتەرناتیف بۆ فەلسەفە و ئەرکەکانی ئەو ببینێت.

کەواتە فەلسەفە دەکەوێتە چ خانەیەکی مەعریفەی مرۆڤایەتی و شوێنی فەلسەفە لەکوێدایە؟ ئەگەر جەستە و تەنەکان بابەتی زانستی سروشتی بن، جیهانی ژیان و زیندەوەرەکان بابەتی زیندەوەرناسین بن، وشیاری و ئاگایی تایبەت بێت بە دەروونناسی و کۆمەڵگەش بابەتی بنەڕەتی کۆمەڵناسی بێت، دەبێت بۆ بابەتی فەلسەفە چ شتێك بگوترێ و چی بۆ دەمێنێتەوە وەك ناوەڕۆك و بابەت؟ "بۆخینسکی" پۆختەی قوتابخانەکانی فەلسەفەی لەمەڕ ئەم پرسە خستۆتەڕوو [١٥]:

**یەکەم:** فەلسەفە مەعریفەیە، واتە کرۆك و گەوهەری زانستە، زانستەکانیدیکە شتمان فێردەکەن، بەڵام فەلسەفە بە رێگایەکی قووڵتر شتەکانمان پێدەناسێنێت، بە قووڵی باس لە وردەکارییەکانی ئەوجۆرە مەعریفەیە دەکات کە قسەی لەسەر دەکات، باس لەوە دەکات تاچەندە ئیمکانە ئەو مەعریفەیە بەرجەستەببێت. هەروەها دیاریکرنی سنوورەکانی مەعریفەی فەلسەفی، ئەو مەرجە بنەڕەتییانەی کە پێویستن بۆئەم مەعریفەیە یان روونتر دەکرێت چ جۆرە مەعریفەیەك بزانرێت کە لەتوانادابێت بۆناسین؟ واتە توانای ئەوەیان هەبێت کە چییەتی (**الکیفیة**) و چۆنیەتی (**الکمیة**) ئەو مەعریفەیەمان بۆ روونبکاتەوە، ئەمە رای "ئەمانۆیل کانت"و هەوادارانی "کانت"ە .





**دووەم:** فەلسەفە زانستی بەهاکانە، هەموو زانستەکانیتر تەنها باس لەو شتانە دەکەن کە **لە** توانای مرۆڤدان، ئەگەری زانین و پێئاشنابوونیان هەیە، بەدیوێکیدیکەدا تەنها باس لەو کایە و مەسەلانە دەکەن کە بوونیان هەیە و لەدیارچاون، بەڵام فەلسەفە بەپێچەوانەی ئەمەوەیە، باس لەو کایە و شتانە دەکات کە خۆیان لەخۆیاندا پێویستە بەوجۆرەبن، ئەمەش وەڵامی ئەو قوتابخانە فەلسەفییەی باشووری ئەڵمانیایە (١٨٩٠-١٩٢٠) کە دەکۆشا فەلسەفەکەی "کانت" زیندووبکاتەوە. "فیندڵبەند" Windlbnd رێبەرێتی ئەم تێڕامان و روانگەی کردووە.

**وەڵامی سێیەم:** فەلسەفە زانستی مرۆڤە، چونکە بونیاتنەری هەموو شتەکان، لەکاتێکدا زانستی سروشتی و زانستە ئەقڵییەکانیتریش ئەم پەیوەندییەیان فەرامۆشکردووە، ئەم تێڕامانە زیاتر تێڕامانی وجودیزمییەکانە.

**وەڵامی چوارەم:** مەیدانی فەلسەفە، زمانە، "فیتگنشتاین" دەڵێ: هیچ بابەت و مەسەلەیەکی فەلسەفی لەگۆڕێ نییە، بەڵکو فەلسەفە تەنها یەك ئیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەرکی روونکردنەوە دەبینێت، فەلسەفە لە زمانی ئەودوای زانستەکانیدیکە دەکۆڵێتەوە، ئەمەش بۆچوونی زۆربەی پۆزەتیڤیستییە لۆجیکییە هاوچەرخەکانی وەکو "شلیك"و "کارناب"و "رێشنباخ"و "نوێرات"ە، بەڵام تیوریاکە تیوریای "فیتگنشتاین"ە. "بۆخینسکی" تێبینی ئەوەیکردووە کە چەند بیروڕایەکیدیکەش هەن کە لەو چوار بیروڕایانەی پێشەوە نزیکن، بەڵام تەنها ئەوەندە هەیە کە خاوەنەکانیان فەلسەفەکار نین، بۆنموونە پۆزەتیڤیستییە لۆجیکییەکان هەموو ئەو فەیلەسوفانەی کە هاوڕانین لەگەڵیاندا دەیانخەنە ریزی میتافیزیکاییەکانەوە، میتافیزیکاش لە روانگەی ئەوانەوە جگەلە وڕێنە بەولاوە هیچیدیکە نییە.

بەلای ئەوانەوە فەیلەسوفی میتافیزیکایی تەنها هەر دەنگێك دەردەکات بەبێ ئەوە ئەو دەنگەی هیچ دەلالەتێکی هەبێت و هیچ خزمەتێك بە دۆزی مەعریفە و مرۆڤیش بکات، بەڵام ئەم وێنا کردنەی میتافیزیکا بەم شێوازە تەنها لای خاوەنەکانیان شوێنی سەرنجدانە، دەنا میتافیزیکا جەمسەری دووەمی فیکرە یان لای هەندێك هەر زانستی یەکەمینیشە، چونکە میتافیزیکا پەیوەستە بە مەعریفەی ئیلاهییەوە هەر مەعریفەیەکی ئیلاهیش مەعریفەی یەکەمە .

هەوادارانی "کانت"یش نەیارەکانی خۆیان بە میتافیزیکایی وەسفکردووە، بەلاّم لای ئەمان مەبەست لە میتافیزیکایی وڕێنە و ژاوەژاو نییە، بەلّکو مەبەستیان لەئەوەیە کە سەردەمەکەی تێپەڕیوە، ئیستە ئیتر ئەوانەی پێوەیخەریکن وەك فەلسەفەکار ناناسرێن. وجودییەکانیش Existentialism هەموو ئەوانیدیکە بەکەم تەماشادەکەن، بەلاّم لەکۆتاییدا بۆخینسکی ئاماژە بەئەوە دەکات کە ئەو نیگەرانە لەوەی توێژەر و رووناکبیر خۆی گرێدراوی ئەو وەلاّمانەی پێشەوە بکات، واتە وەلاّمی ئامادەکراو و پێشوەخت. پێدەچێت ئەوەیان لەڕاستییەوە نزیکتر بێت کە فەلسەفە کۆی هەموو ئەو تێڕامانانە بێت کە باسکران.

واتە هەم مەعریفە و هەم بەهاکان و هەمیش مرۆڤ و زمانەوانیش لەخۆبگرێت و ئەوانە هەموویان بکاتە شوێنی بایەخپێدان و لێکۆڵینەوەکانی خۆی. نەك هەر ئەوەندە، بەلّکو ئەم دونیا و گردوونەش سەرانسەر پڕە لە کێشمەکێشم و گرفت و پرسی هەمەجۆرە و بێوەلاّم کە هیچ کام لە لقەکانی زانست هیچ باسوخواسێکیان دەربارەنەکردووە و هیچیان دەربارەی نەدرکاندووە، دەشێت ئەوانە ببنە بابەتی فەلسەفییانە، نابێت فەلسەفە بەرتەسکبکرێتەوە بۆ چەند کایە و مەودا و بوارێکی تایبەتی و دیاریکراو، فەلسەفە زانستی شیتەلّکردن و تێڕامانە لەهەموو کایەکانی ژیان و گەردوون و قوولّبوونەوەیە بەنێو ناخی شتەکاندا، بەتایبەتی ئەو کایە و مەسەلانەی کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی دووبارەدەبنەوە و هەرگیز کۆتاییانپێنایەت، بەلاّم پرسەکان بەپێی سەردەمەکان بە فۆرمی جیاجیا ئاراستە دەکرێن، فەلسەفە زانستێکی هەمەکی و هەمەچەشنە و فرەڕەهەندە، وەك ئەودوای لقەکانی زانست گرێدراوی بابەتی تایبەتی نییە، فەیلەسوفە موسولّمانەکان دەربارەی فەلسەفە وتویانە زانستی هەمەکییە (العلم الکلی) Universals،"بۆخینسکی " دەلّێت: دەشێت فەلسەفە توێژینەوەی هەمان بابەتی هەر زانستێکیدیکە بکات، بەلاّم ئەوەی فەلسەفە لە ئەودوای لقەکانیدیکەی زانست و مەعریفە جیادەکاتەوە تەنها شێواز و پەیڕەوەکەیەتی، پێڕەوی فەلسەفە رێگرنییە لەوەی چ جۆرە پێڕەوێك هەلّدەبژێرێت، روانگەکەشی ئەوەیە کە کاتێ وەلاّمی ئەشکالێك دەداتەوە و چارەسەری گرفتێك دەکات زۆر دوور بۆی دەروانێ بەم مانایە فەلسەفە زانستی بنەڕەتەکانە(١٦).

***





## پەراوێز

١. مبادیو أولیه فی الفلسفه، ص ٢٩-٣٠ .

٢. مبادیو أولیه فی الفلسفه، هەمان سەرچاوە، ص٣٠-٣١.ه

٣. مبادیو أولیه فی الفلسفه، هەمان سەرچاوە، ص ٢١

٤. هەمان سەرچاوە،ص٢١-٢٢

٥. سەرنج بدە لە: مێژووی فەلسەفە، ل ٥٢-٥٣. المنهج الجدلی عند هیجل، امام عبد الفتاح امام، دار التنویر، بیروت، عام ١٩٨٢، ص ١٤٨.

٦. سەرنج بدە لە ئەو دوو سەرچاوەی پێشەوە.

**٧. المعجم الفلسفی، ٢/١٢٢.**

**٨. موسوعة الفلسفة، ٢/٧٩.**

**٩. المعجم الفلسفی٢/٥٠٥.الموسوعة الفلسفیةالمختصرة، ١٨٧.موسوعة الفلسفة٢/٧٩-٨٠.**

**١٠. المعجم الفلسفی٢/١٢٤.**

**١١. مابعد الطبیعة، لأرستو، ص ٣٧.**

**١٢. موسوعة الفلسفة، ٢/٨٠.**

**١٣. النجاة،لابن سینا، ص ٣٤٥.**

١٤. المعجم الفلسفی٢/١٢٢.

١٥. هەمان سەرچاوە، ل ١١٧- ١١٨.

**١٦. الفلسفة والانسان، ص ١١٠-١١٢.**

# مێژوو و فەلسەفەی یارسان

نووسینی: ت. تاهیری

وەرگێڕانی: بیهزاد خۆشحالی

## یارسان و ڕێبازەکانیتر:

دوای بەرفراوانبوونی وڵاتانی ئیسلامی و پەرەسەندنی ئایینی ئیسلام، بەمەبەستی باشتر بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتانە دەسەڵاتدارانی موسڵمان پێویستییان بەدانان و ئیجرای یاسای تایبەت بوو، چونکە لەسەردەمی ژیانی حەزرەتی محەممەددا، ئەو زاتە گشت کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی بەپشتبەستن بە "وەحی" چارەسەردەکرد، بەڵام دوای کۆچیدوایی پێغەمبەر، وەحی نەما و قورئانیش نەیدەتوانی وەڵامی گشت کێشە کۆمەڵایەتییەکان بداتەوە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە یارانی نزیکی پێغەمبەر "سەحابە" گشت ئەو بیرەوەری و گوتانەی لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتبوو و لەیادیان مابوو، وەبیربهێننەوە و بەمشێوە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە و چارەسەری کێشەکان بکەن. ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی حەدیس. ئەڵبەت پاش کۆچیدوایی پێغەمبەری ئیسلام، هەندێك لە یارانی نزیکی ئەو زاتە بەمەبەستی پاراستنی قورئان وەك تەنیا سەرچاوەی موسڵمانێتی، لەگەڵ حەدیس و پشتبەستن بە بیرەوەرییەکانی سەحابە نەبوون، بەڵام گرووپێکیتر لە سەحابە و لەسەرووی هەموویانەوە، عەلی کوڕی ئەبوتالێب، بەپشتبەستن بە وتەیەکی پێغەمبەر کە فەرموویبووی: خودا شادیدەدات بەو کەسەی کە وتەکانی منی بیستووە و لە بیریناکات و بۆ ئەو کەسانەی دەگێڕێتەوە کە گوێیانلێنەبووە. لەسەر کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی حەدیسەکان پێداگرییاندەکرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لایەنگران و دۆستانی عەلی، لەوانە "مالیکی بنی ئەنەس" لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کەسانە بن کە دەستیانداوەتە کۆکردنەوەی حەدیس و زانستی تایبەت بەم بوارەیان پێکهێنا و گەشەیانپێدا کە لەناو ئەهلی سوننەدا لەسەردەمی "عومەری ئیبنی عەبدولعەزیز"ەوە دەستیپێکرد(١).

گێڕانەوەی حەدیس و شیکردنەوەی، بووە هۆی پێکهاتن و سەرهەڵدانی مەرجەع و کەسایەتییە باوەڕپێکراوەکانی ئەم بوارە. هەرئەمەش ململانێی لێکەوتەوە و بەرەو لایەنی





جیاوازی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا چوو. لەوەها هەلومەرجێکدا، بنەماڵەی بەتوانای بەنی ئومەییەش بەهۆی ڕکەبەریی و بەربەرەکانێ لەگەڵ بنەماڵەی عەلیدا، لە قووڵکردنەوە و تەشەنەکردنی جیاوازییەکان دەوریانبینێ و بوونە هۆی دابەشبوونی موسڵمانان و سەرهەڵدانی فیرقە ئیسلامییە دژبەرەکان کە هەر یەك لەوان بەپشتبەستن بە شیکردنەوەی تایبەتی خۆی و چۆنیەتی تێگەیشتنی لە قورئان و حەدیسەکان، بۆچوونی خۆیان بە حەق و هی ئەوانیتریان بە لادان لە ئیسلامی ڕەسەن دانا.

بنەماڵەی بەنی ئومەییە، شیعەکان و لایەنگرانی عەلی و فیرقەی دەرچووەکان "خەواریج" سێ لایەنی گەورە و بەهێزی دونیای ئیسلام بوون کە دواتر لە هەرکام لەم سێ لایەنە لق و فیرقەی جۆراوجۆر کەوتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بیروبۆچوونی دواکەوتوانەی عەرەبە نوێ موسڵمانەکان و هزری ڕەگەزپەرەستی "عەرەبیسم" کە عەرەبی لەسەرەوەی نەتەوەکانیتر دادەنا و بەم بۆنەوە بە چاوێکی سووکەوە سەیری ناعەرەبەکان بەتایبەت ئێرانییەکانیانی دەکرد و ئەوانیان بە عەجەمی "موالی"واتە کۆیلەی ئازادکراو دادەنا.

هەرئەمەش لەلایەکەوە بووە هۆی سەرهەڵدانی هزری عیرفانی کە هیچ بایەخێکی بەتایبەتمەندیگەلی وەك ڕەگەز و زمان و نەتەوە نەدەدا و بە یەکسان سەیری عەرەب و عەجەم و کۆنە موسڵمان و تازە موسڵمانی دەکرد و لەلایەکیترەوە، ئاگری فیرقەگەری و سەرهەڵدانی بۆچوون و تەفسیری جیاجیای لە قورئان و حەدیس و بنەما فیکرییەکانی ئیسلام بەتینتر دەکردەوە.

ئەڵبەت لەسەرەتای ئەم گورانکارییەنەدا، ڕێبەرانی دونیای ئیسلام جگەلە زانستی حەدیس و شیکردنەوەی ئیسلامی، هیچ زانستێکیتریان وەرنەدەگرت و نکۆڵییان لە بوونی هەر زانستێکیتر دەکرد، کە دەتوانین بڵێین هەر ئەمەش بووە هۆی ئەو هەموو کتێبسووتاندنەی کە بەوردی لە مێژوودا باسیانکراوە، بەڵام ئەم شێوە تێڕوانینە زۆری نەخایاند و لەژێر گوشاری گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا، کوڵێدا و هەرەسیهێنا و موسڵمانەکانیش بۆوەرگرتن و فێربوونی زانستەکانیتر چالاکی زۆریان نواند کە لە یەکەم هەنگاودا دەستیاندایە خوێندنەوە و وەرگێڕان.

چالاکی وەرگێڕان و فراوانبوونی ئەو کتێبانەی کە لە سەدەی دووهەمی کۆچیدا لە زمانەکانیترەوە وەرگێردرانە سەر زمانی عەرەبی، ئەوەندە لەسەر دونیای ئیسلام کاریگەرییان هەبووە کە لە مێژوودا بە "شۆڕشی وەرگێڕان" ناوی لێدەبرێت.

ئەو شۆڕشە، بەتایبەت لەسەرهەڵدانی زانستی "کەلام"دا رۆڵێکی گرینگی هەبوو، هەروەها هزری "عیرفانی"ش بەکەڵکوەرگرتن لە عیرفانی مەسیحی، ئیرانی و هیلینی ئەوەندەیتر بەهێزبوو.

هەر لەو سەردەمەشدا، وەرگێڕەکان، بەوەرگێڕانی سەرچاوە فەلسەفییە هیلینییەکان، بیروبووچوونی "فەلسەفی"شیان هێنایە ناو موسڵمانەکانەوە.

سەرەرای هەمووی ئەمانە، زوڵم و زۆر و دیکتاتۆرییەتی دەسەڵاتداران و سەرکوتکردنی بەنی ئومەییە لەلایەکەوەو و توندڕەوی و ئیفراتی تازە موسڵمانەکان لەلایەکیترەوە ، بووە هۆی ئەوە کە هەندێك لە زانا ئایینی و رێبەرانی فیکری گۆشەگیری بگرنەبەر و هەم لە کۆمەڵگا و هەم لە دەسەڵاتدارەکان دووریبکەن. ئەمانە رێبازی دەروونگرایی و خۆشەویستی "اللە"و پەروەردەی تاکەکەسییان گرتەبەر و بەرەبەرە بوونە هۆی دروستبوون و سەرهەڵدانی بیروبۆچوونی جیاجیا لە ئیسلامەتیدا. بۆنموونە بۆ هۆی تەشەنەکردن و بگرە زاڵبوونی وشکە موسڵمانییەوە، کەسانێك دەرکەوتن کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان رێگای "ریا"و درۆیان گرتەبەر. لەبەرانبەر ئەمانەدا تاقمێکیتر سەریانهەڵدا کە بە "مەلامەتییە" ناوبانگیاندەرکرد. پەیڕەوانی رێبازی مەلامەتییە، بەپێچەوانەی ئەوانیتر، وایاندەنواند کە هیچ باوەڕێکیان بە یاسا شەرعی و بنەما ئیسلامییەکان نییە. ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە خۆیان بە ئیسلامی راستەقینە دەزانی و لەتەنیایی خۆیاندا گشت یاسا شەرعییەکانیان بەجێدەهێنا و زۆریش لەسەری سووربوون، بەڵام لەبەرچاوی خەڵکاندا جاری وابوو هەڵسوکەوتی بەرووالەت دژە شەرعییان دەنواند و بەم بۆنەوە وەك لادەر سەیریاندەکردن یان رێبازی "تەیفوورییە" کە لەلایەن "بایەزیدی بەستامی"یەوە دامەزرابوو. پەیڕەوانی ئەم رێبازە گرینگییەکی زۆریان بە "خۆشی دەروونی"و "سەرخۆشی مەعنەوی" دەدا.

سەرهەڵدانی هزری جۆراوجۆر وەك یەکبوویی، حلوولی "جێگیربوونی خودا لە جەستەی مرۆڤدا"، مرۆڤ خوایی و.. لە ناو سۆفییەکاندا، بووە هۆی ئەوەی کە مەلاکان و زانا ئایینییە فەرمییەکان بە لادەر و کافریان دانێن و دەسەڵاتدارانیش بەپشتبەستن بە "فەتوا"ی ئەوان، دەستبدەنە بەندکردن و کوشتن و شاربەدەرکردنیان.

بۆنموونە "حسەین ئیبن مەنسووری حەلاج" کە بە ساحێریان ناوبرد و بنەمای ساحێرییەکەیان گەڕانەوە بۆ "سجاح موتنەببە"ی سەردەمی وەفاتی حەزرەتی محەمەد!





هەروەها "شبلی"و بایەزیدی بەستامییان بەکافر لەقەڵەمدا و بەدەیان و بگرە بەسەدان کەسایەتی لەمجۆرانەیان بە تۆمەتی لادەر و کافر دانا و سزای جۆراوجۆریان بەسەردا سەپاندن. ئەڵبەت هەڵسوکەوتی لەمجۆرە لەگەڵ کەسانی خاوەن بیروبۆچوونی جیاوازدا، بەتایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەی بۆچوونەکانیان لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای زاڵ و بۆچوونی "فەرمی"دا ناگونجێت، تایبەت بە دونیای ئیسلام نییە و بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەناو گشت ئایین و کۆمەڵگاکاندا روویداوە، وەك سووتاندنی "جۆردانۆ بورنو"ی مەسیحی کە دژ بە کۆنەپەرەستی و دواکەوتوویی کڵێسای مەسیحی وەستا و قەشەکان بە زیندوویی سووتاندیان یان مەحکەمە ئایینەکانی ئەورووپای "مەسیحی" کە سەدان کەسیان بە تۆمەتی ساحیر و لادەر و کافر، بە دڕندانەترین شێوە سزادا.. پێویستە بگوترێ کە بۆچوونەکانی "مانی"و ئامۆژگارییەکانی "بووزا"یش لەسەرهەڵدانی "سوفیزم" لە ئێراندا دەوریانبینیوە و بەوردبوونەوەیەکی ئاساییش دەتوانین شوێنپێی ئەو هزر و ئایینانە لەناو شێوازی بۆچوونی سۆفییە ئێرانی و ئیسلامییەکاندا، بە فیرقە جۆراوجۆرەکانیەوە، دەستنیشانبکەین.

ئەگەر لە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی "سۆفیزم"وە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی "حەسەنی بەسری"و ئەو کەسایەتییە بە یەکەم سۆفی دادەنرێت، مێژووی ئەم بۆچوونە لێکبدەینەوە، بۆماندەردەکەوێت کە ئەم قوتابخانە فیکرییە، بەتەواوی لق و پۆکانیەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان لەژێر کاریگەری هزری ئەهلی حەقدا بووە و لێکچوونێکی بەرچاویان تێدادەبینرێت، تاڕادەیەك کە دەتوانین بڵێین هەر هزر و قوتابخانەیەکی عیرفانی دەتوانێت بنەماکانی خۆی لە ئایینی یارساندا بدۆزێتەوە کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرتەسکنەبوون و کراوەیی ئەم هزرە.

حەسەنی بەسری یەکێکە لە "چل تەنان"و پلەیەکی بەرچاوی لە ئایینی یاریدا وەرگرتوە، هەروەها بۆچوونەکانی مەنسوری حەلاج کە ئەویش یەکێکە لە چل تەنان و پلەی "داوود"ی هەیە و بیروباوەڕی "مەلامەتییان"و "فەتیان"یش لەم هزرەدا رەنگیداوەتەوە، تاڕادەیەك کە سوڵتان سەهاك دەفەرموێ:

یاری چوار چێوەن باوڕی وە جا     راستی و پاکی و نیستی و ردا

ئاشکرایە کە "ردا" هەمان جوامێری داشکاو بەلایەنی مەلامەتییەدایە یان خەلسە و جەزەبەی فیرقەی تەیفوورییە کە وێڕای ئەوەی کە بایزیدی بەستامی بۆخۆی یەکێکە لە "چل تەنان"، بیروبۆچوونەکانیشی بەڕاشکاوی لە هزری یارساندا رەنگیداوەتەوە.

هونەر بە گشتی و هونەری موسیقا لە ئایینی یاریدا بایەخێکی زۆری پێدراوە و ژەندنی "تەنبوورە" لە بۆنە ئایینییەکاندا، بەتایبەت لە داخستنی جەمدا و لەگەڵ ئەوەشدا زیکر و خەلسە و جەزەبە و ئەنجامی کرداری "خارق العادە" زۆر باوە. پێویستە بگوترێ جەزبە و خەلسە بەشێکە لە عیرفان و لە زۆربەی ڕێبازە سۆفیانەکاندا بەرچاودەکەوێت کە لەئاکامدا دەبێتە هۆی تەسلیمبوونی ڕۆح بەرانبەر بە جوانیناسی هۆنەر و لەخۆبیخود دەبێت، بۆیە لە زۆربەی ریوڕەسمی ئایینی خویاندا بە "تەنبوور" لە مەقامی "لەخۆ بیخود بوون"دا قەراردەگرن و کارگەلێکی سەیر و سەمەر لەخۆیانەوە پێشاندەدەن. نووسەری "طرایق الحقایق" دەیگێڕێتەوە کە لە ڕۆژانی موجتەبا ئاغا محەمەد عەلی کرماشانی تایفەی سوفییە لە خزمەت ئەودا دەرسم دەخوێند. کەسانێکی لەسەر ڕێگا دانابوو کە دەرویشەکان بێنن بۆ میوانی ئەو، بەسودفە ڕۆژێك پیاوێك کە "باباتەیمور" "شاتەیموور"یان پێدەگوت بە تەنبوورەوە هینایانە خزمەتی. بیهینن. لێیپرسی، بنەماکانی دین چەند دانەن؟ ئەو کەسەیش بەهەمان سازەکەی، دەستیکرد بە ژەندن و فەرمووی: مەگەر بنەماکانی ئایین وەك شاگەرانە و هەروەها بەدەم قسەوە دەگەڕا و تەنبووری دەژەند و دەیخوێند:

یکتاست یارما بیهمتاست یارما

پاشان لە نزیك درگای ماڵ وەستا و وتی: مەگەر بەحاکمبوویت کە ڕێگا بە زایرەکان دەگریت و جا لە ماڵ هاتەدەر. مەجلیس وایلیهات کە هیچکەس نەیتوانی قسەیەك بکات و ئەویش بەزووترینکات لەبەرچاو ونبوو.

دەگێڕنەوە کە گوایە پەیڕەوانی ڕێبازی "موشەعشەعییە" لەکاتی شەڕدا دوعایەك دەخوێننەوە کە شمشێر کاریانلێناکات هەروەها "ئیوانۆف" لە زمانی "ژۆکوڤسکییە"وە دەگێڕێتەوە کە لەکاتی هێرشبردنیان بۆ خوراسان، لەحاڵێکدا کە بەشێك لە لەشکری "گۆران"ەکان شەڕیاندەکرد، گروپێکیان خەریکی زیکربوون و هەر بەمبۆنەوە تیری دوژمنەکانیان بەرنەدەکەوت، هەروەها لەهەمان لاپەڕەدا نووسییویەتی جارێکیان "شاه نیعمەتوڵڵا کرمانی/ ١٤٣١- ١٣٢٩ " لەگەڵ یەکێك لە دەروێشەکانی ئەهلی حەقدا سەرقاڵی زیکر بوون، کەسێك بە شمیشێر هێرشیکردە سەر ئەو کەسایەتییە، ئەو زاتە پیرۆزە هەستی بە زەربەی شمشێرەکە نەکرد، بەڵام کاتێك کە هاتەوە سەرخۆی چاوی بە هێرشبەرەکە کەوت کە سەریبڕابوو و لاشەکەی لە





گوشەیەکدا کەوتبوو(٢). ئەم ڕووداوە هەمان چیرۆکی "سبحانی ما اعظم شاني" بایەزیدی بەستامی وەبیردەهێنیتەوە.

نووسەری کتێبی "طرایق الحقایق" دەربارەی فیرقەیەکەوە کە دەچوونە ناو ئاگر و بە "حسێنولڵاهی " دەناسرین و نووسەر خوی لە شەوی نۆهەمی مانگی موحەڕەمدا کردارەکانیانی بە چاو بینیوە، دەنووسێت: بۆئەوەی باشتر ئاگام لە کردارەکانیان بێت، ئیزنم لێوەرگرتن و لێیاننزیکبوومەوە، ئەو جەماعەتە دوای دوو سێ کاتژمێر شیوەنکردن و گەڕان و هەڵسووران بەدەور ئاگرەکەدا، هەشت نۆ نەفەریان بەدەم شیوەنەوە چوونەناو ئاگرەکەوە و تانزیك ئەژنۆیان لە پشکۆدا بوو، بەڵام بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات کە ژێرپێیان پشکۆیە و ئەوەندە بەناو پشکۆکاندا سووڕانەوە، تا هەمووی دامرکا و بوو بە خەڵووز(٣).

سەبارەت بە هزری یارسانی پێویستە بگوترێ کە پێش لە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی تەسەوەف "سۆفیزم" عیرفان پەرەیسەند، بەتایبەت لە کوردستاندا، ئەم هزرە کە لەسەردەمی "میترائیسم"ەوە سەریهەڵدابوو بەوەرگرتنی گشت ئەو حەقیقەتانەی لەدرێژایی مێژوودا بۆ مرۆڤەکان ئاشکرابوون، خۆی دەوڵەمەندکردبوو و لەوپەڕی گەشەسەندنداببوو. دواتریش فیرقە جیاجیاکانی تەسەوف دوای سەرهەڵدانیان ئاوێتەی هزری یاریی بوون، کە لێرەدا ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین.

کەواتە نابێت و ناتوانین یارسان بەیەکێك لە فیرقەکانی غالی بزانین و بەوشێوە پێناسەی بۆبکەین، بەتایبەت کە بنەماکانی ئەم هزرە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش لەسەرهەلدانی زەردەشت. لە واقیعدا دەتوانین بڵێین دانیشتوانی زاگرۆس وێڕای پاراستنی بیروبۆچوونەکانی تایبەتی خۆیان، تا سەرهەلدانی شاخۆشین لە هەر ئایین و ڕێبازێك کە بەدرێژایی مێژوو دەرکەوتووە بەهرەمەندبوون و توانیویانە حەقیقەتەکانی هەر ئایینێك وەربگرن و لەهەمانکاتدا بنەما فیکرییەکانی خۆیان بپارێزن، بەمپێیە بە وتەی "ئەبوو مەنسوری عەبدولقادری بەغدادی" یارسانەکان لەبنەڕەتدا "مەجووس"ن و مەجووسەکان چوار فیرقەن: مەجووسییەکان، مەسخییەکان، خوڕەمییەکان و بێهئافەریدییەکان(٤)، کە هەر چوار فیرقەکە لە یارساندا تواونەتەوە و ئاوێتەی ئەم هزرە بوون. کەواتە یارسانەکان هەر ئەو مەجووسانەن کە قورئان لە سورەتی حەج ئایەتی ١٧دا ئاماژەی پێکردوون و ئەوانی بە ئەهلی کیتاب داناوە. دەربارەی ئەفکار و بیروڕای یارسانی ئەبێ بڵێین کە پێش فۆرماسیونی سوفیگەری و عیرفان و پەرەسەندنی

لە ناوچەگەلی جوراوجور بەتایبەت لە کوردستان، ئەم وینینە سەیری تەواوبوونی خوی لەسەردەمی "میهر"ەوە تێپەڕاندووە و بە هەڵگرتنی ئەو حەقیقەتانەی کە لە دریژەی مێژوودا بو ئینسان دەرکەوتووە بە کامیلترین شێوە جیلوەی کردووە کە دواتر تەریقەتگەلی جۆراوجۆری سوفیگەری دوای فۆرماسیون، لەگەڵ وینینی یارسانی تێکەڵاوبوون کە بەشێك لەوانە دەخەینە بەرباس.

بەهۆی ئەوەی کە ئایینزاگەلی "غەلات" لەدرێژەی مێژووی خویاندا تووشی زەبر و ئازار و ئەشکەنجە و سەرکوتکردن بووگن، روانگەی یارسانی کارگەلێکی وایکردووە کە ئەم ئایینزاگەلە بە شێوازی نهێنی لەو سەرکوتکردنە دووربکەون و ئەمری ئایینی و پڕوپاگەندەی دینی خویان درێژەبدەن.

یەکێك لە هۆکارگەلی باسکراو کە پێشتر باسی لێکرا نزیکبوونی باوەڕی ئایدیۆلۆژیکی ئایینزاگەلی "غەلات" لەگەڵ یارسانی وەك مرۆڤ خودایی، ڕێزلینان لە کەسایەتی حەزرەتی عەلی "دروودی خودای لەسەربێت"و ئیمامەکان، بڕوا بە گەڕانەوە، یەکگرتنەوە، سەرهەڵدان، وەحدەتولوجود و فرەباوەڕی یان فرە ناسینییە.

هەروەها یەکێکیتر لە هۆکارگەلێك کە دەتوانین ئاماژەپێبدەین هەبوونی مینتالیتەی کراوەی یارسانی و قبوولکردنی خەڵکی سەرەڕای ئایین و بڕوا و بیروبۆچوون و ئایدیایە. ئەو شێوە نیگا دڵفراوانە لای یارسانی دەبێتە هۆی دڵکراوەیی و دڵفراوانی لە کێشەگەلی کۆمەڵایەتی و رامیاری سەبارەت بە ئەویدی و بۆیە لە کۆمەڵگای یاریدا هەرگیز روانینی قینەوەرانە و دۆژمنیکردن لەگەڵ پەیڕەوکەرانی ئایینگەلیتر نابینریت. ئەمشێوە روانینە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئایینی یارسانی هەر لە "خوزستان" تا "روسیا" زۆرتر لە شەڕ و قین و دۆژمنی خەریك پتەوکردنی پیوەندیگەلی ئایینی نێوخۆ بیتەوە و ئەو حکومەتانەش کە لە دڵی ئایین و بۆچوونی یارسانی سەرهەڵدەدەن کەمتر سیمای شەڕ و دۆژمنی و سەرکوتکردنی ئەویدیان پێوەدیاربێت.
بەپیچەوانە دەبینین کە ڕێز و حورمەتی ئەویدیش دەگیردرێت کە دەتوانین جیگەپێی ئەم ئیدیعایە لە حکومەتگەلی سەفەوی و لەشکەری قەرەقۆیونلوو و نادرشا و زەندییە و.. بدۆزینەوە. هەر ئەم شتە بووە هۆی ئەوە کە کەسایەتی "غالی" یان هەر کەسایەتییەکیدیکە کە دەچووە ژێر حیمایەی یارسانەوە بەپاراستنی بیروبۆچوونی پێشووی خوی، بێتە پێناسەکەری ئایینی یارسانی کە بەو دڵفراوانییەوە قبووڵیکردووە و لە مەترسی نەیاران پاراستوویەتی.





ئەم باسە لە دواییدا دەبێتە هۆی ناکوکی نێوان کۆمەڵگای یارسانی بەتایبەت دوای سەردەمی "پردیوەر". ئەهلی حەق فیرقەیەکی عیرفانی بووە کە جگەلە سوفیگەری و حیکمەتی ئیشراقی، ئیدەگەلێك لە بیروڕای جوولەکە و مەجووس و مانەوییەتیشی لەگەڵ برێك لە ئەفکار و ئەندیشەگەلی شێعە و "غەلات" بەتایبەت "دروزییە"و "نەسیرییە" تێکەڵاوکردووە و هیدیهیدی رەگەی سوفیگەری لەم ئایینەدا بەهێزتربووەتەوە.

بۆ راڤەکردنی ئەندیشە، ئایدیا و وتەکانی ئەم ئایینە، دەبێ ئاشنایەتیمان لەگەڵ هەموو شاخەکانی مرۆڤناسی بێت.

ئەڵبەت ئەو باسە کە سەبارەت بە ئەهلی حەق دەکرێت کە گوایە یەکێك لە شاخەگەلی "غەلات"ە یان ئەفکار و ئەندیشەگەلی سوفیانەتیدا دەستی باڵای هەیە ناتوانێ دروستبێت لەبەرئەوەی کە زۆریەك لە ئایین و ئەندیشەکان بەبێ ئەوەی هەڵگری بیروبۆچوونی یەکتربن لەبرێك ڕێوڕەسمدا لەیەکدەچن، هەروەها بەپێی ئەم روانگەیە یارسان لە قۆناغی حەقیقەتدایە و جگەلە حەقیقەت و قووڵترین ئەندیشەکان، هیچکیتر قبووڵناکات و لەبەرئەوەی هەموو ئایینەکان ــ چ ئاسمانی و چ نائاسمانی ـ هەڵگری بەشێك لە حەقیقەتن، ئایینی یارسانی بە هەڵگرتنی حەقیقەتی ئایینەکانیتر دەگەیەتە ئەوپەڕی پێگەیشتن و کەماڵ.

ئەم بارووداۆخە بووەتە هۆی ئەوە کە زۆربەی پسپۆڕان، وینینی یارسانی وەك یەك ئایین تێکەڵاو لە "میهرپەرستی"، "زەردەشتیگەری"، "زروانیسم"، "هیندۆدیسم"، "بوودیسم"، "ئایینی کۆنفۆسیۆسی"، "خاچپەرستی"، "مانەوییەت"، "مەزدەکیسم"، "ئیسلام"، "ئیسلامی سوفیگەرانە" یا "ئایینزاگەلی غالی"و تەنانەت فەلسەفەی مودرنیسمیش پێناسەبکەن.

ئەڵبەت نابێ ئەوە لەبیربکەین کە بۆ لێکچوونی یارسان لەگەڵ ئەم ئایینگەلە لەباری ئەندیشە و ئایدیۆلۆژی، دەتوانین نیشانەگەلێك فرە لە کەلامی سەرەنجامدا بدۆزینەوە. یەکێکیتر لە هۆکارگەلی ئەم جۆرە روانین و پێناسە لەلایەن پسپۆڕانەوە، تێنەگەیشتن لە رەمز و رازی وینینی ئەهلی حەق بووە. لەبەرئەوەی کە ئەم ئایینە بەدریژایی هەبوونی خوی، باسی داهاتوو و تەوەرگەلی جوراوجور دەکات، بۆنموونە "شاخوشین" "سەدەی چوارەم"، "باباسەرهەنگ" "سەدەی پینجەم".. یا "باباناوس سەرگەتی" "سەدەی شەشەم" کە سەریهەڵداوە هەموو شایەتی لەسەر سەرهەڵدانی سولڵتان ئیسحاق لە سەدەی حەوتەم دەدەن.

لەواقیعدا، یارانی تایبەت بەدرێژایی زەمەن، لە ئیسلام بەرەو ئەملا، وردەکاریگەلی سەرەتایی سەرهەڵدانی سوڵتان ئیسحاقیان وەدیهناوە و تەنانەت لەم کەلام-گەلەیش-دا "کەلامگەلی پێش پردیوەر" ناوگەلی زاتیان لە پردیوەردا وتووە و دوای ئەوش کەسانێك هاتوون کە لەسەر تەوەری ئایندەبینی پیداگریانکردووە ئەمە لەحالێکدایە کە هیچکام لە ئایینزاگەلی "غەلات" پێشتر ئەم باسەیان نەهیناوەتەئاراوە. لەواقیعدا ئەمە ئایینزانی "غەلاتە" کە بەشێکە لە ئەهلی حەق لەبەرئەوەی کە ناوونیشانی هەموو ئەم ئایینزاگەلە ئەهلی حەقدا هەیە و هەموو ریبەرانی لەباری دەروونی و پیوەندی مەعنەوی گەیشتوونەتە ناوەندی بنیاتی ئەهلی حەق و لەگەڵ ریبەران و گەورەکانی ئەهلی حەقدا یەکیکن هەر ئەوجۆرە کە پێشتر باسکرا بنەڕەتی ئەم روانگەیە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ پێش لەدایکبوونی زەردەشت و لەواقیعدا خەڵکانی دانیشتووی زاگروس بە پاراستنی بیروبوچوون و بڕواگەلی سەردەمی خۆیان تا سەرهەڵدانی شاخوشین، لە هەر روانگە و وینینی ئایینی کە لە دریژەی مێژوودا سەری هەڵداوە بەهرەیان وەرگرتووە و ئەگەرچی بەشێك لە حەقیقەتەکانی ئەو ئایینەیان وەرگرتووە بەڵام بڕواگەلی کۆن و رەسەنی خۆیان هەروا پاراستووە.

کەوایە بەپێی وتە ـ بەڵگەی "ئەبومەنسورعەبدولقاهیر بەغدادی" یارسانییەکان لە مەجووسن کە دەبنە چوار گرووپی "زروانیان"، "مەسخیان"، "خورەمیان"و "بەئافەریدان" کە هەر چوار گرووپی تێکەڵاوە ئایینی یارسانی دەبن، بەمجۆرە "یارسانی" ئەو "مەجووسانەن" کە قورئان لە سوورەتی حەج ئایەتی١٧ ئاماژەپیپێدەکات و ئەوان وەك "ئەهلی کتێب" پێناسەدەکات، هەروەها دەتوانین بە سەرزەوی زاگروس بەتایبەت هەورامان و ریگا شاخاوییەکەی ئاماژەبدەین کە دێرتر لە ناوچەگەلیتر تەسلیمی ئیسلام دەبن. لەم بەشە لە باسەکەماندا چەند ژێرشاخەی ئایینی وەك "عەلەوییە"، "بەکتاشییە"، "سەفەوییە"، "حروفییە"، "موشەعشەعییە"، "نووربەخشییە"، "حەیدەرییە"و پیوەندی کۆمەڵایەتی و لێکچونگەلی فیکری هاوبەش نێوان ئەو ئایینزا و ئایینی یارسانی دەخەینەبەر لێکولینەوە ئەڵبەت یارسان لەگەڵ کەسایەتیگەلی سەربە فەلسەفە و ئایینی جۆربەجۆریش لێکچوونگەلێکی هەیە کە هەر لەسەرەتا تا سەردەمی قاجار دەتوانین ناویانلێببەین. یەکێك لەوانە "ئیبن عەرەبی"یە کە فەلسەفەی فیکری ئەو "وەحدەتولوجود" بووە یان "شیخ-الدین سهروردی" کە باس لە دوو تەوەری عەقڵ و عیشق دەکات و لە تیۆری خوداناسیدا فەلسەفە و باوەڕی خوی پێناسەدەکات. یارسانیش بە قایلبوون بە "وەحدەتولوجود" ئەڵبەت بە روانین بە یەکتاپەرستی ئەژماری و هەبوونی تەواوییەتی





یەکتاپەرستی ئیشراقی ـ گرینگیدەدات بە دوو تەوەری عەقڵ و عیشق، بەواتا هەم یاسا و ئەخلاقی هەیە کە روانگەی کۆمەڵناسی ئەوەیە و هەم عیشق و ئوستورەی هەیە کە باسی میتافیزیك دەکات.

لە تورکیای ئەمڕۆدا کە بەشێکە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پیشوو، چەند ئایین و رێبازی فیکری پەرەیانسەندووە و تا هەنووکەش بوونیان هەیە کە لەوانە دەتوانین ئاماژە بە بەکتاشییە[٥]، عەلەوییە، ئەهلی سوننە و ئەهلی شەریعەت بکەین.

ئایینی سوننە ئایینی فەرمی و گشتگیری تورکیای عوسمانی بوو و رێبازی بەکتاشییش، بەهۆی بڵاوبوونەوەی لەناو سوپای تورکیا "یەنیچری"یەکاندا لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە پشتگیریلیدەکرا. لە تورکیای ئەم سەردەمەدا جیا لە ئایینی فەرمی، بەکتاشیگەریی و عەلەوییە دوو رێبازی فیکری بەرچاو و دیاریکراو بوون کە بەنهێنی سیریمونیای ئایینی خۆیان بەڕێوەدەبرد و لەسەرەتادا پەیوەندییەکی ئەوتۆشیان لەگەڵ یەکدا نەبوو.

بەکتاشییەکان لە ناوچەکانی "رۆمئیلی"واتە لە بەشی رۆژئاوای عوسمانی و لە ناوچە داگیرکراوەکانی ئەورووپادا نیشتەجێبوون و عەلەوییەکان کە "قیزیلباش"یشیان پێدەگوترا، لە بەشی رۆژهەڵاتی عوسمانی، نزیك سنوورەکانی ئێران نیشتەجێبوون، بەڵام بەپێچەوانەی رێبازی بەکتاشییە کە لەلایەن حکومەتەوە پشتگیری لێدەکرا، عەلەوییەکان بەهۆی نزیکی بیروبۆچوونەکانیانەوە لە ئایینی فەرمی حکومەتی "سەفەویە" لەلایەن حکومەتەوە وەك دوژمن سەیریاندەکراو رووبەرووی عەزیەت و ئازار دەبوونەوە. دوژمنایەتی لەگەڵ عەلەوییەکاندا کە ئیشق و قیزیلباش و رافزیشیان پێدەگوترا، بەتایبەت لەسەردەمی سوڵتان سەلیمدا گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. پەیڕەوانی ئەم ئایینزایە، بەمەبەستی سووککردنەوەی گوشاری حکومەت، نکۆڵیان لە ناسنامەی نەتەوایەتی خۆیان دەکرد و خۆیان وەك تورك دەناساند، ئەم نکۆڵیکردنە تا هەنووکەش هەر دەبینرێت، بەڵام بەبەردەوامی لەسەر بیروباوەڕی ئایینی خۆیان پێداگرییانکردووە. ئەڵبەت ئەو گوشار و سەرکوتکردنانەش بێبەرپەرچ نەبووە و تائێستا بووەتە هۆی چەندەها سەرهەڵدان و شۆڕشی عەلەوییەکان لە کوردستاندا. زۆربەی عەلەوییەکان لە شار و ناوچەکانی سیواس، دەرسیم، تکە، حەمید و زولقەدر نیشتەجێن. ئەڵبەت نە ئەوەی کە هەموو قیزیلباش و عەلەوی بەتەواوی کورد بزانین بەڵکو لە کتێب و پەرتووکەکاندا نیویك لە کوردبوونی عەلەویان نەبراوە و وەك "تورکی قیزیلباش" پێناسەکراون، بۆنموونە "گردلیفسکی" دەنووسیت:

"گومان لەوە-دا نییە کە قیزیلباشەکان، لە تورکە شێعەکانن کە لەژێر کاریگەرییەتی خاچپەرستی "کەنیسەی گریگوری ئەرمەنی"و باوەڕگەلی مێژینەیی ئاسایی کۆندا ریگەی نویی ئایینی خویان دۆزیوەتەوە. دەربارەی سەرهەڵدانی عەلەویگەری دەبێ بڵێین کە ئەو بزووتنەوەیە وەك زۆربەی سەرهەڵدانەکانیدیکەی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیهەمی زایینی واتە سەردەمی سەرهەڵدانی "مانی" کە لەژێر کاریگەرییەتی ئیسلام، ئەندیشە و بیروبوچوونی سوفیگەری و خاچپەرستیشی لەنێو خویدا جیگەکردووەتەوە. عەلەوییەکان بڕوایان بە گەڕانەوە و دوورنادووریش هەیە و رێبەری ئایینی خویان بە "دەدە" ناودەبەن یەکێك لە رێبەرانی عەلەوییە "چەلەبی ئەفەندی"یە کە لە سەدەی بیستەمدا ژیاوە. دەدە لە بنەماڵەیەکی تایبەت بەناوی "شیخ خوییار"ە و ماڵی ئەو زۆرتر جێگای کۆبوونەوەگەلی ئایینی "جەمە". لە رێوڕەسمی جەم کە "دەدە" بەرپرسایەتیدەکات "سەماع"یش دەکریت و بەوجۆرەیە کە "دەدە" سروودی ئایینی دەربارەی پلەی بەرزی حەزرەتی عەلی دەخوینیت و هاوکات لەگەڵ ئەو سرووده جۆریك "سەماع"ی عیرفانی پەیدادەبێت. عەلەوییەکان هەموو پینج شەبانە بەرۆژوو دەبن و هۆی ئەو رۆژووگرتنە، شەهیدبوونی حەزرەتی عەلی لە رۆژی پێنج شەممە دەزانن. کەعبەی عەلەوییان مەرقەدی حاجی بەکتاشە کە رۆژی دەیەمی مەحەرەم، کاتی بەرێوەچوونی رێوڕەسمی حەجی ئەوان دەبێت بەڵام نابێ لەبیربکەین کە مەرقەدی گەورەپیاوانی موسڵمان و سەییدەکانیش بۆئەوان جێگای رێزو حورمەتە و پایەبەرزانە سەیریدەکەن کە ئەمەش هەبوونی پیوەندی نێوان یارسانی و عەلەوییە دەسەلمینێت.

"بیورووك" یان "بیارق" کتیبێکە کە پەندی ئایینی و مەسایلی دینی عەلەوییەکانی تیدایە و کتێبی پیروزی ئایینی رێزی دەگیردرێت. "زۆربەی کتێبە پیرۆزەکانیان لە کاتی شەڕی تورك و رووس لەناوچووە".

قیزیلباشەکانی تورکیا لە ئاخافتندا خویان وەك "عەلەوی" پێناسەدەکەن. دەروێشیکی ئەهلی حەق بە منی وت: لە تورکیا ئیمە بەنێوی عەلەوی دەناسن.. نووسەرانی بەشی کوردستانناسی لە ئینسیلکوپدیای بریتاینکا "سیرئیح. راولیسنون و سیر چارلز دەبلیو ویلسون"، عەلیئلاهی دویسم و ئەهلی حەقی زاگروس لە تەنیشت یەکدا وەسفدەکەن.

پێویستە ئاماژەبکرێت کە لەسەرچاوە کۆنەکاندا هیچ ئاماژەیەك بە کوردبوونی عەلەوییەکان نەکراوە و بەبەردەامی بە "قیزیلباشی تورك" ناویانلێبراوە.





بەهەرحاڵ، سەرهەڵدانی رێبازی عەلەوی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی حەوتەم و هەشتەم، واتە ئەو سەردەمەی کە پیربنیامین رووەدەکاتە تورکستان و لەو وڵاتە چالاکی ئایینی دەنوێنێت. ئەڵبەت لە تورکیای ئەو سەردەمەدا، بێجگەلە "ئەحتییە"کان و پەیڕەوانی "شێخییە"، فەلسەفەی یەکبوویی و عیرفانیش بەشێوەیەکی زانستیانە لە تەکیە و خانەقاکاندا دەگوترایەوە، بەڵام بەهۆی چالاکییە ئایینییەکانی "شێخ عەلی سیاپۆش"و "شێخ حەیدەر"و "شێخ جونەید"وە کە هەرسێکیان لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە پشتگیریانلێدەکرا، لە ناوچەی ئاناتۆلی پەرەیسەند، هەروەها دەتوانین ئاماژە بە چالاکی کەسایەتییە یارسانییەکان لەو ناوچەیە بکەین. وەك "حسەینی سیاکووهی" کە لەسەرئەنجامدا بە "گلێمەکۆڵ" ناویلێبراوە و لەگەڵ یارانی خۆیدا رووەدەکەنە بۆچوونەکانی "پردیوەر"، هەروەها "شاوەیس قولی"ش لە وڵاتی تورکستاندا، لەو ناوچانەی کە عەلەوییەکان نیشتەجێبوون، چالاکی دەنواند. دوای ئەوان دەتوانین ئاماژە بە "یەعقووبی قووشچی ئۆغلی" بکەین کە بەباوەڕی هەندێك لایەن، یەکێك لە "بازبان"ەکانی سوڵتان سەلیم بووە و بەهۆی رووداوێکەوە دەست لە کارەکەی هەڵدەگرێت و دەبێتە یەکێك لە یارانی "شائیبراهیم"و پاش ماوەیەك دەچێت بۆ تورکستان، هەروەها کوڕی یەعقووبی قووشچی ئۆغلی کە یەکێك لە شاعیران و "کەلام"زانان و گەورەکانی یارسانی لە وڵاتی تورکستان بووە، ئەم کەسایەتییە لەکاتی خۆیدا سەرئەنجامی وەرگێڕاوەتەسەر زمانی تورکی.

لە دوای ئەم کەسایەتییانە دەتوانین ئاماژە بە "محەممەد بەگ"و نەوەکانی، وەك "خانئاتەش" بکەین کە لە ناوچەی ئاناتۆلیدا چالاکی ئایینیان بووە. بەهەرحاڵ لێکچوویی و پێوەندی یارسانییەکان و عەلەوییەکان تاڕادەیەکە کە زۆرێك لە توێژەران و کەسایەتییە سەرەکییەکانی عەلەوی بە ئالاهەڵگرانی یارسان دادەنێن. ئەڵبەت هەروا کە پێشتر ئاماژەمپێداوە، کەسایەتییە سەرەکییەکانی یارسان لەسەرچاوەکاندا بە "نازناو" ناویانلێبراوە و هەرئەمەش وایکردووە کە هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نەبێت بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئایا ئەو کەسایەتییانە لەسەرهەڵدانەکانی عەلەوییەکانی ئاناتۆلیدا بەشدارییانکردووە یان نا؟ بەڵام نکۆڵی لە پەیوەندیی و لێکچوونی باوەڕە ئایینییەکانیان ناگرێت و دەرکەوتنی شاوەیس قولی و قووشچی ئۆغلی و محەممەد بەگ لەو شوێنانەی کە عەلەوییەکان نیشتەجێن، رێخۆشکەربووە بۆئەوەی کە "خان ئاتەش" هزری یارسانیان باشتر پێبناسێنێت و باوەڕەکانی ئەم ئایینە زۆرتر لێکنزیکبێتەوە. هەرئەمەش وایکردووە کە تائێستاش ئەو ئاواتەی بۆ ناساندنی عەلەوییەکان

بەکاردەبرێت، زۆربەیان نـاوی بنەماڵـە و کەسـایەتییە یارسـانییەکان بـن. لەوانـە: ئەبـداڵ بـەگ، ئاتەش بەگ، نەبی لی، عەلی ئەڵڵاهی و.. هتد، هەروەها داخستنی "جەم"و قوربانیکردن لـەناو عەلەوییەکانـدا لـە یارسـانەوە وەرگیـراوە. سـیرێمونیای "سـەماع"یـش لـە "چـۆپی ڕەمزبـاری" یارسانەوە وەرگیراوە، بەکارهێنانی "تەمبوورە"ش لە بۆنە ئاینییەکانـدا، لێکچوونێکی تـەواوی لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو سازەدا لەلایەن یارسانییەکانەوە هەیە.

دانانی "سمێڵ"یش وەك ڕەمزێکی ئایینی لەناو هەردوو ئاییندا باوە. سەبارەت بە بەکتاشـییەکان دەتوانین بڵێـین هەرچـەند لـە درێـژایی مێژوویانـدا بێگیروگرفـت نـەبوون، بـەڵام بەبـەراورد لەگـەڵ عەلەوییەکاندا لە بارودۆخێکی باشتردا ژیاون.

"بەکتاش" بەباوەڕی یارسانییەکان و بەپێی سەرچاوە کەلامییـەکان، هـەمان "سـوڵتان سـەهاکی بەرزنجی"یە کە لەنێوەراستی دەرەی پردیوەردا سەردانی باکووری کوردستانی کردووە و لە ئاسیای بچووکدا بناغەی "بەکتاشییە" داناوە و دواتر لەلایەن "بـالیم سـۆڵتان"و گـەورە شـاعیرانیترەوە، وەك "قایغوسزئەبدال"[٦]وە کـە "بنیـامینی مێهمـان" بـوو و هـەروەها "پـیر سـوڵتان ئەبـدال"و "مریـد قـول هیمـەت پەرەپێـدراوە. پیرئیـسماعیلی کـەوەلانی "یـەکێك لـە حـەفتا و دوو پـیر" لەمبارەوە دەفەرموێ:

ئەو بەکتاشیان،..

بارگەی شام  وەستەن ئەو بەکتاشیان
نە پردیوەردا شام وەستەن سڕخان
نە حاجی بەکتاش  بروزدا نیشان
نییاش تـەریقەت دین عەلەویان
هەفتەنان  چـەوگا یورتشان زییان
قایاقسز بنیام چەوگا بی عەیان
گول بابا داوود میرد رووی مەیدان
شاهین بیانی مـوسی دەفتەرخوان
موستەفا چەوگا نامش بی عوریان
ڕەمزبار بی عبدال ئیسمش بی ویران
زەردەجام غەزەل دەدەبی سولتان





ئەیوەت نامش بی توراب ئەو زەمان
هەفتە نان ئید بی چەوگا یورتشان
پادشام هەر وەختی ڕەنگی دا نیشان[٧]

بەپێی نامیلکـەی "بـساتی" کـە لەسـەردەمی "شاتەهماسـب"ی سـەفەویدا نووسـراوە و عەلەوییەکان بە"مناقب و فرمایش بزرگ" ناویلێدەبەن، وا دەردەکەوێ کە بنـەماکان و بۆچـوونە بنەڕەتییەکانی بەکتاشییە هەمان بنەماکانی ڕێبـازی "ئەخییـە"ن و بـیری "ئەوپـەڕگری" تێیـدا ڕەنگیداوەتەوە، هەروەها سەرچاوە مێژووییەکان دەریدەخەن کە بەکتاشییە لە کۆندا لەگەڵ یەکێك لە ڕێبازە سۆفییەکان کە بە "ئەیدالانی ڕۆم" ناوبانگیان دەرکردبـوو، پەیوەنـدییان هـەبووە. هـەر بەم بۆنەوە بەکتاشییەکان بە "ئەبدالانی بەکتاشی"ش ناویانلێبردراوە.

لـە ڕێبـازی بەکتاشییەشـدا، وەك ڕێبـازە سـۆفییانەکان و ئەوپـەڕگرەکان، هەنـدێك لـە عیباداتی تایبەت لـەجیاتی حوکمـە شـەرعییەکان دادەنرێـت وەك: نـاردنی سـەڵەوات بـۆ دوانـزە ئیمامی شیعە لە هەموو بەیانی و ئێوارەیەکدا. خویندنی دوعای "نادعەلی"، نەخواردنەوەی ئاو لە دەرۆژی دەستپیکی مـانگی موحەڕەمـدا. داننـان بـە هەڵـە و گوناهـەکان لـەلای "باباشـێخ" لەدوای مانگی مەحەڕەم، هەروەها بەشێوەی یارسانەکان ڕۆژی یەکەمی ساڵ، واتە ئەوڕۆژەی کـە هەتاو لە "بورجی حەمل"دا نیشتەجێدەبێت، بە ڕۆژی لەدایکبوونی سوڵتان سەهاك دەزانن.

ڕۆژی نەورۆزیـشیان بـەلاوە پـیرۆزە و بـە ڕۆژی لـەدایکبوونی حـەزرەتی عـەلی دەزانـن و ڕێزیلێدەگرن، هەروەها لەکاتی دیـاریکراودا سفرەی میهرەبـانی "دەم" رادەخـەن و بەکۆمـەڵ لـە دەوری کۆدەبنــەوە و ســروودی بەکتاشــی "نــەفس" دەچـڕن و "نــەی" دەژەنــن کــە چــۆنیەتی بەڕێوەچوونەکەی داخستنی جەم لەلای یارسانییەکان، وەبیردەخاتەوە. کتێبەکانی بەکتاشـییەکان، وەك یارسانییەکان، زۆرتر لەسەر شیعر دانراون و شیعر لای ئـەم جەماعەتـە بایـەخی هەیـە و بـە زمانی فارسی، تورکی و عەرەبی و ئالبانیایین.

بەکتاشییەکان و عەلەوییەکانی ئاسـیای بـچووك لەسـەرەتاوە پەیوەنـدییان پێکەوەنـەبوو، بەڵام هەنووکە ئەوەندە لێکنزیکبوونەتەوە کە دەڵێی یەك ئایینن و بەراستیش هەروایە. سەبارەت بە شۆڕش و سەرهەڵدانی عەلەوییەکان بۆنموونە دەتوانین ئاماژە بەوانەی خوارەوە بکەین:

شۆڕشی "بابائیسحاق" لەسەردەمی سەلجووقییەکانی ئاناتۆلی لەکاتی "غیاسەدین کەیخوسرەوی دووهەمدا "١٢٤٦- ١٢٣٦ ز" لە ناوچەکانی سیواس، ئاماسییە، توقات، چوورووم و مەلاتییە، هەروەها شۆڕشی "بەدرەین سەماوی" لەسەرەمی حکومەتی محەمەد چەلبی لەناوچەی رۆم ئیلی و بالکان و شۆڕشی "شاقولی بابا" کە "بابا تکەلی " یان قەرابیق "سمێڵڕەش"یشی پێدەگوترا. شاقولی بابا کوڕی "حەسەن خەلیفە" یەکێك لە جێگرەکانی "شێخ حەیدەر" باوکی شائیسماعیلی سەفەوی بوو، شاقولی بابا خەڵکی ئاوایی "یالم لی" سەر بە ناوچەی قورقودایلی بوو و یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی "تکەلو" سەربە عەشیرەتی "تکە ئیلی" بوو و هەر بەم بۆنەوە بە "باباتکەلی"یش ناوبانگی دەرکردبوو، هەروەها لە مانگی زیقعدەی ساڵی ٩٣٣ ی کۆچیدا سەرهەڵدانێك لە ناوچەی "بوزووق" روودەدات کە "قەدری هەرجابابا" ناسراو بە "سولن"و کوڕەکەی "شاوەلی" سەرۆکایەتیدەکەن، هەروەها دەتوانین ئاماژە بە شۆڕشی "سوکلون" قووچەئۆغلی لە ناوچەی بوزقات و بابا زولنوون بکەین، هەروەها شۆڕشی "وەلی خەلیفە" لە تورکمەنەکانی قەراعیسالو و دومووز ئۆغلان "تومووز ئۆغلان" لە ناوچەی ئادانە و شۆڕشی "یەکجە بەگ" لە ناوچەی ترسووس و شۆڕشی "قەلەندەرشا" شایانی ئاماژەن. پێویستە بگوترێت کە یەکێك لەسەرەکیترین هۆکارەکانی ئەم شۆڕشانە زوڵم و زۆر و گوشاری حکومەتی عوسمانی بووە دەرحەق بە عەلەوییەکان کە بەهۆی جیاوازی ئایینیەوە ئەنجامیداون و ئەویش بەبیانووی نزیکی ئایینی عەلەوی لە ئایینی شیعەگەری کە ئایینی فەرمی حکومەتی سەفەوی بووە، گومانی ئەوە دەکرا کە بەم بۆنەوە عەلەوییەکان یارمەتی سەفەوییەکان بدەن. ئەڵبەت راستە کە پێش لەوەی ناوچەی ئاناتۆلی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکانەوە، عەلەوییەکانی ئەو ناوچەیە، بەهۆی نزیکی ئایینیەوە پەیوەندییان بە سەفەوییەکان، بەتایبەت لەسەرەمی شائیسماعیلدا هەبووە، بەڵام دواتر ئەم پەیوەندییە بەهۆی بێسنووری دەستیوەردانەکانی سەفەوییەکان لە کاروباری کۆمەڵایەتی و ئایینی عەلەوییەکاندا، بەرەو لاوازی چووە و ناڕەزایی عەلەوییەکانی لێکەوتووتەوە کە لە رووداوی "چاڵدێران"دا رۆڵی هەبوو.

شەڕی چاڵدێران بەمشێوە بوو کە دوای ئەوەی لە ساڵی ٩١٧ی کۆچیدا "شاقولی بابا" لەگەڵ سوفییەکانیتردا روویکردە ئێران و ناوچەکانی قرامان، سیواس و ئەرزنجانی داگیرکرد و سوپای عوسمانی تێکشکاند و دوو سەرکردەی عوسمانی "قراگووز پاشا"و "سوڵتان بایەزیدخان عەلی پاشا"ی کوشت، "نوور عەلی خەلیفەی روملو لە ساڵی ٩١٨ی کۆچیدا بە فەرمانی





شائیسماعیل بە بیانووی کۆکردنەوەی سۆفییەکان و لایەنگرانی بنەماڵەی سەفەوی، هێرشیکردەسەر خاکی عوسمانی و شارەکانی قەرەحەساری شەرقی و مەلاتییەی داگیرکرد و بەناوی شائیسماعیلەوە خوتبەیخوێند. هەر لەوساڵانەدا یەکێکیتر لەسەرکردەکانی قیزیلباش بەناوی "خان محەمەدی ئستە جانلوو" قەڵای دیاربەکری داگیرکرد و سوپاکەی "عەلائەدولەی زولقەدری" تێکشکاند و بووە هۆی ئەوەی کە ئەو سەرکردەیە تەسلیمی شائیسماعیل ببێت و لە عوسمانییەکان دووربکەوێتەوە. ئەم هێرشانە بووە هۆی لەشکەرکێشی و هێرشی سوڵتان سەلیم بۆسەر ئێران.

سوڵتان سەلیم لەشکەرکێشییەکەی خۆی لە "ئەدرنە"وە دەستپێکرد و لە رێگای "ئاق شەهر"و "سووشەهر"ەوە سنووردەبەزێنێ و دەچێتە خاکی ئێران. پێویستە بگوترێ کە هەڵسووکەوتی شائیسماعیل لە هەمبەر کوردەکاندا بەهەمان ئەندازەی "ئاق قویوونلو"ەکان زاڵمانە و توندوتیژ بوو و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە سەرکردەکانی ئاناتۆلی لە گەڵ "یاوزسوڵتان"دا ریکبکەون.

ئدریسی بەدلیسی لە داگیرکردنی دیاربەکر و ناوچە رۆژهەلاتییەکاندا، رۆڵێکی گرینگی هەبوو و خزمەتێکی زۆری بە حکومەتی عوسمانی کرد. ئەم کاسایەتییە توانیویەتی لەگەڵ ئەمیرە کوردەکان دیدار پێکبهێنێت و هانیانبدات بۆ هاوکاریکردنی دوڵەتی عوسمانی و لە کارەکەیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەم بۆنەوە ئەمیرە کوردەکانی ورمێ، ئێراق، عەمادییە، جیزە، ئەکیل، بەدلیس، خیزران، گارزان، پالو، سیرت، حەسن کیفا، میافارقین، جەزیرەی ئیبنی عومەر و بەگشتی ئەمیری بیست و پێنج ناوچەی لەگەڵ عوسمانییەکاندا رێکخست کە چوار کەس لە ئەمیرە هەرە بەهێزەکانی ئەو سەردەمە، "ئەمیر شەرف خانی بەدلیسی" حاکمی بەدلیس و مەلکی خیزران "ئەمیرداوود"و "مەلك خەلیلی دووهەم" حاکمی حسەین کیفا و "سوڵتان حسەین" حاکمی عمادیەشیان لەگەڵ بوو.

### سەفەوییە

سەفەوییە لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا پەیڕەوانی رێبازی سەفەوییە لە یارسان نزیکدەبنەوە و یەکێتییەك لەنێوانیاندا پێکدێت، ئەوەش لەسەردەمی شێخ سەفییەدینی ئەردەبیلیدا، لە ساڵی ٦٧٥ی کۆچیدا دەقەومێت. لەوساڵەدا شێخ سەفییەدین دەگاتە خزمەت

"تاجەدین ئیبراهیم" ناسراو بە "شێخ زاهیدی گیلانی" یەکێك لە شاگردەکانی "عەینەدین زەمانی جەمالەدین گیلی" شاگردی نەجمەدین کوبرا و ئەویش بەپێی نەریتی ڕێبازەکە بۆ کەمەربەستن دەینێرێت بۆ پردیوەر. چۆنیەتی ئەم ڕووداوە لەسەرئەنجامدا بە وردی نووسراوە[٨].

ئەڵبەت هەروا کە پێشتر ئاماژەمپێکردوە، هزری یاری پێداگری تەواویکردووە بۆ شاردنەوەی "نهینی"ی ئایینەکە و شاردنەوە و نەدرکاندنی ڕاستییەکان و بەنهێنی هێشتنەوەی ناوونیشانی کەسایەتییە ئایینییەکان. هەر بەم بۆنەوە زۆربەی کەسایەتییەکان بە نازناو، ناویانلێبراوە و ڕووداوی چاوپێکەوتنی شێخ سەفی و سوڵتان سەهاك لە پردیوەریش بەئاشکرا باسینەکراوە و لەسەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژەپێنەکراوە.

بەهەرحاڵ شێخ سەفی، دوای چوونی بۆ گەیلان و وەرگرتنی پلەی نوێنەرایەتی شێخ زاهیدی گەیلانی، ڕێبەری ئەو ڕێبازەی وەرگرت و بە ناردنی "خەلیفە" بۆ وڵاتانی دەورووبەر، هەروەها بۆ کوردستان بانگەشە بۆ ئەوە ڕێبازە دەکات و پەیڕەو و لایەنگرێکی زۆر بۆ ڕێبازی سەفەوییە کۆدەکاتەوە[٩].

توانایی و هێزی ئایینی ئەم بنەماڵەیە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ڕێبازەکە و لەئەنجامدا دەسەڵاتی سیاسیان بۆ دەخولقێنێت، ئەڵبەت پێش لەوەدەستهێنانی دەسەڵاتە سیاسی و پێکهێنانی حکومەتی سەفەوییە، کاریگەری زۆریان لەسەر دەسەڵاتدارانی پێش سەفەوییە هەبووە. بۆنموونە دەیگێڕنەوە کە "ئەمیر تەیموری گورکانی" دەستی یارمەتی و دۆستایەتی دەداتەدەست "خواجە عەلی سیاپۆش"و دەبێتە موریدی ئەو[١٠].

ئەمیر تەیموور بۆ یەکەمجار لە نزیك چۆمی فورات و جاریدووهەم لە دزفوول و بۆ سێهەمجار لە ئەردەبیل چاوی بە خواجە عەلی دەکەوێت و لێیدەپرسێت: چ خواستیکت هەیە تا بۆت دابینکەم؟ خواجە عەلی داوایلێدەکات دیلە ڕۆمییکان ئازادبکات، ئەمیرتەیموور ئەو ئارەزووەی بۆ جێبەجێدەکات و گشت دیلەکان ئازاددەبن، هەروەها ناوچەی ئەردەبیل دەکاتە وەقفی شێخ سەفی.

هێز و توانای ئایینی، سیاسی و ئابووری بنەماڵەی سەفەوی لەسەرەمی شێخ عەلیدا سەقامگیردەبێت و پەرەدەستێنێت. گشت دیلە ڕۆمییەکانیش دەبنە سەرسپوردەی بنەماڵەی سەفەوی و دواتر دەچنە ناوڕیزەکانی "قیزیلباش"ەوەو دەبنە هێزی سەرەکی ئەو سوپایە.





بەهۆی گوشاری "جەهانشای قەرەقویونلوو"ەوە "شێخ جونەید" ناچاردەبێت ئەردەبیل چۆڵبکات و ڕووبکاتە دیاربەکر و لەوێ لەگەڵ خوشکی "ئوزون حەسەن" زەماوەنددەکات و لەگەڵ تورکمەنەکانی ئاسیای بچووك پێوەندی بنەماڵەیی پێکدەهێنێت و پاش ماوەیەك بە لەشکەرێکی بەهێزی تورکمانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەردەبیل و لەمکاتەوە پڕوپاگەندەی ئایینی بنەماڵەی سەفەوی دەگۆڕدرێت بۆ چالاکی سیاسی و عەسکەری. دواتر بە ئەمری شێخ حەیدەر گشت موریدەکانی کڵاوێکی سوور لەسەردەکەن کە کڵاوی حەیدەریشی پێدەگوترا. لەوکاتەوە هێزی عەسکەری بنەماڵەی سەفەوی بە قیزیلباش واتە "کڵاوسوور" ناوبانگیاندەرکرد. ئەم هێزە لە هۆز و عەشیرەتەکانی ئاسیای بچووك پێکهاتبوو. وەك هۆزەکانی شاملو "بەگدلو"، عەیدلو، عەرەب گرلو و تلقاز، ئەستاجلو " تایفەکانی کەنگەرلوو شەرەفلو" زولقەدر " تایفەکانی سوکلان و شەمس دین لو و حاجیلەر و قزغلو" قاجار "تایفەکانی ئیگرمی درت" ئەفشار " تایفەکانی ئیمانلو و ئەلپلوو ئەسالو" تورکمان "تایفەکانی پرناك و ئوردە کلو" ئیسپیرلو و ڕۆملو "تایفەکانی قویلاحەسار"و قاراداقلو و بەیات و تالش ئالپائوت و قزاقلوو جاگیرلو و بایبورت لو[١١].

پێوەندی ئەم هۆز و تایەفانە لەلایەن ئیسماعیل، کوڕە بچووکەکەی شێخ حەیدەر، بە بەکارهێنانی موردیدەکان و پەیك و پەیامنێرەکانی لە ئاسیای بچووکدا بەڕێوەدەبریا.

سەردەمی شکۆ و بەهێزی بنەماڵەی سەفەوی پیش لەدایکبوونی شائیسماعیل "٢٥ی ڕەجەبی ساڵی ٨٧٣ ی کۆچی" دەستپێدەکات کە موریدەکان ئەویان بە مورشدی کامل" دادەنا و بە سۆفییەکانی سەربەو بنەماڵە لە ناوچەکانی ڕۆم و قەراجەداغ و ئەهەر کۆدەبوونەوە و دیاری و خەڵاتیان بۆدەبرد. شێخ ئیسماعیل دوای پێنج ساڵ نیشتەجێبوون لە ناوچەی "لاهیجان" سەردەمەکەی بە گونجاوزانی بۆ دەرکەوتن و هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی بەرفراوان، لەژێر ئاڵای سۆفیگەری و ئاییندا، بەبانگەشەکردن بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی شەرعی کە بریتیبوولە حکومەتی "ئیهام مەهدی".

بەمشێوە بوو کە کوڕە بچووکەکەی شێخ حەیدەر دوای چەند ساڵ خۆشاردنەوە لە گەیلان، بەیارمەتی سۆفییەکان و موریدەکانی خۆی بزاڤی سەفەویی کە لەسەردەمی سەدرەدین و خواجە عەلییەوە دەستپیکرد بوو، گەیاندییە دەرئەنجام[١٢].

یەکەم گروپ لە موریدەکانی کە بەهانایەوە هاتن، گروپێکی پێنج هەزار کەسی بوون لە موریدەکانی سووریا و رۆم و پاش ئەوان گروپێکی حەوت هەزار کەسی لە سۆفییەکانی تورکیا و ئاسیای بچووك، کە دەمێك بوو هزری سەفەوییەیان وەرگرتبوو.

تاجرێکی خەڵکی "ونیز" لە ساڵی ١٥١٨ زایینی سەبارەت بە خۆشەویستی شائیسماعیل لەناو موریدەکانیدا دەڵێت: خەڵك ئەو سۆفییەیان خۆشدەوێت و پایەوپلەی تائاستی خوداوەندی بەرزدەکەنەوە. زۆربەی عەسکەرەکانی بێقەڵغان دەچنە مەیدانی شەڕ و هیوایان ئەوەیە کە سەرکردەکەیان "شائیسماعیل" لەکاتی شەڕکردندا چاوی پێیانبکەوێت..، بە سینگی بێبەرگەوە هێرشدەبەن و هاواردەکەن شیك، شیك[١٣].

بەسەرکەوتن و سەقامگیربوونی دەسەڵاتی سەفەوییەکان لە ناوچەکەدا، شائیسماعیل ئایینزای شیعەی دوانزە ئیمامی لە ئێران کردە ئایینی فەرمی و هەرکەس خاوەن بیروبۆچوون و ئایینێکی جیاواز ببوایە، لەناویدەبرد، هەروەها هەستا بەدەستتێوەردان لە ئاسیای بچووك و بە هاندانی ئەو: لە ساڵی ٩١٧ی کۆچیدا، شاقوولی بابای سەرکردەی سۆفییەکانی "تکەلو" هەرێمەکانی: تکە، قرامان و سیواسی رووتاندەوە و زۆر لە عەسکەرەکانی عوسمانی ئەو هەرێمانەی کوشت. بایەزیدخانی عوسمانیش بەهۆی سەرقالبوونیەوە بەدامرکاندنی نافەرمانی کوڕە بچکۆڵەکەیەوە، نەیدەتوانی بەتەواوەتی بەرەنگاری ئاژاوەچییەکان ببێتەوە و تەنیا بە نووسینی نامەیەکی نارەزایی بۆ شائیسماعیل پەسەندیکرد، بەڵام دواتر فەرمانی دوورخستنەوەی شیعەکانی ئاسیای بچووکی بۆ سوریا لە ساڵەکانی ٩٠٧و ٩٠٨ی کۆچی" دەرکرد.

باروودۆخی قەیراناوی و شۆڕشی بەربڵاوی شیعەکانی "تکە" لە ساڵی ٩١٧ کۆچی دەریخست کە ئەو بەشە لە ئاسیای بچووك لەمێژبوو ناوەندی بۆچوونە ئایینییە جۆراوجۆرە تازەکانە و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە دوای کوژرانی بایەزید بەدەستپێکی حکومەتەکەی لە وەرزی بەهاری ساڵی ٩١٨ی کۆچیدا، بارودۆخی شیعەکانی ئاسیای بچووك بەرەو خراپی بڕوات و مەترسی شۆڕشی سەرلەنوێیان و هێرشی سەفەوییەکان، سوڵتان سەلیمی گەیاندە ئەو قەناعەتە کە شیعەگەری لە وڵاتەکەیدا قەدەغەبکات و تا بۆی کرا لێیانبکوژێت[١٤].

ئیسماعیل حەقی ئووزون چارشی لی بەپێی "تاج ئەلتەواریخ" دەیگێڕێتەوە: سوڵتان سەلیم سەبارەت بە شیعەکانی دانیشتووی ئاناتۆلی فەرمانێکی بۆ ئەمیرەکانی نارد کە بەپێی ئەو فەرمانە دەبوایە گشت شیعەکانی ئەو ناوچە لە حەوت تا حەفتا ساڵە، ناونووسبکرێن و





بۆیبنێرن. دواتر فەرمانی کوشتنیانی دەرکرد و چل هەزار نەفەریان بەندکران کە هەندێکیان لێکوشتن و توێڵی ئەوانیتریان داخکرد تابناسرێنەوە.

ئەم رووداوە، واتە کوژرانی چل هەزار کەس لە شیعەکان، لە کەلامەکانی یارساندا ئاماژەپێکراوە و هاوکاتە لەگەڵ دەورەی دووهەمی سەردەمی پردیوەردا. واتە لەسەردەمی شاوەیس قوولیدا بووە و هەرئەویش بە مەبەستی نارەزایی دەربڕین نامەیەك ئاراستەی سوڵتان سەلیم دەکات و لە ریگای یەکێك لە یارەکانی کە ناوی ئەحمەد بووە و بە عالی قەلەندەر ناوبانگیدەرکردبوو بۆیرەوانەدەکات."پیر رۆستەمی سو" سەرحەڵقەی حەفتاو دوو پیر لەمبارەوە دەفەرموێ:

ژە مولکات روم ژە ئی عەسر دوور
شای سەفاکی کەردە بیزوهوور
کەردی موسەخەر مولك بەغداد شار
کوشتەبی بێحەد لەش وەبان لار
ئەعراب زەبوون موسەلمان ژار
کوشتەبی لێشان رەد وەچل هەزار[١٥]

ئەم بابەتە بەواتا نامەنووسرانی نێوان شائیسماعیل و سوڵتان سەلیم کە چەندینجار دووپاتدەبێتەوە و هاتنی ئەو نووسراوگەلە لە تیکستەکانی یارساندا کە تەوەرەکەی، نامەنووسینی "نەقیب یارسانی" "کە لەوکاتەدا شاوەیس قولی بووە" بۆ سوڵتان سەلیم و بانگهێشتکردنی ئەو بە عەدالەتە کە بە رەستەیەکی زۆر جوان لەژێر ناوی "اذا حکمتم بین الناس ان تحکموا بالعدل" کاتێك بەسەر خەڵکدا حکومەت دەکەیت بە عەدل و داد حوکمبکە" کاردانەوەی دەبێت و ئاکامی ژیانی وی شەهیدبوون لە بەغداوە کە ئەودەم بەشێك لە ئیمپراتۆریای عوسمانی بووە.

لەلایەکیترەوە چالاکی عەلەوییەکانی ئاناتولی لەو سەردەمەدا لەوپەڕی تینوتاوی خوی بووە و لەلایەن شائیسماعیل وەك "پیرکامیل"ـ کە لەنێو عەلەوییەکان پلەی خودایی هەبووە و پیوەندیگەلێکی نزیکی لەگەڵ یارسانی لەسەردەمی شێخ سەفی باپیری و سەدرەدین خواجە عەلی بووە ـ پشتگیریکراوە و دەبووە هۆی گەشەکردنی زۆرتری ئەو چالاکیانە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە

ڕواڵەتێکی ڕوون و ئاشکرا لە ڕووداوەکانی ئەم سەردەمە زاتییە وەدەستنەکەویت، بەڵام ئەو شتەی کە بەپێی بەڵگەنامەکان، زۆر ڕۆشن و ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەو کەسایەتییەی کە لە کەلامی یارسانیدا وەك ڕێبەری ئەو ئایینە ناویلێبراوە و دژ بە حکومەتی عوسمانی ڕاپەڕیوە شاوەیس قولییە کە جامی مەرگ بە شەهیدبوون دەنوشیت و لەدوای شەهیدبوونی بە "عالی قەلەندەر" ناوبانگ دەردەکات.

لایەنی بەرانبەر بەو کە "شاوەیس قولی" شەهیددەکات سوڵتان سەلیمە کە ساڵی نیشتنە سەرتەختی ئەو "٩١٨ کوچی" هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی "عالی قەلەندەر"دا. ئەم سەردەمە هاوکاتە لەگەڵ قۆناغی دووهەمی پردیوەر کە باسەکەی بە تیروتەسەلی لە بەشی "ساداتی بەرزەنجە"دا هاتووە.

جودا لەوە "شائیسماعیل" لەو سەردەمە کەلامییەدا جیگایەکی نییە بەڵام بەپێی بەڵگەنامەگەلی یارسانی لە یارسانی وەك قەڵایەك دژ بە عوسمانی کەڵکیوەرگرتووە و ماوەیەك توانیویەتی بەرەی "قیزیلباش_ یارسانی" پێکبینی، بەڵام ڕێژەی کوردەکان لەناو سوپای شائیسماعیلدا زۆر کەمبوو و هیچ ناوێك لە "کەلهۆڕ"ەکان نەبراوە، ئەڵبەت ئاماژە بە کوردەکانی "پازووکی" کە لەو زەمەنەدا لە دەڤەری کیغی و ئەلاشکرت لە باکووری زەریاچەی وان نیشتەجێبوون، کراوە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوە کە شانەی سەرەکی و ناوەندی سوپای شائیسماعیل قیزیلباشەکان بوون و ئەوانیش ڕازینەدەبوون کە جگەلە خۆیان هیچ هۆز و تایفەیەك لەناو سیستەمی عەسکەری و سیاسی حکومەتدا بەشداربێت.

ئەم ڕێگرییە تاڕادەیەك بوو کە بۆیانبکرایە، بچووکترین و بێنرخترین پۆست و مەقامیان بە ئێرانییەکان نەدەسپارد. قیزیلباشەکان، ناتورکەکانیان بە "تاجیك" ناودەبرد کە ئەم وشە تائێستاش لەناو یارسانییە تورکەکاندا باوە و بۆ ناوبردن لەو کەسانەی کە یارسانی نین بەکاردەهێنرێت. ئەڵبەت پێوەندی یارسان و قیزیڵباشەکان "عەلەوی"یەکان لەسەردەمی سوڵتان سەهاك و قووشچی ئۆغلییەوە، کە جوگرافیای چالاکییەکانی خۆی و یارانی دەڤەرەکانی: تەبریز، ئەلنجە، نەخجەوان، ئۆردوباد، مەرەند و ئەرەسباران بوو دەگرێتەوە کە دواتر بە سەرهەلدانی شاوەیس قوولی و گەڕانی لە ئاسیای بچووکدا ئەو پەیوەندییە پتەوتردەبێت و دوای دەرکەوتنی محەممەد بەگ و سەفەری ئەو زاتە بۆ تورکیا "لە کەلامدا ڕۆم"و هەروەها ڕێبەریکردنی بەکتاشییەکان و عەلەوییەکان، بەپێی ئایینی خۆیان، هەروەها سەرهەلدانی خان ئاتەش و براکان





و یارەکانیتری لە دەڤەرەکانی تەبرێز و سەهەند و ئەو ناوچانە، پەیوەندییەکان ئەوەندەیتر بەهێزدەبێت، هەروەها هەبوونی سەیید محەممەد حسەین کە مەزارەکەی لە "ماکۆ"یە بەگشتی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لەنێوان ساڵەکانی ٨٠٠ تا ١٠٥٠ی کۆچی، هەبوونی کاریگەر و دایمی یارسانەکان لە هەرێمەکانی تورکستان و ئازەربایجان و ئاناتۆلی، بەشێوەگەلێکی جۆراوجۆر، وەك دەورەکانی پێشتر، دەرکەوتنی شاخۆشین لە لوڕستان و سوڵتان سەهاك لە هەورامان و هەروەها شاوەیس قوولی و بەرەکانی لە تورکستان، بەردەوامی و ڕیشەداکوتانی هزری یاری لەو هەرێمانە مێژوویەکی کۆن و بەرچاوی هەیە، هەروەها مەبەست لە "مەسنەدنشینە سەفەوییەکان" لەناو چل تەنانی ئەهلی حەقدا، ئاماژەیە بە سەفیەدین ئەردەبیلی، شێخ سەدرەدین و خواجە عەلی سیاپۆشە کە پەیوەندییەکی تایبەتیان بە یارسان و پردیوەرەوە هەبووە، هەروەها بونیاتنانی "دودەی عەجەم" لە حەیدەرییە کە دەرئەنجامەکەی "سەرسپوردەگی" بە بنەماڵەی "میری" لەناو یارسانەکانیدا لێدەکەوێتەوە، ئەو پەیوەندییانەمان زۆرتر بۆ دەردەخەن.

بەهەرحاڵ ئەو بزاڤەی کە ئایینی قیزیلباشەکانی ئاناتۆلی ڕێکوپێککرد و بیروبۆچوونەکانیانی نووسی و لە کتێب و نامیلکەدا تۆماریکرد، لە ناوچە کوردنشینەکان بە ئەهلی حەق ناوبانگیدەکرد و لەڕاستیشدا بەپێی سەرچاوەکانی تایبەت بە ئەهلی حەق، دەتوانین بزاڤەکانی بکتاشی و ئەهلی حەق و قیزیلباش بە سێ شێوەی جیاواز لە یەك ئایین بچوێنین[١٦].

"مینۆرسکی"ش دەنووسێ: لە ناوچەکانی پشت قەفقاز دوو گرووپی عەلی ئەڵلاهی بوونیان هەیە، گرووپی یەکەم: لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ئەلیزابت پول "گەنجە" لە ناحیەی جبرائیل، لێواری چەپی ڕووباری ئاراس، بەرامبەر ئاوایی قولدور نیشتەجێن. گرووپی دووهەم: ئەو عەلی ئەڵلاهییانەن کە لەسەر خەریتە ڕەگەزناسییەکانی ڕووسەکان دەستنیشانکراون و لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی "کارس"دا ژیان دەبەنەسەر. "م. گرونارد" ئەمانە بە قیزیلباش دادەنیت و ئەگەر ئەو پەیوەندییانەی کە بە "سیواس"ەوە هەیانە ڕەچاوبگرین، لەوەدەچێت ئەم بۆچوونە ڕاستبێت. ئەو دەنووسێت: ئەم جەماعەتە جارێکیان پەیوەندییان بە بەرپرسانی ڕووسیاوە کرد و خوازیاری ئەوەبوون کە ئایینەکەیان وەك ئایینێکی نیوە مەسیحی یان "ڕۆم کریستیان" بەڕەسمی بناسرێت[١٧].

## حرووفییە

یەكێكیتر لەو بزاڤە فیكرییانەی كە لەسەر بنەمای بیروبۆچوونی سۆفییانە "عیرفان"و پەروەردەكردنی نەفسانی پێكهاتووە، "حرووفییە"یە. بونیاتنەری ئەم بزاڤە "فەزل ئەڵڵا حروفی ئێسترئابادی" كوڕی ئەبومحەممەدی تەبرێزییە، كە بەناوی عەبدولڕەحمان بانگیاندەكرد و بە "فەزل ئەڵڵا حەلالخۆر" ناوبانگیدەركرد بوو.

فەزڵ ئەڵڵا ئەوەندە پارێزكار و راست \كردار بوو كە سەبارەت بەو وتوویانە لە درێژایی تەمەنیدا نانی كەسی نەخوارد و داوای هیچی لە كەس نەكرد و بە دەسڕەنجی خۆی ژیا(١٨).

پیرەوكەرانی حرووفییە، كە باوەڕیان بە پاشایەتییەكی مەعنەوی بۆ فەزل ئەڵڵا هەبوو و پێیاندەگوت شافەزل ئەڵڵا كە ئەم باوەڕە لە كەلامەكانی ئەهلی حەقیشدا رەنگیداوەتەوە و هەركات مەبەست ناوبردن لە نەعیمی ئیسترئابادی بێت، بە "شا فەزلی وەلی" ناویلێبراوە.

شافەزل ئەڵڵا بە مەبەستی چالاكی ئایینی و راگەیاندنی بیروبۆچوونە تایبەتەكانی خۆی، سەردانی زۆر ناوچە و شوێنی كردووە كە لەوانە دەتوانین ئاماژە بە ئێراق و جیبال و ئازەربایجان و خوراسان و پشتڕووبار "ماورا النهر" بكەین كە لەو سەفەرانەدا توانیویەتی گەلێك پەیڕەو بۆ لای خۆی رابكێشێ كە زۆربەیان "سەیید" بوون و هەندێكیان لە ناوداران و زانایانی ئایینی و هەروەها دەسەڵاتدا و ئەمیر و سەرۆك هۆزەكان بوون(١٩).

بنەما و بناخەی هزری فەزڵوڵا حرووفییە لەسەر باوەڕ بە پیرۆزی حروف "پیتەكان"و نهینی ناوەكانی قورئان و كتێبە ئاسمانییەكانیتر و هەروەها "یەكبوویی"و شیكردنەوە و تێگەیشتن لەمانە بەشێوەیەكی مرۆڤدۆستانە داڕێژراوە.

ئەم بیروبۆچوونە، بە جۆرێك لە جۆرەكان لە زۆربەی ئایینەكاندا بەرچاودەكەوێت.. بۆ نموونە لە قورئاندا، پیتەكانی ئەلف و لام و میم بەشێوەیەكی "سڕی" ئاماژەیانپێكراوە یان ئەم وتەی حەزرەتی عەلی كە دەفەرموێ: "انا نقطە تحت باب بسم الله" یان وتەی ئینجیل كە دەفەرموێ:

لە سەرەتادا وشە هەبوو، وشە لای خودا بوو، وشە خودا بوو و هەمان لە سەرەتادا لای خودا بوو و هەر شتێك بەهۆی ئەوەوە مەوجوود بوو و جگەلەو هیچ شیتك لەو شتانەی كە بوونیان پەیداكردوە، بوونیان نەبووە(٢٠)، هەروەها ئاماژە بە وشەگەلێكی وەك لەوح و قەڵەم





بەدوای یەكدا لە چەندین شوێنی سەرئەنجامدا دەریدەخەن كە دەسكەوتی پێوەندی ئەم دوانە، "وشە"یە. شێخ ئەمیر دەفەرموێ:

نە لەوح و نە قەڵەم نە یار نە ئەغیار
پادشام نە دوڕبی دوڕ نە دەریا بار

كە بۆ خۆی سەلمێنەری ئەوەیە كە هەندێك لە وشەكان و پیتەكان لەناو پەیڕەوانی یارسانیشدا رێز و حورمەتی تایبەتییان هەیە. پێویستە ئاماژەبكرێت كە رێزگرتن لە پیتەكان و ژمارەكان "اعداد" مێژوویەكی زۆر كۆنی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاكانی دەستپێكی ژیانی مرۆڤ. بۆنموونە لە كتێبی "ریگ ودا" قایلبوون بە سیحراوییبوونی هەندێك لە وشەكان بەرچاودەكەوێت.

لە سروودی ٢یماندالای دەهەمی بەشی چێبوونی جیهاندا هاتووە:

لە سەرەتادا "هرن گربهە" دەركەوت و یەكەم خودای ئافراندن بوو. ئەو بۆخۆی ئاسمان و زەوینی رادەگرت(٢١).

لە شوێنێكیتردا بەمشێوە گوتراوە: كاتێك كە "بریهسپتی" كە ناوی لە گشا شتەكان ناوە، كورتترین و یەكەم پیتی دەنگداری هەنارد، گشت جوانییەكان و كەڵكەی شتەكان بەدڵسۆزییەوە دەركەوتن(٢٢)، بەڵام بەهۆی دژواری تێگەیشتن لە بیروبۆچوونەكانی شافەزل ئەڵڵا و بەهۆی ئەوەوە كە پێداگری لەسەر "حلول" واتە جێگیربوونی خودا لە جەستەیدا دەكرد، دژمنەكانی گشت توانایی خۆیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی وتەكانی بە بێبایەخ و ناڕاست لەقەڵەمبدەن..، بەهەرحاڵ شافەزل ئەڵڵا قوتابخانەیەكی نوێی ئایینی و فەلسەفی داهێنا و بناخەكەی داڕشت كە ئەگەر بەشە ئاینییەكەی لابردبایە سەركەوتووتر دەبوو(٢٣).

تەشەنەكردن و بڵاوبوونەوەی بۆچوونەكانی حرووفییە و پڕوپاكەندەی "ئاتەئیستی"و خەباتی سیاسی ئەو جەماعەتە، بێگومان لە بەرژەوەندی فیودالەكان و مەلاكان و دەسەڵاتدارانی "تەیموری"دا نەبوو و هەر ئەمەش وایكرد كە بەتوندی بەرەنگاری بوونەوە و گشت تواناییەكانیان بۆ قۆڵبەستكردن و لەناوبردنی شافەزل ئەڵڵا و پەیڕەوەكانی خستەگەڕ.

لە سەرەتای ساڵی ٨٠٤ ی كۆچیدا "شروانشاە" قۆڵبەستیكرد و لە باكۆ خستییە بەندیخانە. دواتر تەسلیمی تەیمورییەكانی كرد و ئەوانیش بردیانە قەڵای "النجق"و دوای كەمتر لە

مانگێك "تەیمووری میرانشا" بە دەستی خۆی سەریبڕی و بەفەرمانی ئەو لاشەکەیان بە دووی ئەسپەوە بەست و لە ناوشاردا کردیانەکێش تاببێتە هۆی چاوترساندنی خەڵك. دوای ئەوەش سەر و لاشەکەیان سووتاند.

دوای کوژرانی فەزل ئەڵڵا و سەرکوتکردنی حرووفییەکان، یەکێك لە پەیڕەوانی ئەو ڕێبازە بەناوی "ئەحمەد لوڕ" هێرشیکردەسەر "شاروخ میرزا"و بەشکستهێنانی هێرشەکەی ئاگری گرتن و کوشتنی حرووفییەکان ئەوەندەیتر بەتینبوو و وایلێهات کە پاشماوەکانی ئەو ڕێبازە چیتر کۆمەڵگای ئێران بە شوێنێکی گونجاو بۆ چالاکییە ئایینییەکانیان دانەنێن و رووبکەنە وڵاتی عوسمانی و لە ناوچەی ئاناتۆلی نیشتەجێبن.

لەوانە بەتایبەت دەتوانین ئاماژە بە شاعیری گەورەی حرووفی "نەسیمی"و کچەکەی و "عەلی ئەڵڵا"و چەندین کەسایەتیتر بکەین، کە بەهۆی نزیکی و لێکچوویی هەندێك لە بیروباوەڕەکانی خۆیان بەکتاشییەکانەوە، توانیان ماوەیەك لەناو پەیڕەوانی بەکتاشییە بحەسێنەوە و ڕێبازەکەیان بپارێزن. دیارە بەکتاشییەکانیش هەستیان بەو لێکچوونە ئایینییە کردووە و ڕێزێکی یەکجار زۆریان بووە بۆ شافەزل ئەڵڵا، تاڕادەیەك کە لە ڕیزی حاجی بەکتاش و حەزرەتی عەلیدا دایانناوە و هەنووکەش سێیەم کەسایەتی پیرۆزی بەکتاشییەکانە.

زۆربەی ئەو حرووفییانەی کە لە ئێراندا مانەوە و روویاننەکردە خاکی عوسمانی و نەشیاندەویست دەست لە ڕێبازەکەیان هەڵگرن، روویانکردە ناوچەکانی نیشتەجێبوونی یارسانییەکان و ئاوێتەی یارسانییەکان بوون و لە کوژران و شەهیدبوون خۆیان پاراست.

ئەڵبەت بەپێی بڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکان هەر لە سەرەتاوە بیروبۆچوونی حرووفییە لە کوردستان و لوڕستان و کرماشان و کوردستانی ئێراقدا تەشەنەیکرد بوو و کەسانێك لەم ناوچانەدا پەیڕەوی ئەو ڕێبازە بوون. هۆکاری ئەمەش جیا لەسەردانەکەی خودی فەزل ئەڵڵا، سەفەر و سەردانی پەیڕەوانی حرووفییە بوو کە بەردەوام بۆ چالاکی ئایینی روویانکردبووە ئەم ناوچانە و پەیڕەویان وەدەستخستبوو.

بەلگەیەك بەدەستەوەیە کە دەسەلمێنێت کوردستانی ئێراق یەکێك لە بنکەکانی ئەو ڕێبازە بووە. ئەڵبەت لە کەلامی یارسانیدا، لە دەمیشق وەك هەڵستگەی بزووتنەوەی "حرووفییە"ش ناودەبردریت کە بەسەرنجدانی بەڵگەنامەکان دەتوانین حرووفییە لە عیراق و ناوچەگەلی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی کە دەمیشقیش بەشێك لەو ناوچەگەلە بووگە دەگاتە





پەرەسەندنێك بەرچاو، بەتایبەت ئەوە کە "فەزڵ" بۆ خویشی چەندجار هاتووچۆی دەمیشقی کردووە و دوورنییە گەر بڵێین پیگەی حرووفییەش لە دەمیشق وەکو ناوەندی چالاکی عەلەوییەکان و شیعەی ئەوپەڕگر و بزووتنەوەی پێڕەوکەری حەزرەتی عەلی بووە.

دواتر سولْتان سەلیم لە ساڵی ٩٢٣ کۆچی تەکیەیەك لە دەمیشق بینادەکات کە هی بەکتاشییە بووە ئەگەرچی نموونەی ئەو تەکیەگەلە پێشتریش لە دەمیشقدا بووە بەڵام دوای یەکگرتنی "حروفییە"و "بەکتاشییە" سەرنجێکی زۆرتر بۆلای خوی رادەکێشت کە ناوی ئەو تەکییەگەلە لە کتێبی "پیرزادە ئایینی"دا هاتووە، بەڵام لە کۆتاییەکانی سەردەمی یەکەمی قۆناغی پردیوەر "جامەی سولْتان سەهاکی". بەتایبەت کە لە کۆتایی دەورەی یەکەمی سەردەمی پردیوەریدا "کراسی سولْتان سەهاکی" یەکێك لە مەلا پلەبەرزەکانی ناوچەکە بەنێوی "مەلا عابەدینی جاف" کە یەکێك لە شاگردەکانی "مەلا ئلیاسی شارەزووری" بووە ڕێبازی یاری وەردەگرێت و هەر بەم بۆنەوە مەلاکان و موحتەسەبینی ناوچەکەوە دژایەتیدەکەن، کە بەوردی لە "دیوانی عابدین"دا باسیکراوە. چۆنیەتی گۆڕانکاری لە بیروباوەڕی عابدین و وەرگرتنی ئایینی یاری لەلایەن ئەو زاتەوە، چیرۆکی "پوڵیس"ی مەسیحیان بیردەخاتەوە.

یەکێك لەو کەسانەی کە مۆچیاری عابدین دەکا و هزری یاری بەگاڵتەدادەنێت "نەرگسی ئیبنی مەلاشکری" دلْدارەکەی خودی عابدینە کە دواتر بۆ خۆیشی ئایینی یاری وەردەگرێت، بەڵام لە سەرەتادا بەمشێوە موچیاری عابدینی کردووە:

عابدین کفره،...

کەم شەیتان بێژە، ئەم حەرفە کفره  
مەیکە وەبیانوو کاکەییان سەفره  
ئسحاق بە جادوو وەعلم جەفره(٢٤)

لەم وتانەی نەرگسدا دەردەکەوێت کە لەو سەردەمەدا باسی حرووف "پیتەکان"و حرووفییە و زانستەکانی پەیوەندیدار بەو عیلمە، وەك "جەفر" لە ناوچەکەدا تەوەرێکی ناسراوبووە و ئەوان یارسانییەکان بەتایبەت سولْتان سەهاکیان بە کەڵکوەرگرتن لە زانستی جفر و بگرە سیحر و ساحیریش، تاوانبارکردووە کە ئەمەش لەلایەکەوە مێژووی گۆڕانی بیروباوەڕی عابدینمان بۆ روونەدەکاتەوە و لەلایەکیترەوە ئاماژەیەکە بە مێژووی یەکێتی نێوان یارسانییەکان و

حرووفییه. کەواتە ئەگەر ئێمە دەیەی حەوتەمی سەدەی هەشتەمی کۆچی بە مێژووی سەرهەڵدان و دەستپێکی چالاکییەکانی بزاڤی حرووفییە لەلایەن شافەزڵڵاوە بزانین، بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی ئەو هزرە لە کوردستاندا، لە دەستپێکی دەیەی کۆتایی سەدەی هەشتەمدا بووە و وەرگرتنی ئایینی یاریش لەلایەن عابدینەوە لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا روویداوە.

ئەڵبەت دواتر یەکیەتی حرووفییە و یارسانەکان لە سەرەمی دەرکەوتنی شاوەیس قوولی و قووشچی ئۆغلی و هەروەها محەممەد بەگ و خان ئاتەش، کە لە هەرێمەکانی باکووری کوردستان و ئازەربایجاندا چالاکی ئایینییان دەنواند و بەم بۆنەوە بارووذۆخێکی لەباریان بۆ نزیکبوونەوەی زۆرتری ئەم دوو ئایینە پێکهێنا. قووشچی ئۆغلی سەبارەت بەو ناوچانە دەفەرموێ:

اوزومدلین دیك دابانی یدی قدم قیزقاپانی
النجه و نخجوان اردوباد یاری ایسرتم
گر گردن بری زنوزی سوفیانی مرند دوزی
اشاقیده شام قازانی تبریز دەیاری ایسترم
اراند قالانلاری عین علینین یار نلری
ترکمه ایللرینده چاروادار یاری ایسترم
ارسباران قشلاقیندا بتون اغیر سیلاقیندا
قیش گونی توکلی داغیندا نرگس بهاری ایسترم(٢٥)

بەپێی ئەم دێڕانە وادیارە قووشچی ئۆغلی گشت ئەو ناوچانەی کە حرووفییەکان تێیدا بڵاوەیانکردووە بەمەبەستی بانگەشەیان بۆ هزری یاری گەڕاوە و هەرئەمەش بووەتە هۆی لێکتێگەیشتن و نزیکبوونەوەی پەیڕەوانی هەر دوو ئایینەکە.

پێویستە بگوترێ تەواوی ئەو ناوچانە لە کۆتایی سەدەی دووهەم بەملاوە، شوێنی نیشتەجێبوونی "راوەندییە"و لەو ژێر کاریگەری خورەم دینەکاندا بووە و شوێنەواری زۆریان لەو ناوچانە ماوەتەوە، لەوانە قەڵای "بز" کە تاهەنووکەش بەرچاودەکەوێت، هەروەها "غولامحسەین ساعێدی" لە کتێبی "ایلخچی"، لەو شوێنەدا کە بەکورتی باسی بەسەرهاتی چل تەنانی ئەهلی حەقی ئازەربایجان دەکات، کەسایەتییەك ناودەبات کە زۆر کەس بە نەعیمی ئیسترئابادی دەزانێت.





ساعێدی دەنووسیت: نەبی ئاغا پێبەندی هیچ شوێنێك نەبوو، بەردەوام بەپێ رێگای دەپێوا، لە چیایەکەوە بۆ چیایەکیتر، لە گوندێکەوە بۆ گوندێکیتر، لە شارێکەوە بۆ وڵاتێك.. لەپڕدا دەهات و کتووپڕ وندەبوو، رۆژێك لە ئەرمەنستان و پەیڕەوان و نەخجەوان چاویانپێدەکەوت و کاتێکیتر لە خوراسان، سەر لە بەیانی لە گوند دەبینرا، کاتژمێرێك دواتر لە ساحێب زەمانی تەبرێز.. وەك شێت دەژیا و دەڕۆیشت و لای دۆستەکانی زۆر خۆشەویست .. پێیناوەتە هەر شوێنێك، سەرنجی کەسانێکی بۆلای خۆی راکێشاوە.

لەپ ەیڕەوان و نەخجەوان، لەناو ئەرمەنییەکاندا موریدی زۆرە.. تاهەنووکەش لە ئیلخچی تایفەیەك نیشتەجێن کە پێیاندەگوترێ "نەبی لی"یەکان(٢٦)، هەروەها لەناو چلتەنانی "ئیلخچی"و دەوروبەری و تەبرێزدا "قطب نامە" گەلێك هەن کە درێژترینیان هی شاعیرێکی زۆر بەناوبانگە بەناوی "رەهبەری". ئەو شاعیرە دیوانە شێعرێکیشی لێماوەتەوە، هەروەها قوتبنامەی "بابا نەهانی" کە نازناوی "خاتم القطبین" بووە. لەم نامیلکانەدا باسی پەیڕەوانی رێبازە سوفیانەکان "ئەهلی تەریقەت"و چلتەنان(٢٧) کراوە و بە زمانێکی سادە و ساکار ناوی گشت "قوتب"ـەکان دەبات، کە وردبوونەوە لەو ناوانە بەباشی پەیوەندییەکانی هەر چوار رێبازی حرووفییە و بەکتاشییە و سەفەوییە و یارسانمان بۆ روونەدەکاتەوە(٢٨)، هەروەها کە پێشتر باسکرا، فەزل ئەڵڵای حرووفی لە کەلامی سەرئەنجامدا بە شافەزل ئەڵڵا ناویلیبراوە کە "شامێوان" بووە و یارەکانیشی بریتیبوونلە: مەنسوور، نەسیمی، زەکەریا و تورك سەربڕ کە بەسەرهاتی هەموویان لە دەفتەرەکانی یارساندا نووسراوە. پیر نازداری شیرازی سەبارەت بە شافەزل ئەڵڵا و یارەکانی دەفەرموێ:

ئەو یانەی ساری...

بارگەی شام وەستەن ئەو یانەی ساری
نمانا جلوەی جامەی عەیاری
نیاش مەعرفەت شای خاوەندکاری
جامەی هەفتەنان یورتش بوجاری
نەسیمی بنیام، پیردا باری
مەنسوور بی داوود رەهبەروە یاری
زەکەریا موسا پادەفتەر داری

تورکه موستەفا، کـەمان وەقاری
یورت ساری بی زات رەمـــــز باری
زەردەبام مەحموود ئیبن سەخاری
ئەیوەت بـــی عەزیز ئیبن موختاری
شافەزل مەولام ســـــــڕش تەیاری
مەعرەفەت نیا نە دەمشق شـــــاری
چـوارتەن هەفتەنان چەوگادان دیاری
وەبـــەرگ ســـــڕی بیشان ئیزهاری
مەولام رەنگبازەن رەنگش وسیاری
یاران چە رەنگش نەوینان ئـــــازاری(٢٩)

هەروەها لە کەلامەکانی یاریدا چیرۆکێك سەبارەت بە شافەزل ئـەڵڵا و یارەکـانی هـاتووە کە بەمجۆرەیە:

شـافەزل ئـەڵڵا و یارەکـانی بـەرخێکیان بـوو کـە هـەموو شـەوێك دەیـانکردە قوربـانی. قوربانیکردنەکـە بەمـشێوەبوو: بـە ئـەمری شـافەزل "تورکـەی سـەربڕ" بەرخەکـەی سـەردەبڕی و حسەینی کوڕی مەنسوور بەرخەکەی بـەداردادەکرد و نەسـیمی پێـستەکەی دەگرتـەوە و لـە پـاش ئەوە زەکەریا بەرخەکەی لەتدەکرد و عەینـە قوربانییەکـەی دەکوڵانـد، دوای ئـەوەی دوعایـان بـە سـەردا دەخوێنـد، دەیـانخوارد. پاشـان ئێـسکەکانیان دەخـستەوە نـاو پێـستەکەیی و بەرخەکـە سەرلەنوێ زیندوودەبووەو و شەوی دواتر بەهەمانشێوە قوربانییان دەکردەوە.

ڕۆژێك کە شافەزل لەوێ نەبوو، بە بێئیزنی ئەو، یارەکانی کە خۆشیان بە خاوەن کەرامات دادەنا، بێگوێدان بە عەینە کە داوای لێـدەکردن لـە نـەبوونی شـافەزڵدا بەرخەکـە قوربانینەکـەن، بەرخەکەیان سەربڕی، بەڵام لە ئـاخردا هـەر کارێکیـانکرد بەرخەکـە زیندوونـەبووەوە. دواتـر کـە شافەزل گەڕایەوە و رووداوەکەی لە عەینە پرسی و ئەویش بۆیگێڕایەوە.

شافەزل بەسەرهاتی هەموویانی بۆ پێشگۆییکردن و هـەمان کرداریـان بەسـەرداهات کـە لەگەڵ بەرخەکە دەیانکرد، بەمشێوە دوژمنان سەری تورکەی سەربڕیان لە جەستەی جوداکـردەوە. مەنسوور لەداردرا و زەکەریا تیکەتیکەکرا و پێستی نەسیمییان بە زیندوویی لێکردەوە.





دوای کورتە باسیك لەسەر ژیان و بەسەرهاتی "شافەزڵ وەلی" مەبەستی کەلامی یارسان کە هەمان "نەعیمی ئەستەرئابادییە"و پەوەندی ئەو لەگەڵ یارسانییەکان لە ناوچەی کوردسـتان، دەگەینە سـەر باسـی یـارانی وی "مەنـسوور، نەسـیمی، زەکـەریا.." بـەپیی بەڵگـە و تیکـستی یارسانی.

لە زۆربەی تیکستەکانی یارسانی نێو لە "مەنسووری" دەبریت کە دەتوانین بـە متمانـەوە بڵێین مەبەست "ابوالمغیپ حسین ابومنصور محمد بیعناوی الحلاج"ە کـە لـە سـاڵی ٢٤٤ کۆچـی "٨٥٥ زایینی" لە بەیزای فارس لەدایکـدەبێت و لـە قوتابخانـەی "جونەیـد" دەرسـدەخوینیت و لەدواییدا سەفەر و تەبلیغ و فیرکاری دەستپێدەکات، هـەروەها کـە لـە مێـژوودا بـە تێروتەسـەلی باسیکراوە، لە پەیوەندی لەگـەڵ فیرکـاری و خوداناسـی ئـەودا دۆژمنـانی زۆری بـۆ سـازدەوێت و سەرەنجام لە ساڵی ٣٠٩ کۆچی "٩٢٣ زایینی" دوای موحاکەمـە لـەداردەدریت و لـە ئاکامـدا جەستەی ئاگردەدری.

شێخ ئەمیر لەمبارەوە دەفەرموێ:

ئه وروَ سه نگ واران نه به غداد شاربی
مـه نسوور سه رمه س ته سلیم وه دار بی
مـــــه نسوور وه شادی سوَ شه فـه قه وه
ســـه رمه س بی وه جـــام ئنه لحه قه وه

بـەڵام مەنـسووری حـەلاج بـەناوبانگی سـەدەی سـیهەم بەدرێـژایی پێنجسەدسـاڵ مێـژوو دێتەنێو ریزی یارانی شافەزڵ. ئەمە لەحاڵێکدایە کە شافەزڵ لە نووسراوەکانی خویدا، بە فراوانـی باسی "مەنسوور" دەکات:

همچو منصور اناالحق زده از غایت شوق
برسردار نعره-زنان می-آیم

و یان "زەکـەریای" بـەناوبانگ کـە شـەرحی ژیـانی لـە تەوراتـدا هـاتووە و لـە ئاکامـدا جەستەی دوولەتدەکرێت، هەم لە کەلامی سەردەمی بارگەبارگە و کەلام دامیار دامیار و دیکـەی تێکستگەلی یارسانی بەبێرەچاوکردنی جوغرافیا و زەمەن لـە ریـزی یـارانی شـافەزڵ دادەنریـت و پیرمووسا لە کەلامی دامیار دامیار بەندی ١٩٤ دەفەرموی:

زه که ریا شه قم/ نـه خـــه تـای ویـم زه کـه ریـا شـه قـم/نوسـه نـده ی ده وران دوو هه فت ته وه قم/چوینکه خه تام بی نه وی موتله قم

له واقیعشدا کەسێکیدیکە لە مێژوودا بێجگەلە زەکەریای پیغەمبەری بەناوبانگ ناناسین کە شێوەی مردنی دووشـەقەبوون ببێـت و نـاوی زەکـەریا بێـت و بیروبـڕوای تایبـەت بـە خویـشی هەبووبێت، هەروەها سەبارەت بە "نەسیمی" شاعیر کـە یـەکێك بـووە لـە سـەییدەکانی شیراز و پەیڕەوی ڕێبازی حرووفییەی کردووە و گوایە لەگەڵ کـچی شـافەزلدا زەماوەنـدیکردوە، لـە سـاڵی ٨٢ یَ کۆچی "٤١١٧ ی زایینی"دا لە شاری حەلـەب بـە تۆمـەتی لادانـی فیکـری، سـەرەتا بـە زیندوویی پێستیدەکەنن و دوای ئەوە لەسێدارەیدەدەن[٣٠].

ئەبو زەر ئەحمـەدی کـوڕی بورهانـەدینی حەلـەبی "وەفـات ٨٨٤ کۆچـی" لـە کتێبەکـەی خۆیدا "کنوزالذهب فی تاریخ حلب" بەناوی عەلی باسـی نەسـیمی دەکـات و مێژوونووسـێکیتری هاوچەرخی نەسیمی واتە ئیبنی حەجەری عسقلانی "وەفات ٨٢٥" لـە بەرهەمەکـەی خۆیـدا بـە "نەسـیمەدین" ناویلێـدەبات کـە ئەمـەش هـەمان نازناوەکەیـەتی و وادەردەکـەوێت کـە نـاوی ڕاستەقینەی شتێکیتر بووە.

لـەم سەرچـاوانەدا وادەردەکـەوێت کـە لـە سـەرەتادا نازنـاوی نەسـیمەدینی بـۆ خـۆی هەڵبژاردووە و ناوی عەلی بووە و دواتر نازنـاوی "عیمـادەدین"ی لـە خـۆی نـاوە، هـەروەها ئـەو کەسەی کە بەناوی "مەحمودی کوڕی سخاری" لە کەلامی سەرئەنجامدا ناویلێبراوە بەسەرهەلدانی "زەردەبام" پێناسەکراوە، وادیارە هەمان "مـەحمودی پسیخانی"یـە کـە یـەکێك بـووە لـە یـارە نزیکەکانی شافەزل ئەڵڵا و دواتر بناخەی ڕێبازی "نقطویە"ی دانا کە ئەم ڕێبازەش بەشێکبوو لـە ڕێبازی حرووفییە، بە باوەڕی من "سخاری" دەتوانێت هەمان "پسیخانی" بێت و تـەنیا وشـەکە گۆڕانکاری بەسەرداهاتبێت.

ئەڵبەت بەڕێز **محەممەد** عـەلی سـوڵتانی لـە کتێـبی "قیـام و نهـضت علویـان زاگـروس"دا نووسیویەتی مەبەست لە"مەحمودی سخاری" کە لەکەلامی سەرئەنجامدا نـاویلێبراوە "مـەحمودی غەزنەوی"یە کە بە هەڵە مەحمودی سخاری نووسراوە.

ئـەم بۆچـوونەی سـوڵتانی ناتوانێـت لەڕاسـتییەوە نزیکبێـت، چـونکە هـەرگیز هیـچ پەیوەندییەکی فیکری لەنێوان مەحمودی غەزنەوی لە یارساندا نەبووە و مەبەست لەهێنانی نـاوی سـوڵتان مـەحمود لـە سـەرئەنجامدا شـتێکی گـشتییە و هۆکارەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ نەبوونـی





چوارچـێوەیەکی داخـراو لـە هـزری یاریـدا. لـە واقیعـدا بـە بـاوەڕی یارسـان، هـەر دەرکـەوتن و یەکبوونێك و بوونێك بە ئیرادە و خواستی ئیلاهی سەردەگرێت و تەواوی هێز و توانـا و شـکۆیەك کە لەسەر ئەم زەوینە خۆی دەنوێنێت، لـە زات و خواسـتی خـوداوە تەشـەنەدەکات و ئـەو ئەرکـە بەجێدەهێنێت کە پێیسپێردراوە. جا لە هەر پلەوپایە و ڕەگەز و ئایینکدا بێت گرینگ نییە.
کاتێك هیز و شمشێر بەدەست چەنگیزخانی مەغولەوەیە و کاتێکیتر لە کراسـیتر سـەرنۆکێکدا بـە سەر سێدارەوە یاریدەکات و کاتی وا هەیە بۆ خۆی شمشێر هەڵدەگرێت و تووڕەیی و قینی خۆی بە کوشتن و قڕکردن دەنوێنیَ و لە سەردەمێکیتردا هەر خۆی دەبێتە قوربانی.

ئەڵبەت ئەمە بە مانای جەبرگرایی ئەم هزرە نییە، بەڵکو باسکردن لـەو ڕووداوانەیـە کـە دەبیَ ڕووبدەن و ڕوودانیان گرینگی تایبەتی هەیە.

بەپێی ئایاتی "قورئان"یـش هیـچ غونـچەیەك ناپـشکوێت و هیـچ دوگیانێـك لێنابێتـەوە مەگەر بە ئەمری خوداوەند نەبێت و هەموو شتێك بە خواستی خودا ڕوودەدات.

سـەرەڕای ئـەوە، ئامـاژەکردنی ئاشـکرا بـە قۆنـاغی زاتـی سـوڵتان مـەحمود غەزنـەوی و ڕووداوەکانی پیوەندیدار بە ئەوە لـە کەلامگـەلی یارسـانی وەك سـەردەمی بەرزەنجـە، بابانـاوس، بارگە بارگە، دامیار دامیار، دیوان عابدین و لە کەلامگەلی دوای قۆناغی پردیوەر، ڕاسـتی ئـەم قۆناغە لە کەلامەکانی یارسانیدا پێشاندەدات. کەوایە "مەحموود پەسـیخانی" کـە لـە کەلامـی سەرەنجامدا بەناوی "مەحمود سەخاری" نێویلێبراوە لەگـەڵ "سـوڵتان مـەحمود غەزنـەوی"دا دوو کەسایەتی بەتەواوی لێکجیاوازن.

ئیستا بەسەرنجدان بە وتارگەلێك کە لەسەر کەسایەتییەکان هـاتووە، گومانێـك نامێنیـت کە ئەم کەسایەتییانە هەمان کەسایەتییە ناودارەکانن کـە لـە مێـژوودا ناویانهـاتووە، بـەڵام ئـەم باسەش تەرحدەکرێت کە بەپێی تیکستگەلی "نوم نامە" لـە شـافەزلَ ــ کـە ببـوی یـارانی خـوی لەنێودا نووسیوە ـ ئەم مەسەلەیە مەحال و غەیری مومکین دەکات کـە یـارانی شـافەرڵ، هـەمان ئەو کەسایەتییەکانن کە لە زەمەن و کاتی تایبەتدا سەریانهەڵداوە.

ئیستا ئەم پرسیارە دێتەئاراوە کە چۆن ئیمکانی هەیە هەریەك لەم کەسایەتییانە لە کـات و زەمەنی تایبەتدا ژیابێتن و لە عـەینی حاڵـدا ئەمانـە لەیـەك سـەردەمدا هاوژیـان و هاوکـات و هاوزەمەن بووبێتن؟ و بۆچی لە کەلامی سەرەنجامدا ئاواهاتووە؟

ئەڵبەت زۆریـەك لـە یارسـانییەکان ددان بـە هەڵـەبوونی ناوگـەلی باسـکراو لـە کەلامـی

سەردەمی پردیوەر "بێجگە شافەزڵ نەعیمی ئەستەرئابادی" دەکەن و لەو بڕوایەدان کە شافەزڵ وەلی مەبەستی کەلامی سەرەنجام لە سەدەکانی سیهەم و چوارەمی هیجریدا ژیاوە بەڵام هاتنی ئەو، شایەتی سەردەمی دیوانی بەرزەنجەیە کە لە دوایین ساڵەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی هەوتەمی هیجریدایە کە یارسانییەکانی دووچاری هەڵەکردووە، بەڵام وانییە، چونکە ئێمە کەسێکیتر لە مێژوودا جگەلە "فەزلۆڵلا حرووفی ئەستەرئابادی" ناناسین کە ناوی وایبێت. سەرەڕای ئەوە، کەسانێك کە نکوڵی لەم باسە دەکەن باسی پێشبینی لە کەلام و کەڵکوەرگرتن لە رەمز و ژمارەکە لە کەلامی یارسانیدا کاردانەوەی هەبووە لەبەرچاوناگرن، هەروەها ئیمە جگەلە قۆناغی سەردەمی بەرزەنجە، تەنیا لە سی قۆناغی کەلامی لە "فەزوڵلا"و "حرووفییە" دەتوانین نیشانەیەك پەیدابکەین کە هەر سی قۆناغ بگەڕێنەوە بە میانەی سەردەمی دووهەمی پردیوەر واتا ساڵەکانی سەرەتایی سەدەی دەیەم بەدواوە لەحاڵێکدا کە دوایین کەسایەتی شەهیدکراوی بەناوبانگ لە کەلامی سەرەنجامدا "نەسیمی"یە کە نزیك بە بیست ساڵ دوای شافەزڵ "٨٢٠ کۆچی مانگی" شەهیددەکریت.

کە وایە دەتوانین هەر یەك لەم کەسایەتییانە تەنیا لە روانگەی عیرفان و بیروبڕوا وەك یەك بزانین. لەواقیعدا خاڵی هاوبەشی ئەمانە تەنیا بەکارگرتنی عیرفان و راوبۆچوونی هاوسان بیروانگەگەلی هاوبەشە کە هەموویان پەیڕەکەری یەك فەلسەفەی "وحدت الوجود" کارگرتنی ئەو لە ئیشوکاری ئایینیدان.. وەك نموونە:

"حەلاج" کە لە جەرگەی چلتەنی ناسراوی ئەهلی حەق ناویلێبراوە و پلەی داوودی هەیە دانی بەوەداناوە کە زاتی پەروەردگار دەرکناکریت و خوداوەندگاری ساحیب رۆحێکی خودایییە و ئەو رۆحە قسەکەرە کە دەتوانیت پێوەندبێت بە دەروونی سالیکەوە و ئەم پەیوەستە بە شێوازی "حلول" "جیگربوون" سەرهەڵدەدات و بەمشێوە، ئەو کەسایەتییە دەبێتە بینەری هەبوونی خوداوەندە کە وایە لە کاتی وەسڵ بووندا چەمکی "اناالحق" بە زمان دەڵێت.

ئەم بووچوونە بۆ هەموو ئەو کەسانە راستە و دەتوانین جێگەپێی لە نووسراوەکانیاندا بدۆزینەوە.. وەك ئەم دوو بەندە لە "علي اعلي خليفه شافضل" کە دەفەرموی:

حلاج کە رفت بر سر دار/از فضل بیافت ابرار/
رە برد بە نطق گفت اناالحق/شد کشته و شد وجود مطلق





و یا ئەم دوو بەیتە لە "شافەزل" کە تێیدا، باسی مرۆڤ ـ خودایی کراوە:

بیرون ز وجود خود، خدا را/زینهار مجو! کە گفتمت فاش
گویی کە بغیر ما کسی هست؟/از خویش تو این حدیث متراش

و رەچاوکردنی ئەم بڕوا مینتالییە و بڕوا بەوەی کە کۆنترۆڵکردنی زەمەن، تەنیا لەتوانای ئەولیا و پیغەمبەراندایە لەبەرئەوەی کە دەسەڵات بەسەر هەستی زەمەن و چاودێریکردنی ئەو، تەنیا تایبەت بە کەسانگەلێکە کە ئیرادەی بەهێزیان هەیە بەواتا ئەو کەسانەی کە رازی هەتاهەتایی لە عەشقدا دەوێتن و ئەم گرینگایەتییە لە کەلامی یارسانیدا کە تەنیا وینین و مینتالیتەی بەرز لەبەرچاودەگریت وەك کوی کەسایەتیگەلیك بە یەك روانگەوە دێتەئاراوە کە هەریەك ساحیب زات و فریشتەکانن و پیوەندی ئەوان، پیوەندییەکی زۆحی و دەروونی بەبێرەچاوگرتنی کاتە و ئەوانیش بەپیی هێزی ئەوپەڕماتریالی خوایی کاردەکەنەسەر شوێن و زەمەن. "موستەفا کامیل شەیبی" نیز ئاماژەدەکات کە حەلاج لە روانگەی پەیڕەوکەرانی فەزوڵلا پلەیەکی بەرزی هەبووە لەبەرئەوەی کە ئەویان وەك گەورە و پێشڕەو سەیردەکرد. گوایە حەللاج وەك یەکەم شەهیدی سوفی دێتە خەوی فەزڵ و ئەو وەك هاوڕا و دۆستی خوی ناودەبات و فەزڵیش دوای قەتڵ دەبێتە یاری حەللاج و لەباری سەرەتا و سەرەنجام، بەسەرهاتی حەللاجی بۆ دووپاتدەبێتەوە.

هەموو ئەم تاکانە بەپیی بڕوای ئەهلی حەق لە فریشتەگەلی نزیك بە دەرگای یەکتان کە بەپێی پیویستییەکان لە قاڵبی جەستەییدا لەسەر زەوی جیلوەدەکەن تا هۆکاری گۆڕانکاری و بەرەوپێشچوون ئامادەبکەن و بۆیە شرۆڤەی هەبوونی خۆیان هەر لە ئەزەڵ و لە کاتی خولقاندن لە قۆناغەگەلی جوراوجۆردا دەزانن و پێداگری لەسەر دەکەن. ئەم باسە بەواتا "زەمەن" لەکن ئەمانە□دا جیا لە "کات"ە لای مرۆڤ و هەروەها بە حۆکمی پێداویستییەکان، مرۆڤ وەك ساحیب هێز و ئیرادە، دامیاریکردووە و پێشەکییەکانی حلول و یەکگرتن ئامادەدەکات. لە واقیعدا بەپێی بۆچوونی ئەهلی حەق، هەر کەسایەتییەکی ناودار و یان بەهێزێك کە بە پەروەردەکردنی ئیرادە، ریگەی خوی دەڕوات و دەگاتە پلەی مامۆستایی، نیشانەگەلێك لە حلول لەخۆیدا دەبینێت کە لەچاو یارسانییەوە، ئەو کەسایەتییە، دەبێتە ساحیب هێز و زات کە ئەگەر، ئەم هێز و زاتە لە کەسایەتیدا پێناسەبکەین دەبێ باسی فەلسەفەی ئیشراقی "سوهرەوەردی" بێننە

بەرباس کە هەر کەسایەتییەك پلەی ئیشراق دەپێوێت و هێدی هێدی دەگاتە هێزی تەواوی رۆحی کە میوانداری ئەوە.

بەهەرحاڵ، لەچاونەکردنی زەمەن بۆ فریشتەکان کە شرۆڤەی هاتووچۆی پەیتاپەیتا یان بۆ سەرزەوی کە وەك بەسەرچوونی قۆناغگەلی جۆربەجۆر باسیلێدەکرێ، وەك بەشێك لە فەلسەفەی دۆنادۆن لەکن یارسانییەکان پێناسەدەکرێت کە ئەم تەوەرە لە بەشی یارسانی لە مێژوودا و هەروەها لە بەشی لێکچوونی یارسانی لەگەڵ زەردەشتیگەریدا باسیلێدەکریت کە پیویست بە دووپاتکردنی نییە، بەڵام وتنی یەك رەستە جێگای خۆیەتی کە کۆی ناسراوانی عیرفان لەم قۆناغە زاتییەدا، مەقامی مەعریفییە و هەمووی بەهۆی ئەوانە لە مینتالیتە و فەلسەفەی "وحده الوجود" پەیڕەویدەکەن کە ئاکامی هەموویان بەهۆی داکۆکیکردن لە ئەرکی سەرشانیان، شەهیدبوون و شەهادەت بووە کە ئەم لێکچوونە ئەوانی لەیەك ریزدا دەستەکردووە.

لەواقیعدا، ئەم کەسانە بەهۆی وتەی راستەقینەی سەرەنجام لە "هەفتەن"ن کە یاری "سوڵتان"ن و لە قۆناغگەلی جوراوجۆردا سەریانهەڵداوە کە نموونەی گرینگی ئەمانە لە جێگە بە جێگەی سەرەنجامدا دەبینن" وەك ئەم وتەی "پیرملوان کەعبەیی"، لە بەندی ٥٨ لەهەمان قۆناغی کەلامیدا کە باسی سەرهەڵدانی پێشدادییەکان دەکات و لە ئاکامدا بە "کیانییەکان" تەواویاندەکات. کۆی کەسایەتیگەلێك وەك "جەمشید جەم" برادەری "تەهمووریس پێشدادی مەنوچیهر" لە بنەماڵەی "ئیرج" و کوڕی "پەشەنگ"، "کەیقوباد" کوڕی "ئەنوشیروان" یەکەمین پاشای زنجیرەی کیانی بە مێژووی پاشایەتی ٥٣١-٤٨٨ زایینی و "فەرەیدوون".. کە بەمتمانەوە لەیەك سەردەمدا دەژیاون، بەڵام هەریەك لەمانە، لە "هەفتەن"ن کە لە قۆناغە جۆربەجۆرەکاندا سەریانهەڵداوە.. هەروەها کە وتاری کەلامی "ئاغە ئەحمەدی دووهەم" دەربارەی ئەم قۆناغە زاتییە هاتووە: جیلوەی زاتی میوانی شافەزڵ وەلی قەلەندەر، بینیامین لەنێو پەرییەکان پاشا بوو، دەروونی چوار مەلایەك لە حوزووزدا بوون، بنەماکانی مەعریفەت لە پاشاوە سەرچاوەدەگرن و نەسیمی و زەکەریان و مەنسوور و "تورك سەربر" لەوانن..، بەرخی شافەزڵ ولی-**یان** سەربڕی و هەر چوار کەس، ئاکامیان بەچاوی خویان دێت. "ئاغە ئەحمەد"یش لەو بڕوادایە کە ئەم گرینگایەتییە لە دونیای دەرووندا شیلکیگرتووە و زاتەکان لە قۆناغێکی زەمەنی تایبەتدا لەیەکتر کۆبوونەتەوە و ئەم سەردەمە کەلامییە دروستکراوە کە لە پردیوەردا، رووداوەکە دەنووسرێت.





**نووربەخشییە**

نووربەخشییە یەکێکیتر لەو رێبازانەیە کە پەیوەندییەکی بەرچاوی لەگەڵ یارساندا هەبووە. بناخەی ئەم رێبازە لەلایەن "محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا موسەوی خوراسانی ٧٩٥- ٨٦٩ کۆچی"یەوە دانراوە. میر سەیید محەممەد دوای سەردانێك بۆ شاری "هەرات" دەبێتە پەیڕەوی رێبازی "کبرەویە" کە پیرەکەی خواجە ئیسحاقی خەتلانی بووە.

خواجە ئیسحاق پاش ماوەیەك خەوێك دەبینێت و بەهۆی ئەو خەوەوە نازناوی "نووربەخش" دەبەخشێت بە سەیید مەحەمەد و بە دەستی خۆی خیرقەی "سەیید عەلی هەمەدانی" دەخاتەسەر شانی.

سەیید مەحەمەد خۆی لەمبارەوە، لە نامیلکەی "الهدی"دا دەنووسیت: شێخ و سەییدی من ئیسحاق کوڕی ئارامشای خەتلانی "قدس الله تعالی سره" بە من، نووربەخشی فەرموو: بۆ من دەرکەوتووە کە تۆ ئیمامی مەهدی وەعدەدراو لە ئاخرزەمان دای. پاشان لەگەڵ من بەیعەتیکرد و گوتی: باکتنەبێت من شایەتی دەدەم کە تۆ ئیمام مەهدیت و من گیانم دەکەمە فیدای تۆ. خودا ئاگادارتبێت، هەرچەند بەڵا و کێشە بۆ ئیمام و پێغەمبەرەکان هەر دەبێت و لەوەشدا حیکمەتێکی تێدایە. ئەو "خواجە ئیسحاق" بڕیارەکەی بردەسەر و لە یەکێك لە شەوەکانی ئەربەعیندا گشت شاگردە تایبەتەکانی بانگهیشتکرد، پاش ئەوەی کە هەموویان کۆبوونەوە گوتی: هەرچەند کە بەڕواڵەت محەممەدی نووربەخش موریدی منە، بەڵام لەواقیعدا شێخی منە، هەر ئەوشەوە خیرقەی شێخێتی خستەسەر شانی من و من هەر بەم خیرقەوە کۆچیدواییدەکەم[٣١].

دوای ئەوەی سەیید محەممەدی نووربەخش خۆی بە ئیمامی زەمانی زانی و بۆ ئەم مەبەستە بانگەشەیکرد و کەسانێك بەیعەتیان لەگەڵ کرد، چەندجارێك لەنێوان نووربەخشییەکان و حکومەتییەکاندا شەڕ و پیکادان روویدا و لەهەمان ساڵدا "٨٢٧ کۆچی" شاهرۆخ میرزا رێبازی هەمەدانییەتی نووربەخشییەی سەرکوتکرد و رێبەرە ٩٧ ساڵەکەی، واتە خواجە ئیسحاقی خەتلانی و دوو کوڕەکەی و ژمارەیەکی زۆر لە پەیڕەوکەرانی شەهیدکرد[٣٢].

دوای ئەوە شاهرۆخ میرزا میرمحەممەدی دەستبەسەرکرد و ناردی بۆ هەرات. دواتر روویکردە شیراز و لەوێوە چوو بۆ بەهبەهان و شووشتەر و بەسرە و ناوچەی کرماشان و ئیلام.

ئەڵبەت بە وتەی قازی نوورئەڵڵا شووشتەری، پێشتریش، دووجار سەردانی کوردستانی کردبوو و وادەردەکەوێت کە خەڵکی ئەو هەرێمە باوەڕێکی زۆریان پێیبووە و بەناوی ئەوەوە خوتبەیان خوێندووە و سکەیان بە ناویەوە لێداوە.

دوای بانگەشەی "مەهدەوییەت" لە کوردستان کە گوایە خەڵکێکی زۆری لێکۆدەبێتەوە، شاهرۆخ میرزا نامەیەك ئاراستەی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان دەکات و داوایانلێدەکات لە هەر شوێنێکدا ئەو کەسایەتییەیان بەردەستکەوت دەستبەسەریبکەن و بینێرن بۆلای ئەو[٣٣].

دوای قولبەستکردنی سەیید محەممەد، شاهرۆخ میرزا کە لە کوشتنی دەترسێ و بەومەرجەی کە بانگەشەی مەهدەوییەت نەکات و تەنیا باسی زانستە فەرمییەکان بکات، دەینێرێت بۆ ئاوایی "سولغان"ی نزیك شاری تەبریز. سەیید محەممەد تا کۆتایی ژیانی لەوئاواییە نیشتەجێدەبێت و ژیانی خۆی بە عیبادەت و ڕێنومایی خەڵکەوە دەباتەسەر.

چۆنیەتی پێوەندی نووربەخشییە و یارسان لە دوو ڕوانگەوە جێگەی سەرنجە. واتە هەم لە ڕوانگەی بیروبۆچوونەکانیانەوە و هەم لە ڕوانگەی مێژوویی و کاتییەوە. نزیکی و پێوەندی سەیید محەممەد بە یارسانەوە تاڕادەیەك بوو کە زۆربەی بەسەرهاتنووسەکان و لێکۆڵەرانی بیانی سەیید محەممەد بە برای شێخ موسا و شێخ عیسا، واتە بە کوڕی باباعەلی هەمەدانی دادەنێن، هەروەها هەندێکیان شێخ عیسای باوکی سوڵتان سەهاکی بەرزنجی بە سەیید عیسا نووربەخشی ناودەبەن، هەروەها زۆربەیان سەیید محەممەدبەگی باوکی خان ئاتەش و سەیید محەممەدی نووربەخش بە یەك کەس دەزانن و لەسەر ئەو باوەڕەن کە نووربەخشی نازناوی ئەو کەسایەتییە بووە. کەسانێکیش بابایادگار و سەیید محەممەدی نووربەخش بە یەك کەس دادەنێن و نووسیویانە سەیید محەممەد کوڕی سەیید عەلی کوڕی شێخ موسایە، هەروەها بەهۆی تێکەڵبوون و یەکگرتوویی "موشەعشەعییە"و نووربەخشییە لە کۆمەڵگای یارساندا، تاهەنووکەش کەسانێك هەن کە بەناوی بنەماڵەی "نووربەخشی"یەوە لە کۆمەڵگای یاریدا دەژین.

بەهەرحاڵ هاتنی سەیید محەممەدی نووربەخش بۆ کوردستان، ئەویش چەندینجار و بەتایبەت سەردانی بۆئەو ناوچانەی کە یارسانەکانی تێدانیشتەجێبوون و هەروەها پەیڕەویکردنی ئەو کەسایەتییە لەلایەن پیاوماقوولانی ناوچەکەوە، ناتوانێت بێپەیوەندییەکی پتەو و بەرفراوان لەنێوان یارسان و ئەو کەسایەتییەدا ڕوویدابێت.





سەردانی سەیید محەممەد بۆ کوردستان لە کۆتایی سەدەی یەکەمی پردیوەر و دەستپێکی سەردەمی دووهەمدا ڕوویداوە، واتە لە دەورەی شاوەیس قوولی کە لەوکاتەدا ناوچەکە بەتەواوەتی یارسانی بووە.

### مۆشەعشەعییە

مۆشەعشەعییە یەکێکیتر لەو ڕێبازانەیە کە گوایە لەگەڵ یارساندا پێوەندی هەبووە. ئەم ڕێبازە لەلایەن "سەیید محەممەدی کوڕی فەلاحی مۆشەعشەع"ەوە بونیاتنراوە. سەیید محەممەد لە ناوچەی "واست"ی هەرێمی خووزستان لەدایکبووە و لە ساڵی ٨٤٠ی کۆچی بانگەشەی بۆ مەهدەوییەت کردووە و خۆی بە حەزرەتی مەهدی زانیوە و لە ساڵی ٨٧٠ی کۆچیدا وەفاتیکردووە. "سەیید محەمەد" سالیکگەلێکی فرە لە قۆتابخانەی "شێخ ئەحمەد" ژیاوە و لەچەند سەرچاوە-شدا هاتووە کە شێخ، دایکی ئەوی بەژنیی خواستووە. یەکێك لە بەناوبانگ-ترین شاگردەکانی شێخ ئەحمەد، "سەیید محەمەد نووربەخش" بووە کە پێشتر باسیکرا. لەمێژوودا هاتووە کە "ئەحمەد بن فەهەد حیللی" کتێبکی نووسی کە بریتیبوولە تەرکیبگەلی تەقینەوە کە بتکتولوجیاکەی ئیمە وەبیر بومبی هیدروژینی دەخاتەوە. ئەو کتێبە دەگاتە دەستی سەیید محەمەد کە لە ڕێگای ئەوەوە دەیتوانی بە خوێندنی دوعایەك، دۆژمنانی لەشەڕدا لەناوببات و ئەو دوعایشی فێر جەنگاوەران و پەیڕەوکەرانی خوی کردبوو“ بۆیە هیچ شمشێر و ئەسبابی شەڕێك - کاری لەسەر نەدەکرد.

سەیید محەمەد بەپیی وتەی خوی لە کەلامی "المهدی"دا، دوای ئەوەی ئیدیعای "مەهدەوییەت"ی کرد. بۆ ناوچەگەلی لوڕستانی ـ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یارسانی کە پێشتر وەسیلەی شاخوشین ئیدارەدەکرا ـ هەڵدی و لە لوڕستان بزووتنەوەیەك سازدەکات و پیڕەوکەرانی زۆر لە دەوری خوی کۆدەکات کە دواتر پێگەی دەسەڵاتی "موشەعشەعی" تاسەردەمی سەیید موحسین دەگاتە ناوچەگەلی کرماشان و دەورووبەری، بەڵام لەمیانەی ریگەدا مەولا عەلی جێگەی باوکی دەگرێتەوە و تەنانەت سەیید محەمەد خانەنشیندەکات بەڵام زۆر ناخایەنێت و لە ساڵی ٨٦١ کۆچی دەمریت کە بە کۆچیدوایی مەولا عەلی، دەسەڵات، دیسانەوە دەکەویتەدەست سەیید محەمەد. لەدوای سەیید محەمەد، سەیید موحسین دەبێتە جیگری کە ئەمە سەردەمی هێمنایەتی و لووتکەی دەسەڵاتی موشەعشەعییەیە. لە سەردەمی دەسەڵاتی چل و

چەند ساڵەی "سەیید موحسین"، سەرتاسەری خوزستان و بەسرە و ناوچەگەلی دەوروبەر تانزیکەی بەغداد و بیهبەهان و کەمکیلوویە و بەندرەکانی خەلیجی فارس، بەختیاری، لوڕستان، پشکوە و کرماشان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی موشەعشەعییە. و هەروەها کۆڕ لە دوای باوك تاسەردەمی نادرشای ئەفشار لەم ناوچەگەلەدا فەرمانڕەواییدەکەن.

سەرەنجام نادرشا حکومەتی موشەعشەعییە لەناودەبات کە دەتوانین ئاماژە بە دواین والی بنەماڵەی موشەعشەع لە ڕۆژەکانی ئاخری سەردەمی نادری بدەین.

پێویستە بگوترێ کە سەبارەت بە بانگەشەی مەهدەوییەتی سەیید محەممەدی نووربەخش و هەروەها سەیید محەممەدی کوڕی فەلاح و ڕێبازەکەیان، هیچ ئاماژە یان هیچ کەلامێك لە سەرئەنجامدا بوونی نییە و لە هیچ شوێنێکدا وەك "خاوەن زات" ناویانلێنەبراوە. تەنانەت لە کەلامەکانی دەورەی زاتی "خان ئاتەش"یشدا کە هاوکات بووە لەگەڵ یەکگرتنی موشەعشەعییە و نووربەخشییە، هیچ ئاماژەیەکیان پێنەکراوەو هەرئەمەش دەیسەلمێنێت کە پێوەندی یارسان و ئەم دوو بزاڤە لەڕاستییەوە دوورەو ئەوەش کە گوایە بنەماڵەی ئاتەش بەگی بە ڕەچەڵەك پەیوەندییان بە موشەعشەعییەکانەوە هەیە، ڕاست نییە، چونکە بناخەی بنەماڵەی ئاتەش بەگی لە پردیوەر داڕێژراوە.

### حەیدەرییە

یەکێکیتر لەو ڕێبازانەی پەیوەندییەکی نزیك و بەرچاوی لەگەڵ یارساندا هەبووە، ڕێبازی حەیدەرییە. ئەم ڕێبازە لە سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا لە هیندوستان، هاوکات لە گەڵ سەرەتاکانی دەورەی یەکەمی سەردەمی پردیوەر، لە هیندوستان سەرهەڵدەدات و لە دەورەی دووهەمی سەردەمی پردیوەردا لە ئێران پەرەدەستێنێت و گەشەدەکات[٣٤].

بنیاتنەر و سەرحەڵقەی ئەم ڕێبازە "جەلالەدین حەیدەر"ە کە زۆرجار بە باوکی شائیسماعیلی سەفەوی دایدەنین. لە هەندێك لە سەرچاوەکانیشدا "قوتیەدین جەلالەدینی حەیدەری توونی"یان بە سەرحەلقەی ئەم ڕێبازە زانیوە[٣٥]، هەروەها کەسانێکیش "قوتبەدین حەیدەری زاوە"یان کە گۆڕەکەی لە شاری "توربەت حەیدەرییە"یە بە بونیاتنەری ئەم ڕێبازە داناوە. "سەیید جەلالەدین حەیدەری بوخاری" ناوێکیش کە خەڵکی هیندوستان بووە و هەر لەو وڵاتەش کۆچیدواییکردوە، لەلایەن هەندێك لە لێکۆڵەرانەوە بە سەرحەلقەی ئەم ڕێبازە





پیناسەکراوە، بەڵگەنامە مێژووییەکانیش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە هەر ئەم کەسایەتییە، واتە جەلالەدینی بوخاری سەرحەڵقەو بونیاتنەری ئەم ڕێبازەیە و بە وتەی کەلامی سەرئەنجام لە بنەڕەتدا پەیڕەوی ئایینی "درووزی" بووە.

"مودەڕیسی عالەم" کە بۆ خۆی یەکێك لە سەرحەلقەکانی دەروێشانی "خاکسار" بووە سەبارەت بە جەلالەدین حەیدەر نووسیویەتی: من لە زاری مورشیدەکەی خۆمەوە بیستوومە کە سەیید جەلالەدین حەیدەر پیاوێکی ئێرانی بووەو ماوەیەکی زۆر لە هیندوستان سەرقاڵی پەروەردەکردنی دەروونی و چالاکی ئایینی بووە[٣٦]، هەروەها لە "تبیان الحق ایات ولایت"دا هاتووە: ئەم نەزمە "حەیدەری" لەلایەن خوالێخۆشبوو جەلالەدین هیندییەوە پێکهاتووەو چل تەن و حەو تەنی شیراز و قوتبەدین حەیدەر کە بە توربەی حەیدەرییە بەناوبانگە پەیوەندی بەوە هەیە[٣٧]، هەروەها سەیید محەممەد عەلی خواجەدین لە زمانی "محەممەد باقری ساعیدی"یەوە دەڵیت: پرسیارکرا سەیید جەلالەدین کێیە؟ سەیید جەلالەدین حەیدەرەی بوخارائی بەگوێرەی "عمده المقالات" چاپی حەیدەرئاباد، کوڕی سەیید ئەبوو زەید کوڕی سەیید یوسف کوڕی ئەبوجەعفەر کوڕی سەیید مەحمود کوڕی سەیید ئەحمەد کوڕی سەیید عەبدوڵڵا کوڕی سەیید عەلی عەسکەر کوڕی محەممەد نەقییە. کە بەگومانەوە دەتوانین بڵێین لە سەدەکانی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە.

کەواتە ناتوانین ڕەچەڵەکی سیلسیلەی خاکسار بگەڕێنینەوە بۆ بنەماڵەی سەفەوییە و ئەو کورسی مامانەی کە لەبەردەست خاکسارەکاندایە، وایدەردەخەن کە ئەو تیدییایە کە سوڵتان حەیدەری باوکی شائیسماعیلی سەفەوی بونیاتی ئەم ڕێبازەی داناوە، لەڕاستییەوە دوورە. ئەڵبەت ئەمە ڕاستە سوڵتان حەیدەر لە بنەماڵەی "فەقر"ەو باوەگەورەی، واتە شێخ سەفییەدین موریدی شێخ زاهیدی گەیلانی بووە، بەڵام هەروەها کە ئاماژەمانپێکرد ئەو کەسایەتییە بونیاتنەری ئەم ڕێبازە نەبووە. نووسەری "طرایق الحایق"یش لە هەمان "سەیید جەلالەدین بوخاری" نامدەبات کە موریدی "بەهائەدین زەکەریا ملتانی" نووسەری فارسینووسی نیمچە دوورگەی هیندوستان و موریدی "شێخ شەهابودین سوهرەوەردی" بووە کە لە بەرواری ۶۶۵-۶۵۶ کۆچی لە "ملتان" کۆچیدواییکردووە و ئەو لە جەرگەی دەرویشانی جەلالیدا پێناسەدەکات کە مەزاری ئەو لە "ئووچە"ی هیندوستانە و "حاجی زەینولعابدین شیروانی" لە وەسفی "ئووچ" دەنووسێت: دیهاتێکە لە بیلادی "ملتان"و ناوچەیە کە لە بەشی دووهەم“

کەشوهوایەکی خۆشی هەیە و دانیشتوانی زۆرتر دەروێشگەلی جەلالی و دیکەی هیندییەکانن. و لەبەرئەوەی مەرقەدی "سەیید جەلالی بوخاری" لەوێدایە و ئەولاد و سەرشاخەی ئەو گەورەپیاوە لەو ناوچەیەدا ژیاون، سەروەری جەلالییەکان و گەورەی دەروێشانی ئەم ناوچەیەن، هەروەها لە ناساندنی "سەیید جەلال"ی ناوبراودا دەنووسێت: "سەیید جەلالەدین" عارفێکی کەموێنە بوو و ئاوێنەی فەقرو فەنای سەردەمی خوی بوو و لە مەزهەبی ئیمامییە-دا لە سەواددا ئیشیدەکرد، هەروەها لە "منتخبات رسایل خاکسار"دا، "میرزا شەیدا"، سەیید جەلالەدین بە خەڵکی بوخارا ناودەبات.

بەپێی ئەم نووسراوانەدا دەتوانین بڵێین مەبەست لە جەلالەدین حەیدەر، دانەری زنجیرەی "حەیدەری"، هەمان سەیید جەلال بوخارییە کە لە سەدەی شەشەم و هەوتەمدا ژیاوە و لە "ئووچی" هیندوستان ئەسپەردەکراوە.

"ابن بطوطة" لە سەفەرنامەکەی خویدا سەبارەت بە شاری "ئووچ" دەڵێت: لە رۆژگاری ئەمڕودا، ئووچ لە قەوارەی سێ ئاواییدا لە ناوچەی پەنجاب ماوەتەوە کە لە رۆژگارانی کولە□دا زۆر بەناوبانگ بووە و نێوی کۆنی ئەوشارە، گوایە "دیوگرە" "دژخودا" بووە کە نەقڵدەکرێ لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا کچی "راجای مەحەل" لەسەر دەستی "سەیید جەلالەدین" شایەتیمان دینی و دەبێتە موسڵمان و ئەم قەڵا بۆ رێزنان لە مەقامی ئەو بەناوی "ئووجا" یان "ئووچ شەریف" بنیاتدەکرێ، بەم بۆنەوە دەتوانین وا بڵێین کە نێوی نوێی ئەم ناوچە لە وشەی "ئووجای" تورکی بە مانای سێ هاتبێ، هەروەها دەگوترێت کە: "لە شاری "ئووجە" شێخ عابید زاهید شەریف قوتبەدین حەیدەر عەلەوی"م زیارەتکرد و خیرقەم لەدەستی ئەو ئەستاند کە وێدەچی کۆڕەزای "سەیید جەلال سوورپۆشی بوخاری" یان هەمان "جەلالەدین حوسەین" ناسراو بە "مەحزووم جەهانینان" کوڕی "سەیید ئەحمەد کەبیر سەیید جەلالەدین سوور بوخارایی" کوڕی "سەیید عەلی ئەبدوالمویەد ئووچ بوخارایی" "٧٠٧-٧٨٥ کۆچی مانگی" بووە.

ئەم زاتە لە سەردانەکەی بۆ کوردستان کە هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی یەکەمی پردیوەردا، دەگاتە خزمەت سوڵتان سەهاکی بەرزنجی و دیداری لەگەڵدا دەکات. سەیید جەلالەدین لەلایەن یارسانەکانەوە نازناوی "بابا هیندو"ی پێدەبەخشرێت کە بەخشینی ئەم نازناوەش دوو هۆی بووە: یەکەم بەپێی یاسای یارسان هەر کەسایەتییەك کە ئەم هزرە وەردەگرێت نازناوێکی پێدەبەخشن، دووهەم چۆن ئەو زاتە تەمەنی زۆر بووە "هەشتا ساڵ"و لە هیندەوە سەفەری بۆ پردیوەر کردووە





نازناوی "بابا هیندو"یان لێناوە. ئەم سەردانە، بە رەچاوکردنی ژیانی جەلالەدین "٥٩٥- ٦٩٠ ی کۆچی"و بەپێی کەلامی سەرئەنجام دەبێت لە ساڵی ٦٧٥ ی کۆچی روویدابێت و هەرئەویش بۆ یەکەمجار "گوێزی هیندی" بە دیاری دەباتە پردیوەر.

هەندێك سەرچاوە بەدەستەوەن کە گوایە جەلالەدین لەگەڵ فیرقەی "درووزی" پێوەندی بووە و باوەڕی بە هزری "یەکبوویی" هەبووە و هەرئەمەش بووەتە هۆی ئەوە کە ئارەزووی سەردانی پردیوەر بکات و پرسان پرسان بگاتە ئەو شوێنە.

جەلالەدین دوای ماوەیەك نیشتەجێبوون لە پردیوەر، بە ئەمری سوڵتان سەهاك بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی هزری "حەیدەری" دەگەڕێتەوە بۆ هیندوستان. پیربنیامین لە سەردانەکەی جەلالەدین حەیدەر بۆ پردیوەر بەمشێوە بە خێرهاتنی دەکات:

هندوی تازە یار..

وەش ئامای وەخەیر هیندوی تازە یار<br>
دانەی یاریت سایو مەتابار<br>
ئاوردن پەی جەم بەیای ساحبکار

هەروەها سوڵتان سەهاك سەبارەت بە پلەوپایەی سەیید جەلالەدین کە میوانداری زاتی"داوود"ی کردووە و دوای پەردەگرتنی داوود، ماوەیەك شوێنی داوود "میکائیل"ی لە پردیوەر پڕکردووەتەوە، دەفەرموێ:

جەلای تودایم نە جەلای زاخم<br>
ئیسا چە توی یاری گوستاخم<br>
ئیدن یار داوود وە شاخای شاخم<br>
وەش ئازاد مووە دڵی دوساخم

دوای هاتنی سەیید جەلالەدین حەیدەر بۆ پردیوەر و گەڕانەوەی بۆ هیندوستان، بەشێوەیەکی فەرمی و دیاریکراو پەیوەندی فیکری یارسان و ئەو وڵاتە چێدەبێت و دواتر بەچوونی بابایادگار بۆ ولاتی هیند و نواندنی چالاکی ئایینی لەو وڵاتە و پێکهاتنی یارانی "زکری" پەیوەندییەکە پتەوتر دەبێت و پەرە دەسێنیت، هەروەها کە پێشتر ئاماژەمپێکرد، سوڵتان

سەهاك یارەکانی خۆی بۆ چالاکی ئایینی دەنارد بۆ وڵاتانی دوور و نزیك، بەڵام ئەو یارانە بەناوی راستەقینەی خۆیانەوە نەدەناسران و هەر هەموویان خاوەن نازناوی پردیوەری بوون و هەر ئەمەش وایکردووە کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بەناوگەلێکیترەوە ئاماژەیانپێکرابێت و ناسینەوەیان دژواردەبێت.

لە کتێبی "تذکرە اعلی"دا بەمشێوە ئاماژە بەو راستییە کراوە: هەر یارێك زانستێکی پێدەدرا و دەنێردرا بۆ شوێنێك، حاجی باوەیسی بۆ کوێستان، سەیید حەبیب بۆ کوردستان، سەیید محەممەد بۆ ئەردەبیل، میر بۆ تورکستان، سەیید شەهابەدین بۆ رۆم و سەیید مستەفا بۆ لوڕستان.

هەر لەو سەرچاوەدا سەبارەت بە کەسایەتی "میر" نووسراوە: میر نێردرا بۆ تورکستان، لەو وڵاتە میر بوو لە شوێنێکیتر شا بوو، لە هیند روالەتی مرۆڤی بوو، لە ملکی ئەفغان شا شێر بوو، لە شوێنێك ئەمیر بوو، ناوی شەریعەت حسەین، ناوی تەریقەت شا سەیید جەلالەدین، ناوی حەقیقەت میر بوو، ناوی مەعریفەت پیر بوو.

پێوەندی یارسان لە گەڵ وڵاتی هیند، دوای دەرکەوتنی شاهەیاس "ئەیاز" لە ناوچەی "تان"ی هیندوستان و هاتنی ئەو زاتە بۆ هەورامان لە سەردەمی "پیر قەنبەری شاهۆیی" ئەوەندەیتر پتەودەبێت. شاهەیاس ناسراو بە "دودەمەردی حەقانی" شامیوان بووە و لە سەرەتا یەکێك بووە لە موریدانی قوتابخانەی سەیید جەلالەدینی بوخاری سەرحەڵقە و خاوەن دوودەی فەقیرەکانی خاکسار، ناوی تەریقەتییەیەکەی شاهەیاس "غولامعەلی شا" بووە کە هەندێك لە کەسان پێیانوایە خەڵکی قەندەهار بووە و نووسیویانە مەزارگەکەشی هەر لەو شوێنەیە. ئەڵبەت جەنابی مودەڕسی عالەم لە گەنجینەی ئەولیادا نووسیویەتی غولامعەلی شا لە هیندوستانەوە هات بۆ ئێران، ئەڵبەت من نالێم خەڵکی هیندوستان بووە، بەڵکو بۆ پەروەردەی دەروونی خۆی روویکردووەتە ئەو وڵاتە و لای پیرەکان و "مورتاز"ەکانی هیندوستان دەرسیوەرگرتووە و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و دەستیداوەتە پەروەردەکردن و رێنمایی خەڵك، بەڵام مودەڕسی عالەم لە دەستنیشانکردنی شوێنی لەدایکبوونی ئەو کەسایەتییە دوودڵ بووە، بەڵام بەپێی کەلامی سەرئەنجام دەردەکەوێ کە غولامعەلی شا بە رەچەڵەك هیندی بووە و دوای سەردانەکەی بۆ پردیوەر فێری زمانی کوردی دەبێت و بەوتەی هەندێ کەس لە دۆڵێکی نێوان ئیسلامئابادی غەرب و کرندا ون "غەیب"دەبێت و تائێستاش ئەو دوڵە لای خەڵکی ئەو ناوچەیە بە "تووەی



ژمارە (١٦) ئایار ٢٠١٢ کۆچ

هەیاس" بەناوبانگە.

بەپێی کەلامی سەرئەنجام هاتنی ئەو زاتە بۆ هەورامان و ناساندنی خۆی بە پیرقەنبەری شاهۆیی بەمەبەستی سەرسپوردەیی و وەرگرتنی ئیزن بووە بۆ بونیاتنانی رێبازێکی نوێی جیا لە رێبازی حەیدەری. بابا شاموراد لەمبارەوە دەفەرموێ:

فەرزەند شێخ عیسی یانە بساکان
زات یکتائیش ها وەستەن ئەو تان
بەو شا کە زاتش خالقەن جبار
هەیاس هاوە دون شای خاوەندکار
وە هندوستاندا بی وە دودەمەرد
وە شارەزویلدا دێت کە چیشش کەرد

غولامعەلی شا "شاهەیاس ــ دودە مەردی حەقانی" بنیاتی سلسلەی جەلالی کە "ئەبووتورابی"و "غولامعەلی شاهی"شی پێدەگوترێت، داناوە کە هەنووکە لە ئێراندا تەنیا خاکسار جەلالی رێخستنیان هەیە و لقەکانیتری حەیدەری ژمارەیان زۆر کەمە و لە هەر کامێکە و چەند کەسێك ماوەتەوە.

دوای دودەمەردی حەقانی شاهەیاس کوڕی شێخ عیسا بساکانی لە هەوراماندا دەردەکەوێت، کە بەوردی لە "بەشی یارسان دوای پردیوەر"دا باسیکراوە.

سەبارەت بە یارەکانی سوڵتان سەهاك ئەو ناوانەی کە لە کەلامی سەرئەنجام و تێکستە کۆنەکانی یارساندا ئاماژەیانپێکراوە و لە مێژوودا هیچ ئاماژەیەك بەو کەس و ناوانە نەکراوە، کە هەر ئەمەش بووەتە هۆی سەرلێشواوی لێکۆڵەران و سازکردنی ئەفسانە و چیرۆکی بێبنەما، پێویستە بگوترێت گشت ئەو کەسایەتییانە لەهەمان سەردەمی یەکەمی پردیوەردا بەناوە ئەزەلییەکانیانەوە "ناوە پردیوەرییەکانیان" ناویانلێبراوە، بەواتایەکیتر هیچ کەسایەتییەك بەناوی ئەم دونیاییەوە بانگیلێنەدەکرا و گشتیان خاوەن نازناوبوون و بەو نازناوەوە دەناسران، هەروەها پێویستە بگوترێت کە بەهۆی درێژخایەنبوونی سەردەمی پردیوەر کە نزیك بە سێسەد ساڵ دەبێت و هەروەها بە رەچاوگرتنی تەمەنی مرۆڤێك، هەر ئەرك و پلەیەك لەوماوەدا بەچەندین کەس سپێردراوە و دوای کۆچیدوایی "جەستەیەك" بەڕێوەبەری ئەو ئەرکە کە بە باوەڕی یارسانەکان فریشتەیەك بووە و بە ئەمری خودا لە رووی زەویندا دەرکەوتووە، پێویست بووە لەجەستەیەکیتردا

دەرکەوێت و درێژە بە ئەرکی پێسپێردراو، بدات. کەواتە دەتوانین بڵێین، بۆنموونە فریشتەیەکی وەك میکائیل یان یەکێك لە حەفتا و دوو پیر، لە سەرەتای سەردەمی پردیوەرەوە تاکۆتایی ئەو سەردەمە پێویستبووە چەندین "کراس"و "جەستە" بگۆڕێت، تابتوانێت ئەرکە پێسپێردراوەکەی بەجێبهێنێت.

هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوە کە ناو و شوێنی لەدایکبوون و وەفاتی زۆربەی یارانی سوڵتان سەهاك نادیاربێت، هەروەها ئەم راستییە وایکردووە کە نەتوانین بڵێین ئەو کەلامانەی کە بۆمانماوەتەوە لە چ کات و مێژوویێکی پردیوەردا نووسراون. بۆنموونە کەلامێك کە لە زمانی "کاکاپیرە"وە گوتراوە، بەناوی "بنیامین"یشەوە ناسراوە و بەهی ئەویش زانراوە. ئەڵبەت کەلامی واش هەیە کە مێژووی گوتنەکەی ئاشکرایە و دەتوانین مێژووی بۆدابنێین، بەڵام سەبارەت بە یارانی سوڵتان ئیسحاق و ئەو نێوانە لە کەلامی سەرەنجامدا کە لە مێژوودا ناوێك لەم کەسایەتییانە تۆمارنەکراوە و هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بڕێك کەسایەتی دەستکرد لەلایەن پسپۆڕانەوە دروستبکرێت و عاسمان و رێسمان بۆبکەن، دەبێ بڵێین کە هەموو کەسایەتییەکانی یارسانی لەهەمان سەرەتاکانی پردیوەردا بەناوگەلی ئەزەڵی و یان بە وتەی سەرەنجام بەناوگەلی پردیوەری پێناسەکراون، بەجۆرە کە ناوگەلی راستەقینەی خۆی نەبڕاوە بەڵکو نازناوێکی بۆدانراوە، هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە بەهۆی درێژخایەنبوونی سەردەمی پردیوەر کە نزیکەی سێسەد ساڵی خایاندووە و هەروەها درێژەی تەمەنی مرۆڤێکی ئاسایی دەبێ سەیری ئەم وردەکارییە بەجۆرێك بکەین کە پلەوپایە و سەروەری لە دەزگای یاری-دا کە بەپێی بیروبڕوای ئەهلی حەق، هەموویان لە فریشتەگەلی نزیك بە دەرگای خوداین و لە عالەمی خاکیدا ئەرکی خویان بەجێدەهێنن بەپێی رواڵەت لە چەند جامە و کراسدا بە قاڵبگەلی جۆراوجۆر لە گەڕاندا بووگن و رۆح یا فریشتە دوای خاڵیکردنەوەی جلوبەرگی مرۆڤایەتی "مەبەست کۆچیدواییکردنە"، لە جامەیەکی نوی-دا جیلوەیکردووە و گریمانەی ئەوە هەیە کە یەك پلەیان فریشتەیەك وەکی میکاییل، عەقیق و یان یەکێك لە هەفتاو دوو پیر و.. لە سەرەتای سەردەمی پردیوەر تاکۆتاییەکانی ئەم چەرخە، چەند جامە و کراسیان گوڕابێت و تەنانەت کەمتر لە مرۆڤێکی ئاساییش تەمەنیانکردبێت. بۆنموونە شەست و شەش خزمەتکاری کەمەرزێرین کە لە سەرەتای پردیوەر، خزمەتی سوڵتان ئیسحاقیان کردووە و خوازیاری سەرسپاردن لە دەزگای یاریدا بوون و لە گەورەپیاوان و ریشچەرمووەکانی ناوچە بووگن لەدوای چەند ساڵ کراسیان





دەرهاوردبێت و بەهۆی تەمەن زۆربوون، تەنانەت نەیانتوانیبێت بەنیوەی چەرخی یەکەمی پردیوەریش گەیشتبن و یان مەلا روکنەدین و ئەوانیدیکە کە لە سەردەمی بەرزەنجەدا ناویانلێبراوە تاکۆتاییەکانی سەردەمی پردیوەر چەند جامە و قاڵبیان بەناوگەلی جۆراوجۆر خاڵیکردبێت بەڵام لە کەلامی سەرەنجامدا هەر بەنێوی "پیرموسا" یادیانلێدەکرێت.

کەوایە بەپێی بارودۆخ کە لە سەردەمی پردیوەر، هەموو یاران پێکەوەبوون و رێوڕەسمی یارییان بەجێهاوردگە هەریەك لە یاران، لە پێڕستی رێبەرایەتی سوڵتان ئیسحاقدا کە قاڵبی بە رواڵەت بەجێدێڵێت ئەو رۆحە ئەچێتە قاڵبێکیدیکەوە و هەموو کاتێك جیگەی خاڵی سوڵتان ئیسحاق پڕدەکەنەوە و ئەم رووداوە دەبێتە هۆی ئەوە کە زۆربەی نێوی یارانی سوڵتان ئیسحاق و جیگای لەدایکبوون و ناشتینان رووننەبێتەوە و فرەتربن بە ئەفسانە. هەمان شت دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی کەلامەکانی بەردەست بۆمانی روونکەنەوە کە ئەو کەسایەتییە لەکام سەردەمدا ژیاوە لەبەرئەوەی کە هەموویان بەناوگەلی تایبەت، ناویانلێبراوە.

بۆنموونە کەلامێك کە لە زاری "کاکە پیرە" هاتووەتەدەر، بەهەمان ناوی پیر بینیامین تۆمارکراوە. ئەڵبەت قۆناغەکانی کەلامیدیکەش هەن کە دەتوانین زمانی وتاری ئەوان پێناسەبکەین، وەك کەلامی سەردەمی بارگە بارگە کە دەگەڕێتەوە بە کۆتاییەکانی سەردەمی پردیوەرییە چونکە بەلگەگەلی بەردەست وەك شایەتی دەربارەی شافەزڵ، حاج بەکتاش وەلی کە لە نیوەی پردیوەردا فۆرمی گرتووە و ئەمانە بەهۆی باسگەلی تەرحکراو وەك پیوەندی رۆحی و مەعنەوی، سەفەر و هاتووچوو و بڵاوکردنەوە و پڕوپاگەندەکردن بۆ ئایینی یاری، ئاگاداری هەبوونی یەکتر بوون و شایەتییان بۆیەکترداوە کە ئەمە پێشاندەری راستی ئیدیعاکانی کەلامی یارسانە، هەروەها ئاماژەنەکردنی کەسایەتییەکان بە کات و شوێنی ژیانیان لە سەردەمانی جۆربەجۆردا ئەو راستییە دەردەخەن کە یارسانی هەرگیز روانگەی ناوچەگەرایانەیان نەبووە و بەپێی فەلسەفەی یارسانی، پڕوپاگەندەیان بۆ ئەندیشەی ئینسانی کردووە و خویان بە پاسداری حەقیقەت زانیوە و بەپێی هەمان بنەمایە کە بۆ هەموو کتێبە ئایینییەکان رێز و حورمەت دادەنێن و تەکریمیاندەکەن، بەڵام فەرمانگەلی سەرەنجام وەك رێنووسی ژیانی خویان دەزانن و نوێژی و تاعەتی خویان نزیك ئەم وتەی کۆنفۆسیوس دەکەنەوە کە ژیانی من، نوێژی منە.

***

**سەرچاوە**

١. تاریخ ایران از اسلام تا سلاجقه، ر.ن.فرای، ترجمە حسن انوشە، امیر کبیر١٣٦٣، ص ٤٠٧.

٢. یادداشت هایی در مورد گایفه اهل حق ، مینوورسکی

٣. طریق الحقایق، جلد اول، ص ٥٣٢

٤. الفرق بین الفرق در تاریخ مزاهب اسلام، ص: ٢٥٧.

٥. بکتاشییە ڕێبازی پێڕەوانی (حاجی بەکتاشی وەلی)ن کە (بالیم سوڵتان/ کۆچکردووی ساڵی ٩٢٢ زایینی) بە کۆکردنەوە ودەستنیشانکردنی بنەما و یاساکانی چوارچێوەیەکی تایبەتی بۆ دانا. ئەم ڕێبازە پەیوەندییەکی بەرچاوی لەگەڵ هزری یاریدا هەیە ودەتوانین بڵێین جگە لەودابونەریت و تایبەتمەندییە نەتەوایەتی و ناوچەییەی کە ئاوێتەی ئەو ڕێبازە بووە، لێکچوونێکی تەواویان هەیە. حاجی بەکتاش کە ناوی تەواوی (محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی مووسا خوراسانی)یە و لە نەیشابوور لەدایکبووە، رووەکاتە (ئاناتولی) لە سوپای (یەنی چری)دا لایەنگرێکی زۆر روویتێدەکەن. ئەو کەسایەتییە ڕێبازێك پێکدەهێنێت کە لە سەدەکانی نۆهەم ودەهەمدا دەبێتە ئایینی فەرمی سوپای یەنی چری و بەهۆی ڕۆڵی ئەو سوپایە لە شەڕ ودواتر داگیرکردنی (نیمچە دوورگەی باڵکان) لەو ناوچەش بڵاودەبێتەوە، بەسەرهاتی حاجی بەکتاش نادیار و تەموومژاوییە و زۆرتر لە کەسایەتییەکی ئەفسانەیی دەچێت، بەڵام ئاشکرایە کە لەسەرەتادا پێڕەوی ڕێبازی (بابایی) بووە کە ئەم ڕێبازە یەکێك بووە لە لقەکانی ڕێبازی مەلامەتییە لە خوراسان. ئەو کەسایەتییە لە ساڵی ٧٣٨ی کۆچی لە گوندی بەکتاش، لەنێوان شارەکانی قوونیە و قەیسەرییە کۆچیدواییدەکات. لە ڕێبازی بەکتاشییەدا پێنج پلەی ئایینی دەستنیشانکراوە کە بریتینلە:

(موجیب). ئەم پلە تایبەتە بەو کەسانەی سەرسپوردەی یەکێك لە (بابا)کان دەبن. پلەی دووەم (دەروێشی)یە. دەروێش بە موجبێك دەگوترێت کە دان بە دەروێشیدا بنێت وداخڵی (تەکیە) یەك بێت و بۆ ماوەیەك خزمەتی ئەو شوێنە بکات. پلەی سێهەم (بابا)یە. دەروێش دوای ئەنجامی گشت ئەو ئەرکانەی لەسەرشانی دانراوە بە پشتگیری موجب ودەروێشەکانیتر، پلەی بابایی وەردەگرێت و ئیزنی پەروەردەکردنی پێدەدرێت.

پلەی چوارم (تجرد)ە. تەجەرود یەودەروێش یان بابایانەی دەگوترێت کە بە خواستی خۆیان زەماوەندناکەن ودوای تاشینی سەر و کونکردنی گوێچکەی راست، بۆ هەتاهەتایی خزمەتی ڕێبازەکەیان دەکەن.

پلەی پێنجەم (خەلیفە)یە. هەر کەسێك بیەوێت بگاتە پلەی خەلیفە، پێویستە لانیکەم پشتگیری سێ بابای (موجەرەد) وەربگرێت: (بڕوانە: سوبحانی و ئەنساری، ص: ٥٢٧ ـ ٥٢٩).





٦. عارفگەلی شاعیر و کوکەرانێکی فرە بە نازناوی «قایغوسوز» لەنێو تورکە شیعەکان، بەکتاشەکان و ڕێبازگەلی ئاوەها بووگن. ئەو پەرتووکەی کە بەنیوی «رسالەی دڵ قایغوسوز» هاتووە، بەشێکە لە یەك «قارا مجموعە»ی تیکستە ئایینییەکانی کتێبی کۆن تورك کە بەرهەمی خوالیخۆشبوو «فاخیر ئیز»ە. «قارا مجموعە» بە کوی کتێبگەلی بنەماکانی ئەدەب دەگوترێت کە لەلایەن «موریدە»کانەوە نووسراوە و هەمووی بۆ شێخ سەفی یان وتارەکانی ئەودەگەڕیتەوە. لەبنەمادا «قارا مجموعە» دەبێ نووسراوەی «شێخ سەفی ئەالدین ئەردەبیلی» بووبێت. (قارا مجموعە، د. سەیید حوسەین محەممەدزادە سدیق، لاپەڕەی ١٠١).

٧. سەرئەنجام، کەلامی بارگە بارگە، بەندی ٥٤.

٨. سەرئەنجام، دەورەی شێخ سەفییەدینی شەردەبیلی.

٩. زندگی شاه اسماعیل صفوی، رحیم زادە صفوی، ص: ٦٨.

١٠. عالم ارای صفوی، ص: ٢٥.

١١. سازمان اداری حکومت صفوی، مینورسکی، ص: ٢٤.

١٢. دنبالە جسجودر تصرف ایران، ص ٧٥.

١٣. سفرنامە یك تاجر در شرح سفرهای ایتالیائیها در ایران، انجمن هکلیوت.

١٤. جنگ چالدران، نصراللّە فلسفی، مجلە دانشگاه ادبیات تهران، ش ٢ سال اول.

١٥. سەرئەنجام دەورەی عالی قەلەندەر، بەندی ٧.

١٦. تاریخ ایران دەورە صفویان، پژوهش در دانشگاه کمبریج، ترجمە: دکتر یعقوب اژند، ص: ٣١٣.

١٧. یادداشت هایی در مورد تایفەهای اهل حق، مینورسکی ، ص: ١٣.

١٨. واژەنامە گرگانی، دکتر صادق.

١٩. دنبالە جستجودر تصرف ایران، ص: ٥٥.

٢٠. زندگی و اشعار عمادالدین نسیمی، ص: ٢٤.

٢١. ریگ ودا.

٢٢. ریگ ودا.

٢٣. تاریخ تظم و نثر در ایران، جلد دوم، ص: ٧٦.

٢٤. سەرئەنجام، دیوانی عابدین، بەندی ٤٠.

٢٥. دیوانی قووشچی ئۆغلی ـ دەسنووس.

٢٦. ایلخضی، غولامحسین ساعدی، ص: ١٠٠.

٢٧. مەسنەد نیشنانی عەلەوییە، عیرفان و سەفەوییە کە بەنێوی «چل تەنان» ناوبانگیاندەر کردووە بریتینلە: ١– هو ٢– شێخ حەسەن بەسری ٣– شێخ حەبیب عەجەمی ٤– شێخ

عەبدوڵلا سەمەرقەندی ٥- ئیبراهیمی ئەدهەم ٦- شێخ ئەبوو سلێمان داوود بن نەسر تاعی کەرخی ٧- شێخ مارفی کەرخی ٨- شێخ سڕی سەقەتی ٩- عەبدولڕەحمان جامی ١٠- بایەزید بەستامی ١١- شێخ جونەید بەغدادی ١٢- شێخ مەمشاد ١٣- شێخ دینەوەری ١٤- شێخ ئەبومحەممەد عەموویە ١٥- شێخ جامی وجیهەدین ئەڵبە کرەوی ١٦- شێخ نەجیبەلدین سوهرەوردی ١٧- شێخ قوتبەدین ئەبوبەکر ئەبهەری ١٨- شێخ روکنەدین سەجاسی ١٩- شێخ فەریدەدین عەتار نەیشابووری ٢٠- شەمسی تەبریزی ٢١- مەولانا جەلالەدین محەممەد مەولەوی (مەلای رۆمی) ٢٢- مەولانا جەلالەدین بەڵخی ٢٣- سوڵتان حەمیە ٢٤- عاشق پاشا ٢٥- شێخ قەزل حەق ٢٦- شێخ شەهابەدین ئەهەری ٢٧- شەمس مەغریبی ٢٨- شێخ جەمالەدین ٢٩- شێخ زاهید گەیلانی ٣٠- شێخ سەفی- ئەدین ئەردەبیلی ٣١- شێخ سەردەدین موسا ٣٢- خواجە عەلی سیاپوش (رەشپۆش) ٣٣- شێخ محەممەد مومین خوراسانی ٣٤- حاجی بەکتاش وەلی ٣٥- پیرئیلیاس ٣٦- خواجە یووسیف حەیران ٣٧- سەیید محەمەد عابیزی ٣٨- سوڵتان حازری ٣٩- سوڵتان نەهانی ٤٠- بابا سەلمان (حەماسەی پڕ شکوی چل تەنان، پەرویز بابازادە، لاپەڕەی٦٢)ە کە کۆی ئەو چل کەسایەتییە عیرفانییە وەك سەرهەڵدانی دووهەم لای ئەهلی حەق پێناسەدەکرێت کە لە جەستەی چل مرۆڤی پاك (ناوبانگیان بە چلتەنی پێشڕەودەرکرد) ئاشکرا دەبن و لە سەردەمی حەزرەتی محەممەد وەدیهات کە یەکەم جەم کەمەربەستەی حەقیان لە گومبەزی ئەلخەزرا پێکهێنا و نهێنییەکانی ئایینی چلتەن لەلایەن «مەولا عەلی» خەڵاتی «شێخ حەسەن بەسری» کرا.

لاپەڕەی ٥٨ لە کتێبی ئەوان (چل تەنان) کە وەك بەڵگە ناوی لێدەبەن، «کشف الاسراری» سوڵتان نەهانییە هەروەها دیوانگەلیتر وەك «قوتب-نامە»، «دیوانی فاتیحی»، «دیوانی هیمەتی»، «دیوانی نەسیمی»، «دیوانی رەهبەری»، «دیوانی حەقیقی»، «دیوانی باباحازری»، «دیوانی خەتایی» (شائیسماعیلی سەفەوی)، «دیوانی عاشق پاشا». (لاپەڕەگەلی ٦٨ و ٧٦). چل تەنان وەك مەسنەد نیشانی چرا ناودەبەن و یەکەم چرای دایەرەی جەمی چل تەنان، «بابا سەلمان» بووە. لەنێو ئەم چل کەسایەتییە عیرفانییە، «فەزوڵلاَ نەعیمی»، «حاجی بەکتاش وەلی»، «سەیید محەمەد موشەعشەع"و «شێخ سەفی ئەردەبیلی» مەسنەد نیشنانی عەلەوییە و سەفەویین کە تەریقەت و رێبازی بیرمەندانەی خویان سامان داوە و نیو خەڵکی ناوچە و سەردەمی خویاندا بڵاویانکردووتەوە. هەروەها سوڵتان جەلالەدین حەیدەر و هەموو ئەو ئائینزانە کە پێوەندی بەوە هەیە و یان تایفەکانی «قزلوو»، «سیاه مەنسوورییەکان» (رەشە مەنسوورییەکان)، «ئایر ملو»ەکان، «قاسملوو»ەکان، هەداوەندەکان و..

٢٨. ایلخضی ص ٨٧.

٢٩. سەرئەنجام، کەلامی بارگە بارگە، بەندی ٥٥.





٣٠. زۆربەی سەرچاوەکان لەو باوەڕەدان کە دواین ساتەکانی ژیانی نەسیمی لە حەڵەب بەسەرچووە، بەڵام خاوەن کتێبی (الگایف الخیال) نووسیویەتی لە شیراز کوژراوە و گشت ئەو کتێبانەی (الگایف الخیال)یان وەك سەرچاوە بەکارهێناوە بەهەمانشێوە شوێنی کوژرانی ئەویان شیراز، یان ناوچەیەکی نزیك ئەو شارە بەناوی زرقان نووسیوە. بڕوانە: زندگی و اشعار عمادالدین نسیمی، ص: ٢٣.

٣١. رسالة الهدى ١/٢١ بة نقل از مشعشیان، محمد علی رنجبر، ص: ٨٠.

٣٢. روضات الجنان، جلد دوم، ص: ٢٥٠. مجالس المومنین، ١٢.

٣٣. مجالس المومنین، ج٣، ص ١٤٦.

٣٤. ئەم رێبازە لە چوار شێواز پێکهاتوە: ١: خاکسار جەلالی کە ئەبووتۆرابی و غولامعەلی شاهیشی پێدەگوترێت. ٢: دوودەعەجەم ٣: مەعسوومعەلی شاهی ٤: نوورائی. ئەم رێبازە حەوت پلەی بۆ سەرکەوتن و گەشەکردن داناوە کە بەم شێوەن:

١: لسان ٢: پیاڵە، بە مانای خواردنەوەی پیاڵەی فەقر (هەژاری) کە چواردە یاسای هەیە. ٣:کیسوەت، کە خوازیارەکەی داخدەکرێت و مانای مۆری نەبووەت دەدات. ٤: گل (خاك؟) سپاردن ٥: گوێزشکاندن کە لەم پلەدا رێڕەو دەگاتە پلەی رێنمایی و دەبێت بگاتە خزمەت یەکێك لە سەییدەکانی بنەماڵەی (میری) ئەهلی حەق و سەرسپوردەی ئایینی یاری بێت.٦: چراغی ٧:ئیرشاد (مورشیدی تەواو)

٣٥. قوتبەدین حەیدەری توونی مووسەوی یەکێکە لە سەییدە رێزدارن و عارفە بە ناوبانگەکان کە پشتاو پشت رەچەڵەکی دەچێتەوەسەر عەبدوڵڵا کوڕی موسا کوڕی موسا کوڕی جەعفەر (موسی ابن جعفر) ئیمامی شێعە. ئەو زاتە سەرحەڵقەی فیرقەی (حەیدەریە)یە. شێخ عەتار گەیشتووەتە خزمەتی و کتێبی (حەیدەرنامە)ی بەناوی ئەوەوە نووسیوە لە شاری (توون)ی خوراسان لەدایکبووەو ماوەیەك لە تەبرێز ژیاوە و هەر لەو شارە کۆچیدواییکردووە. (لغت نامە دهخدا، حرف ق ص١٥٥٥٠) هەر وەها محەممەد مەعسومی شیرازی رەگەزنامەی ئەو زاتەی لە بەرگی دووەمی لاپەڕەی ١٣٠ی کتێبی طرایق الحقایق دا نووسیوە.

٣٦. گنجینە اولیا، عبدلکریم مدرسی عالم، ص: ١١١.

٣٧. تبیان الحق ایات ولایت (تحفة درویش) ص: ١١٤.

# کەسایەتی قازی محەممەد و رۆڵی لە دامەزرانی کۆماری کوردستاندا

ئا. هاوار حەمید

## بنەماڵەی قازی محەممەد

گومانی تێدانییە ئەو بەشە کوردەی کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی کوردستانی ئێران هەر لەمێژەوە کەوتووەتە ژێر دەسەلاتی دەرەبەگ و کۆنەپەرستی داگیرکەر، کۆمەڵێك هۆز و بنەماڵەی تیادادەرکەوتووە هەوڵی زۆریانداوە بۆ ئازادکردنی و دەرکردنی لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەران.. یەکێك لەو بنەماڵانە بنەماڵەی (قازی محەممەد)ە.

قازی محەممەد کە کوڕی قازی عەلی کوڕی میرزا قاسم کوڕی میرزا ئەحمەدە لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمەوە ناوبانگیاندەرکردووە لە موکریاندا، مێژووی ئەم بنەماڵەیە لە سابلاخدا دەگەڕێتەوە بۆ چوارسەدە پێشتر، ئەم بنەماڵەیە لەلای خەڵکی ناوچەکە و کورد بەگشتی تەنانەت لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتیشەوە جێگەی رێز و تەقدیربوونە، لەساڵی ١٨٣٥ بابەگەورەی قازی محەممەد واتا شێخ ئەلمشایخ هەموو هۆز و سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکەی کۆکردووەتەوە و لەو کۆکردنەوەیەدا داوای (جەبهەی یەکێتی) دژی ئینگلیزی کردوە، هەروەها ئازادی کوردستانیشی پێشنیارکرد.(١)

کەواتە بنەماڵەی قازی محەممەد هەر لە رەچەڵەکەوە هەستی نەتەوایەتی و نیشتیمانپەروەری بەهێزیان هەبووە بەرامبەر بە کورد بۆ رزگارکردنی کوردستان لەگەڵ ئەوەشدا هەستی توندیان هەبووە بەرامبەر بەوکەسانەی کە دەیانەوێست کوردستان داگیربکەن. لە ساڵی ١٩١٦ قازی فەتاح برابچووکەکەی باپیری قازی محەممەد لەبەرامبەر هێرشی راستەوخۆی روسەکان شەهیدکراوە و دووکوڕە لاوەکەشی (سالار و محەممەد) لەبەرامبەر هێرشی روسەکان بەدیلیگیران و بۆ شوێنە دوورەکانی روسیای ئەوکاتە بەڕێکران.(٢)

قازی فەتاح لە بزووتنەوەی مەشروتەدا بەشداربوو، هاوکار و هاودەنگ بوون لەگەڵ ئازادیخوازانی ئێران بۆ گۆڕینی سیستەمی پاشایەتی (مطلق) رەها بە پاشایەتی مشرووتە(٣)، قازی فەتاح هەر لەسەرەتاوە کە لەپێناوی بەدیهێنانی یاسای دەستوری زۆر خەباتیکردووە هەر





لەبەرئەم مەبەستەش چەندینجار لە تاران بەندکراوە.(٤) قازی فەتاح هەر بەردەوامبوو لەسەر ئەو هەڵوێستەی خۆی و کۆمەڵێك خەڵکی لە دەور کۆبوونەوە بۆ بەدەستهێنانی یاسای دەستوری. ئەم بنەماڵەیە هەوڵ و تێکۆشان و خەباتی زۆریانکردووە بۆ گەلی کورد، بۆیە قازی محەممەدیش لەسەر ئەو رێڕەوەی بنەماڵەکەی و باوباپیرانی بەردەوامبوو رابردووی خاوێنی بنەماڵەکەی پاڵی بە قازی محەممەدەوە ناوە زیاتر لە رێگەی ئازادکردنی کوردستان خەبات و تێکۆشان بکات، بۆیە ئەم بنەماڵەیە بە وریایی و هەستی زۆر بەرزەوە کاریان بۆ گەلەکەیان دەکرد قازی عەلی باوکی قازی محەممەد ئەویش بەهەمانشێوە خەباتی زۆریکردووە بۆ گەلی کورد چی بەئاشکرا چی بەنهێنی لە بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتیدا.(٥)

قازی عەلی لە ١٩٣٠ لە مهاباد رێکخراوێکی کوردی بەناوی (بزووتنەوەی محەممەد) پێکهێنا. ناوبراو لەگەڵ جوولانەوەی شێخ محەممەد خیابانی لە تەورێز پەیوەندییان هەبوو، تاساڵی ١٩٣٤ لەسەر ئەوکارە بەردەوامبووە. قازی عەلی، دوو کوڕی هەبوو یەکیان (ئەبولقاسم قازی) ناسراو بە سەدری قازی، ئەویتریشیان قازی محەممەد بووە. قازی عەلی لە ساڵی ١٩٣٦ کۆچیدواییکرد فتوحاتی قازی بۆ قازی محەممەد گەڕایەوە.(٦)

## ژیانی قازی محەممەد

قازی محەممەد کوڕی قازی عەلی کوڕی قازی قاسم کوڕی شێخ مشایخە سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی قازی محەممەد بۆچوونی جیاواز هەیە یەکێك لەو بۆچونانە بۆچوونی دانا (محەممەد بەهائەدین ساحیب ) لە کتێبی پێشەوا قازی محەممەد و کۆماری مهاباد دەڵێ: لە ساڵی ١٩٠١ لەدایکبووە. هەروەها کریس کۆچیرا لە کتێبی کورد لە سەدەی ١٩، ٢٠دا و جەلیل گادانی لە کتێبی: (دەی خاکە لێوەی هەزار و سێسەد و هەشتادا رۆژی شەهیدانی کوردسان) دەڵێت: لە ساڵی ١٩٠٠ لە مهاباد لەدایکبووە، بۆیە ئێمەش لەگەڵ ساڵی ١٩٠٠ داین لەبەرئەوەی زۆربەی مێژوونوسان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدان و قازی محەممەد کاتێك لەسێدارەدرا لە ساڵی ١٩٤٧ تەمەنی (٤٧ ) ساڵ بوو، قازی محەممەد لە بنەماڵەیەك لەدایکبوو کە هەموویان زانا و ژیر و رووناکبیر بوونە.(٧) قازی پێویستی بەلێوردبوونەوەیەکی ورد و زیاتر هەیە ئەو کەسایەتییە مەزنە پلەوپایەیەکی تایبەتی هەیە لە مێژووی گەلی کوردا. پێشەوا قازی رووناکبیرێکی هەڵکەوتوو بوو کە لەوڕۆژگارەدا وێنەی لەناو کوردا زۆر کەم بەدیدەکرا. قازی شارستانییەتی و زانستی تازە و

هەروەها لە وەزع و رووداوەکانی جیهان بەتەواوی شارەزابوو، زمانی تورکی و فارسی و ئینگلیزی و عەرەبی فەرەنسی و روسی دەزانی.[٨] ئەوەی شایەنی وتنە قازی پیاوێکی دیندار و خواناس بوو کاتی خۆی بە شتی لاوەکییەوە بەفیڕۆنەدەدا بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابوو هێمنی وئاسایش بەردەوامبێت، هەروەها قازی محەممەد پیاوێکی ئەندام باریکبوو کەمێك رەنگی زەردبوو، تووکی سەری کورتبوو، چاوی تاڕادایەك گەورەبوو لەڕاستیدا بە روخساری جوانی دەرکەوت.[٩] قازی پیاوێکی ماقوڵ و باوەڕپێکراوبوو لەناو خەڵکدا هەموو ئەم خەسڵەتانەی تێکەڵبوو لەگەڵ رووناکبیری و لەسەرخۆیی و هێمنیدا بەڕاستی جێگەی تێڕوانینە.. قازی محەممەد تێکەڵاوییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ روسەکاندا تاڕادەیەك خاسیەت و رەوشتی ئەوانی وەرگرتبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەستی نەتەوایەتی و کوردپەروەرییەکەی لەسەر هەموویانەوەبوو. گەلێك نووسەر بەدەر لە کورد باسی رەوشتی قازی محەممەدیان کردووە کە شارەزاییی تەواوی هەبووە لە بواری ئایینی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، ئەگەر کێشە روویبدایە بگەشتبایە دەستی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرد ئەوجا بڕیاری لەسەردەدا هەرگیز لە بڕیاری خۆی پاشگەزنەدەبووەوە، قازی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان هەوڵیدەدا بە شێوەیەکی دادپەروەری بێت. پێش ئەوەی باوکی ئیجازەی قازییەتی بداتێ سەرۆکایەتی معارف و ئەوقافی مەهابادی لە ئەستۆدابوو، تائەو سەردەمی کورد کەسی وای تێدادەرنەکەوتبوو کەوەك قازی شارەزابێت لە خوێندن و زانست و رۆشنبیریدا.[١٠]

## رۆڵی قازی لە بەهێزکردنی هەستی نەتەوایەتیدا

قازی محەممەد هەر لەبەرئەوەی کە لە حێزانێکی نیشتمانپەروەر پەروەردەکرابوو خۆشەویستی نیشتمان و گەل لە دڵیدا رەگیداکوتابوو، بۆیە زۆر بەچالاکانە هەوڵیدەدا بۆ رزگارکردنی گەل ونیشتمان لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەران و کۆنەپەرستانی ئێران. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوە کە قازی محەممەد هەر لە سەرەتای ژیانیەوە تێکەڵ بە دنیای سیاسەت بێت، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٧- ١٩٣٠ کۆمەڵەیەکی بچووکی سیاسی کوردی دامەزراند، هەر لەبەر بوونی کەسایەتی قازی خۆی بوو بنەماڵەکەی کە ناوبانگییەکی دیاریکراویان هەبوو لە ناوچەکەدا و لە هەموو لایەکەوە خزمەتی گەلی کردووە، جگەلەوەی قازی خۆی دەوریکی کاریگەری هەبوو لە کۆکردنەوەی سەرۆك هۆز و بنەماڵە ناودارەکان.[١١]

بەمجۆرە ژمارەی ئەندامەکانی زیادیکرد زۆربەی لاوەکانی ناوچەکە لە دەوروبەری کۆبونەوە، ئەوەی شایەنی وتنە قازی لەبەر کەسایەتی خۆی و ناوبانگی بنەماڵەکەی لە ناوچەکەدا





بووە هۆی ئەوەی ئەم کۆمەڵە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوجەکە لە دەوری کۆبوونەوە و هەمان هەڵوێستی قازی محەممەدیان وەرگرتووە لە هەستی نەتەوایەتیدا. هەر لەبەرئەوەش بوو کاتێ کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ. ك) دروستبوو کە ژمارەی ئەندامەکانی لە (٢٠) کەس تێپەڕینەدەکرد پەیوەندییانکرد بە قازی محەممەدەوە داوایانلێکرد بێتە ریزی کۆمەڵەوە ئەویش بە دڵێکی پاك و نیازێکی راستەوە چووە ریزی خەبات و تێکۆشانەوە لەگەڵ کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد، پاش ماوەیەك ژمارەی زۆربوو سەرکردایەتی لە ناوچەکاندا بڵاوکرایەوە بۆئەوەی بە هەموو لایەك بەرنامەی کۆمەڵەیەی ژیانەوەی کورد بگەینن.[١٢] ئەوەی جێگەی وتنە ئەم کۆمەڵە کاتێك ژمارەی ئەندامەکانی کەمبوو بەنهێنی کاریدەکرد، بەڵام کاتێك ژمارەی ئەندامەکانی زیادیکرد دەستیانکرد بە تێکۆشان لەسەر بیروباوەڕی راست بۆ رزگارکردنی گەلی کورد لەبەرئەوە قازی محەممەد خەڵك بە کەسێکی راستگۆ و خزمەتگوزار دایدەنا و کاتێ باوکی کۆچیدواییکرد قازی جێگەکەی گرتەوە ئەمەش قازی محەممەدی ئەوەندە بەرزکردبووەوە وایلێکرد کە خەڵکی زۆر لە دەوری کۆمەڵەی ژیانەوە کۆببنەوە، بەتایبەتی مەلاکانی موکریان کە خزمەتێکی زۆریانکرد بۆ کۆمەڵە بۆیە ئەم کۆمەڵەیە لای رۆشنبیران و تەواوی چینەکانی گەلی کورد دەرکەوت. دوای ئەوەی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد بڕیاریاندا لە کۆبونەوەیەکی نهێنیدا سەرۆکی کۆمەڵە دەسنیشانبکەن. رۆژێك لە رۆژەکانی تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ لە مهاباد کۆبونەوەیەك رێکخرا لە ماڵی (عەلی ریحانی) ئیگلتون دەڵێت : لە ماڵی ئەحمەد ئیلاهی چاوەڕوانی قازی محەممەد دەکرا بۆ ئامەدەبوون پاش هاتن و ئامادەبوون و قسە و وتووێژ، لەمبارەیەوە ئینگلتون ((لە ماڵی ئەحمەدی ئیلاهی (٢٤) ئەندامی کۆمەڵە چاوەڕوانبوون لەپێشدا قاسم قادری و قادر مدەڕسی لەگەڵ قازی محەممەددا قسەیانکرد دەربارەی بەئەندامبوونی، بێدوودڵی قبوڵێکرد لەدواییدا هەرچەندە قازی محەممەد ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبوو، بەڵام رابەر و دەمڕاستی کۆمەڵە هەر ئەوبوو، لەلایەکیتر هەندێ را هەیە کە گوایە هەر ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەندامەتی قازی محەممەد تێپەڕنەبوو هەڵبژێرا بە سەرکردەی کۆمەڵە، بەڵام هێمنی شاعیر لە بیرەوەرییەکانیدا لە پێشکی تاریك و روونا هاوژیانی خۆی لەتەك رووداوەکانی ئەو سەردەمەدا وادەردەخات. پێشەوا قازی محەممەد ئەندامێکی سادەی کۆمەڵە بوو ناوی نهێنی (بینایی ) بوو.[١٣]

دوای ئەوەی کە قازی محەممەد هەڵبژێردرا ئەو ئەرکە گەورەییەی نیشتمان کەوتە سەرشانی.. جێگەی خۆی لە دڵی هەموو خەڵکدا کۆکردبووەوە، بەڵام دوای ئەوەی نوێنەرانی

کورد بە سەرۆکایەتی قازی محەممەد چوونە باکۆ لە سەفەری دووەمیدا بۆ کۆبوونەوە کاتێك گەڕانەوە پێشنیاری دامەزراندنی حزبی دیموکراتیکوردستانی کرد کە ئەم حیزبە جێگای کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد دەگرێتەوە کوردەکانیش بە بۆچوونی مەحمودی مەلا عیزەت زۆرجار لەلایەن کۆمەڵەی (ژ. ك) درۆیان لەگەڵدا کراوە، کۆمەڵەی (ژ. ك) بەرەبەرە لەبەرچاوی خەڵك کەوت و پارتی (ژ.ك) بە بڕیاریکی تایبەتی هەڵوەشرایەوە. ئەندامانی (ژ.ك) سەر لەنوێ چوونە حیزبی دیموکراتی کوردستان و هەندێ سەرچاوەیتر ئاماژەبەوەدەکەن کە لابردنی حیزبی (ژ.ك) و دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ لێپرسراوانی ئازەربایجانی سۆفیەت. بۆیە ئێمەش لە گەڵ ئەم بۆچوونەداین کە دروستبوونی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ پێشنیاری سۆفیەت، لەبەرئەوەی داهاتووی کورد و ئاواتی لە ڕێگەی کۆمەڵەیەکی بچووکی وەکو (ژ.ك) نایەتەدی بۆیە زۆر پێویستە بۆ سەربەخۆیی کورد حیزبیکی گەورە دابمەزرێت، وەکو حیزبی دیموکراتی کوردستان، بۆیە حیزبی دیموکراتی کوردستان دەورێکی گەورەی هەبوو لە خەبات و تێکۆشان لەپێناوی گەلی کورد، جگەلەوەی قازی لەم حیزبە بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو پێکبهێنێت، چونکە لەپێش ئەمەدا چەندین کێشەی تیرەگەری و خێڵەکی و نەخوێندەواری بالای بەسەر کۆمەڵگای کوردی کێشابوو، جگەلە نەبوونی یاسا و دەسەلاتیش، بۆیە ئەمکارەش شتیکی ئاساننەبوو پڕبوو لە کۆسپ و تەگەرە هەر لەبەرئەوەش بوو حیزب پەرەیسەند و گەیشتە ئەوڕادەیەی کە مەترسی بۆ سەر ئێران دروستکرد بوو، ئامانجی ئەم حیزبەش رزگاری کوردستان بوو سەرەڕای ئەوەش ئامانجە نەتەوەیی و کۆمەلایەتییەکانی کوردی بە شێوەی ئاشکرا و روونتر دەرخستبوو و کردیە خاوەنی بەرنامە و پرۆگرامی نوێ.[١٤] دەتوانین بڵێن هەر ئەنجامی ئەم حیزبە بوو، بووە هۆی دروستبوونی کۆماری کوردستان لەپاڵ زیرەکی و کارامەیی قازی محەممەددا کە وەکو سەرکردەیەکی هۆشیار دەورپکی زۆری بینی.

## رۆڵی قازی لە دامەزراندنی کۆماری کوردستاندا

ئەوەبوو لە رۆژی ٣ی تەموزی ١٩٤١ هێزی روسی لەلای سەرەوەی ئێرانەوە لە سێ لاوە و هێزی بەریتانیا لەلای رۆژئاوا و خوارووی رۆژئاوا لە چەند لایەکەوە خۆیانکرد بە ئێراندا. هێزەکانی سۆڤیەت لەسەرووی کوردستانی ئێران جێگیربوون سۆڤیەت راستەوخۆ لەگەڵ کێشە و گیروگرفتەکانی گەلی کورد رووبەرووبووە،[١٥] ئەوەبوو هەر لەدوای داگیرکردنی ئێرانەوە قازی





محەممەد بەردەوامبوو لەسەر هەڵوێستی خۆی، هەر لەمڕۆژەدا هەستی نەتەوایەتی پاڵی بە قازی محەممەدەوە نا کە زیاتر هەوڵبدات ئەوەبوو قازی محەممەد نەخشەی کوردستانی پیشان کاربەدەستانی ئینگلیز دا بۆئەوەی شارە کوردییەکان سەربەخۆیی بەدەستبهێنێ هەر لەبەرئەمەشە هەر لە سەرەتای داگیرکردنی ئێرانەوە کێشەی کورد لەگەڵ روسیا و بریتانیادا دەستیپێکرد تانزیکەی سالێك، لە ئەنجامی ئەم کێشەیەشدا لە ساڵی ١٩٤٢ حکومەتی روسیا بانگهێشتی بۆ سەرانی کورد نارد و داوای ئەوەی لێکردن چەند نوێنەرێ بنێرن بۆ باکۆ بۆئەوەی لە بارەی کورد و ئێرانەوە قسەبکەن. لەمکاتەدا کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد لەناوە و لەدەرەوە کاری خۆیدەکرد.. قازی محەممەد بۆئەمە وەفدێکی (٣٠) کەسی پێکهێنا و بە سەرۆکایەتی خۆی چوونە باکۆ.[١٦]

ئامانجی کاربەدەستانی روسیا لە بانگهێشتکردنی سەرانی کورد بۆ ئەوەبوو کێشەکەیان چارەسەربکات لە ڕێگەی گفتووگۆوە و سەرانی کوردیش داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد، بەلام ئەمجارەیان هیچ خالێکی گرنگی تیانەبوو بۆ کورد، هەروەها روسیا ئەمەی بە ڕێگایەك دانا بۆئەوەی لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی کورد بکات ، بەلام سەرانی کورد هەر بەردەوامبوون لە داواکردنی سەربەخۆیی کوردستان هەربۆیە لەم کۆبوونەوە و سەفەرەدا نەگەیشتنە ئەنجام، چونکە نوێنەرانی کورد لەگەڵ (باغرۆف) ڕێکنەکەوتن چونکە (باغرۆف) وایدادەنا باری روسیا لەوەدا نییە کە یارمەتی کورد بدات و لەدوای ئەمەش کێشەکە هەرمایەوە کوردەکان هەر بەردەوامبوون لە داواکانی خۆیان لە روسیا و ئینگلیز، بۆیە وا پێویستیدەکرد ئەوانیش چارەسەر بۆئەم کێشەیە بدۆزینەوە، بۆیە چەند سالێك بەسەر بانگکردنی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ تێپەڕیبوو، لە مانگی ئەیلولی ١٩٤٥ نوێنەرانی کورد بانگهێشتکران بۆ باکۆ ئەم سەفەرەش دوای ئەوەبوو قازی محەممەد چوو بۆ تەورێز بۆ هاوبەشیکردن لە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان. لەم سەفەرەدا قازی محەممەد و هاوەلانی بۆ ماوەی مانگێك لە باکۆ مانەوە و چەندین دانیشتنیان ئەنجامدا دەربارەی مافە رەواکانی کورد بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، بەلام (باغروف) دەیوت سەربەخۆیی کوردستان لەئێستادا ئیمکان نییە، بەلام روسیا ئامادەیە پشتگیری لە کورد بکات لەبەرئەوە باغروف راوبۆچونی وابوو کە کوردستان کاتێك ئازاددەبێت گەلی کورد ئازادبێت لە ئێران و عێراق وتورکیا.. واتا کوردەکانی هەرسێ بەشەکە رزگاربێت و دەبێت گەلی کورد لە ئێران لەژێر چاودێری بەشێك لە ئازەربایجانی سەربەخۆدا بێت، بەلام کوردەکان ئەمەیان رەتکردەوە ئینجا بەم قسەیە باغروف نارەحەتبوو،

جارێکیتر دەستیانکردووە بە وتووێژکردن و لە ئاکامدا باغروف دەستی لەسەر مێزەکە دانا و وتی تا روسیا هەیە مافی گشتی بۆ نەتەوەی کورد هەیە پاش ئەوەی باغروف بەڵێنی بە کوردەکاندا کە یارمەتیانبدات لە ئەسلیحە و ماشێن و تۆب و رەشاشیان پێبدات هەروەها بەڵێنیدا ژمارەیەك لە کوردە لاوەکان بنێرێتە زانستگەی نیزامی باکۆ هەروەها بەڵێنیدا یارمەتیانبدات لە دەرکردنی کتێب و رۆژنامەی کوردی و کوردەکانیش بۆ شاری تفلیس سەفەربکەن.[١٧]

ئیتر ئەوەبوو سەرانی کورد گەڕانەوە، قازی **محەممەد** کۆبوونەوەیەکی فراوانی لە کۆتایی تشرینی ١٩٤٥ز پێکهێنا کە بەشێکی زۆر لە خەڵك بەشداریانتێداکرد و لەوکۆبونەوەیەدا قازی **محەممەد** کەوتەقسەکردن لەبارەی بارودۆخی سیاسی کوردستان و ئەنجامی سەفەرەکەیان و لەوکۆبونەوەیەدا قازی **محەممەد** ئەوەی رایگەیاند کە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد بۆ حیزبی دیموکرات کوردستان بگۆڕێت، هەروەها خەڵکی داوای سەربەخۆییان لێدەکرد قازی **محەممەد** خۆی لافیتەیەکی هەڵگرد بەناو خەڵکی دەسووڕایەوە بۆئەوەی دەنگی جەماوەر کۆبکاتەوە کە کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردی لابرد حیزبی دیموکراتی کوردستان جێگای گرتەوە هەر لەوکۆبونەوەیەدا قازی **محەممەد** ئاماژەی بەوە کرد کە ئێمەی کورد دەبێت پەیوەندی خۆمان لەگەڵ دیموکراتی تەورێزدا پتەوبکەین نەهێڵین حکومەتی روسیا رەخنەمان لێبگرێت هەروەها قازی **محەممەد** بڕیاریدا لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی خۆی پێکبهێنێ و سەردانی تەورێز بکات و پەیوەندی خۆی لە گەڵیاندا دابمەزرێنێ.[١٨] پاش ئەوەی سەردانی تەورێزی کرد لەگەڵ فیرقەی ئازەربایجان چاویان بەیەك کەوت دوای کۆبوونەوەیەکی چەند سەعاتی رێککەوتن لەسەر هاوکاریکردنی هەردوو حیزب و گەشەکردنی زمانی تورکی و کوردی لە ناوچەکاندا و لەسەر بەڕێوبردنی ناوچەکانیش هەروەها بڕیاریاندا لیژنەیەکی ئابووری پێکبهێنن لەنێوان هەردوولا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئابووری.

### کارەکانی قازی محەممەد

١. کارەکانی لەڕووی سەربازییەوە. نەبوونی ئەزموونی حکومڕانی خۆبەڕێوبردن و سەپاندنی یاسا بۆئەم کۆمارە شتێکی گرنگبوو، بۆئەوەی ئەم کۆمارە سەرکەوتوو بێت و بمێنێتەوە لە بواری حکومڕانیدا، پێویستی بە هێزی سەربازی بوو بۆئەوەی بتوانێ خۆی بەڕێوەببات بۆیە کێشەی کورد تەنها لە رێگای سیاسی و سەربازی چارەسەری بۆدەکرا، ئەمەش





لەوەوە سەرچاوەیگرت کە گەلێك بەردەوام لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەراندابوو هاتەسەر ئەوەی کە خۆی حوکمی خۆی بکات ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ متمانەی سیاسی کورد خۆی. بۆیە حکومەتی کوردستان بە پێویستی زانی وەکو هەموو دەسەڵاتێکیتری جیهان سوپای نیزامی پێکبهێنێت بۆ رۆژانی بەرەنگاربوونەوە و هەر ئەرکێکی دوژمن، هەروەها بۆئەوەی سەروەری گەل و نیشتمانی پێبپارێزێت.

ئەم سوپایە ژمارەی سەربازانی (١٢٠٠) سەرباز بوو بە فەرمانی قازی **محەممەد** ئەم سوپایە دامەزرا، هەروەها مەلا مستەفای بارزانی هەزار جەنگاوەری خستەڕیزی ئەم سوپایەوە.[١٩] ئەمەش یەکێکە لەو هۆ گرنگانەی کە یارمەتی حکومەتی کوردستان دەدات بۆ مانەوەی حوکمی خۆی، چونکە لەوکاتەدا دامەزراندنی هێزی سەربازی کارێکی زۆر پێویستبوو، چونکە دەوڵەتی ناوەندیی ئێران بەردەوام هێرشیدەکردە سەریان و ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتریشەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەکەدا.

٢. لەڕووی ئابووریەوە لەبەرئەوەی لە پێش دامەزراندنی کۆماری کوردستان زۆربەی زۆری زەوییەکانی کورد لەژێر دەستی کاربەدەستانی ئێراندا بوون بۆیە دوای دامەزراندنی کۆمار لیژنەیەك پێکهێنرا بۆ دابەشکردنی زەویوزار بەسەر جوتیاراندا، ئەمەش بووە هۆی زۆربوونی بەرهەمی کشتوکاڵی هەروەها سەربەستی هاتوچۆ و چالاکی بازرگانی و گۆڕینەوەی کەلوپەل هاتەکایەوە دامەزراندنی ئەمانە هەموویان تاڕادەیەك بازاڕی سنووری کۆماری بووژاندەوە، بەڵام دەرامەت و داهاتی سەرەکی لە کۆمەکی یەکێتی سۆڤیەتەوە بوو کە لە رێگای تەورێزەوە دەنێردرا، کۆماری ئازەربایجان [٢٠] تومەنی بە قەرز دابوو بە کۆماری کوردستان بڕیاریشدرا بە شەکر پڕبکرێتەوە هەرچەندە رژێمی شا ئابلۆقەی خستبووەسەر ناوچەکە بەتایبەتی قەرزکردنی کڕینی توتن، بەڵام سۆفیەت توانی ئەو ساڵە تووتنی کوردستان بکڕێت بە (٨٠) پاوەند.[٢٠] قازی هەمیشە لە هەوڵی زیاتردا بوو بۆ گەشەکردنی ئابووری لەلایەنی کردنەوە بانك و دانانی پارە لە بانکەکاندا دیسان زەوی لە هەندێ خێزانی دەوڵەمەند وەك خێزانی شافیعی لە مهاباد کە بەربەرەکانی کۆماری دەکرد وەرگیراوە.

٣. لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە: شانبەشانی گەشەکردنی لایەنی سیاسی و ئابووری لایەنی کۆمەڵایەتی گەشەیکرد، هەرچەندە کارەکە لەسەرخۆ بوو ئەویش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە کە

لەگەڵ چەوساندنەوە و زوڵملێکردنی زۆردابوو بۆیە خەڵکی وایلێهاتبوو ئەم کۆمارە بچووکەیان بە موڵکی خۆیان دەزانی، چونکە زوڵم وەکو جاران نەمابوو هەرچی داواکاریان بوایە دەگەیشت بەدەستی کاربەدەستان. تەنانەت قازی محەممەدیش رێگە و شوێنی تایبەتی بۆ ئەمجۆرە دیاردانە هەبوو بەتایبەتی رێگەی گەیاندنی نامە و دەنگی هاولاتییان بە خۆی هەر لەبەرئەوەش بوو گەشەکردنی بزووتنەوەی کوردایەتی کەوتە قۆناغێکی نویٚ و کە بیر و لایەنە کۆمەلاتییەکان باشتر خۆیان دەربخەن،[٢١] قازی محەممەد سەربەستی بە خەڵك دابوو بۆئەو داوایانەی کە هەیانبوو، لەڕووی ئایینی و کۆمەلایەتییەوە چەندین دامودەزگای بۆ خەڵك کردبووەوە. بەبێگوێدان بە رەگەز و ئایین و زمان، هەروەها پێکەوەژیان و برایەتی لەناویاندا بە کارێکی گەورە دەزانی بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی، هەروەها پێکهێنان و رێکخستنی لاوان و ئافرەتان وەکو ئەوەی لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا ئافرەت شانبەشانی پیاو بتوانیٚ زۆر لە ئیشوکاری ولات جێبەجێبکات و مافی خۆی بپارێزێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت قازی یەکسانی و سەربەستی بیروباوەڕی لەنێوان خەڵکی ئەو کۆمارەدا چەسپاندووە.

٤. لەڕووی زانستییەوە : بێگومان لایەنی زانست و پەروەردە یەکێکیترە لەوکارە گرنگانەی کە قازی گرنگی زۆری پێدابوو هەر لەبەرئەمەش بوو کە قازی خۆی کەسێکی زانا و رووناکبیر و زمانزانبوو بۆیە زیاتر لە کارەکانیتر پەرەی بەم لایەن داوە، هەر لە سەرەتای لەدایکبوونی کۆمارەکەدا چەندین قوتابخانەی لە ناوچە جیاجیاکاندا کردووەتەوە، هەروەها لیژنەیەکیان پێکهێنا بۆ دانانی کتێبی کوردی و خوێندنیان کرد بە کوردی سەرەڕای ئەوەیش چەندین کتێب وەرگێررا بۆ سەر زمانی کوردی ، هەروەها بڕیاریاندا بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لەو ولاتەدا و هەموو کەس فێری خوێندن و نوسین بکرێت و بۆ یەکەمجار بوو (٥٠) قوتابیان نارد بۆ یەکێتی سۆفیەت بۆ ئەوەی لە (دانشگا ) بەرزەکاندا بخوێنێت، هەروەها چەندانیتر بۆ تەورێز بۆ خوێندن لە زۆربەی لقەکانی زانیاریدا.[٢٢] گومانی تێدانییە ئامانجی قازی لە کردنەوەی قوتابخانە و ناردنی قوتابیان بۆ ولاتانیتر بۆئەوە بوو رزگاربیێت لە نەخوێندەواری، چونکە زانست مایەی شارستانییەت و پێشکەوتنی کۆمەڵگایە هەر لەبەرئەوەش بوو قازی زۆر گرنگی دابوو بەم لایەنە، کاتێك قازی سەرۆکی پەروەردە بوو لە شاری مەهاباد دوو خوێندنگای دروستکردبوو بەناوی (پەهلەوی) ئەویتریان بەناوی (یرماس) کە دوای ئەوە ناوی گۆڕا بۆ خوێندنگای (پەروانە).





٥. لەڕووی ئایینییەوە : قازی خۆی کەسێکی دیندار و موسڵمان بوو بۆیە هەموو کارەکانی و بڕیارەکانی لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا بوو هەر لەبەرئەوەش مزگەوت گرنگییەکی گەورەی هەبوو لەناو کوردەواریدا جگەلەوەی جێگەی نوێژکردن و خواپەرستی بووە جێگای زانست و حوێندن بووە بۆیە زۆر لە شاعیر و نووسەر و رووناکبیرەکان تا کۆتایی چلەکان لە مزگەوتدا پێگەیشتوون، سەرەڕای ئەوەش شوێنی کۆبوونەوە و پەیمانی نێوان خەڵك و بەرپرسەکان بوو، هەر لەبەرئەوەش مزگەوت گرنگیی زۆری بۆ حکومەتی کوردستان بووە، لەبەرئەوەی قازی زۆر کۆبوونەوە گرنگەکانی لە مزگەوتدا دەکرد و لەوێدا لەگەڵ پێشەوایانی ئایین و دەمڕاست و ئاغاکانی کورد کۆدەبووەوە راوێژیدەکرد، هەروەها لە مزگەوتەکاندا وتاری هەینی بە زمانی فارسی یان عەرەبی دەمی بوو، بەلاٚم قازی بڕیاریدا وتاری هەینی بە زمانی کوردی بخوێنریٚ.[٢٣] بۆیە قازی چەندین مزگەوتی لە شارەکانی کوردستان کردەوە بۆئەوەی ئایین لەناو خەڵکدا تەواو پتەوبێت و کێشەکان لە مزگەوتدا چارەسەربکات بەمەش قازی هەوڵی گەشەپێدان و گرنگیپێدانیداوە.

### داگیرکردنی مهاباد و خۆبەدەستەودانی قازی

دوای ئەوەی دەوڵەتی ئێران بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ئازەربایجان جارێکیتر بیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، بۆئەمەش هەستا بە هێرشێکی گەورە بۆسەر ئازەربایجان لەبەرئەوەی ئازەربایجان حکومەتێکی گەورەتر بوو لەوەی کوردستان لەڕووی هێز و تواناوە. ئەم هێزەی ئێران هەر ( ٢٥ ) کم لە تاران دەرچوون تووشی شەڕبوون، چەکدارەکانی ئازەربایجان پشتیان بە سوپای ئێران گرت، بەڵام لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەنگەرەکانیان چۆڵکرد و تا تەورێز نەوەستاوە لە دەوروبەری تەورێز هەندیٚ شەڕیترکرا، بەلاٚم شەڕەکە وانەبوو بۆیە سوپای ئێران لە (١٣)ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ توانی تەورێز داگیربکات، بۆیە ئەم هەوڵەیەش بۆ رۆژی دوایی گەیشتە مەهاباد. بۆئەم مەبەستەش ئەندامانی حیزب و لێپرسراوانی کۆمار روویانکردە ماڵی قازی بۆئەوەی بزانن چیبکەن شورای جەنگ بە سەرۆکایەتی حاجی بابە شێخ پێکهات بۆیە دانیشتنی یەکەم بڕیاردرا شەڕبکرێت. دوای ئەوەی بڕیاریاندا جەنگبکەن لە دژی داگیرکەرانی ئێران، بەلاٚم دوای بیرکردنەوە و لێکدانەوەیەکی زۆر لەلایەن قازی و ئەندامانی حیزبەوە ئەو بڕیارەیان هەڵوەشاندەوە و بڕیاری نوێیان ئەوە بوو جەنگنەکەن لەبەرئەوەی حکومەتی ئازەربایجان بەو هەموو توانایەوە یەك رۆژ

شەڕی پێکراوە ئایا کۆمارێکی بچووکی وەکو کۆماری کوردستان توانای بەرگریکردنی هەیە بەرامبەر بە سۆپای ئێران. ئامانجی قازی لەشەڕنەکردن زیاتر لەبەرئەوە بوو ئێران دەوڵەتیکی گەورەیە و کۆماری کوردستان بچووکە بۆیە زۆر بە ئاسانی دەتوانیت داگیربکات، بۆیە ئەگەر شەڕبکرێت لەگەڵیدا، کاتێك مهاباد داگیربکات زۆر بەتوندی لەگەڵ خەڵکی مەهاباد دەجوولێتەوە هەر لەبەرئەمەیش زۆر لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی داوایان لە قازی کرد کە لە سنووری کۆمار دەربچێت و سنووری عێراق یان روسیا بگرێت، بەڵام قازی بەم پێشنیارە رازینەبوو وتی ئەگەر من لەم شارە دەربچم ئەوە حکومەتی ئێران هەموو رقوکینەی خۆی بە خەڵکی هەژاری ناوچەکە دەڕێژێ بەیەکجاری شارەکە وێراندەکات، بۆیە مەلا مستەفایش هەمان داوایلێکرد، هەروەها قونسولی ئینگلیز لە تەورێز و ئەمریکییەکان هەمان داوایانلێکرد، بەڵام بەهەمانشێوە وەلامیدانەوە.[٢٤]. بەمشێوەیە قازی لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوامبوو تا ئەوڕۆژەی هێزی ئێران بەرەو مهاباد کەوتەڕێ بۆیە لە رۆژی (١٧/کانونی یەکەمی ١٩٤٦/) هێزی ئێران لە بۆکانەوە بەرەو مەهاباد کەوتەڕێ، هەر ئەوڕۆژە قازی و حاجی بابە شیخ و کۆمەڵێکی زۆری لە لێپرسراوانی کۆمار بەرەوڕوویان چوون بۆئەوەی بەڕەسمی پێشوازی هاتنەناوەی هێزی نیزامی ئێران بۆ مهاباد بکەن، کاتێك کە گەیشتەپێشەوە سوپای قازی بەگەرمی پێشوازیلێکردن.[٢٥] هێزی ئێران هەر لەگەڵ چوونەناوەوەیان لە مهاباد دەستیانکرد بە توندوتیژی وخەڵکگرتن بۆیە هەندێك لە ئەندامانی کۆمار رایانکرد، بەڵام هەندێکیان لە ماڵەوە بوون چاوەڕوانی گرتنبوون، قازی لە ماڵەکەی خۆیدا کەوتەژێر چاودێرییەوە، دوای چەند رۆژێك کە بەتەواوی دەسەلاتی ئێران جێگیربوو قازی و ئەوانەی بەدەوریەوەبوون دەستگیرکران و خرانە بەندیخانەوە.[٢٦] هەر بەخۆبەدەستەوەدانی قازی کۆمار بەتەواوی هەرەسدەهێنێ.

هۆکار خۆبەدەستەوەدانی قازی چیبوو؟ چەندین شێوازی لەبەردەوامدا بوو بە بەرگریکردن یان هەڵهاتن یان شەڕکردن بەشێوەی پارتیزانی، بەڵام ئێستا هۆکاری خۆبەدەستەوەدانی ئەو هۆکارانەی پاڵی بە قازییەوە نابێ بۆ خۆبەدەستەوەدان بەتەواوی روونەبووەتەوە بویە هەڵوستی خۆبەدەستەوەدان شتێکی زۆر گرنگە لە مێژووی گەلی کوردە.[٢٧] پێموایە کاریگەرترین هۆکاری خۆبەدەستەوەدانی قازی ئەوەیە کە پێشتر بەڵێنی بە خەڵکی مهاباد دابوو لە مەیدانی چوارچرا تاکو دواهەناسە لەگەڵ خەڵکی مهاباد بێت هەر لەبەرئەوەش بوو بەڵێن و پەیمانی نەشکاند تا دواهەناسە.





**دادگایکردنی قازی**

دوای ئەوەی سوپای ئێران بەرەو مهاباد بەڕێکەوت قازی پێشتر بڕیاریدابوو شەڕنەکرێت لە دژی سوپای ئێران لە (رۆژی١٢/کانونی یەکەمی/١٩٤٦) گەیشتە بۆکان پاشان بەرەو مهاباد لە (١٥/کانونی یەکەمی/١٩٤٦) هێرشی کتوپڕیان کردەسەر مهاباد و داگیریانکرد، بەڵام قازی و ئەندامانی پێشوازیانلێکرد ئەو پێشوازیلێکردنە هیچ سوودی نەبوو، بەڵکو بەشێوەی نامەردانە هاتنەمەیدان هەر لە (١٧)ی ئەومانگەدا قازی و هاوڕێکانی گیران و خرانەبەندیخانەوە.[٢٨] پاش ماوەیەك لە رووخانی کۆماری مهاباد دەستبەسەراگرتنی قازی راگەیەنرا. ئەوەبوو پاش ماوەیەك دادگاییکردن دەستپێکرد. ئەوەی شایەنی باسە کۆبوونەوەی دادگاییکردنەکە چەند سەعاتێکی خایاند، پرسیاری تاوانەکان لەلایەن دادستان حەسەن خرانەڕووی دادگا قازیش زۆر بەهێمنی وەلامی پرسیارەکانی دایەوە بۆ هەر پرسیارێکیش قازییەکان داوای بەڵگەیان دەکرد و بەشی زۆری پرسیارەکان لەلایەن قازییەکان و رەتدەکرایەوە، ئەو خالانەی قازی محەممەد پێیتاوانبارکرابوو ئەمانەبوو:

١. بازرگانیکردنی نەوت لەنێوان دەوڵەتی روسیا و کۆماری کوردستان.
٢. دەستکاریکردنی نەخشەی ئێران و جیاکردنەوەی ورمێ و کرمانشان و تەورێز و ئیلام.
٣. دانان و دروستکردنی ئالا بۆ کۆماری کوردستان.
٤. لێدانی سکەی پوول بۆ حکومەتی کوردستان.
٥. دروستکردنی نەخشەی کوردستانی گەورە بە هەرچوار پارچەکەیەوە.
٦. هێنانی بێگانە بۆ کوردستان وەکو مەلا مستەفای بارزانی.
٧. هەڕەشەکردن و هاندانی خەڵکی کوردستان دژی دەوڵەتی ناوەندی.
٨. پەیمانبەستن لەگەڵ روس دژی دەوڵەتی ناوەندی.
٩. هاتوچۆکردن بۆ دەرەوەی ولات و سەردانی روسیا و کۆبوونەوە لەگەڵ باغرۆف.
١٠. راگەیاندنی حکومەتی کوردستان و داگیرکردنی بەشێکی گەورەی خاکی ئێران، ئەمانە و چەندین خالێتر قازیی پێتاوانبارکرابوو.[٢٩]

قازی هەموو ئەمانەی ڕەتکردەوە تەنها دانی بە سێ خاڵدا نا ئەویش:

١. چوونی بۆ باکۆی ئازەربایجان و چاوپێکەوتن لەگەڵ باغرۆف.

٢. بوونی ئالاّی کوردستان.

٣. هاتنی مەلا مستەفای بارزانی بۆ مەهاباد ئەویش خۆی هاتووە، چونکە کوردە و کوردستان ماڵی خۆیەتی.

دوای تێپەڕبوونی نزیکەی سێ مانگ بەسەر داگیرکردنەکەدا دواتر لە ستادی ئەرتەشی ئێران دەستەیەك بۆ دووبارەکردنەوەی دادگای قازییەکان لەمانە دەستنیشانکران: سەرهەنگ رارا نیکوزادا (دادستان)، سەرهەنگ ڕەجەب عەتا سەرۆکی دادگایی، سەروان حوسێن ئەندام، سەروان نەبەوی وەك پارێزەر بۆ قازییەکان. ئەم دەستەیەی دادگا لە (ڕۆژی ٢٥/٣/١٩٤٧) لە تارانەوە بەرەو تەورێز کەوتنەڕێ لەوێ بەرەو میاندوا لەوەیوە بۆ مەهاباد. ڕۆژی (٢٨/٣/١٩٤٧) گەیشتە ئەو شوێنەی کە بڕیاری دادگاییکردنی قازی محەممەدی لێیە، پاشان دادگاییکردن دەستیپێکرد. تاوانەکان هەمان ئەو (١٢) مادەیەی پێشووتر بوون کە لەلایەن دادگای سەربازییەوە جاری پێشوو رووبەڕویکرایەوە قازی محەممەد تاوانەکانی دانە بەدانە بەدرۆخستنەوە بۆیە داوای لە دادگاکرد بۆ هەر تاوانێك بەڵگە بهێنێتەوە. قازی زۆر بەئارام و لەسەرخۆبوو، بەهۆی پێداگرتنی قازی لەسەر ڕەتکردنەوەی تاوانەکانی دادگا (دادستان) بەسەر قازیدا خۆی تووڕەکرد، قازیش کاردانەوەی هەمانشێوەی هەبوو لەسەرئەوە بۆیە قازی بە دادستانی وت ئەم هەموو درۆ و بوختانە چۆن بۆمتان دروستکردووە ئەگەر راستدەکەن بەڵگە بخەنەڕوو بۆیە ئەم قسەیە دادستانی زۆر تووڕەکرد تەنانەت وایلێکرد بە بستیش لەسەری خۆی دا.[٣٠] ئەویش بە قازی وت کوردان سەگ سیفەتن، بەڵام تەوڕەیی و هەڕەشەی دادستان هیچ کارینەکردەسەر قازی و لەوەلاّمدا وتی سەگ و بێئابڕوو هەر ئێوەن من ئامادەم لەپێناو کورد خۆم بدەم بەکوشت و شانازیشدەکەم بەو مردنە مەردانەیە، قازی دوای تەواوبوونی قسەکانی بڕیاریدا وەلاّمی پرسیارەکان نەداتەوە.. دادستانیش بۆ ئەوەی قازی بێتە سەرخۆی و لەسەر بڕیارەکەی خۆی پاشگەزبێتەوە کاتی پشوودانی دادگای راگەیاند، دوای پشوودان زۆر هەوڵیاندا وەلاّمی پرسیارەکان بداتەوە، بەلاّم قازی وەلاّمینەدایەوە، دەستەی دادگا لەنێو خۆیاندا کەوتنەڕاگۆڕینەوە ناچار بڕیاریاندا لە شوێنی نیکوزدا سەرهەنگ ڕەجەب عەتای ببێت بە سەرۆکی دادگاکە، پرسیارەکان سەرلەنوێ





دەستیپێکردەوە، دادستان پرسیاری ئەوەی لێکرد کە لەگەڵ دەوڵەتی روسیا ڕێککەوتن بۆ بازرگانیکردنی نەوت هەیە، لە وەلاّمدا قازی پێکەنی و وتی ئێمە کام بیر و کۆمپانیای نەوتمان لەبەردەستدابووە تا بازرگانی پێوەبکەین، ڕەنگە ئاوی ئەو رووبارانە بڵێن کە بە شاری مەهابادا ڕەتدەبێت بە نەفتی بزانن، هەروەها وەلاّمی قازی لە پرسیاری ئەوەی بێگانەی هێناوەتە کوردستان وەك مەلا مستەفای بارزانی لەوەلاّمدا وتی مەلا مستەفا بێگانە نەبووە و کوردستان ماڵی خۆیەتی.

سەرهەنگ عەتایی پرسیاری زۆری لێکرد بەلاّم هەر بەردەوام ڕەتیدەکردەوە لەبەرئەوەی قازی لە بەرامبەری بەتوندی وەستابوو. سەرهەنگ پارچە قوماشێکی لە جانتاکەی دەرهێنا کە ڕەنگی سوور و سپی و سەوز بوو چەکوش و داسێکی لەسەربوو.. سەرهەنگ تفێکی لێکرد و خستییە ژێرپێی، قازی لەبەرامبەردا وتی: جارێ ئەمە هەرگیز ئالاّی کوردستان نییە و نەبووە چونکە ئالاّی کوردستان چەکوش و داسی لەسەر نییە و دڵنیابە ئالاّی کوردستان بە دەستت ناکەوێ. هەروەها دڵنیابە لەوەی کە ڕۆژێ دێ ئالاّی کوردستان لەسەر ئەم خانووەی منی تیادا دادگاییدەکرێم هەڵدەدرێت، عەتایی لێیپرسی هەموو ئەو تووڕەییەت بەرامبەر سەرهەنگ نیکوزادە چیبوو لە کاتێکدا تۆ بەهێمنی و لەسەرخۆیی ناسراویت.. لەوەلاّمدا قازی وتی من ئەو مافە بە کەس نادەم گاڵتە بە گەلەکەم بکات ئێستا من لە پێناوی گەلەکەم حوکمی لە سێدارەدانم بەسەردا دراوە.

دادگایی بەوجۆرە درێژەیکێشا و عەتای پرسیاری لە قازی دەکرد ئەویش زۆر بەتوندی و بەبێترس وەلاّمی پرسیارەکانی دەدایەوە لە کۆتاییدا قازی وتی: وائەزانن کە هەڵنەهاتم بەهۆی نەتوانینمەوە بوو، بەڵکو زۆر بە ئاسانی دەمتوانی هەڵبێم و لە سنوور بپەڕمەوە، چونکە شەش جێب و دوو ئۆتۆمبیلم لەبەردەستدابوو لەبەرئەوەی بەڵێنم بە گەلەکەم دابوو تا دواهەناسە لەگەڵیاندابم بۆیە هەڵنەهاتم.

بەمشێوەیە کۆتایی بە دادگا هێنرا، بۆیە لیژنەی دادگایی ویستی بەرەو تاران بچێت لەناکاو دەستور هات تا جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا لەوێ ئامادەبن بۆیە لەوێ مانەوە تا حوکمی دادگا جێبەجێکرا لە (ڕۆژی٣١ی مارت). پاش دەرکردنی دوابڕیار لەلایەن حکومەتی ناوەندی ئێرانەوە کە قازی محەممەد لە سێدارەبدرێت، کەوتنە ڕاگۆڕینەوە بۆ دەسنیشانکردنی شوێنێك تا بڕیارەکەی دەوڵەتی ناوەندی جێبەجێبکرێت، پاشان قازییان گەیاندە بەردەم بینایەکی

چەند دەرگایی لـە چـوار گۆشـەیەکی چوارچـرادا دایانبەزانـد چـووە نێورێزێکـەوە بیـنی دادسـتان سەرهەنگ نیکوازدە و مەلایـەکی کـوردەواری و چـەند چـەکدارێکی لێبـوو و بوونـی قورئانێکـی گـەورە لەسـەر مێزێـك و ئامـادەبوونی سـەرۆکی تەندروسـتی کـە لـە تارانـەوە هـاتبوو.. پاشـان دادستان سەرهەنگ نیکوازدە بڕیاری دادگای خوێندەوە بەمەش قازی لەوە دڵنیـابوو دەبێـت هـەر ئێستا لە سێدارەبدرێت هەر لەوکاتەدا دادستان داوایلێکرد کە دوا وەسیەتنامەی بنووسێت. بۆیە قازی دەستیکرد بە نووسینی وەسیەتنامە .. وەسیەتنامەکەی بەگشتی لەبارەی یەکێتی لە نێوان رۆڵەکانی گەل و پشتبەستن بەیەکتری و هەروەها باوەڕنەبوون بە بێگانە، هەروەها بەرەوپێشچوونی ئاستی زانست و برەودان بە دەزگا ئیدارەییەکان لەگەڵ گەلێك شتیتر لە چوارچێوەی وەسـیەتەکەی دەردەکـەوێت کـە لـە دواچـرکەکانی تەمەنیـشدا جـوانترین ئامۆژگـاری گەلەکـەی دەکـات، ئـەو راستیەمان فێردەکات کـە پشتبەسـتن بـەخۆمان و بـەرەودان بـە دەزگـا زانـستی و پـەروەردەیی و ئایینەکان گەورەترین پشتیوانن بۆ سەرکەوتنی گەلی کورد. لەوشەوە زەنگەی کە بێدەنگی بـاڵای کێشابوو بەسەر مەهابادا و قازیش داوایکرد پێش ئەوەی ببرێتـە بـەردەم پـەتی سـێدارە رێگـەی بدەن نوێژ بکات و لە خواپپاڕێتەوە نزیك دوو سەعات خەریکی خوێندنەوەی نوێـژ و پاڕانـەوەبوو، ئەمکاتە درێژەش دادستانی نیگەرانکردبوو دەستیکردە بۆڵەبۆڵ تـا سـەعات گەیـشتە(٣)ی شـەو پاش ئەمە لـە دەرگایەکـەوە هێنایانـە مەیـدانی چـوار چـرا کـە چـاوی بـە پـەتی سـێدارە کـەوت داوایکرد لە سێدارەنەدرێت.. چـونکە لـە سـێدارەدان لـە ئیـسلامدا کـارێکی ناپەسـەندە، بەڵکـو تیربارانمکەن بەڵام لە سێدارەم مەدەن، بەڵام دوژمنان راکەیان پەسەندنەکرد بەبیانووی ئـەوەی کـە هەر دەبێت دادگا جێبـەجێبکرێت لەوشـەوەدا کـە کـات گەیـشتە ١٠:٣ی بـەیانی کـە رێکەوتـی ٣١/٣/١٩٤٧ هێنرایە ژێر پەتی سێدارە و پاش کـەمتر لـە دوو دەقیقـە گیـانی پـاکی بـەرەو بەهەشتی نەبڕاوە فڕی.

خەڵکی مەهاباد لەکاتێك لە شرینی خەودا بوون کە هـەر ئێـوارە بڕیـاردرابوو کـە نابێـت شەو کەس لە ماڵی خۆی دەربچێت نەیانزانی ئەمشەو ئەوکارە چاوەڕواننەکراوە روودەدات.. پـاش ماوەیەك لاشەی شـەهیدەکانیان درا بـە کەسـوکاریان و هـەر ئـەورۆژە لەسـەر شـانی خـەڵکی بـە شەرەفی مەهاباد لە گۆڕستانی مەلا (جامی) بە خاکی پیرۆزی نیشتمان سپێردران.[٣١]

***





## سەرچاوەکان


١. کریس کۆچیرا: کورد لە سەدەی ١٩,٢٠دا، وەرگێرانی: محەمەد رەباتی، چاپی یەکەم، ل٢٤٦

٢. دانا، محەمەد بەهائەدین ساحیب: پێشەوا قازی محەمەد و کۆماری مهاباد، چاپی یەکەم، سلێمانی ١٩٧١، ل١٥

٣. عومەر بەلەکی: مهاباد و کورتەمێژوویەك: چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٨٤

٤. دانا، محەمەد بەهائەدین ساحیب: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥

٥. کریس کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٦

٦. جەلیل گادانی: خاکەلێوەی١٨٣٠رۆژی شەهیدانی کوردستان، ل١٩ـ ٢٠

٧. مەحمود مەلا عیزەت: جمهوریەتی کوردستان، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢، ل١٩١

٨. عومەر بەلەکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣

٩. کریس کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٧ـ ٢٧٩

١٠. مەحمود مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢

١١. هەمان سەرچاوە: ل١٩٤

١٢. دانا، محەمەد بەهائەدین ساحیب: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦

١٣. مەحمود مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧

١٤. هەمان سەرچاوە، ل٩٧،٧٠، ١٠٧

١٥. رەنجبار، ئەحمەد ئەمین: کۆماری کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان، چاپی یەکەم، هەڵەبجەی شەهید، ل٤٩

١٦. کریس کۆچیرا: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٤

١٧. هەمان سەرچاوە، ل٢٥٣، ٢٦٧

١٨. رەنجبار، ئەحمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩

١٩. هەمان سەرچاوە، ل٤٩

٢٠. مەحمود مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٨ ـ ٢٦٩

٢١. هەمان سەرچاوە، ل٢٧٥

٢٢. دانا، محەمەد بەهائەدین ساحیب: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢ـ٣٤

٢٣. نەوشیروان مستەفائەمین: حکومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆفیەتیدا، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٣، ل١٤٥

٢٤. رەنجبار، ئەحمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩ـ٦٠

٢٥. نەوشیروان مستەفا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٦

٢٦. رەنجبار، ئەحمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٦١

٢٧. مەحمود مەلا عیزەت: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٣

٢٨. دانا، محەمەد بەهائەدین ساحیب: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤

٢٩. بەدرەدین سالح : سەرۆك کۆماری کوردستان لەبەردەم دادگای ئێراندا، چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠٠١، ل٨

٣٠. نەوشیروان مستەفا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٧

٣١. بەدرەدین سالح : سەرچاوەی پێشوو، ل١١، ١٩.

# ئافرەت و ئازادی
# خوێندنەوەیەکی هێرمنۆتیکیانە بۆ پرسی ژن لە قورئاندا

ئا: سەلمان نادر عەبدولڕەحمان

## پێشەکی

شکستی شارستانییەتی ئیسلامی لەبەردەم شارستانی ڕۆژئاوادا، گوزەری مێژوویی شارستانی ئیسلامی راگرت. هەرچەندە دەتوانرێت بوترێت پێش رووخانی دوایەمین قەڵای خەلافەتی ئیسلامی لە تورکیادا، بە چەندین سەدە ئەو خەلافەتە (خیلافەت) لەناوەوە رووخابوو. توانای گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی نەمابوو، درگا بەڕووی نوێگەری و ئیجتهادی نوێدا داخرابوو، هەمو شتێك لەو کۆمەڵگایەدا لە شوێنکەوتنی سەلەفدا کورتکرابویەوە، بەڵام دواجار لە سەرزەوی واقیعیش شتێك بەناوی خەلافەتەوە نەما.

لەڕاستیدا رووخانی خەلافەت وەك قەیرانێك دوو تەوژمی بەدوای خۆیدا هێنا، تەوژمێك کە پێیوابوو ئایین و کلتور لەپشت شکست و پاشەکشەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتەوەیە و پێویستە چیدی کات بەو کلتورەوە بەسەرنەبرێت، لەبەرامبەردا پرۆژەی ئیحیاگەری ئیسلامیش هاتەبوون، پرۆژەی ئیحیاگەری ئیسلامی هەڵگری سایکۆلۆژیەتی غروری برینداربوو، ئەو غرورەی کە شێخ محەممەد غەزالی پێیوایە (گەندەڵترین حەقلی دینداریە). تەوژمی ئیسلامی پێیوابوو شکستی شارستانییەتی رۆژهەڵات بەهۆی دوورکەوتنەوە لە ئیسلامەوە بووە. هەربۆیە تەرحی (ئیسلام چارەسەرە)ی بەرزکردبوویەوە لەڕاستیدا لای ئەم تەوژمە ئیسلام چارەسەری هەموو ئەو تەفسیر و بۆچوونانە بوون تا سەدەی چوارەمی زایینی بەرهەمهاتبوون.

پرۆژەی ئیحیاگەری ئیسلامی، لەگەڵ هەموو بەرکەوتنە مێژووییەکانیدا تەنگژەی نوێ دەهاتنە بەردەمی ئەو تەنگژانەش هێندەی پەیوەستبوون بەتێڕوانینی بۆ دەقەوە پەیوەستنەبوون بەخودی دەقەوە، بەو مانایەی گرفتەکان زاتی و پەیوەستبوون بە مرۆڤەکانەوە نەك مەوزوعین و پەیوەستبن بە ئایین و دەقەکانەوە. لەهەموو ئەو بەرکەوتنانەدا ئەو بنەما دینی و فیقهییە ئامادەییانەی لەبەردەستدان توانای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی رۆژیان نەبوو، ئیدی لەبەردەم دووڕیانێکدا دەمایەوە یا لەسەربنەمای فیقه کاربکات ئەوەش قەیرانەکانی قووڵتردەکردەوە یا





بنەما فیقهییەکان فەرامۆشبکات و چارەسەری عەقڵانییانە هەڵبژێرن و بگەنە کلیلی زاڵبوون بەسەر گرفتەکاندا.

رابردووی بزووتنەوە ئیسلامییەکان ئەوەمان بۆ دەردەخات لە زۆربەی کاتدا ئەوەی دووەمیان هەڵبژێردراون، بەڵام وەك د.محەممەد شەبستەری باسیلێوەدەکات ئەم هەنگاوەش بە پاساوی فیقهییەوە مەیسەربووە، وەك ئەوەی هەندێکجار باس لە قاعیدەی ئوسولی (الضرورات و تبیح المحضورات)( پیداویستییەکان یاساغکراوەکان رێپێدراودەکەن). لەکاتێکدا زۆر بەئاسانی تەرحە عەقڵانییەکان بەبێ پاساوی فیقهی دەتوانرێت جێبەجێبکرێن، بەڵام پێویستیان بە خوێندنەوەی نوێ هەیە، پێویستیان بە میتۆدی نوێی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا هەیە کە ئەو میتۆدەش دەتوانرێت هێرمنۆتیك بێت، خوێندنەوەی هێرمنۆتیکییانە وەك سەرەتایەکی سادە واتە خوێندنەوەی رێژەگەراییانەوە گوماناوییانە.

وەك پێشتریش باسمانکرد پرۆژەی ئیحیاگەری ئیسلامی کە شیعاری ئیسلام چارەسەرەی بەتێڕوانین و تەفسیری زانایانی پێشینەوە بەرزکردبوویەوە لە ٨٠ ساڵی تەمەنی رابردوویدا رووبەڕووی جۆرەها (تەنگژە و قەیرانی فیکری) بووەتەوە. یەکێك لەو بازنانەی کە زۆرترین کێشمەکێشی لەخۆگرتووە مەسەلەی ئافرەت و هەموو ئەو ماف و ئازادییانەبوون کە پەیوەستبوون بەو بابەتەوە. لەلایەکەوە نەیارانی ئەو تەوژمە لە بزووتنەوە سکۆلارەکان بەوە ئیتهامیدەکەن کە دەیەوێت ئافرەت بگێڕتەوە بۆ ناوماڵ و حەرەمسەراکان و بە کۆیلە و کەنیزەك و شمەکیان بکاتەوە و لەبەرامبەریشدا تەوژمی ئیحیاگەری ئیسلامی بەرامبەرەکانی بەوە تۆمەتباردەکەن کە ئافرەت وەك کاڵای سیاسی و لەپێناو تێرکردنی غەریزەکانی پیاوان و لادانی لە فیترەتی ئینسانی بەکاردەهێنن. ئافرەتیش لەبەردەم کێشمەکێشی ئەم دوو تەوژمەدا وردوخاشدەکرێت.

هەردوو تەوژمەکە کۆکن لەسەرئەوەی جیاوازی نێوان ژن و پیاو ناکرێت ئینکارلێبکرێت بەتایبەتی لەڕووی بایۆلۆژییەوە، بەڵام ئایا جیاوازی بایۆلۆژی دەبێتە هۆی جیاوازی ماف و بەرپرسیاریەتی ئەوەیان جیاوای بۆچوونەکان دەهێنێتەکایەوە.

لەگەڵ بەرکەوتنی مێژوویدا پرۆژەی ئیحیاگەری ئیسلامی وەك خۆی لە تەوژمێکی کۆمەڵایەتی فرەلایەنەوە گۆڕا بۆ ئایدۆلۆژیای ئیسلامی و تەرحی سیاسی ئیسلامی بە رووگە جیاوازەکانییەوە کە زیاتر مۆدێلێکی ئیسلامی شوناسی بوون و لە پرسی ئافرەتدا هەندێکجار

رادیکاڵ و شوناسگەرا بوون، لە بانگەشەکردن بۆ فرەژنییەوە وەك چارەسەرێك بۆ قەیرانی کراوەیی کۆمەڵایەتی و رووبەڕووبوونەوەی تێکەڵاوی نامەشروع تاوەکو جەختکردنەوە لەسەر پۆشاکی ژنان بە تەرحی ئەهلی عەزیمەت نەك ئەهلی روخسەت و رەخنەگرتن لە هاتنەدەرەوەی ژنان و پاشتریش لای تەرحە توندەڕەوە ئیسلامییەکەوە قەدەغەکردنی هاتنەدەرەوەی ژنان وەك نموونە ئەفغانییەکەی پرۆژەی ئیسلامی، ئەمەش وەك چەمکێکی تەعمیمی نا بەڵکو وەك نموونە وەگەرنا لای هەندێك بزاوت و نموونەی شوناسگەرای ئیسلامیش پێچەوانەکەی بوونی هەیە وەك بەشداری ژنان لە پرۆژەی سیاسی و کاندیدکردنیان بۆ پەرلەمان بگرە پشتگیریکردنی ژنان بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وەك هەڵویستی ئیسلامییەکانی ئەندۆنوسیا، لەپاش قۆناغی ئایدۆلۆجیای ئیسلامییەوە قۆناغی ئیسلامی مەعریفی و نوێگەرا لە هەناوی تەرحە ئیسلامییەکەدا هاتەبوون ئەو تەرحە نوێگەرایەش بەرکاریگەربوو بە دوو رووگەی فەلسەفی (رووگەیەکی مەعریفەتناسیانە و رووگەیەکی هێرمنۆتیکیانە) کە لێرەدا ئێمە زیاتر جەخت لەسەر رووگە هێرمنۆتیکیانەکەی دەکەینەوە بەتایبەت لە پرسی ژندا.

ئالێرەوە ئەم توێژینەوەیە بازنەی ئەو کێشمەکێشە دەکاتە سنووری لێتوێژینەوەو لەناو تەفسیری ئاییندا بە دوای ماف و کەرامەتی ئافرەتدا وەك مرۆڤ دەگەڕێت بە دیدێکی هێرمنۆتیکیانەوە. جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئایین جیایە لە هەموو ئەو تەفسیرانەی بۆیکراون و هەموو ئەو تەفسیرانەش بەرکاریگەربوون بەو ئاسۆ مێژووییە کە لێیەوە بەرهەمهاتوون، هەروەها بەدوای هەموو ئەو عەرەزیاتانەدا دەگەڕێت کە بەهۆی مێژووییبوونی پەیامی ئایینەوە چوونەتە ناو ئایینەوە، پاشانیش عەدالەت و عەقلانییەت وەك زاتی ئایین لە دووتوێی تەفسیری ئەخلاقی مەعنەویدا بۆ ئایین پێشنیاردەکات.

ئەم توێژینەوەیە دابەشکراوە بەسەر دوو بەشدا بەشی یەکەم لەڕووی تیۆرییەوە بەشێك لە تیۆرەکانی هێرمنۆتیکای تێداخراونەتەڕوو هەرچەندە زیاتر جەخت لەسەر (هێرمنۆتیکای مۆدێرن) یا (فەلسەفی) کراوەتەوە لە بەشی دووەمیشدا باس لە هەموو ئەو (پێش فەهم) و (پێش گریمانانە) کراوە کە رۆڵیانبینیوە لە دروستکردن و فۆرمەڵەبوونی فیقهی ئیسلامی لە رابردوودا و باس لە بونیات و پێداویستییەکانی فیقهی ئیسلامی نوێش کراوە و پاشانیش تەفسیری ئەخلاقی مەعنەوی وەك بەدیلێك پێشنیارکراوە، هەرچەندە بەهۆی سنووردارکردنی توێژینەوەکە بۆ چوارچێوەیەکی دیاریکراو رێگربووە لەوەی ئەو بابەتانە مافی خۆیان پێبدرێت





## بەشی یەکەم

## هێرمنۆتیکا وەك زانستی فەهم

### تەفسیر وەك سەرەتایەك بۆ مرۆییبوونی ئایین

پاش کۆچیدوایی پێغەمبەر (د.خ) کەیسی شێوازی هەڵبژاردنی خەلیفە وەك یەکەم قۆناغ بۆ بەمرۆییبوونی تێگەشتنی ئایینی بەجیاوازی نێوان یارانی پێغەمبەر دەستیپێکرد، ئەو جیاوازییەش لەو سونگەیەوە سەرچاوەیگرتبوو پێغەمبەر (د.خ) کەسی وەك شوێنگرەوەی خۆی دیارینەکردبوو، هەربۆیە تەفسیری جیاواز بۆ ئایین و چەمکی خەلیفە و شیاوبوونی کەسێك بۆ خەلیفە سەریهەڵدا، دەتوانین بڵێین سنووری پێناسەی شورا و تەفسیرکردنی هاتەبوون، ئالێرەوە سەرەتای تەفسیری مرۆڤ بۆ ئایین گەڵاڵەبوو و پاشتریش بەرەو کامڵبوون هەنگاوینا.

مرۆڤەکان بەردەوام لەبەردەم پرسیاری نوێ و رووداوی نوێ و حاڵەتی جیاوازتر و نەبینراوتردا خۆیان دەبینییەوە، سەرەتا بابەتە هاوشێوەکان بەهەمانشێوەی پێشوو چارەسەردەکران، بەڵام زۆربوونی بابەتەکان، مرۆڤەکانی بەرەو دارێژانی سیستەم ئەگەرچی سادەشبووبێت رێنوێنیدەکرد بۆیە (ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەپشتبەستن بە بۆچوون و ئیجماعی ئەهلی حەل و عەقد و دەستیاندایە شیکارکردنی بابەتە نوێیەکان و مەشروعییەتی کاری حاکمان، بەڵام هێدیهێدی بابەتەکان هێندە زیادبوون کە ئیمکانی دەسگرتنی رەها بە نەقڵی سەحابە بەپشتبەستن بە بۆچوونی ئەهلی حەل و عەقد مومکننەبوو، ئالێرەوە کەمی بابەتی نوقڵی و زۆری بابەتە نوێیەکان بۆیە هۆی بەرهەمهێنانی میتۆد و رێچکەیدیکە بۆ ئیجتهادکردن نووسینەوەی ئوسول فیقه و دەسگرتن بە میتۆدەکانی وەك مەسالح مورسەلە، استحسان، قیاس یا عەقل.. هتد، فۆرمەڵەبوون(1)، لە سەرەتاکانی فۆرمەڵەبوونی بنەما و سیستەمەکاندا مرۆڤەکان لەبەردەم رای جیاواز و بۆچوونی جیاوازدا خۆیاندەبینییەوە کە دەتوانرێت دەیان نموونە بۆ هەموو ئەو جیاوازییانە لە جیاوازی بۆچوونی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لە کەیسە هاوشێوەکاندا بهێنرێتەوە، هەربۆیە لە بونیاتنانی سیستەمەکەدا پرسیارێکی سەرەتای سەریهەڵدا ئایا موافقبوون بە دەقی قورئان ویستراوە یا بەتەنها دژنەبوون کافییە(2)کە ئەوەش لەلایەن خۆیەوە موسڵمانی دابەشکردبوو بۆ دوو گرووپی جیاواز.

ئەو جیاوازبوونەش هەرچەندە لە زۆربەی بارەکاندا رووگە و شوناسی دینی پێبەخشراوە و بەناوی ئایین و واتای حەقیقی ئایینەوە گەیەنراوە، بەلاّم لە هەناویدا ئیلهامی بەمرۆییبوونی تێگەشتنی ئایینی هەڵگرتووە. هەرئەوەش دەرفەت لەبەردەم خوێندنەوە و رەخنەکردنی ئەودیوە مرۆییەی ئایین و فیقهی ئیسلامی ئاوەڵادەکات، پرۆسەی بەردەوامی تەفسیرکردن و خوێندنەوەی نوێ و ئەگەری گونجاندن و لەباربوونی ئایین لەگەڵ رۆحی مرۆڤدا بەپێی جیاوازی سەردەم و زەمەنە جیاوازەکان دەبەخشێتە ئایین و ئایینیش لە چوارچێوەیەکی سنووربۆدانراو و دۆگماوە کە مرۆڤەکان ناچاربکات بەوەی یا دەبێت لەگەڵ شێوە ژیان و بیرکردنەوەی زەمەنێکی دیاریکراودا هەڵبکەن یا دەبێت تەبەرابن لە دیوە مەعنەوی و حەقیەتە نەدۆزراوەکانی ئایین و نەتوانن سوودیلێوەربگرن.

## هێرمنۆتیکا چییە؟

گەڕان بەدوای پێناسەیەکی یەکانگیر و گشتگیردا بۆ هێرمنۆتیك جگەلە کات بەسەربردن هیچیدیکە نییە چونکە پێناسەیەکی لەوشێوەیەی بوونی نییە، هێرمنۆتیك وەك هەمو زانست و چەمکەکانیدیکەی ناو زانستە مرۆییەکان خاوەنی قوتابخانە و رێچکەی جیاوازە کە تاڕادەیەك دژی یەکی و واتای پێچەوانەی یەکتریان هەیە. هێرمنۆتیك لە هەندێك شوێندا بە زانستی تەفسیر و لە هەندێك شوێنیدیکە بە زانستی فەهم باسیلێوەکراوە، زۆرجاریش بە واتای تەئویل وەرگێڕدراوەتەسەر زمانی عەرەبی و فارسی[٣]. وەرگێڕانی ئەو چەمکە بۆ زمانی عەرەبی و فارسی بۆ چەمکی تەئویل جێگای تێڕامان و رەخنەیە بۆیە ئێمە لێرەدا هەوڵمانداوە بەبێ وەرگێڕان بەکاریبهێنین

## بۆچی پێویستمان بە هێرمنۆتیکایە؟

ئێمە لەبەردەم ترادیسیۆن و کلتورێکی مەزنی شارستانییەتی ئیسلامیداین. پێویستمان بەبەردەوامیدان و گەشەدانە بەو شارستانییەتە، ئالێرەوە گەشەدان بەو شارستانییەتە تەنها لە رێگای فاعیلبوونەوە دەبێت ئەوەش تەنها بە فەهم و تێگەشتن و رۆڵبینین و لەتێگەشتن و تەوزیفکردنی بنەما عەقڵی و دەقییەکانی بەرجەستەدەبێت.

لەلایەکیدیکەوە ئەو سەردەمەی ئێمەی تێدادەژین پێویستی بە شۆڕشێك لە چەمك هەیە





ئەوەش لانیکەم وەك داخوازییەکی ئەم سەردەمە[٤] ئەو شۆڕشەش کە پێویستمان پێیەتی بەبێ میتۆد نایەتەبوون (میتۆد بریتییەلە چەقۆیەکی رەخنەگرانە لە توێکارزانی سەیرکراودا، سەیرکراویش لە پرۆسەی تەشریحکردندا دەگۆڕێت بۆ سەیرکراوێکی نوێ، ئەو سەیرکراوە نوێیەش پێویستی بە کەرەستەی نوی هەیە).[٥]

یەکێك لەو کەرەستە نوێیانەش کە دەتوانرێت لە خوێندنەوەی دەقدا تێگەشتنی واقیعی بەرهەمبهێنێ هێرمنۆتیکە (کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا بەکارهێنان و بایەخپێدانی یەکجار زیادیکردووە، لە رەخنەی ئەدەبییەوە تا کۆمەڵناسان و مێژووناسان تاوەکو مرۆڤناسان و لێکۆڵەرەوە دینییەکان و فەیلەسوف و زماناناسان روویانتێکردووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ روونده‌کاتەوە کە فەهم و تێگەشتن لە هەموو زانستە مرۆییەکاندا بوونی هەیە، لەڕاستیشدا هیچ زانستێك نییە خاڵیبێت لە فەهم و تێگەشتن، هێرمنۆتیك تیۆرێك نییە بتوانن رەتیبکەنەوە یا قبوڵیبکەن بەڵکو بازنەیەکی فراوانە لە تیۆر کە زۆربەیان پەیوەستن بە تێگەشتن و تەفسیرەوە.[٦]

## رۆڵی تەفسیر لە شەفافکردنی دەقدا

کلتوری ئایینی ئێمە لێوانلێو نییە لە رەهاگەرایی و خۆبەحقزانین، بگرە دەتوانرێت پانتایی گەورەی خوازیاربوونی حەقیقەت بدۆزرێتەوە، بەتایبەتی لە پانتاییە عیرفانی و ئەخلاقییەکەیدا و لەبەرامبەریشدا خاڵیش نییە لەخۆسەپاندن و بەرەها تەماشاکردنی بۆچوون و تەفسیر، ئەو قەیرانەش لەوێوە سەرچاوەدەگرێت کە زانستی تەفسیر تا ئاستێکی دیاریکراو گەشەیکردووە لە شارستانییەتی ئیسلامیدا. پرۆژەی بەرەوپێشچوونی تەفسیر و تێڕامان لە دەق نەیتوانیوە لەسەر ئەو گوزەرە پرشنگدارە بەردەوامبێت کە بونیاتنرابوو. پرۆژەی بونیاتنانی شارستانییەت و پێکهاتەکانی زووبەزوو لەگەڵ پاشماوە و تەخەلوفاتەکانی خۆیدا دەرگیربوو نەیتوانی لێیاندربازیببێت و بەڕێوەیانببات بەڵکو دواجار تەسلیمی هەموو ئەو پاشماوانە بوو. ئیدی تەفسیری ئایینی لەبری تەفسیری دەق بوویە پەراوێزنووسین و حاشیەنووسین. تەفسیری تەفسیر و ملکەچکردن بۆ پێوەر و ستانداردی پێشینەکان، ئەوەش لەڕووی کەلامی و فەلسەفییەوە قەیرانی رەهاگەرایی و بەرەوپێشنەچوونی بەدوای خۆیدا هێنا.

لە ئاستی دەرەوەی جیهانی ئیسلامیشدا ئەم گوزەرەی تەفسیر و بەرەوپێشنەچوونی تا سەدەی نۆزدە بەردەوامبوو، بەلاّم لەپاش سەدەی نۆزدەوە خودی تێڕامان لە تەفسیر وەك کایەیەك

که پێویستی به میتۆدی خۆی هەیە تیۆری تایبەتی دەوێت هاتەبواری قسەلەسەرکردن، لەوەپێش مەرجی شارەزاییی زمان و (زمانی دەق) ڕێساکانی زمانی دەق (**قواعد اللغة**) مەرجی وردی و چۆنیەتی بەکارهێنانی چەمك و لێکدراوەکانی به کەرەستەی نووسەر مەرجی رامان لە سەبك و شێوازی بەکارهێنراو و مەرجی رەچاوکردنی مەوقیعی نووسەر[٧]تاکە پێوەر و مەرجی تەفسیرکردن بوون.

کەمنین ئەو بیرمەند و فەقیهانەی پێیانوایە گەشتوونەتە مانای حەقیقی دەق و بگرە لەوەش زیاتر پێیانوایە ئەوان تەفسیریاننەکردووە، بەڵکو دەقەکان ئەو شتانەیان وتوە کە ئەماندەیلێین. ئەوە لەکاتێکدایە دەق بۆ خۆی شەفاف نییە تاوەکو ماناکانی پشتەوەی نمایانبن، بەڵکو ئەوە بەهۆی تەفسیرەوەیە دەقەکان شەفافدەبن و واتای خۆیان دەردەخەن، ئەوەی لەهەناویاندایە پەنهانە ئاشکرانابێت لەڕێی تەفسیرەوە نەبێت[٨].. موفەسیرین و موفەکیرینی ئێمە باوەڕیانوایە لە ڕێگای عیلمی دلالەوە هەموو واتاکانی ناو دەق دەدۆزرێنەوە چونکە دەقەکان هەڵگری واتای عەینین و واتای سەربەخۆی خۆیان هەیە، لەکاتێکدا ئەو دەقانە بە زمان نووسراون و زمانیش دەرکەوتەیەکی مێژووییە و مەرج و ئیمکانی بەیان مێژوویش گۆڕاون تێگەشتن زنجیرەیەکی مێژووییە و مەرج و ئیمکاناتی ئەویش گۆڕاون ئەوەی لە ئاسۆیەکی مێژووییدا (ئەزمونی مرۆڤەکان لەخۆیان و جیهان) لە مێژوویەکیدیکەدا پێویستی بە جۆرێك لەوەرگێڕان و بەیانی نوێ هەیە.[٩]

تەنانەت بیرمەندێکی وەك د.محەممەد شەبستەری پێیوایە بێتەفسیر هیچ کەسێك لە هیچ دەقێك ناگات و ئەوەی لە دەلالەدا هاتووە تەنها کارئاسانی بۆ تەفسیرکردن دەکات تەنانەت ئەو دەقانەش کە هەموان وەك یەك تەفسیریاندەکەن مانای ئەوەنییە تەنها ئەو واتایەیان هەیە بەڵکو ئەوەش بەو واتایە دێت کە هەموان وەك یەك تەفسیریدەکەن نەوەك بەهۆی دەلالەتی خودی دەقەوە ئەو یەك تەفسیرییە هاتووەتە بوون.[١٠]

### سەرەتای سەرهەڵدانی هێرمنۆتیك و خەسڵەتی ڕێچکە جیاوازەکانی

دانانی (کتێبی پیرۆز) لە ساڵی ١٦٥٤ز لەلایەن (دانهاوەر)ەوە دەتوانرێت و قۆناغێکی سەرەتایی هێرمنۆتیك هەژماربکرێت[١١]، هەرچەندە بە رای زۆربەی لێکۆڵەرەوان شلایر ماخەر بە یەکەمین کەسێك دەزانرێت کە کاری لەسەر هێرمنۆتیك کردبێت.





ڕۆشنگەرەکانی ئەوروپا تەفسیری کڵێسایان بۆ کتێبی پیرۆز رەتدەکردەوە پێیانوابوو پێویستە تێگەشتنی دەقی کتێبی پیرۆز بە شێوە و یاسای دیاریکراوبێت ئەم رووگەیەش لەژێر کاریگەری پرۆتستانیزمدا بوو (جیابوونەوە لە کڵێسای فەرمی) ئەم سەبکە لەژێر کاریگەر ڕۆشنگەراکان و عەقڵگەراکانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا روویدا کە باوەڕیانوابوو مرۆڤ دەتوانێت لەڕێی عەقڵییەوە دەستی بە حەقیقەت بگات، بەڵام پێویستە ئەو دەسڕاگەشتنە بە حەقیقەت بەهۆی ڕێسا و یاسای دیاریکراوەوە بێت.[١٢]

ئەم قۆناغەی مێژووی تەفسیر لای هەندێك لە توێژەرەوەکان بە قۆناغی کلاسیکی هێرمنۆتیك دەزانرێت کە بەدوای خۆیدا قۆناغی ڕۆمانتیکی هێناوە، بەڵام لەم توێژینەوەیەدا بە قۆناغێکی هێرمنۆتیکی نەناسێنراوە، بەڵکو وەك دواین قۆناغی پێش سەردەمی هێرمنۆتیکی و دانانی میتۆد و تیۆری تێگەشتن کاری لەسەرکراوە، چونکە ئەگەر ئەم قۆناغە بە قۆناغێکی هێرمنۆتیکی بناسێنین ئەوا بەلانیکەمەوە موفەسیرە موسڵمانەکان زیاتر لە ٨ سەدە پێش ئەم قۆناغە گەشتوونەتە ئەو دەرئەنجامانە و شارستانییەتی ڕۆژئاوا لەمڕووەوە زۆر لە پاش شارستانییەتی ئیسلامەوە دەستیپێکردووە.

قۆناغی دانهاوەر و پرۆتستانیزم بۆ تەفسیر و تێگەشتنی دەق تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە بازاڕی گەرمبوو لە سەدەی نۆزدەدا رووگەیەکیدیکەی هێرمنۆتیك هات سەرەڕای جیاوازی لەگەڵیدا بەڵام لەسەر هەمان ریتم بەردەوامبوو. ئەویش لەلایەن موتەکەلیمی ئەڵمانی و ئەندازیاری لیبرالیزمی ئاییني فریدیك شلایر ماخەر (١٧٦٨-١٨٣٤)ەوە بونیاتنرا کە بە (هێرمنۆتیکی ڕۆمانتیك)ی دەناسرێت ئەو تیۆرەشی لەبەرامبەر تیۆری ڕۆشنگەرە عەقڵانییەکاندا پێشنیارکرد، ئەو ناوەشی بەهۆی بەرکاریگەربوونی بە ڕۆمانتیك لێنرا.[١٣] جیاوازی نێوان ئەو دوو قوتابخانەیە لەوەدابوو ئەوەی یەکەمیان پێیوایە دەسڕاگەشتن بە مانای حەقیقی دەق مومکنە، بەڵام لەوەی دووەمیاندا خراپتێگەشتن لە دەق ئاساییە، سەرەڕای ئەوەش لە قوناغی ڕۆمانتیکدا پێش فەهم و پێشگریمانەکان لە پەیوەستی بەتێگەشتنەوە بایەخیانپێدرا. ئالێرەوە فەهم و تێگەشتن خرایەژێر گومانەوە. لەهەمانکاتدا باوەڕیان بە فەهمی عەینی و تێگەشتن و دۆزینەوەی مەبەستی نووسەر (دانەر) هەبوو.

بەدوای قۆناغی ڕۆمانتیکی شلایر ماخەر و قۆناغی فەلسەفی هێرمنۆتیك دەسپێدەکات کە بە قۆناغی (هایدگەر) ناسراوە لەو سەرەتایەوە سەرچاوەدەگرێت کە ئەرکی فەلسەفە

وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی واتای بوونە ئەمەش ئامانجێکی (بوون ناسیانەیە) نەك (تیۆرناسی و مەعریفەت ناسی) ئەرکی حەقیقی فەلسەفە و هێرمنۆتیك و دیاردەناسی یەك شتە ئەرکی حەقیقی فەلسەفە گەڕانە بەدوای واتای بووندا ئەمەش بەتەنها بە شیکاری دەرکەوتەناسی و وجودی مرۆیی (دازاین) دێتەبوون.[١٤]

پاش مارتن هایدگەر هانس گۆرگ گادامەر (١٩٠٠-٢٠٠٢) درێژەی بەو ڕێبازە فەلسەفییەدا و پێیوابوو:

تێگەشتنی دەق تێکەڵبوونی ئاسۆی دەق و ئاسۆی راڤەکارە،[١٥] چونکە جیاوازی زەمەنی نێوان دەق و راڤەکار جیاوازییەکی ئەنتۆلۆژییانەیە و راڤەکار ناتوانێت چاوپۆشیلێبکات و ناتوانێت لەدەرەوەی بەدیهییاتەکانی سەردەمی خۆیدا (هەر سەردەمێك کۆمەڵێك بەدیهییاتی هەیە کە مرۆڤ پرسیاری لەبارەوە ناکات[١٦]) بیربکاتەوە هەربۆیە تەفسیری دەقیش لە چوارچێوەی ئەو بەدیهییاتانەدا ئەنجامدەدات. بۆنموونە بەدیهییاتەکانی مرۆڤێك لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا لەبارەی خۆر و ئاوی پاکەوە جیاوازن لە بەدیهییاتەکانی مرۆڤێکی سەدەی ١٥ کۆچی، مرۆڤی سەدەی یەکەمی کۆچی لە تەفسیرکردنی خۆردا بەوشێوەیە بیریکردووەتەوە کە زەوی جەرگەی بوونەوەرە و خۆر بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیە مایە قەبوڵکردن نییە لای مرۆڤێکی ئەم سەردەمە و پرسیاریش لە بچووکی زەوی لەبەرامبەر گێتی و خۆردا ناکات، هەروەها لەمەڕ ئاوی پاکەوە مرۆڤی سەدەی یەکەمی کۆچی پێیوابووە، ئەگەر ئاو تام و بۆن و رەنگی نەگۆڕێت ئیدی ئەو ئاوە پاکە چونکە قسەکردن لەسەر زیندەوەری بچووکی نەبینراوی وەك بەکتریا و ڤایرۆس بەشێك نەبوون لە سنووری باوەڕپێکراوەکانی چ جای بەدیهییاتەکانی ئەو مرۆڤە، سەرەڕای هەموو ئەو جیاوازییانە، بەڵام ئەزموونی هاوبەش لەنێوان مرۆڤەکاندا هەیە هەر ئەوەش وادەکات تێگەشتن مومکنبێت.[١٧]

شیکاری دەق لەهەمانکاتدا شیکاری ئەزموونی شعورییە، جیاوازی نییە لەنێوان زمان و بووندا لەنێوان واقیع و فیکردا لەنێوان تەسەور و ئاسۆدا تێگەشتن لە دەق بەگەڕانەوە بۆ رەسەنیی لە ئەزموونی مرۆییدا مومکنە.[١٨] ئەمجۆرە تێگەشتن و تەفسیرکردنەی تەفسیر لای گادامەر و دیلیسی و شەبستەری لەلایەن هابرماسەوە مایەی رەخنەلێگرتن و رەتکردنەوەیە چونکە لەوەها حاڵەتێکدا هیچ پێوەرێك بۆ جیاکردنەوەی تەفسیری دروست و نادروست بوونی نامێنێت.[١٩]





٢. هیچ تێگەشتنێکی عەینی دەق بوونی نییە،[٢٠] ئەگەر دەق واتای عەینی هەبوایە تەفسیرەکان جیاوازنەدەبوون [٢١]

٣. تێگەشتن بێکۆتایە[٢٢]: زمان لای گادامەر بریتییەلەو وجودەی لە چوارچێوەی فەهمدا رێکدەخرێت هەرئەمەش وادەکات فەهم و هێرمنۆتیکا یەکبن جگەلەوەش پۆل رێکۆر کە بە یەکێك لە فەیلەسوفە دیارەکانی فەلسەفەی زمان دەزانرێت باوەڕی بە فرەواتایی زمان ( poly seme) هەیە ئەوەشی بە خەسڵەتی هەموو زمانەکان دەزانی سروشتی زمان وەهایە، دەبێت هۆی خراپ فەهمی و ئاڵۆزی ئەو دەڵێت ئیدعای ناسینی رەها ئەفسانەیەکی درۆیینەیە گادامەریش تەسەور و وجود یەك شتن و تەفسیری رەها بە گومانێکی ناوەکی دەزانێت.[٢٣]

پرۆسەی تەفسیرکردنی نوێی دەق لەوێوە سەرچاوەدەگرێت کە خوێنەرەکان لە پانتایی دەقدا دەرگیردەبن و لەگەڵ رووبەڕووبوونەوەی خوێنەر و دەقدا تەفسیری نوێ بەرهەمدێت.[٢٤] ئالێرەوە دەتوانین بڵێین هیچ تەفسیرێك ناتوانێت ئیدعای ئەوە بکات کە تەفسیری کۆتاییە چونکە هەموو تەفسیرێك لە شێوەی گوزارەیەکدا و هەموو گوزارەیەك سنوورداری و مەفاهیمی خۆی لەگەڵدایە لێرەشەوە هیچ گوزارە و مەحدودییەتێك ناتوانێت یەکسانی تەواوی کەلامی خوا بێت ئەگەر تۆ لەسەر گوزارەیەك وەستایت و وتت ئەم تێگەشتنەی من پڕاوپڕی خودی کەلامی خوایە لە دەرەوەی ئەم تێگەشتنەی مندا شتێکیدیکە نییە ئەو کات تۆ سنوورداری و بەرتەنگی مرۆییت سەپاندووە بەسەر بێسنوور و فراوانی کەلامی خواییدا، ئالێرەوە سەرنجی ئێوە بۆئەوە رادەکێشم ئێمە لە واتای هەر دەقێك گونجاو لەگەڵ باری مێژوییماندا دەگەین.[٢٥]

٤. هەموو تەفسیر و خوێندنەوەکان مێژوویین،[٢٦] لە دەروەی مێژوودا هیچ مانایەك بۆ تەفسیر نامێنێتەوە، چونکە لە دەرەوەی سیاقی داخوازییەکانی سەردەمدا نەبێت لە دەق ناگەین، تێگەشتن پەیوەستە بە زەمەنی ئێستاوە لە دەرەوەی مێژوودا بوونی نییە موفەسیر تێگەشتنی تایبەتی بە سەردەمی خۆی هەیە ناتوانرێت لێیجیابکرێتەوە ئەم بۆچوونەی گادامەر لەوێوە سەرچاوەدەگرێت کە پێیوایە تەفسیر بەشداریکردنە لە گفتوگۆیەکدا کە پێشتر بوونی هەبووە. زیاتر لە پەراوێزنووسین دەچێت، هیچ دەقێك لە بێدەنگییەوە نایەتەبوون،[٢٧] لەو سۆنگەیەوە کە دەق بەشێکە لە زمان و تێگەشتنیش لە چوارچێوەی زماندایە. لەکاتێکدا زمان مێژووییە و ئیدی هەم دەق و هەم تێگەشتنیش ناچنە سەرومێژووەوە، لەوەش زیاتر ئێمە لە دەرەوەی نەریت و مێژوودا ناتوانین هیچ شتێك دەرکبکەین ئاسۆی بیرکردنەوەمان پەیوەستە بە نەریت و مێژووەوە،

مێژوویی بوونمان مەرجی سەرەکی ئەنتۆلۆژیبوونمانە. ئێمە مەخلوقێکین بەردەوام لە تەفسیر و تەئویلکردندان تەنانەت ئەم خسوسییەتە هەرگیز لە مرۆڤ جیانابێتەوە بە شێوەیەك گادامەر پێیوایە مرۆڤ حەیوانێکی موفەسیرە،[٢٨] ئەم تەسلیمبوونەی گادامەر لای هابرماس جێگای رەخنەیە و رەتیدەکاتەوە چونکە ئەو بیرکردنەوە ئازادانەیە دەکوژێت کە رەخنە لە نەریت دەگرێت.[٢٩]

٥. ئامانجی تەفسیر دۆزینەوەی مەبەستی نووسەر نییە.[٣٠]

٦. پێشزانین و پێشگریمانەکان رۆڵیان هەیە لە تێگەشتندا،[٣١] چەمکی تێگەشتن لە دەق وەك ئەوەی ببێتە خاوەنی تیۆر و میتۆدی دیاریکراو پێشینەیەکی دووری نییە، لەگەڵ سەرهەڵدانی هێرمنۆتیکدا سەریهەڵداوە یا راستتر بڵێین لەگەڵ شلایر ماخەردا دەرکەوتووە. د.محەممەد موجتەهید شەبستەری پێیوایە تێگەشتن لە دەق وەك (شێوەیەك لە ناسین) کە پێویستە تیۆر و میتۆدی تایبەت بە خۆی هەبێت لە سەدەی نۆزدەوە دەستیپێکردووە تا سەدەی نۆزدە تەنها یاساکانی تەفسیری دەقی ئایینی، فەلسەفی، هونەری و حقوقی قسە و باسیانلێوەدەکرا لەم بوارانەشدا پێشینە هەبوو ئەو یاسایانە بریتیبوونلە مەرجی شارەزاییی زمان (زمانی دەق) رێساکانی (زمانی دەق) مەرجی وردی و چۆنیەتی بەکارهێنانی چەمك و لێکدراوەکان بە کەرەستەی نووسەر، مەرجی رامان لە شێواز و سەبکی بەکارهێنراو، مەرجی رەچاوکردنی مەوقیعییەتی نووسەر،[٣٢] هەتاوەکو ئێستاش لە خوێندنەوەی تەفسیر و مەرجی موفەسیرانی ئێمەدا کار لەسەرئەوە نەکراوە پێش فەهم و پێش خوێندنەوەکانی موفەسیرن بدۆزرێنەوە کە ئەمەش خودی هۆکاری حەقیقی جیاوازی بیروبۆچوونەکان دەخولقێنن (لە مەحافیلی فیقهی ئێمەدا هێشتاوەکو ئەو بۆچوونە رەونەقی پێدەدرێت تەنانەت پێشیانوایە پێویستە موفەسیر بە زیهنی خاڵی لەپێش فەهم و پەیوەستی و چاوەڕوانییەوە دەسبداتە تەفسیرکردنی کیتاب و سوننەت، لایەنگرانی ئەم بۆچوونە نەك تەنها ئەم کارە بە مومکن بەڵکو بە واجبیشی دەزانن و بە پێشمەرجی دەسکەوتنی مانای تەواوەتی کیتاب و سوننەتی دەزانن، ئەو بۆچوونەش بووەتە هۆی فەرامۆشکردنی گەڕان بەدوای پێش فەهم و پەیوەستی و چاوەڕوانی موفەسیران و زاڵبوونی ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە تەفسیر لەسەر بنەمای مەبحەسەکانی زانستی زمان و ئوسوڵ دروستبووە، زانستە مرۆییەکانیدیکە لە فۆرمەلەبوونی شکڵی ئەو فەتوایانە و ناوەڕۆکیاندا رۆڵیاننییە. ئەمەش بووەتە هۆی ونکردنی کارەکتەری سەرەکی جیاوازی بۆچوون و فەتواکان،





تەنها ئەو جیاوازییانە دەخرێنە بەرچاو کە رۆڵی دووەمیان هەیە لە دروستکردنی جیاوازیدا ئەوانیش زانستی زمان و بنەماکانی ئوسوڵن)[٣٣]

د.شەبستەری نموونەی دوو گروپی جیاوازی لە فیقهی ئیسلامیدا دەهێنێتەوە ئەویش بە مەبەستی روونکردنەوەی پێش فەهمەکانیان و پێیوایە (ئێمە خاوەنی زیاتر لە دووجۆر تێڕوانین بەڵام لێرەدا ئێمە تێڕوانینەکان کورتدەکەینەوە بۆ تێڕوانی بەحەرامزانینی هەرجۆرە داهێنراوێك، لە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ)و خەلیفە راشیدینەکاندا نەبووبن وەك هەڵبژاردن و دیاریکردنی ماوەی حوکمەت و دروستکردنی پەرلەمان و تەداخولکردنی دەوڵەت لە موڵکی تایبەتیدا.. هتد، ئەمانەش ناولێدەنێن گروپی (ناجائیزبوون) گروپی دوەمیش کە پێیوایە بەشێك لەو دەرکەوتانەی جیهانی نوێ رێگەپێدراوون ئەمانەش ناولێدەنێین گروپی بە(جائیز) زانین. ئەم دوو گروپە هەردووکیان بۆ بۆچوونەکانیان دەگەڕێنەوە بۆ کیتاب و سوننەت واتە لە کردەیەکی هاوبەشدا دوو ئەنجامی جیاواز بەرهەمدێت. جیاوازی ئەم دوو بۆچوونە بریتییەلە جیاوازی لە پێش فەهم و چاوەڕوانیان لە ئایین. بریتییەلە ناسینی خودا و مرۆڤ واتە خوداناسیان و مرۆڤناسیان، گروپی یەکەم پێیانوایە شارعبوونی خوای گەورە بە واتای یاسا دانەری خوای گەورەیە بەو واتایەی خوای گەورە لە وردودرشتی ژیانی تاك و کۆمەڵدا یاسادادەنێت ئەو مافەش تەنها بە خوا رەوادەبینرێت، هەروەها لە مرۆڤناسیشدا ئەوان زانست و تواناکانی مرۆڤ لەبەرچاوناگرن پێیانوایە مرۆڤ هەمیشە کۆیلەی ئارەزووەکانییەتی هەرئەوەش وادەکات نەزانبێت بە بەختەوەری خۆی ئەم بۆچوونەش تیۆرێکی فەلسەفی کۆنە، لەکاتێکدا گروپی دووەم هەم پێیانوانییە شارعبوونی خوای گەوەرە بە مانای تەداخولکردنە لە وردودرشتدا بەڵکو خوای گەورە بەهاکانی دیاریکردووە دووەمیش دان بە توانای مرۆڤدا دەنێن پێیانوانییە مرۆڤ کۆیلەی حەزەکانی بێت)،[٣٤] جگەلەو نموونەیەی د. شەبستەری دەتوانین تەفسیری ئیعجازی زانستی بە نموونەیەکی روونی پێش فەهم و چاوەڕوانییەکانی موفەسیر لە تێگەشتندا روونبکەینەوە، یەکێك لەو رەخنانەی لە تەفسیری زانستی دەگیرێت ئەو رەخنەیەی کە پێیوایە پێش دۆزینەوەی زانستەکان موفەسیرین نایەن باس لەو زانستە بکەین بەڵام پاش دۆزینەوەی زانستەکان ئاماژەبەوەدەکەن سەرەتای ئەو زانستە لە قورئان یا فەرمودەدا هەبووە، لەکاتێکدا هەم ئەوانەی تەفسیرەکە دەکەن و هەم ئەوانەش کە رەخنەدەگرن بایەخ بە رۆڵی ئەو پێش فەهم و پێش زانستانە نادەن لە کردەی تەفسیردا.

٧. پێویسته کاربکرێت لەسەر دۆزینەوەی ئاسۆی تەفسیر و ئاسۆی دەق،[٣٥] هەرئەوەی کە پێویستی بەئەنجامدانە لە شارستانییەتی ئیسلامیدا دۆزینەوەی ئاسۆی موفەسیرەکانە لە ئاسۆی دەقەکان بەتایبەتی لە کەیسی ماف و تێڕوانیندا بۆ ئافرەت چونکە لە زۆربەی کاتدا بۆچوونی فەقیهەکان هەستپێدەکرێت یا روونتر ئاسۆی فەقیهەکان وەك ئاسۆی دەقەکان نمایشدەکرێت بۆ نموونە لە بابەتی زەواجی ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ ئەهلی کیتابدا هیچ دەقێك بوونی نییە کە ئەو بابەتە بۆ پیاوان بەحەلاڵبزانێت و بۆ ژنان بەحەرام، تەنانەت ئەگەر تەفسیری ئایەتی (الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلُّ لَّهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلاَ مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ وَمَن يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) بەوشێوەیە بکرێت کە زەواجی ئەهلی کیتاب بۆ پیاوی موسڵمان رەوایە و زەواجی ژنی موسڵمان لەگەڵ پیاوی ئەهلی کیتابدا رەوانییە، ئەوا بە روونی دەتوانین بڵێین کەواتە خواردنی دەستی ئەهلی کیتابیش بۆ ژنان رەوانییە، چونکە لە هەموو بارەکانیدا ئەو ئایەتە موخاتەبەی موزەکەری کردووە ئەمەش خسوسییەتێکی زمانە بەتایبەت زمانی عەرەبی ئەگەرنا دەبوو هەموو قورئان بە دوو شێوە دابەزیایە، پێش فەهمی موفەسیرین ئەو تەفسیرەی لەو گوزەرەی لاداوە بەوشێوەیە تەفسیریکردووە کە بۆ پیاوان رەوایە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی ئەهلی کیتابدا بکەن، بەڵام بۆ ژنان رەوانییە چونکە ئەگەر بۆ ژنان نارەوا ببوایە ئەوا بە روونی ئاماژەپێیدەکرا هەروەك لە سورەتی بەقەرەدا بۆ هاوەڵدانەران هاتووە (وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُوْلَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللّهُ يَدْعُوَ إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ[٣٥]) قەدەغەکردنی هاوەڵدانەران بۆ ژنان و پیاوان وەك یەکە سەبارەت بە ئەهلی کیتاب موسڵمانان پێیانوابوو پیاوان دەتوانن ژنەکانیان ناچاربکەن بۆ هەر شتێك خۆیان دەیانەوێت و هەروەها دەتوانن رێز لە پیرۆزی و موقەدەساتیان نەگرن لەم حاڵەتەشدا ژنانی موسڵمان موقەدەساتیان پێشێلدەکرێت لە ئەگەری دووەمدا پیاوی موسڵمان دەتوانن ژنی ئەهلی کیتاب بهێنن بە مەرجێك موقەدەساتی ئەو ژنانە لەسەر پیاوەکان واجبدەبێت، ئەمەش زۆر بە روونی ئاسۆی راڤەکارەکانی ئەو سەردەمە مێژوییەمان بۆ روونده‌کاتەوە





٨. جەختکردنەوە لەسەر بۆشایی نێوان تەفسیر و دەق.[٣٦]

٩. هیچ پێوەرێکی جیاکردنەوەی تەفسیری دروست و نادروستماننییە. ئەم بۆچوونە لای شەبستەری بە روونی لە تەفسیری قورئانیدا دەبینرێت و پێشینەی هەیە، پێشینان وتوویانە قورئان قەتعی و سدور و زەنی و دەلالەیە بەڵام سوننەت زەنی و سدور و زەنی و دەلالەیە.[٣٧]

## بەشی دووەم

## ئافرەت لە بەهەشتی دەق و دۆزەخی فیقهدا

بیرمەندی میسری (د. جەمال بەنا) لە کتێبی ئافرەت لەنێوان ئازادی قورئان و کۆت و بەندی فەقیهەکاندا جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە ئافرەت لە قورئاندا ئازادی پێدراوە و هاوشێوەی پیاو تەماشاکراوە، بەڵام دابونەریتی عەرەبی پێش ئیسلام و پاشماوەی ئەو دابونەریتە بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەوە بووەتە هۆی کۆتوبەندکردن و لەلایەن فەقیهە موسڵمانەکانەوە ئەو مافانەی لێزەوتکراوە،[٣٨]لەهەمانکاتدا (د. نەسر حامد ئەبو زەیدیش) جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کاتێك کە قەیرانی مافی ئافرەت لە ئیسلامدا دەخرێتەبەر گفتوگۆ پارێزەرانی ئیسلام بەتایبەت نوێخوازەکان پەنادەبەنەبەر قورئان باوەڕیانوایە ئیسلام لەپێش سەردەمی مۆدێرنەوە دانی بە مافی ئافرەتدا ناوە و مافگەلێکی سەلماندووە تازەبەتازە پەییانپێدەبرێت ئەوانیش ئایەت و دەقانێك دەهێننەوە کە جەخت لەسەر یەکسانی ژن و پیاو دەکەنەوە، بەڵام سەلەفیگەرا و نەریتگەراکان باوەڕیانوایە ئەو یەکسانییە تایبەتە بە سزا و پاداشتی رۆژی دواییەوە ئەو یەکسانییە یەکسانی دینییە نەك یەکسانی کۆمەڵایەتی. پارێزگارەکان بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانی خۆیان باس لە جیاوازی بایۆلۆژی و فیسیۆلۆژی نێوان ژن و پیاو دەکەن و لەمبارەیەشەوە ئاماژە بە بەشێك لە ئایەتەکانی قورئان دەکەن، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە بونیادی دوولایەنەی ئایەتەکانی قورئان لە گفتوگۆی دیالۆگکردن لەگەڵ عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بکەن، ئەوان بەفەرامۆشکردنی ئەم بونیادەی قورئانی پیرۆز زیاتر جەخت لەسەر تەئویلکردن دەکەنەوە. تەئویلکردنێك لەسەر بنەمای یاریکردنی دەلالەتی بە دەقی دینی -قورئان و سوننەت - دامەزراوە، بەبێ ئەوەی رەچاوی سروشتی ئەو دەقانە لەلایەنی مێژووییەوە بونیاد و کۆکردنەوەی ئەو دەقانە بکەن ئالێرەوەیە هەموو ئەو قەیرانانە خوازیاری ئەوەن لە توێژەری موسڵمان بۆ

بەدەسهێنانی تیۆر لە تێگەشتنی دەقدا هەوڵبدات بتوانێت فیکری ئیسلامی لە قەیرانی تەئویل و دەژەتەئویل کە مێژوویەکی درێژیان هەیە رزگاربکات.. [٣٩] قورئان بەپێچەوانەی تەوراتەوە حەوا بە هۆکاری خواردنی درەختی نەهیلێکراو (گوناهی یەکەم) نازانێت و سزایی یەکسان بۆ هەردووکیان لەقەڵەمدەدات ئەگەرچی هەندێك لە موفەسیرین داستانەکانی تەوراتیان هێناوەتەناو تەفسیرەکەیانەوە و حەوایان بە بەرپرسیاری دەرکردن لە بەهەشت زانیوە ئەمە لەکاتێکدایە لە قورئاندا وەها شتێك بوونی نییە. وەها بۆچوونێك بووەتە هۆی ئەوەی کە ژن بەدرێژایی مێژوو بە هۆکاری گوناه و وەسیلەی نفوزی شەیتان دانراوە. هەربۆیەش زیندانکردنی ژن لەماڵەوە تەنها بۆ پاراستنی ئەو لەسەرلێشواندنی خۆی لەلایەن شەیتانەوە نەبووە بەڵکو مەبەستیش لێی پاراستنی پیاوانیش بووە. [٤٠]

قورئان بەپێچەوانەی تەوراتەوە حەوا بە بەشێك لە ئادەم نازانێت و کە دەشڵێن حەوا لە پەراسوویەکی ئادەم دروستکراوە تەنانەت ئەوەش دەوترێت لە پەراسوویەکی لاری ئادەم دروستکراوە، قورئان دەفەرموێت ئادەم و حەوا لە یەك نەفس دروستکراون (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا (نساء/١)عەلامەی شەهید ناسری سوبحانی لە کاسێتەکانی مافی ئافرەتدا دەڵێت ئەو نەفسە نە ئادەمە و نە حەوا بەڵکو نەفسێکە پاش جیابووەنەوە ئادەم و حەوای لێدروستبووە . واتە (نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ) نە ئادەمە و نە حەوا. [٤١]

## پێشگریمانە کەلامییەکانی پێشینان رۆڵیان لە تەفسیری پرسی ژندا

د.محەمەد موجتەهید شەبستەری پێیوایە بوونی پێش فەهم پێویستی تەفسیرکردنە و بەبێ هەبوونی پێش فەهم ناتوانین تەفسیر بەرهەمبهێنین، بەڵام جەختیش لەسەرئەوە دەکاتەوە پێویستە پێش فەهمەکان نەبنە سەنتەری واتای دەقەکە، ئێمە ناتوانین لە مەجهول موتڵەق پرسیاربکەین ناتوانین ئامانجی مەجهول موتڵەقمان هەبێت کەواتە موفەسیر ناتوانێت پێش فەهمی نەبێت، بەڵام پێویستە پێش فەهمەکانی نەبنە سەنتەری واتا، [٤٢] قۆناغی قسەکردن لەسەر پێش فەهم و پێشگریمانەکانی موفەسیر و مەرجی موفەسیرانی ئێمەدا تاوەکو ئێستا لە پرۆسەی تەفسیری باوی ئێمەدا بۆ ئیسلام کاری لەسەرنەکراوە و بگرە لە زۆربەی کاتەکانیشدا نکوڵیلێدەکرێت، [٤٣] ئالێرەوە بە وردبوونەوە لە پرۆسەی بەردەوامی تەفسیرکردن و هەموو ئەو بۆماوە تەفسیرییەی کە





بۆ ئێمە ماوەتەوە و لەو روانگەیەوەیە کار لەسەر پێش فەهم و پێشگریمانەکانی موفەسیرین بۆ ژن کراوە بکەین دەگەینە بەشێك لەو دەرئەنجامانەی کە بۆچی فیقهی ژنان لەو شێوەیەیە. بۆچی لای هەندێك فەقیه و موفەسیر ژنان زۆرجار تا ئاستێکی باڵا هەڵدەکشێن و لای بەشێکیدیکەش گومان لەسەر مرۆڤبونیان دروستدەکرێت. لەکاتێکدا لە رووکاردا هەردوو لایەنەکەیان بەناوی تەفسیرکردن و ئیلهاموەرگرتن لەهەمان دەقەوە بۆچوونەکانیان بڵاودەکەنەوە.

د.عەبدولکەریم سروش جەخت لەسەر هەمان بۆچوون دەکاتەوە و پێیوایە پیاوان بەرمەبنای ناسین و ئەو وێناکردنەوە لەبارەی ژنەوە هەیانبوو مافیان بەژن داوە بەڵام ئەمە بەتەنها هۆکارنییە بەڵکو لەڕاستیدا ژنان بە هۆکاری جیاواز رۆڵی کۆمەلایەتیدیکەی هەبووە ئەو ئیمکانیات و دەرفەتانەی لەبەردەم پیاودا هەبوون لەبەردەم ژناندا نەبوون.. [٤٤] ئالێرەوە ئایینەکان جیاواز لە مێژوون، وێناکردن و ناسینەکان وێناکردنی مێژوویین و لە دەرەوەی ئایینەکانەوە بەرهەمهاتوون ئایینەکان سیستمی بەرهەمهێنانی وێناکان نەبوون هەربۆیە هەموو ئەو ناسین و وێناکردنەوەی لەبارەی ژنەوە هەبوون وێناکردنێکی مێژووین و پەیوەندییان بە ئایینێکی دیاریکراوەوە و نییە بەڵکو پەیوەندییان بە مێژوویەکی دیاریکراوەوە هەیە و لە هەموو پرۆسەی گۆڕانی مێژوودا پێویستە ئەو ویناکردنانە بگۆڕین تاوەکو تەفسیرەکانیش بگۆڕن بۆنموونە لای حەکیمە یۆنانییەکانەوە (یۆنانییەکان پێیانوابووە ژن ئاژەڵێکی قژدرێژ و عەقلکورتە)، [٤٥] تا دەگاتە حەکیمە موسڵمانەکان بگرە لە ئایینە جیاوازەکانەوە دەبینین هەمان ریتم لە بیرکردنەوە هەیە و ژنان لە ئاستێکی نزمتر لە پیاو زۆرجاریش لە مرۆڤ تەماشاکراوە، ئەمەش دەرخەری مێژوویی بوونی ئەو تێڕوانینەیە.

ئەرەستۆ باوەڕیوایە لاوازی ئەخلاقی لای ژن زیاتر تا لای پیاو خواجە نەسیری توسی باوەڕیوایە خودا ژنی بۆ خزمەتی پیاو دروستکردووە، [٤٦] قەیرانی فیکری موحافیزکاری دینی لێرەدایە نایەوێت ئەو تێڕوانینە مێژوویانە بگۆڕێن بگرە دان بەبوونی وەها رۆڵکی مێژووییدا نانێن.. هەروەك لەو فەتوایەوە زۆر بە روونی دەردەکەوێت کە لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا لە میسر سەبارەت بە مافی بوونە ئەندام پەرلەمانی لەلایەن لیژنەی فەتوای ئەو وڵاتەوە دەرچوو هەریەکە لە موفتی میسر و زانکۆی ئەزهەر و ئیخوان موسلیمین پشتگیریانلێکرد و چوونەپەرلەمانیان بۆ ژنان بە سەرەتایەك بۆ لادان لە حوکمی ئیسلام دەزانی و پێیانوابوو ژن مافی ویلایەی نییە چونکە لە شوراکانی پێغەمبەردا ژنان بانگنەکراون لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا

ژنان بەشداری هەڵبژاردنی خەلیفەیان نەکردووە.[٤٧]

بەوردبوونەوە و خویندنەوەیەکی مێژووییانە بۆ دیاردە و جووڵە کۆمەلایەتییەکان دەبینین، پیاوسالاری دیاردەیەکی مێژووییە و پەیوەندی بە ئایینێکی دیاریکراوەوە نییـە، بوزاییی نابێت بـاوەڕ بـە ژن بکـات چـونکە ژن پەیکـەرێکی هەڵخەڵەتێنـەرە، یەهودییـەکان کاتێـك بەیانـی لەخەوهەڵدەستن سوپاسی خودا دەکات کە خـوا بـە ژن دروسـتینەکردووە، هیندۆسـێکیش کاتێـك پیاوەکەی دەمرێت پێویستە لە ئاگری سووتانی تەرمەکەیدا خۆی بسووتێنێ،[٤٨] بوونی تەفسیر و تێڕوانینی پیاوسالاریانە بۆ ژن لەو کەلینەوە چووەتە ناو ئایینەوە کە هەموو دامەزرێنەرانی ئایین و ئایینزاکان لە مێژوودا ژیاون بارودۆخی ئەو مێـژووە دزەی کردووەتـەنێو ئایینـەکان مـن ئێـستا وەك موسڵمانێکی نوێخواز مـافی ئـەوەم هەیـە هـەموو ئەوانـە بخەمـەلاوە پـەیامی ئـایینی خۆم هەڵهێنجێنم.[٤٩]

باسکردن لە بۆچوونی فەقیه و موفەسیرەکان لەم توێژینەوەیەدا کە سـەبارەت بـە ئـافرەت هەیانبووە مەبەست لێی دادگاییکردنی کەسانێك نییە بە پێوەرێك لـە سـەردەمی ژیـانی ئەوانـدا ئەو پێوەرانە نەبوون، بەڵکو مەبەست لێی دۆزینەوەی هەموو ئـەو پێـش فـەهم ئاسـۆ مێـژووی و راڤەکارانەیە کە وایانکردووە فیقهی ژنان بەوشـێوەیە بێـت کـە لەگـەڵ بـارودۆخی رۆحـی و پێـش فەهم و بەدیهییاتەکانی ئەم سەردەمەدا نەگونجێت. لەبارەیـەوە زیـاتر لـە دەیـان نموونـە هـەن کـە لێرەدا هەوڵدەدەین بەشێکیان بخەینەبەرچاو.

ئیمانی غەزالی ریوایـەتێکی لـە کیمیـای سـەعادەتەکەیدا هێنـاوە کـە پێغەمبـەر (د.خ) فەرموویەتی من پاشمردنم هیچ فیتنەیەکم بەجێنەهێشتووە جگەلە ژنان..[٥٠] ئەلبەتە لێرەدا ئێمە موحەدیس نین و هەستان بەتەخریجکردنی فەرموودەکان لەسەرو کاری ئێمەوەیە، هێنانـەوەی ئـەو ریوایەتـەش لێـرەدا بـۆ دەرخـستنی قووڵایـی بیرکردنـەوەی ئیمـام غەزالییـە نـەك مەبەسـت لێـی قسەکردن بێت لەسەر فەرموودەکە، هەروەها لە ئیحیا علومودیندا پێیوایـە ژنـان نیـوەی سـوپای شـەیتانن بـە هاوکـاری ئـەوان شـەیتان دەتوانێـت مەبەسـتەکانی خـۆی لـە کۆمـەڵگای دینیـدا وەدیبهێنێ،[٥١] لەکاتێکدا وەها دەقێك نە لە قورئان و نە لە فەرموودەدا نادۆزینەوە.

پێناسـەکردنی گرێبەسـتی هاوسـەرێتیش لـە کتێبـە فیقهییـە پێـشینەکاندا بەوشـێوەیە پێناسەکراوە کە عەقدی زەواج ئەو عەقدەیە کە بەهۆیەوە ژن دەبێتە موڵکی پیاو.[٥٢] د. **محەمەد** فەرەحات لە کتێبی (أحكام الأسرة والفقه الإسلامي)دا هێناویـەتی عەقـدی زەواج ئـەو عەقدەیـە





کە چێژوەرگرتن لە ژنان بۆ پیاوان حەڵاڵدەکات،[٥٣] لەوەها عیبارەتێکدا شتێك لەسەرو تێرکردنـی پێداویـستییە جینـسی و شـەهوەتییەکانەوە نابینرێـت و لـە هـەرجۆرە تایبەتمەندییـەکی رۆحـی و مرۆیی خاڵیدەبێتەوە پێـچەوانەی رۆحـی ئـایینی ئیـسلامە ئەمـە لەکاتێکدایـە لـە قورئانـدا بـە شێوەیەك باس لە زەواج کراوە کە لای هیچ گەلێك و ئایینێکیدیکە نابینرێت (و من ایتە ان خلق لکم من انفسسکم ازواجا لتسکنو الیهـا و جعـل بینکـم مـودە و رحمـە) لـە پێناسـە قورئـانی و فیقهییەکـەوە بۆماندەردەکـەوێت پێگـەی ئـافرەت لای فیقهییـەکان چـەندە بەرەوداکـشان چـووە تەنانەت **محەمەد** عەبدە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە گرفتە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی بێسەروبەری و بێیاسایی لە تەفسیر و تەئویلدا و جیاوازینەکردن لـەنێوان مـەنتوق و مەفهومـدا لـە دەلالەتـی دەقدا و جیانەکردنەوەی عـام و خـاس لـە بونیـادی دەقـدا هاتوونەتـەبوون..[٥٤] خواجـە نەسـیری توسی لە ئەخلاقی ناسـریدا دەڵێـت خـۆت لـە چـاوی ژنەکەتـدا بەسـام بنوێنـە تـا لـە ئـەوامیر و نەواهییەکاندا یـەکودوو نـەکات،[٥٥] ئـەم بۆچـوونەی خواجـە نەسـیری توسـی و ئیمـام غـەزالی و هەموو ئـەو نموونانەیدیکـە بەشـێکن لەوبیرکردنـەوە بـاوەی لەوسـەردەمەدا لـە مێـژوودا بـاوبوون بۆنموونە حەکیمە یۆنانییەکان، موسـڵمانەکان، ئەوروپاییـەکان تـا سـەرەتای قۆنـاغی رۆشـنگەری وەها بوچوونێکیان هەبووە مافی ژنان لـەژێر تیـشکی ئـەو بۆچـوونەدا داڕێـژاوە ئـەمان نـە تەنهـا لەلایەنی فیکری و ئیداراکییەوە کەمتر سەیری ژنانیان کردووە، بـەڵکو لەلایـەنی سـۆزداریەوە بـە مەخلوقێك دەزانی کە توانای کۆنترۆڵکردنی عاتیفەی خۆی نییە،[٥٦] لە جیهانی ئیسلامیشدا یـا روونتر بڵێین لە کلتوری عەرەبیدا کە زیاتر لە دە سـەدە بەتـەواوەتی زاڵ بووبـوو بەسـەر تەفـسیری ئایینیدا بەرکاریگـەربوو بـەتێڕوانینی عـەرەبی پێـش هـاتنی ئیـسلام، عەرەبـەکان پێـش هاتـنی ئیـسلام چـونکە خـاوەنی یاسـایەکی دیاریکراونـەبوون و خـاوەنی شـارنەبوون و شارسـتانییەتیان نەخولقاندبوو هەروەها پەیڕەوییان لە ئایینە ئاسمانییەکانیدیکە نـەدەکرد، گـەلێك بـوون لەوپـەڕی توندوتیژیدا بۆیە هەموو ماف و دەسکەوتەکانیان بەوهۆیەوە دەبەخشییەوە تەنانەت میراتبردنیش لای ئەوان بەرمەبنای توانای شـەڕکردن بـوو هەربۆیـە نـە ژن و نـە منـداڵ میراتیاننـەدەبرد بگـرە زۆرجـار ژن خـۆی وەك مـیرات تەماشـادەکرا.[٥٧] عەرەبـەکان بەرمـەبنای هێـرش و دژەهێرشـیان مافەکانیان دەبەخشییەوە ئەو دوو چەمکەش لە مێژووی جاهیلیدا جێپەنجەیەکی قووڵیـان لەسـەر کەسێتی عەرەبی و جەختکردنەوە لەسەر واتـای فـەردی لەسـەر حـسابی عەدالـەت و بابـەتیبوون داناوە[٥٨] هەربۆیە لەوەها کۆمەڵگایەکدا مومکننەبوو ئافرەت بە گەورە سەیربکرێت کـە توانـای

شەڕکردن و بەدەسهێنانی غەنیمەتی نەبێت، هەربۆیە دەتوانرێت بوترێت کەم سەیرکردنی ئافرەت یەکێکبووە لە خسوسیاتەکانی ئەو کۆمەڵگایە چونکە ناتوانێت رم هەڵگرێت و ناتوانێت شمشێر بوەشێنێت ناشتوانێ غەنیمەت وەدەسبهێنێ.(٥٩)

ئالێرەوە پرسیارێکی جەوهەری خۆی دەنوێنێ ئایا ئیسلام هەموو بنەما فیکری و دەرونی و یاسایی و بەهاییەکانی کۆمەڵگای عەرەبی گۆڕیوە یاخود لە زەمەنێکی کورتدا وەها کارێك مومکننەبووە؟

گۆڕینی هەموو بنەما فیکری و ئەخلاقی و بەهاییەکانی کۆمەڵگایەك لە تەمەنێکی کورتی پێغەمبەرایەتیدا کارێکی مومکن نییە و بگرە زۆر خەونی پێغەمبەر(د.خ) هەبوون لە تەمەنی خۆیدا نەهاتوونەتەدی یا بەهۆی ترس لە کەوتنەوەی فیتنە و لادان و ئینحرافات نەیتوانیوە بیانکات، بۆنموونە حەزرەتی عائیشە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی (ألم تري أن قومك لما بنوا الكعبة اقتصروا عن قواعد إبراهيم. فقلت: يا رسول الله، ألا تردها على قواعد إبراهيم؟ فقال: لولا حدثان قومك بالكفر. فقال عبد الله بن عمر: لئن كانت عائشة سمعت هذا من رسول الله صلى الله عليه وسلم، ما أرى أن رسول الله صلى الله عليه وسلم ترك استلام الركنين اللذين يليان الحجر، إلا أن البيت لم يتمم على قواعد إبراهيم)(٦٠) ئەگەر بەوردی لەوفەرمودەیە بڕوانین دەبینین پێغەمبەری خوا کۆمەڵگایەکی دروستتر و مەزن و عادلانەتری لە خەوندا بووە ئەوەی بۆ هاتووەتەدی لە کۆمەڵگای سەحابەدا ئەوە نەبووە کە ویستوویەتی ئەوە بووە کە مومکن بووە لە تەمەنی ١٠ساڵی پاش کۆچکردندا بیهێنێتەدی تەنانەت لە فەرموودەکەدا پێغەمبەر د.خ باس لە بونیاتنانەوەی کەعبە دەکات لەسەر بنەمای قەواعیدی ئیبراهیم چونکە کەعبە کورتکرابوویەوە لەسەر پایەکانی ئیبراهیم، بەڵام ئەمە لەکاتێکدایە پێغەمبەری خوا نایەوێت کارێکبکات بەدیهییاتەکانی کۆمەڵگاکەی قەبوڵینەکات، پێغەمبەر د.خ تەنها پێغەمبەرێك نەبووە بەڵکو حەکیمێکی مەزن و سەرکردەیەکی لێوەشاوە و مرۆڤدۆستێکی بێوێنەبووە، بەڵام گەورەیی پێغەمبەرایەتییەکەی هەموو خەسڵەتەکانیدیکەی شاردووەتەوە، لەلایەکیدیکەوە بەگەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە باشترین و پایەدارترینەکانی ناو هاوەڵان ئەو کەسانەن کە لە جاهیلیشدا پایەدار و بڵندبوون.

سئل رسول الله صلى الله عليه وسلم أي الناس أكرم؟ قال: (أكرمهم عند الله أتقاهم).





قالوا: ليس عن هذا نسألك، قال: (فأكرم الناس يوسف نبي الله، ابن نبي الله، ابن نبي الله، ابن خليل الله ). قالوا: ليس عن هذا نسألك، قال: (فعن معادن العرب تسألونني). قالوا: نعم، قال: (فخياركم في الجاهلية خياركم في الإسلام، إذا فقهو)(٦١) ئالێرەوە دەتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە ئیسلام نەیتوانیوە کۆمەڵگایەك بونیاتبنێ پڕاوپڕ لەسەر بنەمای خەون و دنیابینی ئایینی بێت چونکە ئەوانەی تەفسیریانکردووە لەناو کلتورێکی درێژخایەنی بتپەرستی و نەخوێندەواریدا گەورەبوون.. بۆیە باشترینەکانیان ئەوانە بوون کە لەپێش موسڵمانبونیاندا باشبوون، هەربۆیە لەو کۆمەڵگایەدا ئاساییە کە عورف و عادەتی جاهیلی هەبووبن و ئیسلام نەیتوانیبێت لایانببات ئەگەر بیشیویستایە، تەنانەت لە بابەتی زەواجی موتعەدا زۆر بەڕوونی ئەو بابەتە رەنگدەداتەوە زەواجی موتعە هاوەڵان پەنایانبردوەتە بەری و پێغەمبەری خوا لێیقەدەغەکردوون پاشان رێگەی پێداونەتەوە و پاشان لێیقەدەغەکردوونەتەوە هەروەك حەزرەتی عومەر خوا لێیرازیبێت دەفەرموێت (متعتان كانتا على عهد رسول الله) ئیبن و مەسعود دەگێڕێتەوە کە لە غەزادا بوون و ئافرەتیان لەگەڵدا نەبووە داوایانکردووە کە پێغەمبەر رێگەیانبدات زەواجی موتعە بەئەنجامبگەیەنن، بەڵام پێغەمبەر (د.خ) رەتیکردووەتەوەو پاشان رێگەی پێداون و ئەو قەدەغەکردن و رێگەپێدان قەدەغەکردنەوەیە بەڕای زانایان قەدەغەکردنی یەکەم لە جەنگی خەیبەردا بووە و رێگەپێدانی دووەمیش لە فەتحی مەکەدا و قەدەغەکردنی دووەمیش لە حەجی ماڵئاوایدابووە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی رێگەمپێدان موتعەبکەن، بەڵام خوا ئەوەی لەسەر حەرامکردوون(٦٢) ئەم حیوار و گفتوگۆ بەردەوامەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی رێژەی ئەو کلتور و دابونەریتانەی پێش ئیسلامman دەهێننەوە بەرچاو کە قورساییەکی گەورەیان لەسەر بیرکردنەوەی هاوەڵان هەبووە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە ناتوانین بڵێین ئیسلام نەیتوانیوە دەسکاری پێکهاتە و ئەخلاقییاتی مرۆڤەکان بکات، بەڵکو رۆڵی ئیسلام وەك پێکهێنەرێکی ژیانی مرۆیی و پێغەمبەر(د.خ) وەك گەورەترین چاکسازی مرۆڤایەتی نکوڵیلێناکرێت، ئەگەر باوەڕمان بەوشێوەیەبێت ئیدی حیکمەتی هاتنی ئیسلام لەچیدایە، ئایا ئەو کۆمەڵگا ئەخلاقییە و رۆحییە چۆن بەرهەمهات. بەپێچەوانە ئیسلام تا ئەو ئاستەی مومکنبوو دەسکاری نەخشەی عەقڵی و ئەخلاقی شوێنکەوتوانی کردووە. عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە بە خوا ئێمە ژنمان بە هیچ نەدەزانی تا خوای گەورەی پەیامی بۆ نەناردین،(٦٣) بەڵام هەندێك ئەخلاقیات هەبوون لەناو عەرەبەکاندا هۆکاری شێوە تەفسیرکردنی ئایین بوون

لای ئەوان، ئەبو عەلای مەودودی لە کتێبی (الحجاب)دا باس لەوە دەکات پێش هاتنی ئایەتی حیجابیش حەزرەتی عومەر پێداگری لەسەرئەوە دەکرد کە ئافرەتان نەچنەدەرەوە و جارێکیان فەرمووی خۆزگا پێغەمبەر فەرمانیدەکرد کە ژنان نەچنەدەرەوە، شەوێکیان دایکی ئیمانداران سەودەی کچی زەمعەی بینی (خوا لێیانرازیبێت) کە لە ماڵ چووبوویەدەرەوە بۆ هەندێک پێداویستی، حەزرەتی عومەر پێیفەرموو بۆچی هاتوویتەدەرەوە، پاشانیش کاتێک ئایەتی حیجاب هاتەخوارەوە عومەر چالاکتر بوو لە ڕێگریکردن لە ئافرەتان کە بچنەدەرەوە، جارێکیدیش سەودەی کچی زەمعەی بینی کە هاتبووەدەرەوە دووبارە رەخنەی لێگرتەوە، کاتێک دایکی ئیمانداران گەڕایەوە لای پێغەمبەر و هەواڵەکەی پێدا ئەویش فەرمووی ڕێگەتانپێدراوە بچنەدەرەوە بۆ پێداویستییەکانتان..[٦٤] لەبەرامبەردا بەشێك لە هاوەڵان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە ڕێگانادەین بچنەدەرەوە خراپیانبکەن ئەمەش بەڵگەی ئەو گومان و دوودڵییەمان بۆ دەردەخات بەڕووی ڕێگەپێنەدانا وێنای قووڵی رەگی جاهیلیمان بۆ دەردەخات لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا،[٦٥] دۆزینەوەی ئەو رەگانەی کلتوری جاهیلی لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا دەتوانێت نهێنی هەندێك لەو تەفسیرانەمان بۆ روونبکاتەوە کە هیچ بەڵگە و پاساوێکیان نە لە قورئان و نە لە فەرموودەدا نییە بۆنموونە تەبەری لە تەفسیری ئایەتی (لاتؤتو السفهاء اموالم) بۆچوونی زۆری هێناوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەن و زوحاك و موجاهیدە و قەتادە و ئیبنو عەباس و ئیبن عومەرەوە هێناویەتی بەوەی (السفهاء) ژن و منداڵن لەکاتێکدا ئەو سورەتەی ئەو ئایەتەی تێداهاتووە سورەتی نیسائە کە هەموو داکۆکیکردنە لە هەتیوان و ژنان،[٦٦] ئەو هەموو هەڵە تەفسیرکردنەی ئایین یا راستر بڵێین تەئویلکردنەی ئایین لەوێوە سەرچاوەدەگرێت رابردوەکان ژنیان لەلایەنی دەرکەوە بەلاوازتر زانیوە،[٦٧] بگرە زۆرجاریش کەمتر لە مرۆڤ تەماشایانکردووە.

عەرەبەکان ئافرەتیان دەچواند بە مەڕ و بزن هەروەها بە وڵاخ و مانگا چونکە هەردووکیان (....) دەبن ئەمەش هەروەك لە فتحولباریدا هاتووە،[٦٨] مەلا هادی سەبزواری لە پەراوێزی (اسناد اربع)دا لەبارەی ژنەوە قسەیەکی دڵئازاردەری هەیە مەلا سەدرا لە شوێنێکدا ژنی لە زومرەی حەیواندا وەسفکردووە ئەوانی بە ئاژەڵێك زانیوە کە بۆ نیکاحکردن لەبارن مەلا هادی سەبزواری هەمان بۆچوونی هێناوە گەورەیکردووە و پەراوێزی بۆ نووسیوە دەڵێت: ژن لەگەڵ حەیوانە بێزمانەکاندا جیاوازی نییە (کساهن صورة الانسان لئلا یشمزة عن صحبتهن و یرغب في





نکاحهن) خوای گەورە شێوەی مرۆڤی خستووەتەسەر ئەم ئاژەڵە تا پیاوان بێزارنەبن لەقسەلەگەڵکردنیان و ئارەزووی زەواج لەگەڵ کردنیان ببێت، ئەمە بۆچوونی فەیلەسوفێکە کە لەڕووی کاتەوە زۆر دوور نییە لە ئێمە،[٦٩] ئەمەش بەهۆی جیاوازی بەدیهییاتەکانی سەردەمەوەیە هەربۆیە فەقیهەکان پێیانوابووە ژنان مافی تەڵاقیان نییە چونکە عەقڵ و دینیان تەواونییە و کویلەی نەفسیانن،[٧٠] بەڵام بە هەنگاوێکی سادە تەنها بە گۆڕینی شوێنی بۆچوونەکان لە کۆمەڵگای عەرەبی ئەوکاتەوە یا بڵێن لە سنووری پێکهاتە و ستراکچەری ئەو جوگرافیاوە بۆ جوگرافیایەکی جیاوازتر کە هەمان ئایین تێیدا باڵادەستبووە، بەڵام پێش فەهم و پێشگریمانەی جیاوازتریان هەبووە دەبینین فەتواکان گۆڕانکاری جەوهەرییان بەسەردادێت لە یەکێك لەو دۆکیومێنتانەدا کە (ئەبو عەبدوللا محەممەد ئیبن ئەحمەد ئیبن ئەلعەگار، لە کتێبی کتاب - الوثائق و السجلات- ) هێناویەتی کە لە دەوڵەتی ئیسلامی ئەندەلوسدا بووە کە ئەوەش وێنەیەکی عەقدی زەواج بووە بەمشێوەیەبووە فلانی کوڕی فلان (لەبری وشەی فلان ناوی ئەو کەسە نووسراوە) پابەنددەبێت بەوەی بۆ هاوسەرەکەی خۆشەویستی و عەشق پێشکەشبکات هەموو پێداویستییەکانی ئارامش و خۆشحاڵی بۆ دابینبکات تا ئەوکاتەی لەگەڵ ئەودا ژیانی هاوسەری دەگوزەرێنن لەگەڵ کەسی دیکە زەواج نەکات و هیچ کەنیزەکێك نەگرێتەخۆ، لەم سۆنگەیەشەوە ئەگەر وەها کارێك روویدا ئیختیار بە دەستی ژنەکەیە، هەرچیەك بیەوێت ئەنجامیبدات. نابێت کەسی ناوبراو لەم سەنەدەدا زیاتر لە شەش مانگ ژنەکەی بەجێبهێڵێت. مەگەر لە سەفەری حەجی واجبدا نەبێت لەم حاڵەتەشدا تەنها دەتوانێت بۆ ماوەی سێ ساڵ سەفەربکات. ئەڵبەتە دەبێت تەواوی خەرج و پێداویستییەکانی ژنەکەی دابینبکات. لەوماوەیەی کە لە دەقی سەنەدەکەدا هاتووە ئەگەر پیاو زیاتر بڕوات ژن دەتوانێت تا هەرکاتێك کە بیەوێت ژیانی هاوسەرداری کۆتاییپێبهێنێت، هەروەها کەسی ناوبراو نابێت ژنەکەی لە سەردانی کەسان و نزیکانی قەدەغەبکات یا ئەو لەمبارەیەوە تەنگەتاوبکات ئەگەر ئەو سەردانی کەسانی لێقەدەغەبکات یا تەنگەتاویبکات ژن مافی هەیە کۆتایی بەو هاوسەرگیرییە بهێنێ داوای تەڵاقبکات[٧١]).. ئەو وێنەیەی لە عەقدی زەواجدا هاتووە و هەمو ئەو مافانەی بەمەرج لە نووسینی عەقدی زەواجەکەدا هەبوون دەرخەری قوولایی کاریگەری عورف و عادەتن لەسەر تەفسیر و فیقهـ، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە بۆماوەی گوتاری ئایینی ئێمەدا بایەخ بە هەرێمی ئەندەلوس نادرێت لەکاتێکدا توانیویانە ڕوویەکی گەشاوەتری ئایین نمایشبکەن.

**ئایینداری سەردەم ئەرکی بەرامبەر بە ژن**

لە بەشی پێشەوەدا باسمان لە رۆڵی پێشگریمانە مێژووییەکانی فەتوا فیقهی و بۆچوون و تەفسیری موفەسیران کرد. لە ئەگەرێکدا ئەگەر ئەو فەتوا و بۆ چوونانە بۆئەو سەردەمانە مایەی قەبوڵکردنبن ئەوا زۆربەیان لەم سەردەمانەدا جێ رەخنە و بگرە لەلایەن بەشێکی زۆری زانایانی ئایینییەوە باسناکرێن و هیچ بەڵگەیەك بۆ پاساو بۆهێنانەوەیان نییە.

مرۆڤی ئەم سەردەمە لەگەڵ دەرکەوتەکانی جیهانی نوێدا دەستوپەنجە نەرمدەکات. چەمکەکانی مافی مرۆڤ و مافی ژن و منداڵ و کەمینە و جیهانگیری و هەژموونی دەزگاکانی پێکگەشتن و گلۆبالیزم و یاسای مۆدێرن و جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ و زانستەکانی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و ئاسۆکانی ئازادی بیرکردنەوەو ئازادی دەربڕین و زانکۆکان و گروپەکانی فشار و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی سیمایەکی روونی شارستانییەتی نوێن. هەرئەمەش وایکردووە کە ئایینیش پێویستی بەوەهەیە تەفسیری لەبار و گونجاوی بەوسەردەمە بێت.

ئەگەر پێشگریمانە و تێگەشتنمان بۆ جیهانی نوێ بریتیبێتلەوەی جیهانی نوێ بەتەنها بریتییەلە حزب و کۆمپیوتەر و پەرلەمان و فرۆکە و تەکنۆلۆژیا و دەرمانخانەی مۆدێرن و نەخۆشخانەی موجەهەز ئەوا بە هەڵەدا رۆشتووین.. راستە ئەوانە بەشێکن لە نیشانەکانی جیهانی مۆدێرن، بەڵام پرسیارەکە لەوە گەورەترە، ئایا بۆچی لە جیهانی کۆندا ئەو ئامێرانە دروستنەکران لەوانەیە بڵێن بەهۆی عیلمەوە بووە، بەڵام ئایا چیبوو وایکرد کە عیلم لە سەدەی کۆندا سەریهەڵنەداوە[٧٢] لەکاتێکدا ئەمجۆرە جیهانبینییە بۆ جیهانی نوێ جیهانبینییە دنیاییانەیە و پەیوەندی بە ئایینەوە نییە.

لەنێوان جیهانی کۆن و نوێدا چوار جیاوازی بنەرەتی بونیان هەیە ئەوانیش جیاوازین لە بەکارهێنانی وەسائیلدا و غایات و مەفاهیم و تەسەورات و پێشگریمانەکانن، مرۆڤ لە ژیاندا ئامانجی هەیە بۆگەشتنە ئامانجەکانی سوود لە کەرەستە وەردەگرێت تەسەورات و مەفاهیمی تایبەت بە خۆمان هەیە کە تێڕوانینی ئێمە بۆ دەرەوەی خۆمان دیاریدەکات هەروەها پێشگریمانەی تایبەت بە خۆمان هەیە کە جیهانبینی دیاریدەکات.[٧٣]





هۆکارەکان ئامانجەکان دەخولقێنن بۆنموونە ئەگەر نموونەیەك لەبارەی پرسی ژنانەوە بهێنینەوە کە لە روانگەی فەلسەفەی مێژووەوە و دەکرێت وەك خاڵێکی مەزن تەماشابکرێت لە بونیاتنان و فۆرمەڵەبوونی بزووتنەوەی ژناندا ئەویش پەیدابوونی کەرەستەکانی رێگریکردنن لە سکپڕی (contraceptive) لەکاتێکدا ئەو کەرەستانە بۆخۆیان هیچ بۆچوونێکیان نییە، بەڵام بە بڵاوبوونەوەی ئەو کەرەستانە ژنان رزگایانبوو لە بەبەردەوامی منداڵبوون و دەرفەت لەبەردەمیاندا ئاوەڵابوو بۆ چوونەدەرەوە و سیاسەتکردن، هەروەها هاتنەدەرەوەی کچان و دەسدانەخوێندن بەهەمانشێوە کاریگەری هەبوو لەسەر گەشەکردنی بزووتنەوەی ژنان، کچان پێش ئەو قۆناغە بە منداڵی زەواجیاندەکرد، بەڵام بەرەبەرە تەمەنی زەواج هەڵکشا بەرەوسەرەوە، چونکە کچە خوێندکارەکان چاوەڕوانی تەواوکردنی خوێندن بوون لەگەڵ خوێندندا ئەگەر زەواجیانکردبا ئیدی ئەو زەواجە زەواجی پیرۆز یا یاسایی ببوایە یا خود نایاسایی ئەوا دەیانتوانی رێگری لە سکپڕبوون بکەن و درێژە بە خوێندن بدەن. ئالێرەوە دەبینین پەیدابوونی هۆکارەکان چ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر پەیدابوونی ئامانجەکان هەیە لەوبارەیەوە مارکس دەڵێت بۆرجوازییەت هەموو جیهانی بەرمەبنای تەسەوراتی خۆی بونیاتناوە ئەم قسەیە بە رای د. عەبدولکوریم سروش بۆ تەکنۆلۆژیاش راست دەردەچێت.[٧٤]

بونیاتنانی تەسەورات و تێڕوانینی فیقهی تەنها لە چوارچێوەی فیقهدا کورتناکرێنەوە بەڵکو دوورییەکی فەلسەفی و کەلامی هەیە تەنانەت گەڕان بەدوای ماف و داخوازییەکانی ئافرەت لەناو ئاییندا بابەتێکی موجەرەد نییە بەڵکو سیستمێکی تێکهەڵکێشە و ناتوانرێت بەبێ رەچاوکردنی هەموو بەشەکانی دەست بۆ لایەنێکی ببرێت چونکە بابەتی ژن بابەتێکی سەربەخۆی بێگانە لە بابەتەکانیدیکەی شەریعەت نییە بەڵکو پەیوەستدەبێت بە بابەتەکانیدیکەوە بۆنموونە پەیوەستدەبێت بە مرۆڤناسییەوە.. ئەمە راستەخۆترین بنەمای ئەوەیە لە روانگەی ئیسلامەوە دەبێت چۆن سەیری مرۆڤ بکەین؟ پێویستە سەرەتا لە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەدا کاربکەین پاشان سەرەی مافی ژنە.[٧٥] کەواتە پێش قسەکردن لەسەر مافی ژن پێویستمان بە قسەکردنە لەسەر دوو ئاست:

**ئاستی یەکەم:** تێڕوانینی کەلامییە بۆ مرۆڤی ناو ئایین وەك پێشتریش ئاماژەمانپێکرد چونکە کەیسی ژن بابەتێکی موجەڕەد نییە لە ئیسلامدا.

**ئاستی دووەمیش:** تێڕوانینی کۆمەڵناسانەیە بۆ سیستەمە مرۆییەکان و

لەوڕوانگەیەشەوە تەفسیری ئایین بکەین چونکە زانستی فیقهی زانستێکی مەسروفکەرە زانستی فیقهـ بەکاربەری جیهاناسی و مرۆڤناسی و زماناسی و کۆمەڵناسی کۆنە، بۆیە وەڵامەکانی موقنیع نین،[٧٦] هەر ئەوەش وادەکات بزانین فەقیهەکانی ئێمە لە روانگەی جیهانبینی و مرۆڤناسی و کۆمەڵناسییەوە سەر بەچ مەدرەسەیەکن بەلانیکەمەوە ئێمە بۆ بابەتی خێزان دوو تیۆرمان لەبەردەستادیە ئەوانیش تیۆری سروشتی و تیۆری کاملبوونی مێژوویین. بەشێك لە بیرمەندەکان تیۆری باری سروشتی قەبوڵدەکەن لەمەڕ خێزانیش باوەڕیان وەهایە کە خێزان سیستمێکی سروشتی هەیە.. دابەشکردنی کار لەناو ماڵ و دەرەوەی ماڵدا بەرمەبنای ئەم سیستمەیە لەڕاستیشدا هەموو ئەو مافانەی بە ژن دەدرێت یانخۆ لێیزەوتدەکرێن لەسەر بنەمای ئەو سیستمە سروشتییەیە، ئەم سیستمە تەنها پەیوەست نییە بە خێزانەوە بەڵکو پەیوەندی بە بازنەکانیدیکەشەوە هەیە بۆنموونە لە بازنەی سیاسەتدا بیرمەندە سیاسییەکانی ئەم تەوژمە باوەڕیانوایە سیستمی سیاسی تەندروست ئەو سیستمەیە هەرکەسێك لە شوێنی خۆیدا بێت بەشێك لە فەیلەسوفەکانی جیهانی ئیسلامی وەك جەلالە دینی دوانی و خواجە نەسیری توسی سەر بەهەمان تەرزی فیکری بوون، ئەم فەیلەسوفانە باوەڕیان وابوو کۆمەڵگا و خێزان بونیادی سروشتی خۆی هەیە ئێمە ناچارین پەیڕەویلێبکەین و شێوەکانیدیکە ئینحرافن لە سروشتدا،[٧٧] هەروەها جەختیان لەسەر ئەوەدەکردەوە خوای گەورە ئەحکامەکانی پێچەوانەی ئەو سروشتە دانابەزێنێت کە خۆی دروستکردووە.[٧٨]

گروپی دووەم تیۆری تەکامولی مێژوویییە لایەنگرانی ئەم تیۆرە باوەڕیان بەوەها سیستمێك نییە پێیانوانییە سیستمی نەگۆڕ لە سیاسەت و ئابووری و خێزاندا هەبێت و پێیانوایە بەبەردەوامی ئەو سیستمانە بەرەو کاملبوون دەچێت.[٧٩]

قسەکردن لەسەر رەچاوکردنی بارودۆخ و گۆڕینی فیقهـ و فەتوا و تەفسیر بەپێی بنەما و ئەولەوییات و بەدیهییاتەکانی مرۆڤی سەردەم کارکردنە بە ئاراستەی سازگارکردنەوەی ئایین بە رۆحی سەردەم چونکە ئەو عەقڵەی ئایین قەبوڵدەکات و باوەڕی پێدەهێنێ هەمان ئەو عەقڵەیە کە بڕیاردەدات لەسەر باوەڕ و ئیعتقادەکانی ناو ئایین، بڕیاردەدات ئەم ئایینە یا ئەوەکەیدیکەیان زیاتر رێز لە مرۆڤ دەگرێت، عەدالەت پەیڕەودەکات کردەیەکی عەقڵانی نییە و کەسێك پێیوابێت ئایینێکی دیاریکراو ستەم لە چینێك دەکات بۆچوونەکانی ناعەقلانی و نازانستین باوەڕی پێبهێنێ شێخ محەممەد غەزالی دەڵێت: کاتێك لە مولتەقای فیکری ئیسلامیدا بووم سەفیری





ئەڵمانی باسی لە ئیسلام دەکرد وتی پێویستە لەسەرتان وێنەی ئافرەت راستبکەنەوە چونکە وێنەی ئافرەتی ئیسلامی وایکردووە ئەوروپییەکان لە ئیسلام هەڵبێن،[٨٠] ئایینێکی دیاریکراو ناتوانێت سەرنجی مرۆڤەکان بۆلای خۆی رابکێشێت کاتێك لەدەرەوەی بەدیهییات و یەقینەکانی ئەوانەوە بێت. هەرچەندە ئیسلامۆفۆبیاش رۆڵێکی سلبی گێڕاوە لەوبوارەدا، بەڵام کەمنین ئەو کەسانەش کە پێیانوایە شتێك نییە بەناوی کێشەی ئافرەتەوە لە کۆمەڵگای موسڵماناندا، محەممەد قوتب لە کتێبی (واقعنا المعاصر)دا پێیوایە لە میسر و جیهانی ئیسلامیدا شتێك نییە بەناوی کێشەی ئافرەتەوە،[٨١] هەروەها لە پێشەکی ئەوبەشەی (قضية تحرير المرأة) کە لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بڵاویکردووەتەوە پێیوایە هیچ پاساوێك بۆ ورووژاندنی ئەو بابەتە نییە و رەسەنی لە کاری ژناندا ئەوەیە لە ماڵەوە بمێننەوە، هەروەها جەختیش لەسەر ئەوەدەکاتەوە قاسم ئەمین کە گەڕایەوە بانگەشەی بۆ خوێندن و ئازادکردنی ژنان دەکرد.. ئەوەش هەمان ئەو پرۆگرامە بوو موبەشیرەکان دایاننابوو بۆ روخاندنی ئیسلام.[٨٢]

محەممەد غەزالی مێژووی سەرەتاکانی چوونە زانکۆی کچان لە میسر باسدەکات و هەڵوێستی باوەڕدارەکان لەبارەی ئەو هەنگاوە شیدەکاتەوەو بەوەی کاتێك تەها حسێن راگری کۆلێژی ئاداب بوو رێگەیدابوو کچان بچنە کۆلیژەوە.. هەڵویستی ئیماندارەکان بریتیبوولەوەی کە ئەوە رەوا نییە، بەڵام لایەنی بەرامبەر کە مولحیدەکان پێداگری ئەو مافەیان بۆ ئافرەت دەکرد، ئەوە چ ئینسافێکی بۆ ئیسلام لەو شەڕە سەخیفەدا؟ ئایین لەگەڵ نەزانیندایە. بێباوەڕیش لەگەڵ زانستدایە؟ تاکەی رێگەبدەین خەڵکانێك لە سەرزەوی و ئاسماندا درۆبکەن بەناوی ئایینەوە؟[٨٣] لە نامیلکەیەکدا کە لە سایتی (صيدالفوائد)دا کە وێبسایتێکی سەلەفییەکانی سعودییەیە بڵاوکراوەتەوە بەناونیشانی (معركة تحرير المرأة السعودية.. موثق بالأدلة) هاتووە زانایان دژی کردنەوەی قوتابخانەی کچان بوون لە سەرەتاوە رەتیاندەکردەوە قەبوڵیاننەبوو بەپێی ئەو مەرجەی دەبێت لەژێر چاودێری زانایاندا بن و بەرپرسیارەتی فێرکردنی کچان لەئەستۆبگرن و موفتی ئەوکاتەی سعودییە شێخ محەممەد بن ئیبراهیم یەکەم سەرۆکی بوو، بەڵام بەپێی کات مەرجەکان لابران و بڕیارەکان هەڵوەشانەوە و ئاسانکاری دژی بڕیارە یەکلاکەرەوەکان بۆ رێگریکردن لە ئازادبوونی کران هەتاوەکو زانکۆکان و وەزارەتی تەندروستی و پەیمانگا ئیدارەی گشتی بەشی کچانیان کردەوە کە ملکەچی بڕیارەکانی سەرۆکایەتی گشتی فێرکردنی کچان نەبوون ئەمەش وایکرد ژنان کێبەرکێی پیاوان بکەن لە پسپۆڕییەکانیاندا و بیکەنە پیشەی سەرەکیان، هەروەها

بەشی نویٚ کرانەوە وەك بیرکاری و زانستی کیمیا و فیزیا و جیۆلۆجی و زیندەوەرزانی و زمانی ئینگلیزی و دەرون \ناسی وکاریگەریان لەسەر دەرچوونی ژمارەیەکی بەرفراوان لە کچان هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پیداویستییەك بە فێربوونی ئەو زانستانە نەبوو، شێخ عەبدولڕەحمان ئال فریان پێیوایە ئامانجی داکۆکیکردن لە کارکردنی ژنان لەلایەن پیاوانەوە دوو شتە یەکەم: دەسکەوتنی مادە ئەوانە مادین و دووەم: تێرکردنی ئارەزوی سێکسیان،[٨٤]

هەموو ئەو تێڕوانینانە بەشێکن لە کارەکتەرەکانی ئەوبارە نائاساییەی کە لەدەرەوەی ئیسلامەوە روانینی سلبی بۆ ئیسلام دروستبووە بەوەی ئیسلام مافەکانی ژنان پێشێلدەکات و باوەڕی بە مرۆڤبوونی ژن نییە. لەبەرامبەردا لایەنگرانی کرانەوەی ریفۆرمکردنی ئایین پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیان هەیە. تا ئەوئاستەی بەشێك لە زانایانی ئایینی پێیانوایە ئەو بۆچوونە داخراوانە بەشێکن لە نەخوێندەواری کۆمەڵگا و زانایانی ئایینیش محەمەد حسێن فەزلولڵا پێیوایە بڵاوبوونەوەی دواکەوتویی زانایانی ئایینی لێهەڵاوردناکرێت لەبەر کاریگەربوون بەشێوەیەك ئەو دواکەوتووییە لە ژینگەکەدا هەیە رەنگدانەوەی لاشعوری لەسەر زانایان هەیە و پاشماوەی ئەو دواکەوتوییە لە تێگەشتنی دەق و واقیعبینیاندا دەردەکەوێت..[٨٥] کەواتە لای ئەو زانایانە ئەو فەتوا و بۆچوونانە دەرئەنجامی عورف و تەقالیدی دواکەوتووی کۆمەڵگان نەك دەرکەوتەی پەیامی ئایین، عادەت و تەقالید و رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کە مرۆڤ بونیادیدەنێت خۆی بەسەر ئاستە جیاوەزە فیکری و کۆمەلایەتییەکاندا دەسەپێنیٚ و دەبێتە باکگراوندی بیرکردنەوەیان و لەسەر بنەمای ئەو بیردەکەنەوە،[٨٦]چونکە فەقیهەکان لەمەڕ سیستم و مافی خێزان فەتوای جیاوازیانداوە ئەم فەتوایانە پشتیان بە پێش فەهم و پێشگریمانە و چاوەڕوانی ئەوان لە ئەحکامی دینی بەستووە.[٨٧]

کرانەوەی ئایینی بە مانایرەت کردنەوەی ئایین نییە یاخۆ قسەکردن لەسەر حەڵاڵکردن و حەرامکردن نییە یا نەسخکردنی ئایەت و لابردنی ریوایەت نییە ئەوەی دەگۆڕێت فەهمی مرۆڤە لە شەریعەت ئەوەی بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە خودی شەریعەتە،[٨٨] بەڵکو کارکردنە لەسەر دوو ئاست ئاستی یەکەمیان: لابردنی هەموو ئەو ئاسۆ و پێش گریمانانەی کە لەبنەڕەتدا هی فەقیه و موفەسیرەکان بوون ئەوانیش لە دابونەریتی خۆیانەوە وەریانگرتوون هەروەك محەممەد غەزالی دەڵێت: نەبوونی یەکسانی لەنێوان ژن و پیاودا بەهۆی نەریتی چەقبەستووەوەیە نەك بەهۆی شریعەتەوە ئێمە پەیوەستین بە وەحیەوە و لێیدانابڕێین پابەندین بە سەدەی پێغەمبەر و خەلیفە





راشیدەکانەوە، بەڵام گوزەری مێژووی موسڵمانان مێژووی کاری دەسەڵاتداران و گەلەکانە و هەڵە و راست هەڵدەگرێت ئەوە حوکمی لەسەر دەدرێت نەك حوکمی پێبدرێت.[٨٩]

ئاستی دووەمیشیان: نوێکردنەوەی فەهم و تێگەشتنە بۆ قورئان چونکە ئایین سیٚ بەشە (ئیمان، شەریعەت، فەهمی مرۆڤ لە شەریعەت) هەموو بۆچوونی ئێمە لێرەدایە کە غوبار و تەپوتۆزی مرۆڤ لەسەر دین دەنیشێت ئەڵبەتە فەهمی مرۆڤ بۆ دین، ئالێرەوەیە کەمال و نەقس لە فەهمی دیندا روودەدات..[٩٠] بۆیە لایەنگرانی کرانەوەی تەفسیری ئیسلامی بەڕووی مرۆڤی سەردەمدا پێیانوایە هەموو داخرانەکان لەوێوە سەرچاوەیانگرتوە کە هەندێك لە موسڵمانان بۆچوونێکیان لەناو بۆچوونەکاندا یا تەقلیدێکیان لەناو تەقلیدەکاندا وەرگرتووە و وایانزانیوە وەحی خوایە..[٩١] ئەمە لەکاتێکدایە دەکرێت موسڵمانان بگەڕێنەوە سەر بنەما سەرەکییەکانی ئایین و لەوێوە نوێگەری بکەن بۆچی دەبێت درگای ئەم گۆڕانکارییە داخەین تێگەشتنی نویٚ و تەجەلییاتی تازەی شەریعەت بەحەرام بزانین.[٩٢]

## خوێندنەوەی نوێگەراکان بۆ ئایەتەکانی مافی ژنان لە قورئاندا

بەوردبوونەوە لە قورئان و گەڕان بەدوای چەمکی ئافرەتدا لە قورئاندا دەبینین لەسەر سیٚ ئاست قورئان باس لە ئافرەت دەکات ئەوانیش لە ئاستی یەکەمدا ژن و پیاو یەکسانن:

یَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾نساء/١﴿

وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾التوبة/٧٢﴿

وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾نساء/٣٢﴿

وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ

نَصِيرًا(نساء/٧٥)

فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ(آل عمران/١٩٥)

*وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا(نساء/١٢٤)

*إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ(النور/٢٣)

*لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ (النور/١٢)

*لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا(الأحزاب/٧٣)

*وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا (الأحزاب/٥٨)

*إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا(الأحزاب/٣٥)

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(الممتحنة/١٢)

ئاستی دووەمیان کە لەڕووی تەشریعییەوە جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا کراوە:

الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا(نساء/٣٤)





يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيمًا(نساء/١١)

سێیەم لە ئاستی گێڕانەوەدا:

*وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ(النحل/٥٨)

فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ(آل عمران/٣٦)

لایەنگرانی کرانەوە و دانانان بە یەکسانی نێوان ژن و پیاودا پێیانوایە لە سەرەتادا پێویستە ئەو سێ ئاستە جیابکەینەوە، هەروەها لە سیاقێکی مێژوویيدا سەیری ئایەتەکان بکەین.. بۆنموونە هەندێك لە ئەحکامەکان بۆ مێژوویەکی دیاریکراو هاتوونەتە خوارەوە ئەمەش لای نەسر حامد ئەبو زەید بەڕوونی دەردەکەوێت پێیوایە ئەگەر بۆ زانایانی ئوسول ڕەوابێت رەچاوی ئەسباب نزول بکەن بۆ تێگەشتن لە واتای دەق ئەوا ئێمە پێویستمان بەوەیە لە چوارچێوەیەکی فراوانتردا تەماشای دەق بکەین ئەویش بارودۆخی مێژوویی سەدەی حەوتەمی زایینییە..[٩٣] بەوواتایەی تەماشای ئەسباب نزولی ئایەت بە ئایەت نەکەین بەڵکو تەماشای سیاقی مێژووی دابەزینی قورئان بکەن. چونکە بەشێك لە ئایەتەکان بۆ موداراکردن (هەڵکردن)ی بارودۆخ دابەزیوون نەك بۆ ئیدارەکردنی (بەڕێوەبردن و ئاراستە کردن)ی بارودۆخ، ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لای د.عەبدلکەریم سروش لە چوارچێوەی زاتییات و عەرەزیاتی ئیسلامدا دەربڕراوە عەرەزی ئەوەیە کە دەتوانرێ و دەتوانرا بەشێوەیەکیدیکە بێت زاتی دین ئەوەیە کە عەرەز نییە بەبێ ئەو دین نییە گۆڕانی دەبێتە نادینی کەواتە زاتی ئیسلام ئەوەیە کە ئیسلام بەبێ ئەو ئیسلام نییە و لابردنی دەیگۆڕێت بۆ دینێکیدیکە..[٩٤] د. سروش دەیەوێت پێمانبڵێت هەموو ئەو بڕیارانەی لەگەڵ عەقڵی مرۆڤدا نایەنەوە یا ڕاستر بڵێین تایبەت بوون بە سەردەمێکی دیاریکراو و ڕەچاوی بارودۆخی ئەو کاتەیان کردووە بڕیاری عەرزین و لە هەناوی ئایینەوە

سەرچاوەیاننەگرتووە بۆنموونە بابەتی بەکۆیلەکردن کە رای بەشێك لە ئوسولییەکانی لەسەر ئەوەیە بەپێی زەمەن نەسخبوونەتەوە و ئیسلام سەرچاوەکانی بنبڕکردووە، بەڵام ئایا ئەوحاڵەتە تاچەند سەدە پاش هاتنی ئیسلام بەردەوامبوو، بەڵام ئێستا هیچ تەوژم و قوتابخانەیەکی تەفسیری نایەوێت ئەوبابەتە بخاتەوە بەرباس و لێکۆڵینەوە.. تەنانەت مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە فیقهەکەیدا هەستاوە بەلابردنی ئەو چەمکە و گۆڕینی بۆئەوەی بەکارینەهێنێتەوە.. لەلایەکیدیکەوە هەر خودی هەبوونی ناسخ و مەنسوخ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەشێك لە قورئان موراعاتکردنی بارودۆخ و موداراکردن بووە. ئالێرەوە هەموو ئەو موداراکردن و عەرەزیاتانە دەتوانرێت بگۆڕدرێن بە عەرەزیاتیدیکە بەبێ ئەوەی زاتی ئایین بگۆڕێت..[٩٥] هەربۆیە هەموو ئەحکامە کۆمەڵایەتییەکانی شەرع لایەنێکی کاتییان هەیە، مەگەر ئەوەی پێچەوانەکەی بسەلمێت، ئەڵبەتە فەقیهەکانی ئێمە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نایەنەوە مەگەر پێچەوانەکەیان بۆ سەلمابێت ئەوان پێیانوایە ئەحکامە شەرعییەکان جاویدان و سەرمەدین، بەڵام لێکۆڵینەوە مێژووییەکان لەبارەی پێکهاتن و فۆرمەلەبوونی ئیسلام و فیقهی ئیسلامییەوە ئەوەیاندەرخستوە کە ئاراستەکە بەشێوەیەکیدیکە بووە واتە شارع ئەحکام و موقەرەراتی بۆ کۆمەڵگای عەرەبی ئەوکات داناوە ئەوانەش لە سەردەمی خۆیدا عەدالەتیان تەحیقیقکردووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نییە کە ئەو موقەرەڕاتانە باشترین موقەرەڕات بن بەدرێژایی مێژوو.[٩٦]

جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو لای ئەم بیرمەندانە بەشێکن لە عەرەزییاتەکانی ئیسلام و پەیامی هەناوی ئایین نین قورئان بۆ گەلێك دابەزیوە کە جیاوازیکردن لەنێوان ژن و پیاودا یا لەنێوان نێر و مێ بەشێکبووە لە رۆشنبیری و سیستمی کۆمەڵایەتییان.. ئاساییە ئەو جیاکارییە لە قورئاندا رەنگیدابێتەوە بەڵام هەڵە لەوەدایە ئەو جەدەلییەتی وەك ئەوە تەماشابکرێت کە شەریعەتی خوایە،[٩٧] هەربۆیە بۆئەوەی ئێمە بتوانین بگەینە تەفسیرێك کە رەوانبێت لەگەڵ رۆحی سەردەمدا پێویستمان بەوەیە تێڕوانینی کەلامیمان پێش تەفسیر بگۆڕین تاوەکو بگەینە پێشگریمانەی سەردەمیانە بۆ ئافرەت.. هەرکاتێك ئەو پێشگریمانانەمان نوێبوویەوە ئیدی تێڕوانینی نوێ بۆ ژن لەگەڵ مافی کۆنی ژندا دژیەکن.[٩٨]

سیاقی مێژوویی دەق لای ئەبو زەید و گەشەکردنی ئەزموونی نەبەوی و کرانەوە و داخرانی تیۆری شەریعەت لای سروش و لای د. مستەفا مەلەکیان لە نموونەیەکی ناوازەدا خراوەتەڕوو ئەویش بەوەی دەیچوێنێت بە باوکێك کە خاوەنی باغێك بووە و کرێکارێکی بۆ





گرتووە و مەرجیکردووە لەگەڵ کرێکارەکەدا هەموو ساڵێك هەزار تومان بۆ مووچەی ئەو کرێکارە زیاددەکات، کرێکارەکەش لە یەکەم ساڵدا هەموو مانگێك تەنها هەزار تومانی وەرگرتووە، بەڵام پاش دەساڵ مووچەی مانگانەی ئەو کرێکارە بووەتە دە هەزار تومان لەوکاتەدا ئەم باوکە دەمرێت. منداڵەکانی دەبنە دوو بەشەوە بەشێکیان پێیانوایە پێویستە ئێمە دوا هەنگاوی باوکمان بە پیرۆز تەماشابکەین و ئەو کرێکارە لەسەر مووچەی دە هەزار تومانی بهێلینەوە، بەشی دووەمیشیان پێیانوایە پێویستە لەسەر مەساری ئەو گەشەکردنە بچین کە باوکمان ساڵانە لەسەری دەڕۆشت، ئەو دوو گروپەش دەچوێنێت بە گروپی موحافیزکار و نەریتگەراکان لەگەڵ ریفۆرمیست و نوێگەراکان،[٩٩] ئەو تێڕوانینەی سروش و مەلەکیان و ئەبو زەید دەتوانرێت بەمشێوەیەی خوارەوە لیکبدرێتەوە کە پێیانوایە شەریعەت پێویستە لەسەر مەساری گەشەپێدان و بەردەوامبوون لەسەر بڵاوبوونەوە بەردەوامبێت تاوەکو بتوانێت خواستەکانی مرۆڤی سەردەم وەدیبهێنێ.

### لەبری تەئویلکردن بونیاتنانی تەفسیری ئەخلاقی و مەعنەوی

پڕۆژەی تەفسیرکردنی هەریەکە لە نەسر حامد ئەبو زەید و عەبدولکەریم سروش بۆ ئایین لەگەڵ کۆمەڵێك پرسیاری جەوهەری دەرگیردەبێت کە پێدەچێت گومان لەسەر شەرعییەت و مەوزوعیبوونی دروستبکات، چونکە لانیکەم بەڵگەیەك بۆ وەها تێڕوانینێك نییە. ئەمەش بە مانای سفرکردنەوەی هەوڵ و ماندووبوونی ئەو دوو بیرمەندە نایەت. هەردوو بەڕێزیان درگایەکی گەورەیان بەڕووی عەقلانییەتی تەفسیریدا کردووەتەوە، بەڵام ئایا تەرحکردنی زاتی و عەرەزی ئەدیانی عەبدولکەریم سروش و تەفسیری سیاقی مێژووی ئەبو زەید سنووریان لەکوێدایە؟ ئایا کامە زاتییە و کامە عەرەزییە بەتەنها بەوە ئیکتفادەکات بڵێین زاتی ئەوەیە کە ئایین بێ ئەو دەگۆڕێت یان ئایا چ بەڵگەیەکمان لەبەردەستدایە کە هەندێك ئایەت کە جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا دەکەن وەك سیاقێکی مێژوویین و ئەوانەشیان کە باس لە یەکسانی دەکەن پەیامی ئایینن؟ یانخۆ ئەوەی محەممەد حسێن فەزلوڵڵا دەڵێت ئەوەی لەگەڵ عەقڵدا نەیەتەوە تەئویلیدەکەم..[١٠٠] ئالێرەوە ئەمجۆرە تەفسیرکردنە یا راستر بڵێین تەئویلکردنە ناتوانێت بونیادی بنەمایەکی تەفسیری و فیقهی بنێت کە بتوانێت تەرحی نوێی بۆ داهاتوو پێبێت و بشتوانێت قەناعەت بە ئایینداراکان بکات، بەڵام دەکرێت جەخت لەسەر تەفسیری ئەخلاقی و مەعنەوی بکرێتەوە چونکە کۆمەڵگای دینی شتێکی جیاواز لە کۆمەڵگای ئەخلاقی نییە.[١٠١]

لەمبەشەدا هەوڵدراوە لەڕووی کەلامییەوە کار لەسەر تەفسیری ئەخلاقییانە بۆ پرسی ژن بکرێت و ڕەچاوی ئەو بنەما ئەخلاقی بکرێت کە لەنێوان ژن و پیاودا، ژن ژن بێت و پیاو پیاو بێت.. بەهای ئەخلاقی ئەوەیە هەموو کەسێك خۆی بێت،[102] هەروەها نابێت ژن لە بازنەی ژنبوون و پیاو لە بازنەی پیاوبوون بېرێنەدەرەوە، بەڵام ئەگەر ئەوەمان قەبوڵکرد دوو ئەرکمان دەکەوێتەسەر شان یەکەم پێناسەی بازنەی ژن بوون و پیاوو بوونن دووەمیش ئەوەیە هەر پێناسەیەك پشت بە زانستی سەردەم و بنەما و فەرهەنگی ئێمە دەبەستێت. واتە هیچ پێناسەیەکی سەربەخۆ لە فەرهەنگی سەردەممان نییە بەمهۆیەشەوە ئەم پێناسانە گۆڕاوون، ئەو دەرئەنجامانەش کە پارێزەری ئەم کامڵبوون و داخوازییانەن بەهۆی گۆڕانی پێناسەکەوە دەگۆڕێن، ئەمەش بنەمایەکە چ لەبارەی ئیسلامەوە چ لەبارەی قوتابخانەیەکیدیکەوە ڕاست دەردەچێت.[2]

تەفسیری ئەخلاقی شتێکی جیاواز لە ڕەچاوکردنی عەدالەت نییە خودی عەدالەت واتە هەستان بە بەها ئەخلاقییەکان،[103] لەوەش زیاتر عەدالەت تەنها هەستان بە بەها ئەخلاقییەکان نییە بەڵکو عەدالەت تێکڕای بەها ئەخلاقییەکانە،[104] بەڵام ئەوەی لێرەشدا مایەی قسەلەسەرکردنە خودی عەدالەت چی، ئایا عەدلەت چەمکێکی نەگۆڕە و لەهەموو سەردەمەکاندا خاوەنی یەك خەسڵەت و پێناسەیە یانخود پێناسەی عەدالەت بەپێی زەمەن دەگۆڕێت؟ بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونەوە کە پێیوایە عەدالەت هەمان ئەو عەدالەتەیە کە ١٤ سەدە لەمەوپێش پەیڕەوکراوە و گۆڕانی بەسەردانایەت ئێمە پێناسەیەکی دیاریکراوومان نییە بۆ عەدالەت نەك بەتەنها لە کەیسی ژناندا بەڵکو لە سیستمی سیاسی و ئابووریشدا عەدالەت پێویستە لە هەرسەردەمێکدا بۆخودی مرۆڤەکانی ئەوسەردەمە بگەڕێتەوە،[105] عەدالەت چەمکێکە لەدەرەوەی دین کە هەمیشە قەیرانێك لە فیکری دیندا هەیە بەوەی دوو جەمسەرییەك لە فیکردا هەیە کاتێك دەوترێت چەمکێك لەدەرەوەی دینە وا هەستدەکرێت دژی دینە،[106] کەواتە لە تەفسیری ئایینیدا بۆئەوەی بتوانین ئایین سازگاربکەینەوە لەگەڵ ڕۆحی مرۆڤی سەردەمدا پێویستە لەبری سیستمی سروشتی کار لەسەر سیستمی عەدالەت بکەین،[107] عەدالەت وەك بەردی بناغەی هەموو ئەحکامە شەرعییەکان تەماشابکەین و هەر حوکمێك خاوەنی وەها خسوسییەتێك نەبێت ڕەتبکرێتەوە، هەرچەندە دەکرێت لە سەردەمێکدا عادلانەبووبێت.[108]





ئەمەش وەك پێداویستییەکی دینی تاوەکو دین بەردەوامبێت لەئاڕاستەکردنی خەڵکدا پێویستە عەدالەت پەیڕەوبکات، عەدالەتیش مانایەکی دونیایی هەیە هەرئەوەش وادەکات شەریعەت لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا وەڵامی مانا دونیاییەکانی عەدالەت بداتەوە،[109] ئەمەش وادەکات لەدووبارە سیاغەکردنەوەی فیقهدا بڕیاری جیاوازتر بەرهەمبهێنرێت فەتوای جیاوازتر بەرهەمبهێنرێت. پێویستدەکات شەریعەت لەڕووی لۆژیکەوە حەقیقەت بێت و لەڕووی ئەخلاقەوە قەبوڵکراوبێت، بۆنموونە ئەگەر لە ڕۆژگارێکدا ئەوە قەبوڵکراوبێت کە مرۆڤی زیناکار هەتاوەکو دەمرێت بەردبارانبکرێت ئەوا هەستی عەدالەتخوازی ئەمڕۆ ئەوە قەبوڵناکات،[110] ئەم هەستە لەدەرەوەی ئایینەوەیە وەك مرۆڤ هەرئەو هەستەیە بڕیار لەبارەی ئایینەوە دەدات. ئەوکاتەی کە (دوعا) بەشێوەیەکی نامرۆییانە لەلایەن کۆمەڵێك کەسەوە تیرۆرکرا لە بەرنامەیەکی تایبەت بەو کەیسەدا کە لە ڕادیۆی یەکگرتوو کەناڵی هەڵەبجە ئەو پرسیارە لە من کرا ئایا هەستت بەرامبەر ئەو کارەساتە چۆنە منیش وتم: هەستم وەك هەستی ئەو ناموسڵمانانەیە کاتێك دەبینن ئافرەتێك یا پیاوێکی موسڵمان بە پاساوی زیناکردن بەردباران دەکرێت لەلایەن موسڵمانەکانەوە. پێدەچێت منێکی موسڵمان نەتوانم ئەو هەستە بۆخۆم دروستبکەم هەرچۆنێك ئەو هاوڵاتییە یەزیدییانەی ئەو هاوڵاتییەیان بەردبارنکرد بە پاساوی گۆڕینی دین نەیاندەتوانی ئەو هەستەی ئێمەی موسڵمان بۆخۆیان دروستبکەن، چونکە ئەگەر ئەوان وەك ئێمە دەرکی ناشیرینی و ڕەشی ئەو کارەیان بکردایە بەناوچاوی ئایینەکەیانەوە، بەدڵنیاییەوە ئەو کارەیان نەدەکرد، چونکە ناتوانین ڕۆحییەتی عەدالەتخوازی لە خۆماندا بکوژین بە پاساوی ئەوانیدیکە. ئالێرەوە ئایین دەتوانرێت لەگەڵی ئەوانی نائایینیدا لەسەر پێناسەیەك بۆ عەدالەت ڕێکبکەوێت کە ئەوەش تاکە زامنی تەفسیری گونجاو و سەردەمییە بۆ ئایین.

ئەم تەفسیرکردنە لای د. محسن کەدیوەر بە تەفسیری مەعنەوی دەناسێنرێت، چونکە هەموو ئەحکامە ئیسلامییەکان لە سەردەمی دابەزینیاندا خاوەنی ئەو خەسڵەتە بوون عادیلانەترینبوون و عەقڵانیترینبوون و باشترین چارەسەربوون بە ڕای د. محسن کەدیوەر پێیوایە ئەم تەفسیرە تەفسیرێکی ئامانجگەرایانەی ئایینە و ئامانجەکانی ئایین دێنێتەدی جگەلەوەش ئەو سێ خەسڵەتە پاساوی بوون و مەرجی مانەوەی ئایین بوون.[111]

ئەحکامە ئیسلامییەکان لە سەردەمی دابەزیندا عادیلانە، عەقڵانی، باشترینبوون هەبوونی ئەو خەسڵەتانە لەو ئەحکامانەدا وایدەکرد کەسانی ناموسڵمان باوەڕپێبهێنن

هەرئـەوەش وادەکـات بڵێـین عـەقڵانیبوون و عـادیلانـەبوون و باشـتربوون لـەدەرەوەی ئاییـنـەوەن، مەبەستیش لەئەوەی کە لە هەندیك ئەحکام لە ساتی دابەزیندا عادیلانەبوون و مەرج نییە ئێستا عـادیلانە بن دەتوانین ئاماژە بە ئەحکامی عەبد و کۆیلـە بکـەین، ئایـا هیـچ کەسـێك دەتوانێـت ئێستا هەبوونی عەبد بە عـادیلانە بزانێت، لەکاتێکدا لە رابردوودا ئەوە بەهیچ شـێوەیەك مایـەی قسە لەبارەکردنەوە نەبووە، ئایا ئەحکامی جلوبەرگی جیاواز لەنێوان ئـازاد و بەنـدەدا دەتوانرێـت ئێستا هیچی لەبارەوە بوترێت، وتە بەناوبانگەکـەی حـەزرەتی عومـەر سـەبارەت بـە ئـازادی کـە دەڵێت: (متی استعبدت الناس و قـد ولـدتهم امهـاتهم احـرارا) ئایـا لەوسـەردەمەدا خەڵکانێـك نـەبوون بەنـدەبوون لەکاتێکـدا هـەموو کەسـێك بـە ئـازادی لەدایکـدەبێت. ئـەو وتەیـە لـەڕووی تیۆرییەوە هیچی کەمنییە لە بەنـدەکانی مـافی مـرۆڤ، بـەڵکو زۆر بەنـد دەتـوانن تەفـسیری ئـەو بۆچوونە بن، بەڵام لە ئاستی پراکتیکدا ئایا جیاوازی نەبوو لەنێوان بەنـدە و ئـازاددا؟ لەکاتێکـدا هـەبوونی بەنـدە لـە هـەر سیـستمێکی ئـەم سـەردەمەدا مۆرکـی عـادیلبوونی لێدەسـێنێتەوە، جگەلەوەش دەتوانین بڵێین باشترین چارەسەربوون لەوسۆنگەیەوە کـە ئیـسلام لـە دەسـکاریکردنی نەخشەی ئەخلاقی مرۆڤەکانی ئەوسەردەمەدا باشترین ئەحکامـەکانی قـەبوڵکردوون هـەر ئـەوەی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمێت: (انما بعثت لاتمم مكـارم الاخـلاق) باشـترین بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی پێغەمبەر هەستاوە بە گەشەپێدان و تەواوکردنی بەها ئەخلاقییە بووەکانی ناو کۆمـەڵکا. ئەگـەر نموونەیەکی روون لـەوبوارەدا بهێنینـەوە و پاشـتریش لێیـەوە ئـەو بابـەتی شـیکاربکەین دەتوانـین نموونەی مۆدێلەکانی زەواجی پێش هاتنی ئیـسلام روونبکەینـەوە و بـەوەی زیـاتر لـە مۆدێلێکـی زەواج هەبوون لە سەردەمی دابەزینی ئیسلامدا، بەڵام ئیسلام تەنها یەك مۆدێلـی لـەو مۆدێلانـە قەبوڵکرد ئەو زەواجانەش:

- زەواجی بەعولە بەوشێوەیەی کە پاش هاتنی ئیسلام برەوپێدرا.
- نیکاحی موشارەکە (رهط) ئەوەش لەیەککاتدا ژنێك دەبوایە ژنی چەند پیاوێك پاش منـداڵبوون منداڵەکە لە هەریەکێکیان بچوایە دەبوویە منداڵی ئەو.
- نیکاحی (الاستبضاع) ئەوەش ژنانیان دەنارده لای پیاوانی پێکەوتوو تاوەکو منالّی پێکـەوتیان ببێت
- نیکاحی (المقت) کوڕێك ژنەکەی باوکی دەبرد بۆ خۆی
- نیکاحی شغار (ژن بەژن)
- نیکاحی (الالتیاط) ئەمەیان جۆرێك بووە لە لەشفرۆشی.(١١٢)





دەبینـین لـەناو ئـەو مۆدیلانـەی زەواجـدا پێغەمبـەر (د.خ) باشـترینیانی قـەبوڵکردووە هـەروەك خێزانـە خانـەدان و شـەریفزادەکانی پێـش ئیـسلامیش هـەر لەسـەر ئـەو بنەمایـە زەواجیانکردووە.

## دەر ئەنجام

توێژینەوە لەبارەی مافەکانی ئافرەتەوە لە تەفسیری ئیسلامیدا بە یەکێك لەپڕکێشمەترین بابەتەکانی ناو فیکری دینی دەزانرێت، چونکە زیاتر لە تەوژمێك و مۆدێلێکی تەفـسیریی بوونـی هەیە. زیاتر لە پێشگریمانەوە و پێش زانینێك رۆڵی لەدیاریکردنی ئەو مافانـەدا بینیـوە. بەشـێك لە موفەسیرین و بیرمەندە ئیسلامییەکان زیاتر جەخت لەسەر بـەراوردی نێـوان مـافی ئـافرەت لـە ئیسلام و ئایین و شارستانییەتە کۆنەکاندا دەکەن و پێداگری لەسەر ئـەوە دەکەنـەوە لانیکـەم ١٢ سـەدە پێـش شارسـتانییەتی رۆژئـاوا ئیـسلام دانـی بـە کیـانی ئافرەتـدا نـاوە و سـەلماندوویەتی لەبەرامبەردا نوێگـەراکان پێیانوایـە لـەپێش بوونـی (پێـشەڕەوبوونی) شارسـتانییەتی ئیـسلامی دەبێت ئیلهامی هەمیشە لەپێش بوونمانی بەردەوامان(پێشەڕەویکردنی بـەردەوامان) پێبەخـشێت، چونکە هیچ مەعقولییەتێکی تێدانییە ئێمە هەمیشە شانازی بـە رابـردووەوە بکـەین لەکاتێکـدا ئەمڕۆ بتوانین هەمان سەروەری بەپێی رۆژ دووبارەبکەینەوە هەربۆیە لە ململانێی و رەتکردنەوەی یەکتردان.

لەم توێژینەوەیەدا کار بەو ئاراستەیە کـراوە کـە ئـەوە بـسەلمێنرێت ئـەوە بەتـەنها خـودی دەقـەکان نـین بڕیـار لـەبارەی مـافی ئافرەتـەوە دەدەن، بـەڵکو هـەموو ئـەو پێـش فـەهم و پێـش گریمانانەش رۆڵیان هەیە لـەو تەفـسیرەدا کـە بـە بەدیهییاتـەکانی سـەردەم دەزانـرێن و لەهـەموو سەردەم و کاتێکدا نوێدەبنەوە.. هەربۆیە هەموو ئـەو تەفـسیرانەی ئیـدعای گەشـتنە مەقـسەدی شـارع دەکـەن جگەلـە وەهـم هیـچیدیکە نـین، بـەڵکو ئـەوە حەقیقەتێکـە دەقـەکان لـە رێگـەی تەفـسیرەوە مانادەبەخـشن و تەفـسیرەکانیش تـەپوتۆزی مـرۆیین بەسـەر دەقـە ئیلاهییەکانـەوە.. هەربۆیـــە بابـــەتی کێـــشەی ئـــافرەتیش وەك هـــەموو بابەتەکانیدیکـــە مەترەحـــە بـــۆ زیاتـــر قـسەلەبارەوەکردن و تەفـسیرکردنی بـە رۆحـی سـەردەم جگەلـەوەش دەتوانرێـت بوترێـت هیـچ تەفسیرێك ناتوانێت هەتاهەتایە خۆی بە تەفسیری فەرمی و نموونەیی قورئان و فـەرموودە بزانێـت و چونکە هیـچ موفەسـیرێکمان نییـە هێنـدە سـەرکەوتووانە تـوانیبێتی تەفـسیربکات و هـەموو

بۆشایی و گریمانەکانی دەقی دۆزیبێتەوە هیچ دەقێکیشمان نییە هێندە داخراوبێت تەنها یەك دەروازە و کەلەبەری هەبێت لێیەوە بتوانین ماناکانی کەشفبکەن ئەمە سەرەڕای ئەوەی دەق و زمان بۆخۆیان مێژووکردن و بەدرێژایی مێژوو لە گۆڕاندان.

سەبارەت بە مافی ئافرەتیش دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ئەفسانەی مافی کۆتایی جگەلە وەهمی داخراو هیچیدیکە نییە چونکە ماف جێگیر نییە و وەها بۆچوونێکیش بەڵگەی نەشارەزاییە لە ماف، هەروەها لەم توێژینەوەیەشدا کار بە ئاراستەی ناساندنی تەفسیری مێژووگەراکان و نوێگەراکان و تەفسیری ئەخلاقی و مەعنەوی و ئامانجگەرایانەی ئیسلام کراوە لەمەڕ بابەتی ژن. هەروەك چۆن رەخنە لە مێژووگەراکان کراوە کە دەیانەوێت تەفسیری پێشینان و بنەما و سنوورەکانی وەك موقەدەس تەماشابکەن و رۆڵی مێژوو لە بونیاتنانی دەقدا فەرامۆشبکەن، هەروەها دەیانەوێت سیاق و کلتور و تێگەشتنی جیهانێك بەسەر جیهانێکیدیکە و مرۆڤانێك بەسەر مرۆڤانێکیدیکەدا بسەپێنن و بوونەتە پاساوی دەستی تەوژمی ئیسلامۆفۆبیا و مەکانەتی ئافرەت لە مەکانەتی حەقیقی و خەونی دینی و مەعنەوی پێغەمبەرەوە دابەزێنن بۆ ئاستێك کە هیچ کەسێك ئاواتی پێناخوازێت، هەورەها رەخنەش لە نوێگەراکان گیراوە بەوەی پێشگریمانەکانی خۆیان دەکەنە سەنتەری تەفسیر و پێوەرێکی روونیان بۆ ناساندی سیاقی مێژوویی و زاتی و عەرەزی ئەدیان نییە. نوێگەراکان هەموو پێشگریمانەکانیان شارستانییەتی رۆژئاوایە، ئەوەش شارستانییەتی ئیسلامی وەك شارستانییەتێك کە پێویستی بە دووبارە بونیاتناوە هەیە کە تەرحی پێبێت بۆ مرۆڤ و خزمەتی مرۆڤایەتی بکات دەکاتە ژمارەیەکی بێوەزیفە لە تەنیشت شارستانییەتێکیدیکەوە.. هەرچەندە ئەو بیرمەندانە رۆڵێکی عومەدەیی و مەزنیان لە ئاراستەکردنی تەفسیر بەرەو مەساری نوێبوونەوە گێڕاوە. لەبەرامبەردا تەفسیری ئەخلاقی و مەعنەوی وەك بەدیل باسی لێوەکراوە. ئەوەش وەك خەسڵەتێك هاوسەنگی تەفسیری ئایینی کە هاوسەنگی لەنێوان مەعنەوییەت و عەقڵانییەتدا رادەگرێت، مەعنەویبوون خوازیاری هەمان عەقڵانی بوونە کە پێویستە لە تەفسیری دەقدا رۆڵبگێڕێت ئەوەش لەو سۆنگەیەوە کە هەم ئایین دەرکەوتەیەکی ئەخلاقی و مەعنەوییە و هەم دەشتوانێت تەفسیری نوێ و ئامانجگەرایانەی بۆ ژیانی ئەم سەردەمە پێبێت.

ئەم توێژینەوەیەش ئەو دەرئەنجامانەی لێدەخوێندرێتەوە کە خەونی کۆمەڵگای دینی و مەعنەوی گەورەترە لە توانای مرۆیی ئامانجە مەزنەکانی ئایین هەموویان لە کۆمەڵگایەکی





دیاریکراودا بەرجەستەنابن. ئامانجە خواییەکانی گەورەتر و بێسنوورترن لە توانا مرۆییەکان، ئەوەش لە مێژوی ئایینەکاندا لە باشترین دەرفەت و زێڕینترین چرکەساتەکاندا هاتووەتەبوون هیچ نین جگەلە توانای راهاتنی مرۆڤەکان لەگەڵ ئەو پەیامانەدا هیچ نین جگەلە قەترەیەکی کەم لە دەریای پڕشەپۆل و مەزنی رەحمەتی خوایی، هەرئەوەش وامانپێدەکات بیرکردنەوە لە دووبارە سیاغەکردنەوەی کۆمەڵگا لە شێوەی کۆمەڵگایەکیدیکەدا هیچ نەبێت جگەلە دەسگرتن بە ئیمکانییەتی مرۆییەوە بۆ تەحیقیقکردنی بەشێك لە مەقاسیدە ئیلاهییەکان نەك دەسگرتن بە بێسنووری رەحمەتی خواوە بۆ ئارامش و شادیبەخشین بە مرۆڤەکان.

❊❊❊

## سەرچاوەکان


### کتێبەکان

١. قورئانی پیرۆز
٢. ابو علي المودودي. الحجاب. دار الفكر للطباعة و النشر و التوزيع
٣. جمال البنا، المرأة بين تحرير القران و التقيد الفقهاء. دار الفكر الاسلامي ١٩٩٨. شارع جيش بالقاهرة
٤. حسن حنفي. من النص الي الواقع. الجزء الاول تكوين النص، ٢٠٠٣
٥. عبدالكريم سروش اين شهرياري و ئايين ديندارى، نوبت ضاث دوم. ١٣٨٤ ه ش . تهران، مؤسسة فرهنطي سراط
٦. عبدالكريم سروش. قبض و بسط تيوري شريعت نظرية تكامل معرفت دينى . نوبت ضاث نهم . بهار ١٣٨٦ ه ش .تهران، مؤسسة فرهنطي سراط
٧. عبدالكريم سروش. ئايين در اينة. تدوين طرد اوري سروش دباغ، تهران مؤسسة فرهنگى سراط . چاپ دووم .١٣٨٥ هـ ش
٨. عبداهادي عبدالرحمن. سلطة النص. قراتفي توظيف النص الديني.الطبعة الاولي ١٩٩٨.مؤسسة الانتشار العربي، بيروت
٩. کۆمەڵێك نووسەر. كدام اجتهاد دربارة كار امد فقة اسلامي در دنياي امروز. چاپ دووم ١٣٨٤ ه ش، ناشر طرح نو، تهران
١٠. کۆمەڵێك نووسەر. في قرات نص الديني. الطبعة الثاني ١٩٩٠. دار التونسية للنشر
١١. محمد صادق عفيفي. المرأة و حقوقها في الاسلام، ١٤٠٢ ه، مطبوعات رابطةالعالم الاسلام
١٢. محد الغزالي. قضايا المرأة بين التقاليد الراكدة و الوافدة. دار الشروق
١٣. محمد حسين فضل الله دنيا المرأة.الطبة الثانيية ١٩٩٧، دار الملك بيروت
١٤. محمد قوتب. واقعنا المعاصر
١٥. محمد مجتهد شبستري. نقد بر قرات رسمي از دين (بحرانها،ضالشها، راة حلها. چاپ سوم ١٣٨٤ ه ش، ناشر طرح نو، تهران
١٦. محمد مجتهد شبستري. هرمنوتيك كيتاب سنت
١٧. نصر حامد ابوزيد، دوائر الخوف. قراءة في خطاب المرأة. الطبعة الثالثة ٢٠٠٤، الناشر دار الفكر العربي. بيروت

### گۆڤارەکان

١. تحسین حەمە غریب، عدالت رۆحی شەریعەتە. گۆڤاری هەژان. ژمارە ٢٠
٢. مستەفا مەلەکیان. وەرگێڕانی مریەم محەممەد. هەژان ژمارە ٢٠
٣. احمدی واعضی.درامدی بر هرمنوتيك . كتاب نقد . سال ششم .شماره ٢٣

### ئینتەرنێت

١. iicwc.org/lagna/iicwc/iicwc.php?id=335
٢. ايت قنبرى. هرمونتك. باشگاه انديشه
٣. صحيح البخاري - الصفحه أو الرقم ٣٣٦٨ خلاصه حكم المحدث (صحيح) لە مەوسوعەی در السنه وەرگیراوە
٤. معركه تحرير المرأه السعوديه..موثق بالأدلة صيد الفوائد
٥. همايون همتى، هرمنوتيك مسئلەفهم. ویبسایتی نورپورتال
٦. محمد فاطمي .هرمنوتيك و فلسفه .www.fatemi.ir
٧. محمد مجتهد شبسترى. هرمنوتيك تفسيرى دينى از جهان. ویب سایتی مەعناگەرا

### کاسێت

١. ناصری سوبحانی. مافی ئافرەت.

# ڕێکخستنە سیاسییەکانی باکووری کوردستان

## ١٩٦٠-١٩٨٠

ماجد خەلیل

**بەشی یەکەم**

**تورکیـای قۆنـاغی فـرە پارتایـەتی و دەسـتپێکردنەوەی جووڵانـەوەی سیاسـیی و ڕووناکبیریی کورد**

**باسی یەکەم: تورکیای قۆناغی فرە پارتایەتی و شوێنی کورد لـە گۆڕانـە نێوخۆیـی و دەرەکییەکاندا**

**یەکەم: گۆڕانکارییە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی تورکیای قۆناغی فرە پارتایەتی (١٩٥٠- ١٩٦٠)**

کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم، گۆڕانکاریی بەرینی لەسەر ئاستی جیهـان هێنایـەگۆڕێ، لەم نێوەندەدا دەسەڵاتدارێتی تورکیاش ناچاربوو لەبـەردەم ئـەم ڕەوشـە نوێیـەدا و ئـەم شـەپۆلی کرانەوەی دیموکراسییەدا گۆڕانکـاری لـە سیـستەمی سیاسـیی خۆیـدا بکـات. یەکـەم هـەنگاوی ملکەچکردن بـۆ داخوازییـە دیموکراسییەکان لـە تورکیـادا ئاماژەکـانی لـە حوزەیرانـی ١٩٤٥دا دەستیپێکرد. ئەویش بریتیبوولە هەڵبژاردنێکی ئازاد بـۆ ئەنجومـەنی نیـشتیمانی تورکیـا(*) کـە تێیدا بۆ یەکەمجار ئەم ئەنجومەنە ڕێگەیدا بە دامەزراندنی پارتی سیاسی و ڕێگەدان بە چـێکردنی سەندیکای سەربەخۆ لە نێوخۆی وڵاتدا، ئەم هەنگاوە بۆ یەکـەمجار بـواری لەبـەردەم وەشـانکردنی چەندین ڕۆژنامـە و گۆڤـاردا کـردەوە کـە بـەدەر لـە ڕۆژنامـەی پـارتی دەسـەڵاتدار بـۆ یەکـەمجار شەنوکەوی سیاسەت و ڕەوشی کیشوەریان دەکرد(١).





دیارە ئەم گۆڕانکارییانە هەوانتە نەبوو، بەڵکو بە فشاری وڵاتانی هاوپەیمانی سـەرکەوتوو لە دوای جەنگ، لە سەرووی هەمووشیانەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا فرەیی لە ڕامیاریـی تورکیـادا هێنایـەگۆڕێ، وەلێ لەڕاسـتیدا گۆڕانکارییـەکان لـە تورکیـادا بـە ئاراسـتە و ئەجێندایەکیترەوە دەگوزەرا، چونکە لە زەمینەی واقیعدا قۆنـاغی فرەپارتایـەتی پێـشکەوتنێکی زانستی لەتەك خۆیدا نەهێنابوو، لەبەرئەوە نێوەڕۆکی ئەم فرەدەنگییە لە واقیعی وڵاتدا سەبارەت بـە خواسـتە دیموکراسـییەکانی کۆمـەڵانی خـەڵکی تورکیـا و سـەبارەت بـە مەزهـەب و نەتـەوە جیاوازەکانی تورکیا تەنها مەکرێکی سیاسیی و هەڵخەڵەتاندنێکی ڕووکەش بـوو کـە لـە ڕژێمـی سیاسی نوێی تورکیادا ڕەچاو و پێڕەودەکـرا، بـەڵام ناکرێـت لـە دیـوی کاریگـەریی و دەسـکەوتە مەزنەکانی ئەم گۆڕانکارییەش بگەڕێین ئاماژەیانپێنەکـەین، چـونکە لەڕاسـتیدا ئـەو خەڵەتاندنـە ڕووکەشە لە میکانیزمی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگەی تورکیدا جموجوڵێکی هۆشیاریی و ئاگایـی وەهای هێنایەگۆڕێ کە پارتی گـەلی کۆمـاریی و پایـەو ڕیـشە پتـەوەکانی ئـەو هێـز و تەڤگـەرە پیرۆزەی تورکیای بۆ یەکەمجار لەرزاند و وەك کودەتایـەکی میللـی و وەك شـۆڕێکی سـپی بـەڕەی دەسەڵاتی لەژێر پێیان دەرهێنا(٢).

هاوکات لە دەرەوەی ڕامیاریی دەوڵەتیشدا و لە نێوخۆی پارتی گەلی کۆماریدا جۆرێ لـە کرانەوەی سیاسییترنجێنرایە پێڕەوی پارتەکەوە. ئیتر ئەم پارتە ڕازیبوو بـەو سیـستەمە ئابووریيـە کراوەیەی ئـەو سـەردەمە دەیخواسـت و هەنـدێ لـە خواسـتی سـەرمایەدار و بازرگانـە دیارەکانـی نێوخۆی وڵاتیشی هێنایەدی، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی لەنێو ڕیزەکانیدا پەرەیـسەند و بەشـێك لـە کادیرە دیار و بەرچاوەکانی جیابوونەوە و پارتی دیموکراتی تورکیایان دامەزراند(٣).

دامەرزاندنی ئەم پارتە لەکاتێکدا بوو کـە جـەلال بایـار(*١)لـە کـانونی یەکـەمی هـەمان ساڵدا لە پارتی گەلی کۆماری دەستی لەکار کێشایەوە و ئیـتر لەتـەك عـەدنان مەنـدەریس(*٢)و محەممەد فوئاد کۆپریللی(*٣)و ڕەفیق کور ئالتان پارتی دیموکراتی تورکیایـان دامەزرانـد(*٤)، بـەڵام پێش ئەوەی پارتەکە ڕابگەیەنن وەك پێرێکی بەرهەڵستکار لەناو پارتی گـەلی کۆماریـدا هەوڵـی ڕیفۆرمیـان دەدا و داوای گۆڕیـنی سیاسـەتی پارتەکـەیان دەکـرد و داوایانـدەکرد ئازادییـە سیاسییەکان فراوانتربکـرێن، هـەروەها داوایـان دەکـرد میتـۆدی پارتەکـە بگۆڕدرێـت و خواسـتی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازادیان گەلاڵەبکرێت، بەڵام ئەم هەوڵانە نەزۆك و ناکامبوون، چـونکە کۆنگرەی پارتی گەلی کۆماری ئەم بەرهەڵستکارییەی تێکڕا دایەدواوە و ئەنـدامێتی هەموویانـی

هەڵپەسارد[٤]. بەمجۆرە بە لەبەرچاوگرتنی یاسا نوێیەکانی دەستووری وڵات لە (٧)ی کانونی دووەمی ١٩٤٦ پارتی دیموکراتی تورکیایان لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسی بەرفراواندا راگەیاند[٥]. هاوکات ژمارەیەك لە ئەندام پەرلەمانەکانی سەربە کۆمارییەکان کە چینی خاوەن زەوی و سەرمایەدار و زەنگینەکان هاتنەڕیزی پارتە نوێیەکەوە، لێرەوە دەسپێکی کرانەوە بەرەو دونیای دیموکراسی لە سیستەمی سیاسیی تورکیادا بەشێوەیەکی رووکەش و فش هاتەگۆڕێ. لە سەرەتاوە ئەم پارتە بە ئامانجی فراوانکردنی لیبرالّیەت و ئازادیی لەژیانی سیاسیی تورکیادا وەك بزووتنەوەیەکی سیاسیی کەوتەجموجووڵ[٦].

وەلێ لە واقیعدا پێکهاتەی ستراکتۆری پارتی دیموکراتی تورکیا هەمان پێکهاتەی ستراکتۆری پارتی گەلی کۆماریی بوو، ئەمەش بەواتای ئەوەی گۆڕانی دیموکراسی لە تورکیادا ئاڵوگۆڕێکی رواڵەتی و رووکەشە، ئەمەش چاودێرانی سیاسیی لەوەدا پێشبینیان بۆدەکرد کە ئەو کۆتوبەندانەی کە ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە لە رێگەی دەستوری ساڵی ١٩٢٤دا داینابوون و پەیوەستبوون بە گروپی سیاسیی چەپ و کاری سیاسییان بە قەدەغەکراوی و وەك خۆی مابوونەوە، یاخۆ پارتی دیموکراتی تورکیا لەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە نەیار و دژکار نەبوو دەگەڵ پارتی گەلی کۆماری و هەمان ئەجێندای لە میتۆدەکەیدا حەشاردابوو[٧].. هەروەها هەموو ئەوانەش پارتی دیموکراتی تورکیایان دامەزراند نوێنەری ئەو خواستە نوێیانە بوون کە دەبوو داد و هانای خەڵکی بەشمەینەتی تورکیا بێت، وەلێ تارادەیەك توانیان بەربە شەپپوری تاکپەرستی و تاکپارتایەتی لە تورکیادا رابگرێت. بۆنموونە عیسمەت ئینۆنۆ[*٥] لەمەڕ پێویستی دەرکەوتنی رژێمی فرەپارتایەتی لە تورکیادا دەڵێ: "ئەگەر ئێمە لە (١٩٤٥ـ١٩٤٦ز) دەستپێشخەریمان لە جێگیرکردنی دیموکراسی نەکردبا ئەوا ووبەڕووی رووداوی خوێناوی دەبووینەوە[٨]". لەبەرئەوەی تورکیا لەبەردەم نائارامییەکی ئابووری و سیاسیی ناوخۆییدا دەژیا و هەیمەنەی سەرمایەداری وڵاتانی غەوارەیش دەیخواست بازارێکی ئابووری ئازاد لە تورکیادا قوتبکاتەوە[٩]. لەم نێوەندەدا پارتی دیموکراتی تورکیا داد و نارەزایەتیی خەڵکی چەندین ساڵ زەبوونی تورکیای خستە بەرنامەی کاریەوە بۆ گەیشتنی بەدەسەڵات، هەربۆیە بەردەوام بانگەشەی ئازادیی و دیموکراتی و رێگەدان بە دامەزراندنی پارت و سەندیکا مژووڵی کردبوو، بەڵام یەکێك لە خەمە گەورەکانی چینی ژێردەستی تورکیا بەرامبەر ئەم پارتە لە گۆڕەپانەکەدا بریتیبوولەوەی کە هەمیشە بەرژەوەندی بۆرژوا گەورەکان و دەرەبەگەکانی وێنا دەکرد، دیموکراتەکان لایەنگریی پێدانی





بوارگەلێکی فراوان بوو بە چالاکی تایبەتو رێگر نەبوون لە هاتنە ناوەوەی سەرمایەداری دەرەکیی. لەگەڵ ئەوەشدا لایەنگرو هەوادارانی ئەم پارتە روو لە نماکردن و زێدەبوون بوو، بەجۆرێك بڕیاربوو ١٩٤٧ هەڵبژاردنی نوێنەران ئەنجامبدرێت، بەڵام سەرانی پارتی گەلی کۆماریی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانیان پێشخست بۆ ٢١ی تەمووزی ١٩٤٦[١٠]، ئەمەش لە ترسی زێدەبوونی ژمارەی لایەنگران و دەنگی دیموکراتەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاکامی هەڵبژاردنەکەدا دیموکراتەکان ٦١ کورسی پەرلەمان و پارتی گەلی کۆماری ٤٠٤ کورسی پەرلەمانیان مسۆگەرکرد[١١]، ئەم ئەنجامە لە ماوەیەکی کەمدا و تەنها لە دوای شەش مانگ لە دامەزراندنی دیموکراتەکانەوە توانرا بەدەستبهێنرێت[١٢]، لەدوای ئەم قۆناغە ئیتر دیموکراتەکان چاویان لە هەڵبژاردنی ١٩٥٠ بوو بۆ بەدەستهێنانی دەنگ، هەربۆیە زێدەتر پێداگیرییان لە ئازادییە مەدەنییەکان دەکردەوە، بەتایبەتی کە دەیانزانی نەفرینی سەر ریفۆرمە ئاینییەکانی کەمالیزم سەرچاوەیەکی باشە بۆ وەدەستهێنانی دەنگ، ئەو سەرچاوەیەش لەو گوندەییانەوە بوو کە ٨٠٪ی خەڵکی تورکیایان پێکدەهێنا، دیموکراتەکان دەیانزانی ئیسلامی سیاسیی لە پاشەکشەدایە، بەڵام ئیسلامی میللی لەنێو خەڵکدا هەرماوە و باشترین چەکی ستراتیژی چنگخستنی دەسەڵاتە[١٣]. بەمجۆرە لە بانگەشەی هەڵبژاردندا پارتی دیموکرات ئاینیی کردە چەکی سیاسی[١٤]، مەندەریس بانگەشەیدەکرد ئایین بیروباوەڕی تورکەکانە، هەروەکو چۆن لە ئەوروپادا مەسیحییەت بیروباوەڕیانە و سیستەمی دەسەڵات عەلمانییە[١٥]، مەندەریس لە بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی ١٩٥٠دا بوێرانە دەیوت: "قۆناغی کەمالیی بەدامەزراندنی کۆماری تورکیا کۆتاییهاتووە، ئێمە لەگەڵ لایەنە باشەکانیداین و لە لایەنە خراپەکانی نابێ بێئاگابین، دەوڵەت بێئاگایە مەترسی بندەستکردنی لایەنە رۆحییەکانی کۆمەڵگا".. هەروەها پارتی دیموکرات لە کۆنگرەی ١٩٤٧دا ئاماژەی بەوەدا کە ئایین خۆراکی رۆحیی کۆمەڵگەی تورکیایە[١٦]. مەندەریس دەیوت: "پەشیماننابینەوە لە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، بەڵام تورکیا وڵاتێکی ئیسلامییە و بە ئیسلامیی دەمێنێتەوە، تورکەکانیش بیروباوەڕیان تەنها ئیسلامییە[١٧]".

پێمانوایە ئەم هەنگاوەی تورکیا بەرەو ئایین تەنها و تەنها وەك چەکێکی سیاسییەوە هەبوو، لەلایەکیتریشەوە پێوەندیی بە رەوشی جەنگی سارد و پشیتوانیکردنی خۆرئاواوە بوو بۆ ژینگەیەکی سەرمایەداریی و دژەسۆشیالیستی لەوجۆرە، بەدەر لەوەی هەنگاوێکیش بوو بۆ بردنەوەی گەمەی هەڵبژاردنەکان، هەنگاوێکیتری سیاسەتی پارتی دیموکرات بریتیبوولە سیاسەتی

ئابوورییدا، ئەوان لایەنگیریی ئابووری ئازاد بوون، خواستی پارێزگاریکردن لە پیشەگەر و بازرگان و گەورە خاوەندارەکانیان هەبوو، خۆیان بە پشتیوانی رۆشنبیرانی شارنشین و رۆژنامەنووس و چینی ناوەند دەزانی، هەموو ئەو چین و توێژانەش بەگەرمی پێشوازییان لەم هەنگاوانە دەکرد[١٨]. بەمجۆرە دیموکراتەکان لە دوو رێگاوە ویستی گۆڕانکارییان لە تورکیادا دەستپێکرد:

**یەکەم: تێگەیشتن و چەمکێکی نوێ بۆ سیکۆلاریەت و تێڕوانینێکیتر بۆ ئایین لە دەرەوەی کەمالیزم**

**دووەم: هەڵوێستی دیموکراتەکان لە پرەنسیپی دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری وڵاتدا[١٩].**

دیموکراتەکان مەبەستیان بوو واز لە سیاسەتی (ئیشتراکییەتی دەوڵەت) لە ئابووریدا بهێنرێ[٢٠]. ئەمەش پەیوەستبوو بە سەرەتایەك بۆ گەشەی سەرمایەداریی تورکی کە بەسترابوو بە سەرمایەداریی جیهانەوە[٢١]. ئەوەی تێبینیدەکرێ، ئەوەیە گۆڕانکارییە نێوخۆییەکانی تورکیا بەشێوەیەکی گشتی ئاراستەیەکیان نەگرت کە بۆ بەرژەوەندی گشتی دەسەڵاتی کەمالیزم مەترسیبێت، خواستەکان تەنها گۆڕینی دەسەڵاتێك بوو بۆ دەسەڵاتێکیتر تەنها لەڕواڵەتدا یان گۆڕینی رەنگەکان بوو[٢٢]، ئەگەرنا لەو گۆڕانەدا بەپێی یاساکان مۆڵەتی کارکردن تەنیا بە پارتە پارێزگارەکان درابوو، لەسەر ئەم بنەمایەش بوو ١٩٤٦ چالاکیی تەواوی پارتە چەپە تازە دامەزراوەکان قەدەغەکرا و وەستێنران، ئیتر هەموو پارتەکان دەبوایە لەسەر بنەمای چینایەتی و بەرژەوەندییە ئایینی و ئابوورییەکان دابمەزرێن، لەبەرئەوە لە بونیادی هەر پارتێکی تورکیدا جیاوازییەك بەدینەدەکرا، پارتی گەلی کۆماریش لە دەورەی نۆیەمیدا ٦٧٪ نوێنەرەکانی لە ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکیادا لە گەورە سەرمایەدار و خاوەن زەوییەکان بوون[٢٥]، لەبەرئەوە ئەم گۆڕانانە وەڵامدانەوەی بارودۆخی ناوخۆ نەبوون، بەڵکو وەڵامی گۆڕانکارییەکانی دەرەوەی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی خەڵکی تورکیا بوون. ئەم رەوشە رووکەشە بەردەوامبوو تا لە ١٤ی ئایاری ١٩٥٠دا هەڵبژاردنێکی سەرتاسەریی بەڕێوەچوو، لەئاکامدا دیموکراتەکان لە پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراودا توانیان سەرکەوتنی مەزن بەدەستبهێنن و ٤٠٣ کورسی لە کۆی ٤٨٢ کورسی مسۆگەربکەن، لەبەرامبەریشدا پارتی گەلی کۆماریی تەنها ٦٩ کورسییان داگیرکرد لە پەرلەماندا، لەدەرەوەی ئەوانیش سەربەخۆکان ٩ کورسیان پێبڕابوو[٢٦].





ئەم هەڵبژاردنە بە یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد لە تورکیادا دەهاتەئەژمار، بەجۆرێك رای گشتی خۆرئاوا بە بایەخەوە سەرنجی دەدا و لەگەڵ راگەیاندنی ئەنجامەکاندا عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆك کۆمار پاشەکشەی خۆی لە سەرۆکایەتی راگەیاند.[٢٥] لەڕاستیدا هەڵبژاردنەکەش زۆر بە پاکوپوختی بەڕێوەچوو، پارتی گەلی کۆماریی دەسەڵاتدار هیچ فشارێکی نەخستەسەر دەنگدەران و دەستیوەرنەدەدایە پرۆسەکەوە[٢٦]. بەجۆرێك دیموکراتەکان لەڕێگای قۆستنەوەی هەڵەکانی پارتی گەلی کۆماریی بۆ هەوەڵجار گەیشتە دەسەڵات، کە هۆکاری سەرەکی ئیستغلالکردنی هەستی ئایینی دانیشتوانی تورکیا و دۆخی ناڕازیبوونی خەڵك و وەڕسبوونیان بوو لە سیاسەتی چەندین ساڵەی پارتی گەلی کۆماریی[٢٧]. ئیتر لە حکومەتی نوێدا جەلال بایار بوو بە سەرۆکی کۆماری تورکیا و عەدنان مەندەریس بوو بە سەرۆك وەزیران و رەفیق کورئاڵتان بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، پۆستی وەزیری دەرەوەش درا بە محەممەد فوئاد کوپریللی.[٢٨]

لێرەوەو لەسەر ئاستی ناوخۆ و سیاسەتیی دەرەوەدا تورکیا ئامباز و رووبەڕووی رەوشێکی نوێ بوویەوە. سەرەتا لەمەڕ سیاسەتی نێوخۆ و گۆڕانکارییەکانی، بەجێگیربوونی دیموکراسی لە بوونی فرەپارتایەتیدا بەئاسانی دەتوانرا سەرنجی خەڵك بۆ چالاکییە سیاسییە ئامانجدارەکان رابکێشرێ، ئەمەیش بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە سەردەمی تاکرەویدا سیاسەت تایبەتبوو بە چینە شارنشینەکان، بۆنموونە هانتنگتۆن دەڵێ:"لە کۆماری تورکیای تاکرەودا گوندییەکان لە سیاسەت داماڵرابوون، هەربۆیە سیستەمی نوێی هاوپەیمانان نەیدەتوانی لەمبارەوە بێدەنگی هەڵبژێرێت، چونکە سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا دژی ئەو وڵاتانە بوون کە سیاسەتیان بە پیشەی چینە شارنشینەکان دەزانی"[٢٩] لەبەرئەوە بوو، عەدنان مەندەریس بەرگری لە راکێشانی چینی بەرفراوانی جوتیار و پاڵەی تورکیا دەکرد تا پەلکێشیانبکات بۆ مەیدانی سیاسەت، عەدنان مەندەریس دەیوت: "مادامەکێ کۆمەڵانی جوتیار و پاڵە پشتیوانمانن، رۆشنبیرانی ئەستەمبوڵ بۆشکەیەکی بۆش ناهێنن"[٣٠]. ئەمەش بۆخۆی نیازی گۆڕانەکان بەرەو دیموکراسیی دەخاتەژێر پرسیارەوە. دیارە لە زیهنی کۆمەڵانی خەڵکدا ١٤ی مایسی ١٩٥٠ رووخانی رژێمی دیکتاتۆری بوو، بەڵام ئەم کەوتنەی کەمالیزم دەرەنجامی بەرەنگاربوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو دەسەڵات بەرەنگاریی کۆمەڵگا بوویەوە و ئاراستەیەکیتری داپێی، لەبەرئەوە گۆڕانی سیستەم هیچ نەخرایە بەرباسوخواستەوە، لەڕاستیدا ئەنجامێکی سروشتی ئەم کارەش بریتیبوولەوەی کە حکومەتی نوێی مەدەنیی هەرگیز وەك

خاوەنێکی دروستی دەسەلات نەدەبووە خاوەنی مەرجە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان[٣١].

لە سەردەمی دیموکراتەکاندا گەلێك گۆڕانکاریی لە تورکیادا روویاندا، لەوانە گۆڕانکاریی لە بواری کشتوکاڵدا روویدا و سەرنجی جوتیاران بە بەرنامەوە راکێشرا، بەڵام هەرگیز جوتیار سوودمەندنەبوون لە بەرنامەی نوێی کشتوکاڵدا، هەربۆیە کۆچی بەرفراوانی جوتیار بەرەو شارەکان هێدیهێدی دەستیپێکرد[٣٢]، هەروەها لە سەرەتاوە سیاسەتی ئابووری توانی تەواوی کەمایەتییەکانی تورکیا لەسایەی خۆیدا کۆبکاتەوە، بۆنموونە کورد و یۆنانی و ئەرمەنی و جوولەکە و لاز، ئەمانە هەموویان لایەنگریی دیموکراتەکان بوون، چونکە یان جوتیار بوون یان بازرگان و پیشەوەر بوون و بێگومان بەرژەوەندییان لەگەڵ گەورە سەرمایەدارێکی وەك جەلال بایاردا هەڵدەسووڕا[٣٣]، چونکە بەپێشچاوەی پاڵە و جوتیارانەوە، حکومەت رێگەوبانەکانی چاکدەکرد و پشتگیرییەکی تەواوی زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵیی جوتیارانی دەکرد، بەجۆرێ لەو قۆناغەی سەرەتادا تورکیا توانی بۆ وڵاتانی ئەورووپا و رۆژهەڵاتی ناوەراست گەنم و لۆکە و چایی و ترێ بنێرێتەدەرەوە، هەروەها حکومەت چەندەها کارگە و کۆمپانیای دروستکرد لە شارە گەورەکانی وەك ئەزمیر و ئەستەمبوڵ، لەوانە کارگەکانی چنین و چیمەنتۆ و سابوون و میوە.. هتد، سەرمایەداری بەنەزم و تەوژمێك وڵاتی گرتەوە کە هەموو کۆڵانێك لە کۆڵانەکانی شارە گەورەکان ملیۆنێرێکی تێدا هەبوو[٣٤]. حکومەتیش پشتی بە رژێمی لیبراڵیی دەبەست لە کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازیدا، ئەمەش دواجار بووبە هۆی تەنگژەیەکی ئابووری و دارایی، ئەم رەوشە لەدوای هەڵبژاردنی ١٩٥٤دا وردەوردە تەنگژەکانی زێدەتر دەکرد، دیموکراتەکان لە هەڵبژاردنی ١٩٥٤دا، دەنگەکانیان زێدەتر بوون تا لە هەڵبژاردنی پێشوو بەجۆرێك توانیان ٥٠٢ کورسی پەرلەمان مسۆگەربکەن[٣٥].

ئەم سەرکەوتنە مەزنەیتریش لەوەوە بوو کە حکومەت ئابووریی کشتوکاڵی تا ئەوڕادەیە هەستاندبوویە سەرپێ کە تەواوی لادێییەکان کە٨٠٪ خەڵکی تورکیا بوون، ئاوی پاکیان بۆ برابوو یان رووبەرێکی فراوانی زەوییەکانیان پرۆژەی ئاودێری دەیگرتەوە، لەهەمووی گرنگتر بڕی قەرزی کشتوکاڵی لە١٩٥٠وە لە (٢,٥) ملیارەوە بەردەوام زیادیدەکرد، بەڵام هەڵەی کوشندەی ئەم بەرنامە ئابوورییە لەوەدابوو کە قەرزەکان زێدەتر بەر جوتیارە مامناوەنجی و گەورەکان دەکەوتن و بەشی هەرە زۆری جوتیارە هەژارەکان تەنها٣٠٠ ــ ٥٠٠ لیرەیان بە قەرز پێدەدا، بەشێوەیەکی گشتی لە تورکیادا ئاستی بەرهەمهێنان بەرزبوویەوە[٣٦]، بەڵام هەر ئەم سیاسەتە





ئابوورییەی تورکیا بەشێوەیەکیتر بوو بە هۆکاری تەنگژەیەکی ئابووریی نوێ، چونکە وازهێنانی دیموکراتەکان لە ئیشتراکییەتی دەوڵەت هۆکاری سەرەکیی کێشە ئابوورییە نوێیەکان بوو، بەمەش تەوژمێکی نوێی هەڵاوسان لە تورکیادا بەسەختی هاتەکایەوە[٣٧]، چونکە سەرەتا لە سیاسەتی پارتیدا جوتیارەکان چالاکترین هێز بوون کە هەوڵی راکێشانیان بدرێت، دیموکراتەکان تەنها دنەی ئەوانیان دەدا لە بواری ئایدیۆلۆژی و ئابوورییەوە، لەڕاستیشدا چاویانبڕیبوویە بەرژەوەندی ژیانی خۆیان[٣٨]، ئەگەرنا ئەو بەڵێنانەی پارتی دیموکرات دابووی بۆ چاککردنی ئابووری و رزگارکردنی لەدەستێوەردانی دەوڵەت، ئەگەرچی لە سەرەتادا هەندێکیانی بردەسەر، بەڵام نەیتوانی کێشە بنچینەییەکانی ئابووری تورکیا چارەبکات[٣٩]، لەبەرئەوە لە ریفۆرمە ئابووری و کشتوکاڵییەکاندا تەنها سەرمایەدار و خاوەنزەوییەکان و ئاغەکان بەهرەمەنددەبوون، رەوشی پاڵە و جوتیارانی هەژاریش هێدیهێدی چوونەوە قۆناغی پێش ١٩٥٠، بۆنموونە ئەوان هەرگیز توانای کڕینی ئامێریان نەبوو بۆ گواستنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ شار، لەهەمانکاتدا نرخەکان بەردەوام بەرزدەبوونەوە بەهۆی پێشکەوتنی پیشەسازییەوە، لەم نێوەندەشدا گەنجینەی دەوڵەت خاڵیدەبوویەوە و بەرەبەرە دەوڵەت قەرزاردەبوو تا لە ١٩٦٠دا، حکومەتی تورکیا ملیارێ دۆلار قەرزاربوو[٤٠]. بەمجۆرە بارودۆخی دژواری ئابووری هەوادار و هاودەنگیی خەڵکی بۆ دیموکراتەکان تەکاندەوە، لەم رەوشەشدا هیچ هەوڵێکی ئابوورییانە بۆ چارەسەر نەدیترایەوە، تەنها ئەلتەرناتیڤێکیش بۆ چاککردنی رەوشەکە کە حکومەتی مەندەریس گرتیەبەر بەکارهێنانی ئیسلام بوو وەك سیاسەت، بەڵام دەنگدەران بەو مەکرانە بڕوایاننەدەکرد و دادیاننەدەدرا، هەربۆیە لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٥٧دا سەرەتاکانی شکستی دیموکراتەکان دەرکەوت، بەجۆرێ ئاکامی ئەو هەڵبژاردنە ٥٦,٦٪ بۆ پارتی دیموکرات و ٤٧,٣٪ بۆ پارتی گەلی کۆماریی بوو[٤١]. ئەم ئاکامەیش لەچاو هەڵبژاردنی ١٩٥٤دا رێژەیەکی زیاد داکشانی بەخۆیەوە بینیبوو کە دەتوانین بڵێین جوتیارەکان تا ١٩٥٤ پشتگیر و سەرخەری سیاسەتیی عەدنان مەندەریس بوون، لێرە بەدواوە گەشەکردنی ئابووریی وڵات سیاسەتی خۆی گۆڕی و بەرگری لە خۆی دەکرد، ئیتر لاوازبوونی کایەی ئابووری دەوڵەت بەرەبەرە پشتگیری پارتی دیموکراتی کەمدەکردەوە، بۆنموونە لایەنێکی گەورەی ئەم شکستە گەورەیەی دیموکراتەکان بەهۆی ئەو گەمارۆ گەورەیەوە بوو کە لەسەر شمەکەکانەوە دادەنرا کاتێك کە دەهاتنە نێووڵاتەوە[٤٢].

هەڵبژاردنی ١٩٥٧ نیشانیدا کە بەڕادەیەکی باش دیموکراتەکان پاڵپشتی لادێییەکانیان لەدەستداوە، لەگەڵ ئەوەشدا دیموکراتەکان قورسایی خۆیان هەر لە ئاواییەکاندا دەبینییەوە و ئەوانی هەر بە کۆڵەکەی هێز و هیوای خۆی دەزانی، چونکە ئەوکات چینی رۆشنبیری شارەکانی بەتەواوی لەدەستدابوو، رۆشنبیران لە سیاسەتی ئابووری وڵاتەکەیان فرە بێزاربوون، چونکە کێشەی هەڵاوسانن بەردەوام گرفت و گرێی بەردەم کامەرانی ئەوانە بوو کە موچەخۆری دەوڵەت بوون، بۆنموونە مامۆستا و ئەندامانی ئەرتەش و مامۆستای زانکۆکان پشکی مەزنی زیانەکانی ئابووری وڵاتیان بەرکەوتبوو[٤٣]. ئەو سەردەمەش لە ئابووری تورکیادا بریتیبوولە خولی هەڵاوسان و نەشونماکردنی خێرای ناردنەدەرەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، ئەمەش لە چوارچێوەی ئازادی ئابوورییدا بوو لە وڵاتدا[٤٤].

یەکێکیتر لە گۆڕانکارییە گەورەکان کە بەسەرکەوتنی دیموکراتەکان تورکیای هەژاند و گۆمی مەنگی چەند ساڵەی بندەستکردنی بۆ یەکەمجار راوەشاند، بریتیبوولە رابوونی هزر و هێمای ئایینی، لەڕاستیدا بیروباوەڕی ئایینی و نەخشی لە سیاسەتی تورکیادا، لەدەسپێکی پەنجاکاندا بووژانەوەیەکی خێرای بەخۆیەوەبینی کە ئەمەش بەدەر نەبوو لە ململانێکانی جەنگی سارد و کاریگەرییەکانی لەسەر تورکیا، لەگەڵ ئەو خواستە دەرەکییەشدا پێویستە بوترێت کە ئازادیگەلێکی رێژەیی تورکیای گرتبوویەوە کە ئەویش پاڵنەرە سەرەکییەکانی زێدەتر ململانێی پارتە سیاسییەکان دروستیانکرد بوو، ئەوەیش روونە کە لەپێناو بەدەستهێنانی دەنگ و دەرەتانی سەرکەوتندا بازنەی ئازادییەکانیان فراواندەکرد، هەرچۆنێك بێت ئەو ئازادییە رێژەییە هیوای گروپگەلێکی ژیاندەوە کە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە کاری سیاسییان لێ زەوت و زەبوون کرابوو، پێشەنگی ئەو دەستە و گروپانەیش لە تورکیادا لایەنگرانی هەستی ئاینیی بوون[٤٥]. بۆنموونە لەسەرەتاوە بانگەشەکانی مەندەریس بۆ ئازادیی پەیرەوە ئایینییەکانی تورکیا هۆکاری سەرکەوتن بوو لە هەڵبژاردنەکان، بەڕادەیەك دیموکراتەکان لە بەرامبەر ئایینییەکاندا نەرمببوون لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا پارتێکی ئیسلامیی وەك پارتی (الامە)[*٦] بە سەرۆکایەتی (فەوزی جقمق[٤٦] و سادق ال دوغان)، بۆئەوەی بەدژایەتی عەلمانییەت تاوانبارنەکرێن بڕیاریاندا بچنەناو پارتی دیموکراتی تورکیاوە و هەندێکیشیان گەیشتنە ناوەندی سەرکردایەتی ئەو پارتە، بەجۆرێك (٥) لە پاڵێوراوانیان ١٩٥٠ بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی تورکیا هەڵبژێردران، بەمجۆرە هەموو ئەوانەی بڕوایان بە ئیسلامی سیاسیی هەبوو لەگەڵ پارتی





دیموکراتی تورکیادا رێککەوتبوون، ئەم رێکەوتنانەیش زۆرجار لە بەرامبەر ئازادیی ئایینی و چالاکییەکانیان لە تورکیادا رێوشوێنی بۆ دەگیرایەبەر[٤٧]. بۆنموونە لە یەکەم دانیشتنی پەرلەمانی نوێی هەڵبژێردراودا بڕیاردرا بە:

١. بانگدان بە زمانی عەرەبی و خوێندنی قورئان و بەکارهێنانەوەی وشەی (الله) لە جیاتی وشەی (Tanri)[*٧].

٢. دامەزراندنی پەیمانگەی ئایینی بۆ پێگەیاندنی زانایانی ئیسلامیی و خوێندنی وانەی ئایینی لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی تورکیادا و دامەزراندنی ئێزگەی خوێندنەوەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ).

٣) درووستکردنی ١٥ هەزار مزگەوت لە سەرانسەری تورکیادا[٤٨].

بەمجۆرە حکومەتی مەندەریس دەیویست ئیسلام وەك هەوێنی ناسنامەی نەتەوەیی تورك بەکاربهێنێتەوە، ئەوەبوو لە پاش سەرکەوتنی ئیمتیازی پیاوانی ئاینیی زیادکرد، هەروەها زیاد لە (٥٢٦) یاسای سزادانی دەستکاریکرد. لەپاش ئەو بڕیارانە لە تورکیادا بە شێوەیەکی پراکتیکی چیانی ئاینیی دەستیپێکرد، ئیتر پیاوانی ئایینی مۆڵەتیاندرایە بە زمانی عەرەبی بانگبدەن، لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٠دا خوێندنی ئایینی لە قوتابخانەکاندا وەك وانەیەکی سەرەکی شوێنی بۆکرایەوە[٤٩]. (ئیحسان داغی)[*٨] دەڵێ: "گۆڕانی سیستەم بۆ فرەیی رامیاریی وایکرد کە چالاکییە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو روو لە زیادیبکەن، ئەم هەژموونە بە رەنگێك بوو کە چاودێرە رۆژئاواییەکان، نێویاننابوو (رابوونی ئیسلامی)". لەڕاستیدا ئەم بێدارییە ئایینییە کاردانەوەی رابردووی سیاسەتی ئایینیی بوو، ئەمەش دروستکردنی هاوسەنگیبوولەبەرامبەر ئەو زیادەڕۆییانەی ئەتاتورك دژی بە ئایین چاندبووی[٥٠]، وەلێ لەڕاستیدا قۆناغی پەنجاکانی تورکیا فاکتەری ئیسلامیی و بێدارییەکەی، هیچ رۆڵێکی لە سیاسەتی تورکیادا نەبینی، بە بڕوای چاودێران ئیسلام تەنها بۆ بەکارهێنان بوو، ئەگەرنا لە نێوەرۆکدا تەنها فاکتەری نەتەوایەتیی زاڵوزاری براوەی نێو گەمەکانی سیاسەت بوو[٥١]. تەنانەت خودی پارتی دیموکراتی تورکیا پارتێکی تۆرانی و تۆرەمەیەکی دەمارگیر و توند ئاراستەی دەکرد[٥٢]. لەڕاستیدا پارتی دژی هەموو جووڵانەوەیەکی ئیسلامیی سیاسییبوولە تورکیا، هەربۆیە دوای ئەوەی ئەم هێزە وەك مەترسییەك لە تورکیادا نمایدەکرد، بەتایبەتی لە پەیمانگە

ئیسلامییەکانی ئەستەمبوڵدا گروپی توندوتیژی ئیسلامی لێهاتەبەرهەم[٥٣]، ئیدی بەتوندی دژی ئەو دەمارگیرییە ئایینییانە وەستایەوە کە خواستی دەستکەوتێکی زیاتریان لە حکومەت دەویست، بۆنموونە سەرەتای ١٩٥١ کاتێ خەڵك سوکایەتییان بە پەیکەرەکانی ئەتاتورك دەکرد، ئەو پەیکەر و بتانەی کە لەتەواوی کوچە و شەقامەکانی تورکیا دانرابوون، حکومەت کاردانەوەی توندی نواند و سنووری لەسەر تەواوی رێبازە ئاینییەکاندا توندکرد، پارتێکی ئاراستە مەزهەبیی بەنێوی پارتی دیموکراتی موسوڵمانی لە ١٩٥٢دا قەدەغەکرد[٥٤]. دیموکراتەکان لەم رەوشەدا داکۆکیان لە بنەماکانی ئەتاتورکییەت دەکرد[٥٥]، ئازادی ئایینی تەنها بۆ مەبەستی هەڵبژاردنەکان بەکاردەهێنا، هەندێك لە چاودێرانی سیاسیی ئەو ئازادییە بۆ هێشتنەوەی کۆنەپەرستی پێناسەدەکەن، چونکە پێیانوایە لە کۆماری تورکیادا کۆنەپەرستیی هەمیشە لە سندوقەکانی دەنگدانەوە دێتەدی و بەرژەوەندیی خۆرئاواش لەو دواخوازییەدایە[٥٦]. لەبەرئەوە تاکاتێك ئازادی بوونی هەبوو کە هۆشیاریی ئایینی نەبوو، وەلێ کاتێك بۆنوبەرامەی سیاسەت ئالآیە مزگەوت و پەیمانگەکان ئیتر هەموو ئەو رێبازە ئایینییانەی لە تورکیادا پەیرەوی ئایینی خۆیان دەکرد رووبەڕووی راوەدوونان بوونەوە و سنووریان لە پێشدەمدا تەسککرایەوە، چونکە بەکاوەخۆ زەمینەی توندوتیژی لە تورکیادا لەئاکامی سیاسەتیی هەڵەی دیموکراتەکاندا رەنگرێژی کۆمەڵگەی تورکیی کردبوو، بۆنموونە لە کەشی بەهاریی ئیسلامپەیرەوانی تورکیادا پەیرەوانی رێبازی ئیجانی[*٩] لە سەرەتای (١٩٥١)دا، هێرشیانکردە سەر پەیکەرەکانی ئەتاتورك و تێکیانشکاندن، زۆرجاریش بەئاشکرا سەرکۆنەی عەلمانییەتیان دەکرد لە سیستەمی سیاسیی دەوڵەتدا[٥٧].. هەربۆیە لە کاردانەوەی ئەو بانگەشانەدا و لە هەڵمەتێکی بەرفراوانەدا بۆ گرتنی پەیرەوانی رێبازی (ئیجانی) لە (٢٧) حوزەیرانی ١٩٥١دا، سەرۆکی رێبازەکە (کەمال پیلاڤ ئۆغلو) قۆڵبەستکرا و بە ٢٥ ساڵ زیندانیکردن بەندکرا. هاوکات مەندەریس بەشێوەیەکی فەرمیی رایگەیاند کە حکومەت هەموو ئەو کەسانە سەرکوتدەکات کە هەڕەشە لە رووناکبیران و سیاسەتمەداران دەکەن، ئەو لە میدیاکاندا رایگەیاندا:" لە رێرەوە دیموکراسییەکەماندا کە گوزارشت لە خواستی گەل دەکات، بەهیچ شێوەیەك رێ بە مەیل و مەرامیی تاکەکەسیی و سیستەمی تیۆکراتی نادرێ".. هەربۆیە دوابەدوای ئەو لێدوانە هەڵمەتی راوەدوونانی (نەوڕەسییەکان)[*١٠] دەستیپێکرد و لە کانونی دووەمی ١٩٥٣دا سەعیدی نەورەسییان[*١١]دایە دادگا، هەروەها یاسای ئازادیی ویژدانیان بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی ئایین بۆ مەبەستی





سیاسیی بەکارهێنا[٥٨]. پێشتر لە تشرینی دووەمی ١٩٥٤یشدا ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورەی تورك یاسایەکی دەکرد، کە هەموو ئەو سەرکردە و ئەندامە هەڵسوڕاوانە سزای توندبدات کە لە ریزی ئەو رێکخراوانەدان، ئامانجیان لێژکردن و بنکەنکردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە پەیرەوکراوەکانی وڵاتە.. کەواتە مەبەستی فەرمیی و فیکریی لەو یاسایانەش رێگەنەدان بوو بە گروپە ئایینی و سیاسییە توندرەوەکان و کۆڕ و گروپە مارکسی و چەپەکان[٥٩].

لەلایەکیترەوە دەوڵەت بواری بەردەم ئازادی سیاسیی و رۆژنامەگەریی و بەرهەڵستکاریی تەنگترکردەوە، دوواجار ئەم سیاسەتە بوو بەهۆی نارەزاییەکی سەرتاسەری و سەخت، چونکە دەوڵەت نەیتوانی وەڵامی بەرژەوەندییە نیشتیمانییەکان بەتەمامی بداتەوە، هەربۆیە رۆژنامەکان بە توندی رق و رەخنەیان لە سیاسەتی نێوخۆی وڵات دەگرت، لەبەرامبەریشدا حکومەت پەیرەوی لە سیاسەتیی بێدەنگکردن دەکرد، بەمجۆرە و لە ١٩٥٣دا دیموکراتەکان کۆمەڵە یاسایەکیتریان دەرکرد کە تیایدا ئازادیی رۆژنامەگەرییان زێدەتر سنووردارەدەکرد و مەودای ئازادییەکانی پێوەست بە پارتەکانیشیان تەسکتردەکردەوە، لە درێژەی ئەو زنجیرە یاسایانەدا لە ١٩٥٤دا حکومەت یاسایەکی نوێتر دەرکرد کە تێیدا مافی بە حکومەت دەبەخشی کە کارمەندی دەوڵەت لە کارەکەی دەربکات، بەبێ ئەوەی مافی نارەزایی هەبێت لەبەردەم هەر دادگایەکدا[٦٠]. دیارە ئامانجی دیاریی ئەم یاسایەش تەنها رزگاربوون بوو لە هەر کەسێك کە بۆنی بەرهەڵستکاری حکومەت بدات، هەروەها یاسای قەدەغەکردنی ئەو رۆژنامانە دەرکرا کە ئیهانە و رەخنە رووبەڕووی بەرپرسەکان دەکەنەوە، لەئاکامی ئەم یاسایەشدا زۆرێك لە رۆژنامەنووس و نووسەرەکان خرانە بەندینخانەوە[٦١]، چونکە راگەیاندنی بەرهەڵستکاران ببوویە مەکۆ و مەیدانی چاودێریی کارای سەر جموجوولەکانی حکومەت، چونکە خەڵکی تورکیا لەوە رەویبوونەوە کە ئیتر گوێ بۆ ئۆرگانەکان و میدیاکانی حکومەت بگرێت.. بۆنموونە لەناو رووناکبیراندا کۆمەڵەی ئەوان کەسانە دروستببوو کە گوێ بۆ رادیۆ ناگرن[٦٢]. لەڕاسیدا هۆکاری ئەمەش پەرەسەندنی بیری فاشیست و تاکرەویبوولە حکومەتدا، چونکە لە ١٩٥٤بەدواوە ئازادی سیاسیی بوو بە قوربانی ئازادی ئابووریی، مەندەریسیش تەنها جێگەی خۆی تۆکمەدەکرد و خەمی کورسیی شوێنی خەمە بالآکانی وڵاتی گرتبوویەوە.. هەربۆیە چاودێران پێیانوایە سەرکەوتنی هەڵبژاردنەکان تەنها سەرکەوتنێکی تاکەکەسی بوون، لەنێو خودی پارتی بالآدەستیشدا تاکرەوی و تاکبڕیاری زاڵببوو، ئەو کەسانە بۆچوونی حکومەتیان بەدڵنەبوو لەنێو

پارتەکەدا دەردەکران، خودی مەندەریس بەتەواوی رەخنە و رەخنەگرتنی دەدایەدواوە. هاوکات ئازادیی بواری خوێندنیش هەمیشە لاواز و لێڵبوو. بەجۆرێك لەدوای ١٩٥٥دا بەتەواوی سنوور بۆ بواری خوێندن و خوێندەواریی دانرا. لەبەرامبەریشدا بەرهەڵستکارانی حکومەت بەخێرایی تەواوی دامودەزگەکانی حکومەتیان کۆنترۆڵدەکرد، ئەو هاوپەیمانیەتییەیش دیموکراتەکان لە سەرەتاوە و لەتەك هەموو چینەکان دروستیانکردبوو، بەرەبەرە درزیتێکەوت.

هۆکاری سەرەکی پەککەوتنی ئەو هاوپەیمانییەش بەهۆی ئەو بیرە بیۆکراسییەی نێو زانکۆ و دادگاکانەوە بوو، چونکە حکومەت بەتەواوی ببوویە حکومەتێکی بیۆکراسی و لەوێشدا هەر کارمەندێکی دادگاو بەڕێوەبەرایەتی و زانکۆ و سوپا بەئاسانی و بە یاسا بەخواستی پارتی باڵادەست خانەنشیندەکرا، کاردانەوەی ئەم رەوشەش لە تەسکبوونەوەی مەوداکانی ئازادیدا بۆ یەکەمجار لە خۆپیشاندانە بەرفراوانەکانی ئەیلولی ١٩٥٥دا دەردەکەوتن[٦٣].. دواجار خودی پارتی دیموکراتیش ناکۆکی تێکەوت و باڵێکی بە سەرکردایەتی فەیزی لوتفی جیابوونەوەو پارتی حوریەت (Hurriyet partisi)یان دامەزراند و لە یەکەم هەنگاویاندا بوونە گەورەترین پارتی بەرهەڵستکار لە ئەنجوومەنی نیشتیمانیدا، ئەم پارتە پشتگیرییەکی بەرینی بازاڕەکانی دەکرد و سیاسەتێکی تۆکمەی لە ئابووریدا هەبوو، ئەوەی ئەم پارتە دەیکرد تا ئەوکاتە بە مەندەریس نەدەکرا، وەلێ لەگەڵ ئەو تەنگژە سیاسیی و ئابوورییەشدا و لە ١٩٥٦دا ئارەزووی حکومەت بۆ تاکرەوی زیاتردەبوو، بەجۆرێك لە مانگی حوزەیرانی ١٩٥٦ یاسای رۆژنامەوانی بەتەواوی گۆڕینی بەسەرداهێنرا، لەڕاستیدا ئەم هەوڵە بۆ ئازادکردنی نەبوو، بەڵکو بۆ زێدەتر بەهێزکردنی توانستی حکومەت بوو بۆ کۆنترۆڵکردنی میدیا، هاوکات یاسایەکیتری حکومەت لەونێوەندەدا بریتیبوولە یاساغکردنی هەر کۆبوونەوە و گردبوونەوەیەکی سیاسیی.

بەمجۆرە چین و توێژەکانی خەڵکی تورکیا بەرەبەرە گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە دەوڵەت تەنها بۆ مەرامی کاتیی و لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردندا ئاوڕ لەواندەداتەوە[٦٤]. سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکی تورکیا لەتەك وڵاتانی زلهێز و هەرێمیشدا، دەتوانین سەرەتای پەنجاکان بە سەرەتای گۆڕانێکی ریشەیی لە پێوەندییەکاندا دەستنیشانبکەین، سیاسەتە دەرەکییەکانی تورکیا لەگەڵ وڵاتانی هەرێمی و هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات[*١٢] و رۆژئاوادا[*١٣]، بەشێکی گەورەی گۆڕانکارییەکانی سەردەمی پارتی دیموکراتی تورکیا لەخۆدەگرێت و کاریگەری دیاریشی لەسەر رەوشی ناوخۆ بەجێدەهێشت. لەڕاستیدا دیبلۆماسییەتی تورکیا دوای جەنگی جیهانی





دووەم سەرکەوتوو بوو لە نزیکبوونەوە لە ئەمەریکا و خۆرئاوا، ئەم نزیکبوونەوەیەش لەڕێگای مەبدەئیترومان و پرۆژەی مارشاڵەوە بوو، چونکە ئەمەریکا باوەڕی وابوو تورکیا تەنها چەکێکی ستراتیژی بەهێزی ماجەراکانی جەنگی سارده دژی سۆڤیەت، لەئاکامدا زنجیرەیەك رێکەوتنی ستراتیژی گرنگ لەنێوانیاندا لەڕووی سەربازیی و سیاسیی و ئابوورییەوە هاتەگۆڕێ[٦٥]، بەپێی سیاسەتیترومان تورکیا وڵاتێکی ناکۆمۆنیستە و لەبەردەم هەڕەشەی پارچەکردن و دەستێوەردانی دەرەکییەوە پێویستە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا پێداویستییە ئابووریی و سیاسیی و گرنگتر لەهەموویان پێداویستییە سەربازییەکانی دابینبکات، لە رێبازیترومانەدا دژەکۆمۆنیستەکان بریتیبوونلە وڵاتە ئازادەکان، لەمپێناوەدا رژێمە دیکتاتۆرەکان بەپاڵپشتی ئەمەریکا لەڕووی ئابووریی و سەربازیی و سیاسییەوە دژی کۆمۆنیستەکان و بلۆکی رۆژهەڵات هەلەکەیان قۆستەوە[٦٦]. ئەمەش تەنها لەبەرئەوە بوو کە تورکیا گرنگییەکی ستراتیژیی هەبوو بۆ ئەمەریکا[٦٧]، چونکە سۆڤیەت خواستی دەستبەسەراگرتنی کەنارەکانی بسفۆڕ و دەردەنێلی هەبوو، لەبەرئەوە تورکیا و یۆنان تەنها رێگەی قەدەغەکردنی ئەم خواستە بوون[٦٨]، هەر ئەم هۆکارە بوو کە سەرۆکی ئەمەریکی روزفلتی والێکرد کە بڵێت بەرگریی لە تورکیا، پێویستییەکی هەنووکەییە و وەك بەرگریکردنە لەخودی ئەمەریکا، واتە ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا بریتییەلە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا[٦٩]. لەبەرامبەریشدا یەکێتی سۆڤیەت هەر لە سەرەتای ئازاری ١٩٤٥دا میدیا و سیاسەتی راگەیاندنی هەڵمەتێکی توندیان دژی تورکیا دەستپێکرد، لەهەمان مانگدا سۆڤیەت رایگەیاند کە پەیمانی دۆستایەتی (تورك ـ سۆڤیەت)[*١٤] نوێناکاتەوە، سیاسەتمەدارانی تورکیاش پەیوەندییان لەگەڵ سۆڤیەت بەجۆرێك تێکچووبوو کە دەترسان نوێکردنەوەی ئەو پەیمانە تورکیا بخاتە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەی لە دەسەڵات و لەنێو بازنەی سۆڤیەتدان[٧٠]. لە ٨ی تەمموزی ١٩٤٨ تورکیا و ئەمەریکا رێکەوتنێکیان بەست، بەگوێرەی ئەو رێکەوتنە تورکیا هەموو ساڵێ ١٠٠ ملیۆن دۆلاری بۆ ماوەی سێ ساڵ وەردەگرت، ئەمەش لەپێناوی بونیادنانەوەی هێزەکانی نێوخۆ بوو بۆ بەرگریی لەخۆی دژی دوژمنایەتی دەرەکی و ئاسایشی ناوخۆیی، لەبەرامبەر ئەمەشدا تورکیا بەشێوەیەکی فەرمیی دانینا بە ئیسرائیلدا[٧١][*١٥]. بەمجۆرە بە سەرکەوتنی دیموکراتەکان قۆناغی زێڕینی پەیوەندییەکانی ئەمەریکا و تورکیا دەستپێکرد[٧٢]، بەشێوەیەك سەرکەوتنی پارتی دیموکرات و فاکتەریی ئیسلامی لەم پارتەدا بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕواندەکرا زیاتر تورکیای لە خۆرئاوا نزیککردەوە، بۆیە لێرەدا دەگەینە

ئەو راستییەی کە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لەسەر بنەمایەکی جێگیر و نەگۆڕبوو، هەرگیز بە گۆڕانی حکومەتەکان ستراتیژی سیاسیی دەرەکی گۆڕانی بەسەردانەهاتووە، هەربۆیە حکومەتی عەدنان مەندەریس کە ئاراستەیەکی رۆژهەڵاتی و ئیسلامیی لە ئەدەبیاتدا هەبوو، تورکیای لەدانینان بە ئیسرائیل پاشگەزنەکردەوە و زیاتر پەیوەستبوو بە خۆرئاواوە[٧٣].. لەبەرئەوە لە پەنجاکاندا فاکتەری ئیسلامی هیچ رۆڵێکی لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا نەبینی[٧٤]، هەروەها لەڕووی سەربازیی و ئابوورییەوە تورکیا لەماوەی (١٩٤٨ ـ ١٩٦٢)دا بە رێژەی ٣٨٠٠ ملیۆن دۆلار هاریکاریی لە ئەمەریکا وەرگرت کە (١٦٠٠ ملیۆن دۆلاری) یارمەتی ئابووریی و ( ٢٢٠٠ ملیۆن دۆلاری) یارمەتی سەربازی بوو[٧٥]، بەمجۆرە رێژەی قەرزی تورکیا بەهۆی پەیوەستبوونی بە پەیمانەکانەوە ساڵی ١٩٥٠ تەنها قەرزە دەرەکییەکانی گەیشتنە ١٢ ملیار لیرە، قەرزە ناوخۆییەکانیشی بریتیبوونلە ٧ ملیار لیرە. بەجۆرێك رادەی قەرزەکان زیادیانکرد کە مەندەریس ناچاربوو داوای قەرزبکات بۆ دانەوەی سوودی ئەو قەزرانە[٧٦]، هاوکات تورکیا لەناو ئەنجومەنی وڵاتانی ئەوروپادا کە بەپێی رێکەوتنێك لە لەندەن لە ٥ ئایاری ١٩٤٩ دامەزرا بوو، لە مانگی ئایاردا بوو بە ئەندامی ئەو ئەنجوومەنە، بەپێی کارنامەی ئەنجومەنەکە ئامانجی ئەنجومەن کارکردن بوو لەپێناو دۆخی ئارامیی یەکێتی ئەوروپا و باشکردنی بارودۆخ و مەبدەئی دیموکراسی و حوکمی قانون و مافی مرۆڤ[٧٧].

بەمجۆرە پەیوەندییەکانی تورکیا و ئەمەریکا و بەرەی خۆرئاوا هێندە پەرەیانسەند کە ئەوروپییەکان وا سەیری تورکیایان دەکرد بووەتە نوێنەری رۆژئاوا لە ناوچەکەدا، لەبەرئەوە تورکیا هەوڵیدا لەڕێگای سیستەمێکی تازەی هاوپەیمانییەوە درێژە بە دەسەڵاتی خۆرئاوا بدات لە نێوچەکەدا، یەکەم هەنگاویشی بریتیبوولە بە ئەندامبوونی تورکیا لە هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسیدا[*١٦][٧٨]. لەڕاستیدا ئەمەریکا بەتەواوی لەگەڵ رژێمی مەندەریسدا بوو، چونکە پێشتر عیسمەت ئینۆنۆ داوای لە حکومەتی ئەمەریکا کردبوو بۆ بەشداریی لە دانوستانەکانی ئەو پەیمانە، بەڵام سەرۆکی ئەمەریکا هاریترومان ئەم داواکارییەی دابوویە دوواوە. ئەمەیش ئەوە دەردەخات کە ئەمەریکا لەگەڵ سیاسەتی حکومەتی مەندەریسدا کۆکبووە. بەرادەیەك سەرەڕای بوونی نارازییەکی فرە لە بەئەندامبوونی تورکیا، بەڵام تورکیا دواجار بوو بە ئەندامێکی کارا لە پەیمانەکەدا.[٧٩] دیارە هەوڵدانی تورکیا بێهوودە و بێهۆ نەبوو، چونکە تورکیا لە هەموو روویەکەوە مانەوەی خۆی لە بواری ناوخۆ و دەرەوەدا لە پەیوەستبوون بە خۆرئاواوە دەبینییەوە،





بەجۆرێك چاودێران پێیانوابوو تورکیا لە بواری ئابووریی و بازرگانییەوە بێلاموجیمی گرێدراوی خۆرئاوا بوو. لەلایەکیتریشەوە تورکیا دەیویست لە رێگەی ئەو پەیمانەوە لە مەترسییە ناوخۆییەکانی بیری کۆمۆنیزم و جوداخوازی خۆی بپارێزێت و دوورەپەرێز بێت.[٨٠] لەمپێناوەشدا تورکیا ساڵی ١٩٥٠ لەسەر بانگهێشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشداریکرد لە شەڕی کۆریادا بە ٥٠٠٠ سەربازەوە[*١٧] [٨١]. تورکیا لەم هەوڵەیدا چەند ئامانجێکی هەبوو، لەوانە راهێنان و خۆسازدانی سوپاو هێزی چەکداری وڵاتەکەی بوو تەنها بۆ مەبەستی سەرکوت و مراندنی جموجوڵە ناوخۆییەکانی وڵات، لەوپێناوەدا ئەزموونی جینۆسایدی کۆرییەکان کە لەلایەن ئەمەریکاییەکانەوە پەیرەودەکرا لە شەڕی کۆریادا وەك وانەیەك سوپای تورکیای لەسە گۆشکرا[*١٨]. بۆنموونە سەربازانی تورك بەشداربوون لە راهێنان لەسەر بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی و کیمیایی[٨٢]. ئەم زانیارییە بۆ یەکەمجار لەلایەن سۆڤیەتەوە لە هاوینی ١٩٥٢دا رایگەیەنرا و نەتەوە یەکگرتوەکان لە ترس و تۆقینەکانی ئاگادارکرایەوە، ئەوەش راگەیەنرا کە ئەمەریکا چەکی ناوەکی بەکارهێناوە. هەر بەمبۆنەیەوە لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٥٢دا سۆڤیەت پرۆتۆکۆڵێکی بۆ قەدەغەکردنی ئەو چەکە ئامادەکرد، بەڵام تورکیا و ئەمەریکا و هەشت ئەندامیتر دەنگیان لەسەر نەدا و لە مەتەرێزیدا وەستان. دەکرێت بڵێین تورکیا لە یەکەم بەشداریکردنی ناتۆیدا و بەمجۆرە لایەنی سەربازیی بەهێزکرد و تەنانەت دەستیدایە سەودا و مامەڵەکردن بۆ کڕینی چەکی کیمیایی، هەروەها لە ١٩٥٦دا، ٢٥ ئەفسەری پایە بەرزی تورك لە ئەمەریکا لەسەر چەکی کیمیایی بەشداری کۆرسێکیان کرد و پەروەردەکران[٨٣]، بەمجۆرەو بۆ مەبەستی نێوبراو ٥٠٠٠ سەربازی تورکیا تا ساڵی ١٩٥٤ لە کۆریا مانەوە، ئەمەش لەلایەکەوە ئەو هەوڵە بوو کە تورکیای لە ١٨/١٢/١٩٥٢ لە پەیمانی ناتۆدا کردە ئەندام لەلایەکیترەوە ناتۆ پێویستی بە تورکیا بوو، چونکە شوێنی جیۆپۆلەتیکی تورکیا فرە لەباربوو، تورکیا سنووری هەبوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و بولگاریا و دەیتوانی چاودێری جموجوڵی هێزی دەریایی سۆڤیەتەکان بکات لە دەریای رەشەوە تا دەریای ناوەراست[٨٤]، لەهەمانکاتدا تورکیا لەگەڵ وڵاتانی هەرێمیدا بەتایبەتی لەگەڵ عێراق و ئێراندا پەیوەندی ستراتیژیی دامەزراند[*١٩]، لەگەڵ ئێراقدا درێژەی بەو رێکەوتنەدا کە ساڵی ١٩٤٦ بەنێوی دراوسێیەتی چاك و دۆستایەتییەوە گرێیدابوو[٨٥]، لە پەنجاکانیشدا ئەنقەرە خواستی ئەوەی هەبوو سەرداری رۆژهەڵاتی ناوەراست بێ[٨٦] هەربۆیە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق فرە جێگەی بایەخ بوون و بۆئەو مەبەستەش تورکیا

دەستپێشخەریکرد لە بەستنی پەیمانی بەرگریی لەیەکترکردن لەگەڵ عێراقدا و ئەم پەیمانە دواتر بوو بە دەسپێك بۆ بەستنی پەیمانی بەغداد[٨٧]، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا تورکیا دژی وڵاتانی عەرەبی بوو بەگشتی و بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی بەستەوە بە بەرژەوەندی ئەمەریکا و خۆرئاواوە، بە بێگوێدانە سیاسەتی وڵاتانی عەرەبی[٨٨]، ئەمەش وایکردبوو کە تورکیا پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی لاوازبێت، هۆکاری سەرەکیش تەنها بە بۆنەی بەشداربوونی تورکیا بوو لە ناتۆ دا، لەگەڵ ئەوەشدا تورکیا خواستی پەیوەندی هەبوو لەتەکیان، بە مەرجێ باس لە هیچ هاوپەیمانییەك نەکرێ[٨٩]. بۆنموونە سوریا لەلایەکەوە گرفتی ویلایەتی ئەسکەندەرۆنەی لەگەڵ تورکیا هەبوو، لەلایەکیتریشەوە سوریا لە بەرەی رۆژهەڵات بوو، کاتێك لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٥١ (ئەدیب شیشکلی) سەرۆکی ئەرکانی سوپا لە سوریا دەسەڵاتی گرتەدەست، بەئاشکرا دژایەتی تورکیای دەکرد، سوریا دەیوت گەڕانەوەی ئەسکەندەرۆنە تەنها رێگای پەیوەندیمانە، بۆئەم مەبەستەیش لە میدیاکاندا هەڵمەتی توندی دژی تورکیا دەستپێکرد، بەشێوەیەك تورکیا تەواوی رۆژنامەکانی سوریای لە تورکیا قەدەغەکرد، تەنگژەکان گەیشتنە ئاستێك کە هەموو عەرەب جگەلە عێراق دژی تورکیا بوون[٩٠]. ئێرانیش وەك وڵاتێکی دراوسێ، پشتیوانێکی سەرەکی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بوو[٩١]. دیارترین پەیمانێك کە شوێنپەنجەی قووڵی لە پێوەندییە هەرێمییەکانی تورکیا بەجێهێشت بریتیبوولە پەیمانی بەغدا[*٢٠]، ئەم پەیمانە گورزێکی کوشندە بوو لە نەیارانی تورکیا درا لە نێوچەکەدا، لە ٢٤ی شوباتی ١٩٥٥ عێراق و تورکیا ئەم پەیمانەیان مۆرکرد و لە پێنجی نیساندا بەریتانیا و لە ٢٣ ئەیلولدا پاکستان و لە ٢٣ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا ئێران چووەڕیزی پەیمانەکەوە، پەیمانەکە بەتەواوی بووە مایەی هاریکاریی هەموو لایەنە بەشدارەکان، وەلێ ئەمەریکا نەچووەڕیزی ئەندامەکانەوە، بەڵام لە کۆمیتە سوپاییەکاندا و لە سەرپەرشتیکردنی هێزەکاندا بەشداربوو. لەڕاسیدا ئامانجی سەرەکی پەیمانەکە رێگەگرتن بوو لە دزەکردنی کۆمۆنیزم بۆ ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست، هەروەها بایەخێکیتری بەستنەوەی پەیوەندی ستراتیژی تورکیا و ئێران و عێراق بوو[٩٢]، زیاد لەوەیش ئەم پەیمانە تورکیای پاراست لە مەترسی نەیارەکانی، وەك یەکێتی نێوان میسر و سوریا کە پێکەوە هەڕەشەیان لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەکرد، چونکە تورکیا دژی رێکەوتنی میسر و سوریا و سعودیە بوو کە لە ٢٠ی ئازاری ١٩٥٥ مۆرکرابوو، هەربۆیە سوپای تورکیا بەدرێژایی سنووری لەگەڵ سوریا لە ئامادەباشی و هەر ئەگەرێکی دەستدرێژیدا بوو،





لەمنێوەندەدا وەزیری دەرەوەی روسیا مۆلۆتۆڤ رایگەیاند وڵاتەکەی بەرگری لە سوریا دەکات لە هەر هەوڵێکی دەستدرێژیدا، ئاڵۆزییەکان گەیشتنە رادەیەك میسریش سوپاکەی خۆی لە باکووری سوریادا بۆ یارمەتی سوریا ئامادەکردبوو، ئەوان تورکیایان بەبەشدار دەزانی لە پشتیوانی ئیسرائیل بۆ دوژمنایەتی سێ قۆڵی میسر لەلایەن ئەمەریکا و بەریتانیا و ئیسرائیلەوە[٩٣]، هەروەها بەشداری تورکیایان لە پەیمانی بەغداد بەلێدانی بزاڤی سەربەخۆخوازی گەلانی عەرەب دەزانی[٩٤]، بۆیە تورکیا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل زیاتر بەهێزتر دەکرد، بە نەزمێك لە ناوەراستی پەنجاکاندا ئاڵوگۆڕی بازرگانی دوو وڵات گەیشتە ٢,٥ ملیۆن دۆلار، هاوکات لە تشرینی دووەمی ١٩٥٤دا لە ئەنقەرە رێکەوتنێکی ستراتیژی لەنێوان هەردوولادا لەسەر ئەم خاڵانە هاتەئاراوە:

١. دامەزراندنی هاریکاریی بەرگریی لەنێوان دوو وڵاتدا
٢. پەیوەندی ئابووری و پیشەسازی[٩٥].

لە چوارچێوەی پەیمانی بەغدادا تورکیا توانی بزاڤی کۆمۆنیزم لەنێوخۆیدا بەتەواوی سەرکوتبکات و تەواوی سەرکردەکانیان بگرێت و توندی زیندانبکات چاودێری توندیان لەسەردابنێت[٩٦]. دیارە تەوژمی کۆمۆنیستیش لە تورکیادا کەوتبوویە چالاکی و خرۆشانی رێکخراوەیی، هەربۆیە سەردارانی تورکیاش بەو هەواڵانە کێچ کرابوویە کەوڵیان. بۆنموونە عەدنان مەندەریس رایگەیاند بوو ١٣١ کەس لە پیاو و ژن هەستاون بەخۆڕێکخستنەوە بۆ زیندووکردنەوەی حیزبی شیوعی تورکی، هەروەها حکومەت ساڵی ١٩٥٤ هەستا بەدەستگیرکردنی چالاکوانانی رێکخستنەکانی چەپەکان و دەستیگرت بەسەر زۆرێك لە بەڵگەنامە و چالاکی رێکخراوەییاندا[٩٧]. بەمجۆرە بانگەشەکردن دژی شویعیەت و سۆڤیەت لێرەو لەوێی وڵات تەشەنەیدەسەند و لەونێوەندەشدا هەموو بزاڤێکی رزگاریخوازی نیشتیمانیی لە هەرێمەکەدا دژایەتیدەکرا و لەو بازنەیەدا تەماشادەکرا[٩٨]. شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ پچڕانێکی کتوپڕ و گەورەبوو لەنێوان پەیوەندییەکانی عێراق و سوریادا و نەخشە ستراتیژییەتییەکانی تورکیای بەتەواوی گۆڕی[٩٩]، لێرەوە تورکیا کەوتەدژایەتی سیستەمی نوێی عێراق، ساڵی ١٩٥٨ سەرۆکی ئیسرائیلی دوایزمن، بە سەردانێکی نهێنی هاتە تورکیا و هاوپەیمانییەتێکی نوێیان بەست و ناویاننا (**ملف المحيط**)[١٠٠]، کە ئامانجیان گەمارۆدانی

عێراق و سوریا و فشارخستنەسەریان بوو، هاریکاری دوو لایەنە لە بواری سەربازی و هەواڵگیریی، لەهەمان ساڵدا لەبەردەوامبوو، هەروەها ئێران و تورکیا و ئیسرائیل هاوپەیمانییەتێکی ئاسایشیتریان گرێدا کە ناسرا بە (**الرمح الثلاثي**) کە بریتیبوولە ئاڵوگۆڕی زانیاریی ئاسایشی، لەم پەیمانەدا هەر سێ سەرۆکی هەواڵگیریی سێ وڵات کۆببوونەوە[١٠١]. عەدنان مەندەریس داوای لە ئەمەریکا کرد ڕێگا بە تورکیا بدات هێرشبکاتە سەر عێراق. سەبارەت بەو تەنگژەیەی نێوان دوو وڵات باڵوێزی عێراق (نعیب الراوی) وتبووی" تورکیا دوو فیرقەی ئامادەکردووە بۆ سنوورەکانی عێراق، ئەمەش بە مەبەستی سەرکوتی شۆڕشی گەلانی عێراقە، لەمپێناوەشدا ئیسرائیل هاوکاریی سەرۆکی ئەرکانی سوپای تورکیا دەکات شانبەشانی ئێران هەوڵبدەن بۆ گەڕانەوەی سیستەمی پاشایەتیی بۆ ئێراق[١٠٢]. لەڕاسیدا سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی بەغداد، دەبوایە ئاراستەیەکیتر بگرێتەبەر، وەلێ تورکیا زیاتر بوویە پێگەیەك بۆ ناتۆ، بەڵام تەنگژەکانی نێوخۆی تورکیا لە کۆتایی پەنجاکاندا ئەمەریکا و خۆرئاوای قەڵس و دڵکرمێکرد لەمانەوەی دەسەڵاتەکەی، لە لایەکیترەوە نێوان سوپا و پارتی دیموکراتی تورکیا بەتەواوی تێکچووبوو. بۆنموونە لە ١٩٥٧دا چەندین ئەفسەری باڵای سوپا دەستگیر کران تەنها بە تۆمەتی دانانی پلان دژی حکومەتی مەندەریس، لێرەوە سەرلەنوێ، پەیوەندیی توندو تۆڵ لە نێوان پارتی گەلی کۆماریی بەرهەڵستکارو سوپادا دەستیپێکردەوە. دیارە لە سەرەتاوە سوپا لەگەڵ دیموکراتەکان بوو، بەڵام لە دوا ساڵەکاندا ئەو گرەنتیە نەما کە چیتر سوپا پشتگیریی حکومەت بیٚ(١٠٣)، بەرە بەرە سوپا کەوتەوە نێو بەرەی ئۆپۆزسیۆنەوە، چونکە سیاسییەکانی تورکیا هەوڵیان دەدا سوپا بکەنە پاشکۆی خۆیان، سوپاش بەپێچەوانەوە دوور دەکەوتەوەو لەڕێی ناتۆوە سەربەخۆیی خۆی دەپاراستو لە بواری سەربازیدا خۆی تۆکمەو توند دەکرد، لەلایەکیتریشەوە ئەمەریکا دەیزانی تەنها سوپای تورکیا هێزێکە لە داهاتوودا زامنی مانەوەی تورکیایە. دەتوانین بڵێین بەرژەوەندی سوپای تورکیاو سیاسەتەکانی ئەمەریکا لە نێوچەکەدا لە دوو خاڵدا بوو:

یەکەم: هێشتنەوەی ڕێبازی سیاسیی و سنووری جوگرافیی ئەوکاتی تورکیاو زامنکردنی سیکۆلاریزم بۆ تورکیا.[١٠٤] چونکە ئاراستەی سیاسیی نوێی تورکیا بەرەو ئیسلامی سیاسیی هەنگاوی دەنا[١٠٥].





دووەم: پاراستنی یەك پارچەیی تورکیا لە دژی چەپو جوداخوازەکان[١٠٦]، لەبەرئەوە ئەمەریکا لە ڕێگەی کاریدەکرد بۆ بەهێز مانەوەی ئەرتەشی تورکیا لە داهاتوودا[١٠٧].

سوپای تورکیایش دیموکراتەکانی بە ئاراستەیەکی سیاسیی رووت دەبینی و بەردەوامییانی بە کودەتایەك دەزانی دژی ئەتاتورکیزم[١٠٨]، چونکە دیموکراتەکان هیچ هەنگاوێکی ئەوتۆیان نەدەنا بۆ ڕێکخستنەوەی سوپاو پەروەردەکردنی کادیرەکانی و بەتەواوی سوپای تورکیایان پەراوێز خست بوو[١٠٩]. لە لایەکیتریشەوە مەندەریس لە سیاسەتکردندا بەتەواوی وێنای دیکتاتۆریەتی دەکرد و لە خۆی بایی و بێباك ببوو، ئەو هەمیشە پێیوابوو ئەتاتورکی دووەمە و نابێت کەسێك هەبێت کێبەڕکێی پۆست و کورسییەکەی بکات، لەبەرئەوە بە یاسا بواری هەموو پارتێکی بەرهەڵستکاریی کزکرد و ئازادییەکانی زەوتکردن، بۆنموونە بەپێی بڕیاری پەرلەمان هەموو نوسراو و کتێب و دامودەزگاکانی پارتی گەلی کۆماریی دەستی بەسەردا گرت، لەکاتێکدا ئەم پارتە لە هەڵبژاردنی ١٩٥٠دا هەموو ئازادییەکی بە بەرامبەرەکەی دابوو تاوەکو بگاتە کورسی دەسەڵات[١١٠]، ئەم رەوشە بەجۆرێ بوو کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ حکومەتی تورکیا لەژێر دروشمی بەرەی نیشتیمانیدا جەنگی لە دژی بەرەی ئۆپۆزسیۆنەکان راگەیاند، ئەوکات بزاڤی ئۆپۆزسیۆن لەلایەن عیسمەت ئینۆنۆوە سەرکردایەتیدەکرا[١١١]. بەرەی ئۆپۆزسیۆن زۆر بەرەیەکی جەماوەریی بوو، تەواوی توێژی قوتابیان لە بەرەی بەرهەڵستکاریی بوون دژی پارتی دیموکراتی تورکیا، هەربۆیە دیارترین دیمەنەکانی رۆژانەی وڵات بریتیبوولە گرتن و راوەدوونانی خوێندکار و خوێندەوارەکانی وڵات.. بۆنموونە لە ١٨ی نیسانی ١٩٦٠ لە کاردانەوەی توندییەکانی وڵاتدا خوێندکاران بەشێوەیەکی سەرانسەریی راپەڕین، حکومەت بۆ سەرکوتی خۆپیشاندەران گازی فرمێسکڕێژی بۆ بڵاوەپێکردنی هەمووان بەکارهێنا و لە زۆرێك لە شوێنەکانیشدا باری نائاسایی راگەیاند و بە یاسا قەدەغەی خۆپیشاندانەکانی کرد[١١٢]. دەتوانین بڵێین هەوڵی رووناکبیر و قوتابیان و ئەفسەرانی کەمالی هۆکارێکی راستەوخۆ بوو بۆ لاوازکردنی پارتی دیموکراتی تورکیا[١١٣]. ئەودەمانە ئەفسەرانیش زیاتر ئایدیۆلۆژیای ئەتاتورکیان لەنێودا زیندووڕاگیرابوو.. بۆنموونە تیمە ئەمەریکییەکان گەنجەکانی تورکیایان بەڕاهێنان و پسپۆڕی بواری سەربازییەوە سەرقاڵکردبوو، بەڕادەیەك رەوتێکی گەنجی بەئەزموون و شارەزا لە زانست و ئەندازیار لە بواری سەربازیدا پلەی

بەرزییان لە سوپادا وەرگرتبوو، زۆرێك لەوانە لە دەرەوە کۆرس و ڕاهێنان و خولی تایبەتییان بینیبوو[١١٤]، ئیتر ئەمانە بارگاویبوون بە ئایدیۆلۆژیای کەمالییەت و پێیانوابوو دەتوانن لەو قەیرانی ئابووری و سیاسی و ئایدیۆلۆژییە تورکیا بهێننەدەرەوە. دیارە لەبەرامبەر ئەم ڕەوشەدا ئیتر حکومەتی مەندەریس لەبەدیهێنانی دیموکراسیدا دۆڕاندی و لەبەردەم سێ گیروگرفتی چارەنەکراودا، مەیدانەکەی بۆ سوپا چۆڵکرد:

**یەکەم: گرفتی ئابووری**

سوپا پێیوابوو کە فەرمانڕەوایەتی دیموکراتەکان لە چاکسازییەکانی ئەتاتورکی پەکخستووە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کە ئەمەش کورتدەکرێتەوە بۆ فاکتەری ئابووری کە ئەویش خۆی لە گرفتی هەڵئاوساندا وێنادەکرد، ئەمەش ببوویە ئاستەنگ و ڕێگر لەبەردەم گەشەی ئابووری وڵاتدا، لەبەرئەوە قوربانیدان بەوەبەرهێنان و جێگاگرتنەوەی ئەوە بە سیاسەتێکی ستەمکاریی تاقەتپڕووکێن، هەرچی بودجەی وڵات هەبوو هەمووی بەهەدەربرد[١١٥].

**دووەم: ئایین**

حکومەت بەوە تاوانبارکرا کە سیاسەتەکەی بووەتە هەڵوەشاندنەوەی بنەما کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەت، لەمپێناوەدا لایەنە ئایینییەکان خواستی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زێدەتریان دەکرد کە بەتەواوی ریفۆرمی مستەفا کەمال زەوتیکردبوون.

**سێیەم:** دیموکراتەکان و بەرهەڵستکارەکان نەیاندەزانی چۆن بەشێوەیەکی شارستانییانە و بەهەستکردن بە لێپرسراوی ململانێبکەن و ئازادی سیاسیی لە وڵاتدا هیچ ڕەنگوبۆیەکی دیموکراسییانەی نەبوو[١١٦]. بەمجۆرە زەمینەی کودەتایەکی سەربازیی لە تورکیادا بوو بە ئەگەرێکی چاوەڕوانکراو، ئیتر بە هەوڵی ڕووناکبیران و ئەفسەرانی کەمالی پارتی دیموکراتی تورکیا لە دەسەڵات دوورخرایەوە[١١٧].





**دووەم: شوێنی کورد لە گۆڕانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی تورکیادا (١٩٤٦ ـ ١٩٦٠)**

لەماوەی٢٧ ساڵ فەرمانڕەواییکردنی سیستەمی تاکرەویی لە تورکیادا و لە سایەی ڕژێمی پارتی گەلی کۆماریی تاکرەودا، سیاسەتی نکوڵیکردن لە بوونی کورد کاریلەسەرکرا، پارتی گەلی کۆماریی لەم سیاسەتەدا دووالیزمەیەکی سیاسیی ئاشکرای پێرەودەکرد، لەلایەك ئاغا و شێخ و دەرەبەگەکانی کوردی ڕادەکێشا و ئیمتیازی دەدانێ، لەلایەکیترەوە درێژەیدەدا بە سیاسەتی توانەوەی کورد و سەرکوتی تێکڕای جووڵانەوەکانی[١١٨]. لەڕاستیدا تورکیا بەشداری جەنگی دووەمی جیهانیی نەکرد، وەلێ لەکۆی نیو ملیۆن سوپای تورکیادا کە چوار لەشکری پڕچەکبوون، دوو لەشکریان بەتەواوی لە کوردستاندا بوون، ئەگەر هێزی کۆماندۆس و پۆلیسیش دیاریبکەین ئەوا ٢/٣ی هێزی چەکداری تورك لە کوردستاندا بوو.. هەربۆیە چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە کوردستان لە قۆناغی دوای جەنگی جیهانیدا ببوویە داگیرگەیەکی سەربازی تورك، چونکە بە درێژایی ٥٠٠ کیلۆمەتری سنووری هاوبەشی سۆڤیەت و تورکیا سوپای تورك بڵاوببوونەوە[١١٩]، ئەمەش لەبەرئەوەی تورکیا وەك نوێنەری خۆرئاوا دژی سۆڤیەت تەماشادەکرا. لەمنێوەندەدا کاروبای بەڕێوەبردن و ڕۆژانەی هاوڵاتییان و دادگاکان و دەزگاکانی دەوڵەت هەمووی لەژێر دەسەڵاتی سەربازانی تورکەکاندا بوو[١٢٠]. لەگەڵ ئەوەشدا بوونی کورد بەتەواوی نکوڵیلێدەکرا. لەمڕووەوە ڕۆژنامەی سۆن پۆستا لە ١١ ئاوریلی ١٩٤٦دا بەڕاشکاوی نووسیبووی: "هیچکات کەمایەتیی کورد[*٢١] لە تورکیا بوونی نەبووە، نە بەشێوەی نیشتەجێ، نە کۆچەر، نە خاوەن هەستی نەتەوایەتیی، نە بێهەست[١٢١]". پارتی گەلی کۆماریی لە قۆناغی جەنگی دووەمدا زەبروزەنگی سەر کوردانی زێدەترکرد، ئەمەش هەوڵێك بوو تا لەڕێیەوە کاریگەریی جوڵانەوەی بەشەکانیتری کوردستان لە سنووری تورکیادا بمرێنێت. لە قۆناغەکانی جەنگدا ڕووداوی سیوسێ گوللە لە سنوورە کوردییەکانی تورکیادا ڕوویدا، ئەو ڕووداوە لەکاتێکدا بوو کە لە دوارۆژی کۆنگرەی پارتی گەلی کۆماریدا و لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٣دا جێگری سەرۆکوەزیران (شوکری سەرا جۆغلو) ڕایگەیاند" تورکین و تورکچین، هەموو ڕۆژی تورکچێتیمان لەزیادبووندایە. بەم لۆژیکە ڕەگەزپەرستییەوە، لە ساڵانی جەنگی جیهانی دووەمدا کورد ترسناکترین گرفتی پرۆژەی تۆرانیزمی ڕووبەڕووببوویەوە. لەڕاستیدا کورد ڕۆڵی هەبوو لە جۆری مامەڵەی تورکیا لەگەڵ ڕووداوەکانی جەنگدا، چونکە پشتیوانیکردنی تورکیا لە ئەڵمانیای

هیتلەری و بەشداریکردن لە جەنگدا، بێگومان گەلی کوردی دەهێنایە جۆشوخرۆش و کوردستانی لە تورکیا جیادەکردەوە، هەربۆیە تورکیا ئەو بڕیارەینەدا، (ئەلفنستۆن) لە وتارەکەیدا (کورد و مەسەلەی کورد) نوسیویەتی" دەنگوباس هەیە کە ئەگەر تورکیا ناچاربێ لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا بەشەڕبێ، گەلی کورد سەربەخۆیی بەدەستدەهێنێت، واتێدەگەم هیچ شتێك هێندەی بەرپابوونی شۆڕشی رزگاریخوازی کورد لە تورکیا کارناکاتە سەر مەسەلەی راگەیاندنی شەڕ دژی هاوپەیمانان لە تورکیا"، هەروەها باڵوێزەی ئەڵمانیا لە تورکیا (فون پاین) نوسیبووی: "تورکیا لە چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد هەترەشی چوبوو، چونکە بەرایینەدەدا خۆی بە شەڕی جیهانییەوە مژووڵبێت و کوردیش کەڵك لەو دەرفەتە وەرگرێ و سەربەخۆیی بەدەستبهێنێ"، هەروەها نووسیویەتی: "پروپاگەندە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆ ئەژنۆی تورکانی شکاندووە". لەلایەکیترەوە هەمیشە تورکیا بۆ هاوپەیمانانی دووپاتدەکردەوە کە لە هەر جێگەیەك سەرەنێزەی تورك هەبێت مەسەلەی کورد لەوێدا بوونی نییە. رامبۆ نووسیویەتی: "نکولیکردن لەبوونی کورد لەوەوە سەرچاوەیگرتووە کە هێندە لە کورد دەترسن نایەڵن وشەی کوردیش بە زاریاندا بێ". [١٢٢] لە ساڵانی دەوروبەری جەنگی جیهانی دووەم تورکیا ناوچە کوردنیشنەکانی وەك بە ناوچەی قەدەغە کراو راگەیاند و رێگای بە کەس نەدەدا هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کورداندا دابمەزرێنێ و توخنی ژینگەی کوردان بکەوێت"[١٢٣]، لەبەرئەوە خوێندنەوەی هەلومەرجی راستەقینەی کوردستان لەو قۆناغەدا ئێجگار ئاڵۆزە، چونکە سیاسەتی دوای جەنگی دووەم لە تورکیادا، دابڕینی کورد بوو لە دونیای دەرەوە و بەشەکانیتری کوردستان. پێویستە بوترێت لەگەڵ ئەم هەموو رێوشوێنە سیاسییە توندەی حکومەتی تورکیادا بۆ بندەستکردن و مراندنی رەنگودەنگی کورد، کەچی شوێنی کورد لە سیاسەتی ئەمەریکا و سۆڤیەت و زلهێزاندا جێی خۆی گرتبوو. بەنیسبەت ئەمەریکاوە کوردستانی تورکیا و ئێران مەیدانێك بوون بۆ جەنگیسارد دژی سۆڤیەت.. بۆنموونە لە دیکۆمێنتەکاندا باس لە پڕوپاگەندەی سۆڤیەت دەکرێ لەناو کورداندا[١٢٤]. لەڕاستیدا مەترسییەکانی ئەم هەوڵانەبوو کە ئەوەی دەگەیاند هەر بڵاوبونەوەیەکی بیری کۆمۆنیزم لە کوردستان وەك کێشە بۆ ئەمەریکا تەماشادەکرا، لەبەرئەوە بەخۆڕایی نەبوو کە ئەمەریکا هاریکاریی مانەوەی نیو ملیۆن سەربازی تورکی دەکرد لە رۆژهەڵاتی تورکیا، چونکە ئەمە رێگربوو لە هەر جووڵانەوەیەکی چەکداریی کوردیی لە تورکیادا، بەمەش بێبەشبوون و بێئاگابوونی ئەو تەڤگەرەی لە جووڵانەوەکانی کوردی





عێراق و ئێران مسۆگەردەکرد[١٢٥]. دیارە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان ١٩٤٦، زیاتر تورکیای هۆشیارکردەوە لەبەرامبەر هەر کاریگەرییەکی ئەو رەوشە بۆ سەر کوردستانی باکوور. تورکیا و عێراق کۆماری مەهاباتیان بە سەرەتایەك دەزانی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بنکەفراوان کە دواجار دەبوو بەهۆی گۆڕانی نەخشەی جوگرافیی ئێران و عێراق و تورکیا، ئەمەریکاش ئەم بنکەیەی بە بنکەی سۆڤیەت دەزانی لە نێوچەکەدا، ئەمەش هۆکاری زیاتر نێزیکبوونەوەی تورکیا بوو لە بەرەی خۆرئاوا.[١٢٦] پێمانوایە مەبەستی تورکیا لە نزیکبوونەوە لە خۆرئاوا تەنها مەترسی بوو لە کورد و مەبەستی خۆرئاواش بۆ دۆستایەتی تورکیا بریتیبوولە مەترسی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت، لەبەرئەوە تورکیا هەوڵەکانی دژی ئەم کۆمارە خستەگەڕ، ئەوەبوو لە ٢٩ی ئازاری ١٩٤٦ دوای دوو مانگ لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان، هەریەك لە عێراق و تورکیا واژۆی رێکەوتنێکیانکرد لە ئەنقەرە کە دەتوانین بە چڕوپڕترین رێکەوتننامە بیناسێنین لە مێژووی پێوەندیی تورکیاو عێراقدا، ئەم رێکەوتنە بەندەکانی تەرخان کرا بوون بۆ چارەسەری کێشەی ئاسایشیی نێوخۆیان و گۆڕینەوەی تاوانبارانی یەکتری و تەسلیمکردنەوەیان. لەمڕووەوە پەیامنێری رۆژنامەی دێلی میل لە قودس نوسیویەتی: "مەبەست لەو رێکەوتنە مەسەلەی کورد بوو لە تورکیا و عێراق کە بەگەورەترین گرفتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناسرابوو[١٢٧]، بەندەکانیتر لەو راپۆرتە دیبلۆماسییانەوە بوو کە ئەمەریکی و ئینگلیزەکان بەردەوام بەرزیاندەکردنەوە و پێیانوابوو لەلای سەرانی کۆمار نەخشە هەیە بۆ ئازادیی هەموو کوردستان، هەروەها لە مارسی ١٩٤٦ بەشی توێژینەوەی سەربە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا رایگەیاند کە روسیا دەیهەوێ سەربەخۆیی کوردستان و دەوڵەتی کوردیی بکاتە فاکتەرێك تا سنووری خۆی فراوانبکات و بیگەیەنێتە بەندەری ئەسکەندەرۆنە لە سنووری تورکیا و سوریا[١٢٨]. لەبەرئەوە تورکیا و عێراق بە پەلە رێکەوتن و دراوسێیەتیی چاکیان نوێکردەوە. سەبارەت بەم رێککەوتنە کەمال چادرچی یەکێك لە سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراق رایگەیاند: "ئەم رێکەوتنە دەبێتە کارەسات بۆ وڵاتانی عەرەبی."[١٢٩] لەڕاسیدا رووسەکان لەگەڵ خواستەکانی کوردی تورکیادا نەبوون، بەڵکو ئەوان کاریاندەکرد بۆ یارمەتی ئەرمەنەکان دژی تورك[١٣٠]، پێمانوایە تورکەکان بانگەشەی دەستی دەرەکییان کردبووە پاساوێك بۆ زیاتر چەوساندنەوەی گەلی کورد لە تورکیا، ئەگەرنا لە ماوەی جەنگی دووەمدا سۆڤیەت هەوڵینەدەدا پەیوەندی لەگەڵ کوردی تورکیا و سوریا دروستبکات، سۆڤیەت پێیوابوو ئەوان واتە

کورد لایەنگری بەریتانیان، ئەوە تەنها قازی محەممەد و باقیرۆڤ بوون لە باکۆ، لەگەڵ وەزیری سۆڤیەت ئیبراهیمۆڤ دەیانوت دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی دروستدەکەین کە تورکیا و عێراقیش بگرێتەوە[١٣١]. لەڕاستیدا تورکیا تەنها لە کورد دەترسا نەك سۆڤیەت، ئەگەرنا دەسەڵاتدارانی تورکیا پێش ڕاگەیاندنی کۆمار و لە بەهاری ١٩٤٥ بە بیانووی جموجوڵی کوردایەتی لە دیاربەکر و گەڤەر ١٢٠ کەسایەتی و سەرۆکهۆزی کردبەداردا[١٣٢]، لە کاردانەوەی کۆماری مەهابادیشدا و لە هاوینی ١٩٤٦دا دەوڵەت دەستیکرد بەدرێژەدان بە سیاسەتی ڕاگواستن بۆ ڕۆژئاوا و باکوور، واتە بۆ قارس و ئەردەهان، لەمبارەیەوە پەیامنێری ڕۆژنامەی مانشستر گاردیانی ئینلگیزی لە ژمارەی ڕۆژی ٢٦/١٢/١٩٤٦دا بڵاویکردەوە کە فەرمانڕەوایانی تورکیا لە کۆتایی ١٩٤٥و سەرەتای ١٩٤٦ کەوتوونەتە ڕاگواستنی کورد لە نێوچە سنوورییەکانی تورکیا[١٣٣]. بەمجۆرە حکومەت سیاسەتی کۆچی زۆرەملێی وەك کاردانەوەی ئەو ڕەوشە گرتەبەر و بۆ درێژەدان بە سیاسەتی تۆرانیزمیش تورکی کۆچکردووی وڵاتانیتری لە شوێنیاندا نیشتەجێدەکرد[١٣٤]. بەمڕەنگە کۆماری مەهاباد زیاتر تورکیای لەسەر سیاسەتی تواندنەوەی کورد سوورکرد، هەرچەندە ئەو ڕووداوە ڕاستەوخۆ کاریگەریی نەبوو لەسەر پەیوەندی ئێران و تورکیا، بەڵام ئەنقەرە دواجار بەبیستنی هەواڵی ڕووخانی کۆمار فرە خۆشحاڵبوو، لەمبارەوە تورکیا هیوای خواست شای نوێ لە ئێراندا دژی هەڵگەڕاوەکان درێغینەکات[١٣٥]. کەواتە ڕووخاندنی مەهاباد کۆتاییهێنانبوو بە مەترسی یەکپارچەیی تورکیا و عێراق، لەلایەکیتریشەوە کۆتایی بە نێونەتەوەییکردنی کێشەی کورد هێنا لە ماوەی دەرکەوتنی جەنگیساردا، ئیتر پرسی کورد لە ئەجێندای کارنامەی نێودەوڵەتیدا تا ماوەی ٤٥ ساڵ دەرنەکەوتووە[١٣٦]. چاودێرانی غەوارە لەمەڕ پرسی کورد وێنەیەکی تاروتاریك و زەبروزەنگێکی وەحشەتناك پیشانی دنیای دەرێ دەدەن[١٣٧]، چونکە تەنها بەمجۆرە حکومەتی تورکیا زەمینەی بۆ دەرەخسێ درێژە بە سیاسەتی چەوساندنەوەی لەهەمبەر کوردان پەیرەوبکات. ڕۆژنامەی سۆن پۆستا لە ١١ی ئاوریلی ١٩٤٦ بەڕاشکاوی نوسی: " هیچکاتێك کەمایەتی کورد لە تورکیا نەبووە، نە نیشتە بێ، نە کۆچەر، نەخاوەن هەستی نەتەوایەتی، نە بێهەست"[١٣٨]، هەروەها لە هەمان ڕۆژنامەدا کە (١٠) ساڵ دوای کارەساتی دەرسیم نووسەر چووەتە ئەوێ نوسیویەتی: "چەند کەسێ لە خەڵکی ئەو مەڵبەندە بۆیانباسکردم کە بێجگەلە ژاندرمە و مەئموری باجوەرگرتن هیچ موچەخۆرێکی حکومیان نەدیوە، لەوێ نە سەنعەت هەیە و نە کشتوکاڵ و نە بازرگانی، خەڵك پێیانوابوو





دەوڵەت واتە باجگر و پۆلیس، چونکە قوتابخانە و پزیشك نەبوون، خەڵك هەر نازانن دەرمان چییە، لەنێوان گوندەکان ڕێگا نییە"[١٣٩]، هەمان ڕۆژنامە لە ١١/٤/١٩٤٦دا و لە کاردانەوەی ئەو ڕەوشەی لەناو کوردی باشوور و ڕۆژهەڵاتدا دەگوزەرا نووسیبووی: "لامان ڕوون و ئاشکرایە لە ئێران و عێراقدا، کەسانێك هۆشیاری ئەوتۆ لەناویاندا نییە، باسی کوردبوون دەکەن، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە لە تورکیادا کورد نییە، هەروەها دەڵێ: "لە تورکیادا تورکی کێوی یاخود تورکی دڕەندە هەیە، بۆیە لەسەرمانە بەزووترین کات بیانکەینەوە بە تورك، ئەگەر دراوسێکانمان نایانەوێ بڕووخێن، ئەوا پێویستە هەمیشە وریابن"[١٤٠]، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕژێمی فرەپارتایەتی لە تورکیا سیاسەتێکیتر لەمەڕ کوردان دەگیرێتەبەر، نووسەرانی هەمان ڕۆژنامە دەنووسن ئێمە هیچ شتێکمان بۆ کورد نەکردووە، هەرچیەکییان هەبووبێت لێمانسەندوون، ئیتر بۆمان نییە بەمجۆرە لەتەکیان بەردەوامبین،[١٤١] هەروەها نووسەری بەناوبانگی تورك (ئوستونگێل) لە یاداشتەکانی زیندانیدا دەنوسێ: "لەسایەی کۆماری ئەتاتورکدا شاری مێردین کە کەوتووەتە سەر چیایەك، ڕێك لەوێ و لەوشوێنەدا و بە بەرچاومەوە لاوانی کورد و عەرەب لەناو قەفەزی ئاسنیندا دەمردن[١٤٢].

لە ململانێکانی پێش هەڵبژاردندا تەنها گوشاری سەر دەنگە ئایینیەکان کەمکرایەوە، ئەگەرنا لە نەهجی هەردوو پارتی بەرهەڵستکار و باڵادەستدا حاشا لە بوونی گەلی کورد دەکرا، تا ئەوکاتەش بە کوردی قسەکردن و لەبەرکردنی جلوبەرگی کوردی قەدەغەو زەوتبوو[١٤٣]، لەبەرئەوە گواستنەوەی سیستەمی سیاسیی لە تاکپارتییەوە بۆ فرەپارتایەتی بەشێوەیەکی نیگەتیڤ بەسەر ژیانی سیاسیی کورداندا شکایەوە، چونکە پارتە تورکییەکان لەسەر حسابی دەنگی کورد خۆیان لە شێخ و ئاغەکان نزیککردەوە، ئەو ئاغا و شێخانەی کە نوێنەری چینەکانی کورد بوون، لەبەرئەوە چینی باڵادەستی تورك لە پەرلەمان دژی هەر شێوەیەك لە شێوەکانی گۆڕانکاریی کشتوکاڵی بوون، ئەمەش لە بەرژەوەندی دەرەبەگی کورد بوو. لەلایەکیتریشەوە یارمەتیدەری هێشتنەوەی نفوسی تەقلیدیی سەرۆکهۆز و شێخەکان بوون، لێرەشەوە فاکتەرەکانی نەبوونی ڕێکخستنێکی سیاسیی کوردی زیاتر درێژەیدەکێشا[١٤٤]، لەبەرئەوە پارتە سیاسییەکانی تورك کەوتنە ململانێ بۆ دانوستانکردن لەگەڵ کەسایەتییە بەهێزەکانی نێوچەی کوردەواریی، چونکە تەنها لەڕێی ئەوانەوە دەیانتوانی جوتیاران ڕاپێچی سندوقەکانی دەنگدان بکەن[١٤٥].. کەواتە بەم هەڵوێستە پارتی دیموکراتی تورکی و جەلال بایار و

عەدنان مەندەریسی هەمان یاری سەردەمی ئەتاتورکییان دووبارەکردەوە لە رامکردنی کورد بۆ درێژەدان بە رەوتی سیاسیی تورکیا[١٤٦].. هەربۆیە پارتی دیموکراتی تورکیا چەوتی و چەوێڵییەکانی سیاسەتی پارتی گەلی کۆماریی لە مامەڵەکردن لەگەڵ نەریتی گوندنیشنەکان کرد بە ئەزموونێك بۆ سەرکەوتنی، چونکە لە سەردەمی کەمالیدا سیاسەتیی بەمەدەنیکردن و ریفۆرمەکانی کەمالیزم رێزی بۆ نەریتی گوندنشین و تەکیە و خانەقاکانی کورد دانەدەنا، بەمجۆرە پارتی روویکردە خواستی لادێنشین و چادرنشین و لایەنگرانی مەزهەب و رێبازە ئایینیی و دەروێشییەکانی کورد[١٤٧]، چونکە لە فرەحیزبیدا رۆڵی جەماوەر لە ژیانی سیاسییدا دەبێتە جێگای بایەخ، ئیتر نەدەکرا دەنگی جەماوەر لە هەڵبژاردنەکاندا حسابی بۆنەکرێ، کوردیش لەونێوەندەدا لە دەستی شێخ و ئاغاکان و سەرۆکهۆزەکاندا بوو، ئیتر ئەم هۆکارە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەرەبەگی کورد و تورکی لێکنزیککردەوە چونکە پارتە باڵادەستەکان پارتی بۆرجوا بوون[١٤٨]. ئەودەمانەی بۆرجوای تورك دەست لەسەر سنگ بەرامبەر ئاغا و دەرەبەگی کورد وەستابوون، ئیتر هێندەیتر ئەو ئاغا و دەرەبەگانە پلەوپایەیان لەناو خێڵ و هۆزەکانیان پتردەبوو، بەمپێیە دەتوانرێت بوترێت کە سەردەمی فرەپارتایەتیی بۆ کوردستان سەردەمی بوژانەوەی دەرەبەگایەتی بوو، چونکە ئەو نزیکایەتییەی لەگەڵ حکومەت دروستبوو نزیکایەتی کورد نەبوو، بەڵکو نزیکایەتی چینی دەوڵەمەند و دەرەبەگی کورد بوو[١٤٩].

بەم نەزمە ململانێی نێوان پارتی گەلی کۆماریی و پارتی دیموکراتی تورکیا لەمەڕ دەنگەکانی کورد بەردەوامبوو، وەلێ لەتەك ئەمەشدا لە رامیاریی هەردوولادا سیاسەتیی نکوڵی لە بوونی کورد هەر درێژەیدەکێشا و نەگۆڕبوو، لەلایەکیتریشەوە زیندووکردنەوەی هەیمەنەی دەرەبەگ و ئاغا و رێبازە شێخایەتییەکان، زیاتر خواستی ئەمەریکا و خۆرئاوا بوو، چونکە ئەمەریکا ئەو بزاڤە ئیسلامییە و خێڵەکییەی لەژێر ناوی پشتێنەی سەوز بەرامبەر کۆمۆنیزم بەرێوەدەبرد، چونکە وەك ئەزموونکراوە سونیگەریی نەقشبەندیی لایەنی کۆنەپارێزی دەوڵەتی هەمیشە قەبوڵبووە[١٥٠]. ئیتر لە قۆناغی دوای مستەفا کەمالدا بەکارهێنانی تیۆری ئایین بۆ ئامانجە سیاسییەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا خراوەیە لیستی ئامانجەکانی دەوڵەتەوە[١٥١]. لەمبارەیەوە ئەدمۆنز دەنووسێ: "دوای سیستەمی فرەپارتایەتیی لە تورکیا، داهاتووی دەنگی کورد لە هەڵبژاردنەکاندا گرنگی و بەهای زۆری دەبێ و ئیتر نرخ و بایەخدانی فیودال و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد بەرزدەبێتەوە[١٥٢].





ئەوکات پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووریی کورد لەژێر هەیمەنەی رۆحی ئەو رێبازە ئایینییانە بوون کە لە کوردستاندا ئامادەییان هەبوو[*٢٢] هەموو ئەمانە لە سەردەمی رژێمی تاکحیزبیدا سەرکوتکرابوون، کوردیش سەرکوتی رۆحی و کلتوری و زەبروزەنگی سەر راپەرینەکانی خستبووە ئەستۆی پارتی گەلی کۆماریی و پشتگیریی خۆیان بۆ بەرەی بەرهەڵستکار وەکو تۆڵەیەك بۆ سەر کەمالیزم دەزانی[١٥٤]. وەلێ ئەوەی جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە پارتی گەلی کۆماریش لەپاش جەنگی دووەمی جیهانی و لە بانگەشەی هەڵبژاردنەکانیدا کەوتە نەرمی نواندن و بەهەمان شێوەی بەرهەڵستکارانی بەڵێنی چاکسازیی بە هەرێمەکانی رۆژهەڵات دەدا، ئەوان لە پێش بەڵێنەکانی پارتی دیموکراتی تورکیادا مۆڵەتیان بە خوێندنی ئایینیی داو لە مزگەوتەکاندا قوتابخانەی تایبەتی ئایینیان بۆ گوندەکان دامەزراند[١٥٥]، تاڕادەیەکیش رێگەیان دا کوردە دوورخراوەکان بگەڕێنەوە بۆ سەر زەوییە زەوتکراوەکانیان[١٥٦]. تەنانەت سەرۆك وەزیرانی تورکیا ١٩٤٧ رایگەیاند" کاتی ئەوە هاتووە کورد بۆ سەربازی بانگبکرێن[١٥٧]. ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگ بوو، چونکە تائەوکاتە هیچ پۆستێکی هەستیار بە کورد نەدەدرا و بانگهێشتکردنیان لە دامەزراوەیەکی هەستیاری وەك سوپا جێگای بایەخدان بوو بە کورد. کەواتە دەکرێت بڵێین کورد لە نێوان پارتی دەسەڵاتو بەرهەڵستکاردا ببوویە ماددەی ململانێ و دانوستان[١٥٨].. بۆنموونە پارتی گەلی کۆماریی لەبەرامبەر بانگەشەی بەڵێنەکانی دیموکراتەکاندا چەند خزمەتگوزارییەکیان پێشکەش بە دێهاتییەکان کرد، لەوانە هەستان بەپێدانی تراکتۆر بۆ جوتیارەکان و راکێشانی کارەبا بۆ لادێکان و تۆکمەکردنی پەیوەندی لەتەك شێخ و ئاغاکاندا، بەمەش هەموو ئەو هەوڵانەی مستەفا کەمال بۆ بڕینەوەی شێخ و ئاغاکان دابووی، لەپێناو دەنگ و کورسیی پەرلەماندا خودی پارتەکەی زیندوویکردنەوە[١٥٩]. هەرچەندە ئەم زیندووکردنەوەیەش هیچ ئاکامێکی لەسەر ناوەڕۆکی کێشەی کوردی بۆ چارەسەر نەگۆڕی، بەڵکو تەنها نزیکبوونەوەی کۆمەڵێك دەوڵەمەندی کورد بوو لەگەڵ چینی فەرمانڕەوای تورکیا و دواجار ئەوانەی کە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئایینییان هەبوو لەناو کورددا بەشێنەیی دەستیانکرد بە هاوکاریی لەگەڵ چینی فەرمانڕەوای تورکیادا، بەبێ گرنگیدان بە هەڵوێستیان لەسەر ناسنامەی نەتەوەیی کورد، چونکە ئەم زەنگین و لۆرتانەی کورد لە شارەکاندا نیشتەجێبوون و سەرقاڵی بازرگانی خۆیان بوون، جارجاریش بەشداربوون لە کۆبوونەوەی شارەوانی و کاروباری گشت ویلایەتەکاندا، چونکە دەسەڵات لەڕێگای ئەوانەوە کوردی کۆنترۆڵکردبوو(

[١٦٠].. بۆنموونە پارتی دیموکرات دەیتوانی بە کۆنترۆڵکردنی ٢٠ خاوەن زەوی و ئاغا تەواوی دەنگەکانی شاری دیاربەکر و دەوروبەری مسۆگەربکات[١٦١]، لەگەڵ ئەوەشدا تاوەکو ساڵی ١٩٥٠ نەیانتوانی وابکەن لە کورد کە بەشداری کارای هەڵبژاردنەکان بکات.. بۆنموونە ساڵی ١٩٤٨ لەکاتی هەڵبژاردنی گشتی پەرلەمان، کوردی ٦٠ گوندی ویلایەتی ئەرزەڕۆم هەموویان مانیانگرت و بێجگەلە دەمڕاستی گوندەکان کەس دەنگینەدا[١٦٢]. کورد ئەوکات لە خواستی چارەسەری بنچینەییدا بوون، هەموو ئەو بەڵێنانە خواستێکی سەرمایەداریی رووتی رەوشی تورکیا بوو، چونکە سەرمایەداریی تورك پێویستی بە کەرەستەی خاوبوو، بۆیە روویکردبووە کوردستان[١٦٣]، هەربۆیە لە چوارچێوەی ئەم سیاسەتەدا بوو پارتی گەلی کۆماری بڕیاریدا ١٩٤٧ دوو هەزار بنەماڵەی ئاغا و دوورخراوەکان بگەڕێنەوە سەر موڵك و ماڵی خۆیان، ئەمە بێجگەلە ناوچە قەدەغەکراوەکانی[١٦٤] ئاگری و ساسۆن و تونجەلی و زیلان بوو. لەڕاسیدا ئەم بڕیار و برەودانە بە کوردستان و دەرەبەگی کورد دادی کوردی نەدا، چونکە سیاسەتی توانەوە هەر بەردەوامبوو[١٦٥]، تا ١٩٤٨ چاودێریی گشتیی سەرو ویلایەتەکان کاری پێدەکرا کە ٢٣ ویلایەتی لە کۆی ٦٣ ویلایەت لەو پرۆسەیەدا بوون[١٦٦]، لە ئاستی هەرێمیشدا پەیمانی عێراقی تورکی دژی جووڵانەوەی کوردی لەگۆڕێدابوو، پارتی کۆمۆنیستی عێراقی لە نووسراوێکدا نارەزایی دژی پەیمانی عێراقی تورکی لە ٣٠ ئازاری ١٩٤٧ ـ ٢٤ کانوونی دووەمی ١٩٤٨ دەربڕیبوو، تیایدا رۆشنایی خستبووەسەر رەوشی ژیانی کورد لە باکووری کوردستان، کە لەژێر سایەی دەوڵەتی تورکیدایە و پێیوایە بەندەکانی ٢ ـ ٦ لە پەیماننامەکەدا بەئاشکرا هاوکاری ئێران و عێراق و تورکیا دەردەخات بۆ سەرکوتی جووڵانەوەی کوردستان لەژێر ناوی دروشمەکانی دابینکردنی ئاسایشدا[١٦٧]. بەردەوامبوونی کورد فاکتەری نزیکبوونەوەی ئێران و عێراق و تورکیا بوو، لە یاداشتی نەتەوەپەروەرانی کورددا کە ١٩٤٨ سەبارەت بەو رێکەوتنە درایە نەتەوە یەکگرتووەکان هاتبوو: "ئامانجی سەرەکی و بنەمای ئەم رێکەوتننامە بۆ لەناوبردنی میللەتی کورد هاتووەتەکایەوە"[١٦٨]، لەبەرئەمە بوو کە کورد بەتەواوی یاخیبوونی خۆی دژی دەسەڵاتی پارتی گەلی کۆماریی راگەیاندبوو. سەردارانی تورکیاش باش هەستیان بەم مەترسییە کردبوو، ئیتر پێویستبوو بەرنامەدارێژەرانی تورکیا بە هاوکاری هاوپەیمانان رێگایەکی نوێ هەڵبژێرن، مێژوونووس (ئە. نۆخۆسیلۆڤ) لە کتێبەکەیدا کە لەسەر تورکیایە نووسیویەتی: " تەنها١٩٤٩ بەبێ ئەوەی لە تەنها رۆژنامەیەکدا باسبکرێ، لە شەش مانگی ئەو ساڵەدا، لە ٢٢ ویلایەتی





تورکیا ٣٢٣ پێکدادانی چەکدارانەی بە خۆیەوە بینیوە لەنێوان جوتیاران لەلایەك و ژاندرمە و هێزەکانی تورك لەلایەکیترەوە، لەم پێکدادانانەدا جوتیاران دەزگا دەوڵەتی و دەرەبەگایەتییەکانیان سووتاندووە و زەویوزارەکانیان بەسەر خۆیاندا دابەشکردووەتەوە[١٦٩]. لەڕاسیدا دەکرێت ئەم رق و کینەیەی پاڵە و جوتیاری کورد لە رژێم و دەسەڵات پاڵنەری راستەوخۆی ئاشناکردنی کورد بوو بە لایەنگریی پارتی دیموکراتی تورکی بۆ هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك بوو لەوانە:

١) وەك تۆڵەکردنەوەیەك لە ستەم و بندەستکردنی چەندین ساڵەی پارتی گەلی کۆماریی، چونکە میللەت لەبەرئەوە پشتگیرینەکرد کە پرۆگرامەکەی دانینابێت بە بوونی کورددا

٢) کورد بوونە لایەنگری ئەم پارتە چونکە پارتێکیتر لەگۆڕێدانەبوو[١٧٠]، تەنها پارتی کرێکار و جوتیارانی[*٢٣] تورکی بانگەشەیاندەکرد لە ناوچەکەدا، ئەویش دوای چەند مانگێك کە کتوپڕ پەرەیسەند، حکومەت لە دیسەمبەری ١٩٤٦ قەدەغەیکردو وەستاندی

٣) بەهۆی ئەوەی پارتی دیموکرات رێرەوێکی ئیسلامییانەی لە نێوچە کوردییەکاندا گرتبوو. لەڕاستیدا ئەم رێڕەوە بەهۆی ئەوەوە بوو تا خۆی لە بنەما نەتەوەییەکان بدزێتەوە، وەلێ لەبەرئەوەی گەلی کوردیش ٩٩٪ موسوڵمان بوون و لەسەر مەزهەبی شافعی بوون، گرنگییاندا بەم پارتە و رێڕوە ئاینییەکەی[*٢٤]، چونکە پارتی هەستی دەکرد پاڵە و نەدار و جوتیاران لە تورکیا تەنها بە ئایین کۆنترۆڵدەکرێن، هەربۆیە لە هەڵبژاردنەکاندا دەیانوت گەلی تورکیا گەلێکی موسوڵمانە، ئەی کوردینە ئێمەش موسوڵمانین وەك ئێوە، ئەگەر لە هەڵبژاردن سەرکەوین ئەوا لە هەر دێیەك مزگەوتێك دەکەینەوە[١٧١]. بەمجۆرە هۆکاری ئایینی پاڵی بە کوردەوە نا دەنگ بە دیموکراتەکان بدەن.. بۆنموونە نەورەسییەکان لە ئاکامی گیرۆدەبوون و فشاری سەریان و زیندان و قۆڵبەستکرانی چەندینجارەی سەعیدی کوردی لە سەردەمی پارتی گەلی کۆمارییدا، هەموویان دەنگیاندا بە پارتی دیموکراتی تورکیا. ئەم لایەنگیرییە بەجۆرێك بوو کە خودی سەعیدی کوردی پیرۆزبایی سەرکەوتنی لە جەلال بایار کرد، لەبەرامبەردا ئەوانیش ئازادیی تەواوی بانگەشەکەکردنی پەیامەکەیان بۆ فەراهەمکردبوون[١٧٢].. بۆنموونە بزووتنەوەی نەورەسییەکان لە خێزان و دەوروبەری هانی کوردییان دابوو تا دەنگەکانیان بدەن بە دیموکراتەکان[١٧٣]. لەڕاسیدا نەورەسییەکان بەهێزترین رەوتی سۆفیگەریی بوون کە لە ژیانی سیاسی تورکدا کاریگەرییان لەسەر هاوکێشە سیاسییەکان هەبوو[١٧٤]. بەم میکانیزمە پارتی دیموکراتی تورکیا

رووی لە تەماعی بیروباوەڕ و ئابووریی گوندییەکان بوو، لەکاتێکدا پارتی گەلی کۆماریی خراپ دەیڕوانییە جوتیاران و بەگۆڵمەزی پێشکەوتنی پرەنسیپەکانی ئەتاتورکی هەژماردەکردن[١٧٥]. نەقشبەندیەکانیش[*٢٥] کاریگەریی گەورەیان لەسەر سەرکەوتنی پارتی دیموکراتی تورکیا هەبوو، بزاڤی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە دەوروبەری بەدلیس پشتیوانی فراوانیان لە دیموکراتەکان کرد، بەشێوەیەك کە دیموکراتەکان دەستیان بە تۆڕێك گەیشت بوو کە سەرانسەری کوردستانی دەگرتەخۆ، ئەم تۆڕە لە هیچ جێگایەکی تورکیا وەك کوردستان فراواننەبوو[١٧٦] هاوکات قادرییەکانیش[*٢٦] پشتیوانییان لە دیموکراتەکان دەکرد[١٧٧]، ئەوانەی سەربە ڕێبازی سلێمانی[*٢٧]بوون لەبەر دژایەتییان بۆ ئەتاتورك‌و ریفۆرمەکانی کاریگەرییان هەبوو لە دوورخستنەوەی دەنگدەران لە پارتی گەلی کۆماریی[١٧٨]

٤) دیموکراتەکان هەموو سیاسەتە توندوتیژەکانی پارتی گەلی کۆمارییان دەخستەوە یادی خەڵکی کوردستان و لەژێرەوە دەیورووژاندن، ئەمەش هۆکارێکیتری نەفرینی سەر ئەو پارتە بوو.. بۆنموونە دیموکراتەکان بۆ لاوازکردنی عیسمەت ئینۆنۆ، دەستیانکرد بە باسکردن و پەنجە تێژەنینی مەسەلەی ڕووداوی سیوسیٚ گوللە، هەربۆیە بە فەرمانی وەزیری بەرگریی، راوێژکاری دادگەی سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا رۆژی ٢٨/٦/١٩٤٦، ئیفادەی سەر لەشکر مستەفا موغلای و ئەو کەسانەی تۆمەتبارن بە ڕووداوەکە وەردەگریٚ بۆ لێپێچینەوە[١٧٩]. ئیتر ئەم ڕووداوە دەبێتە بنێشتە خۆشەی میدیای تورکیی و تەنانەت لە ١٩٤٨ ڕووداوی سیوسیٚ گوللە لە ئەنجومەنی گەورەی میللی تورکیا باسیلێوەدەکرێت[١٨٠]

٥) دیموکراتەکان بەتەواوەتی کەوتبوونە ژێر رکێفی هەیمەنەی ئەمەریکاوە، چونکە لەڕێی ئابووریی و پەیوەندی نێونەتەوەییەوە پشتگیری ئەوان بوو، لەهەمانکاتدا ئەمەریکا دژی هەر خواستێکی جوداخوازیی کوردیش بوو، هەربۆیە ڕێوشوێنەکانی نزیکبوونەوەی کوردی لە پارتی دیموکراتی تورکیا فەراهەمهێنابوو کە بریتیبوولەوەی کاپیتالیستەکانی تورك بەتەواوی بازاڕی کوردستان وابەستە بە بازاڕەکانی خۆیان بکەن[١٨١].. بۆنموونە ترومان لە ١٢ی ئازاری ١٩٤٧ پێش کۆبوونەوەی کۆنگرێس وتبووی: "پێویستە یارمەتی تورکیا بدەین لەسەر شێوەی مەدەنی و نویٚ، تا یەکێتی نەتەوەییان پارێزراوبیٚ، چونکە پاراستنی سیستەمی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێویستمانە، بەمجۆرە مەبدەئی ترومان بەرگریکردنبوو لە دیموکراسیی لە تورکیا کە مەبەست پێی فشاری دەستیی دەرەکیی و نەیارانی غەوارە بوو[١٨٢]. بەمجۆرە لە هەڵبژاردنی گشتی ساڵی





١٩٥٠ دیموکراتەکان زۆربەی دەنگی رۆژهەڵاتییان بەدەستهێنا[١٨٣].

لە ئەنجامەکانەوە دیارە کە کوردستان ببوویە بنکەی سەرەکی پارتەکە. بەو ئاکامەیش لە هەوەڵەوە و لەو قۆناغەدا زەبروزەنگی پۆلیس و هێزەکانی سوپا لە کوردستان کەمکرایەوە، بۆ یەکەمجار کورد و تورك وەك یەك بوونە خاوەنی مافی دەنگدان، ئیتر زۆر لە ئاغاکانی کورد کە لە سەردەمی پارتی گەلدا دوورخرابوونەوە، لەم قۆناغەدا بوونە ئەندام پەرلەمان و وەزیر و هەرمانبەدەستی میریی، ئیتر ووردەووردە لە کوردستان قوتابخانە و ڕێگاوبان و نەخۆشخانە کرایەوە[١٨٤]، راگواستنی بەکۆمەڵ لەسەر کورد نەما و گرٍ و گێچەڵی دامودەزگاکانی دەوڵەت لەسەر کوردستان پووکایەوە[١٨٥] و کوردە سونییەکان پەیوەندیان لەگەڵ تورکە سونییەکان لە عەلەوییە کوردەکان[*٢٨] پێباشتربوو. ئەمەش مایەی دڵنیایی لێپرسراوانی حکومەت بوو[١٨٦]، ئاغاکان لە ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکدا وەك رەگەزێکی گرنگ رۆڵیان هەبوو، ئەوان پەیوەندی نێوان گوندی نەخوێندەورا و دونیای دەرەوە بوون[١٨٧]، بەجۆریٚ لە هەڵبژاردنی ١٩٥٣دا کورد بەجۆرێك لەگەڵ پارتی دیموکرات بوون کە لە کۆی ٤٠ کورسی شاری دیاربەکردا توانییان ٣٤ کورسی مسۆگەربکەن. دیارە دیموکراتەکان تەنها ئاغاکانیان رازیدەکرد و ئاغاکانیش جوتیارەکانیان لەژێر رکێفدا بوون. ڕێگەیەکیتری ئەم سەرکەوتنە ئەوەبوو کە دەربارەی ڕێسا و ڕێچکەکانی موڵکایەتی، دیموکراتەکان فەتوایان لە شێخەکان وەرگرتبوو تا جوتیارەکان بەوجۆرە رژێمە رازیبکەن[١٨٨]. لێرەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی کە ئەگەر ئاغاکان لەباری ئابوورییەوە جوتیاریان چەوساندبێتەوە و لە وەشگوزەرانی و ژیان هەژارانیان تۆراندبێت، ئەوا شێخ و پیاوانی ئایینیش لەباری رۆحییەوە مژووڵی ئەم کارەبوون، چونکە باری ئابووریی و پژێوی جوتیارەکان بەسترابوو بە ئاغە و شێخەکانەوە، ئەوان ناچاریاندەکردن لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا دەنگبدەن بۆ ئەو پارتەی کە ئاغا و شێخ لە بەرژەوەندیدایە سەرکەوتبێت. بۆیە وەك پاداشتێکیش بۆ ئەو ئەمەکەی بۆ دەوڵەت هەیانە ئەوان لەلای دەوڵەتەوە هێزی چەکدارییان پێدرابوو تا هەیبەتی خۆیان بەسەر رەعییەتەکانیاندا بسەپێنن، بەمپێیە هەموو کاری جوتیارەکان و پەیوەندییان بە میرییەوە لەڕێگای ئاغاکانەوە بوو، جوتیارە و هیتیارەکانیش بستبەبستی ژیانی رۆژانەیان بەستبوویەوە بە فەرمانی گەورە و سەییدەکانیانەوە.. بۆنموونە نامەی جوتیاریٚ بۆ کوڕە سەربازەکەی لەڕێگای ئاغاوە دەدرایە پۆستەکان، لەڕێی ئاغاوە سەردانی پزیشك دەکرا و بڕیاری شووکردن و ژنهێنان دەدرا، بەم رەنگە دەسەڵاتی ئاغا تەنها بەسەر سامان و هێز و بەرهەمی

جوتیاردا نەبوو، بەڵکو گیان و کاروباری تایبەتی خێزان و کاری ڕۆژانەیش هەر ئاغا بوو[١٨٩].
لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ تایبەتمەندیی نەتەوەیی بەنیوەچڵی بووژانەوە، کورد بۆیهەبوو زمانی خۆی بەنیوەچڵ لەناوخۆدا بەکاربهێنێت، بەڵام بۆ چاپەمەنی ئەو زمانە بە هەموو جۆرێك قەدەغە و بڤەبوو، لەکاتێکدا تا ئەوکاتەش ١/٣ کورد فێری زمانی تورکی نەببوون[*٢٩] [١٩٠]. دەسەڵات دانی بە مافی کلتوریی کوردا نەدەنا و لە ڕاگەیاندندا هەر دیاردەیەکی پەیوەست بە مافی کوردیی بە جوداخوازی پێناسەدەکرا[١٩١]. لەبەرئەوە ئەوە نەدەشاردرایەوە کە دیموکراتەکانیش وەك هەمیشە لەهەمبەر پرسی نەتەوایەتیی کورددا هەڵوێستەکانیان لەگەڵ پڕەنسیپەکانی کەمالیزمدا لارینەبووە[١٩٢]. هەربۆیە لەو قۆناغەدا هیچ نوێنەرێکی کورد لە پەرلەماندا بە ناسنامەی کوردییەوە دەرنەکەوت و خۆی بە پەرلەمان ئاشنانەکرد، لەلایەکیتریشەوە بەبەردەوامیی یاساوڕێساکانیش فەرامۆشکردنی کورد و سیاسەتی بەتورككردنیان درێژەپێدەدا[١٩٣]، نەك هەر ئەوەش، بەڵکو هەموو خاڵە ئیجابییەکانی پارتی دیموکرات دواجار بوونە مایەی گرفتێکیتر بۆ کوردو دەرکەوت کە مەبەستێکی ستراتیژیی لەپشتیانەوە ئامادەیی هەبوو، چونکە پارتی دیموکرات بە ئاشکرا ستراتیژی هەبوو بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی سیاسی و ڕووناکبیریی کورد[١٩٤]. ئەمانەش خاڵە ئیجابییەکان بوون:

١) ئازادی ئایینی بۆ کورد فەراهەمهێنابوو[١٩٥]. ئەم ئازادییە ئاراستەیەکی سونیگەریی هەبوو، لەبەرئەوە عەلەوییە کوردەکان[*٣٠] کە وازیان لە خەباتی چەکداری هێنابوو، لە سەرەتای پەنجاکانەوە بوونەوە لایەنگری پارتەکەی ئەتاتورك، چونکە سیاسەتی ئایینی پارتەکە ئەوانی لە ساڵی ١٩٥٧ خستە بەرەی ئۆپۆزسیۆنەوە،[١٩٦] ئەمەش چونکە لەڕووی ئاینییەوە جیاواز سەیردەکران و حکومەت فشاری سەر چالاکییە ئایینییەکانی زیادکردبوون[١٩٧].. بۆنموونە لە دەرسیم کوردی عەلەویی ترسیان لە بزاڤی سونیگەریی لێنیشتبوو. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە کوردانی عەلەویی[١٩٨] لەڕووی ئایینی و نەتەوەییەوە بە بەرنامە دەچەوسانەوە، وەلێ لەم قۆناغەدا فرە بوارتر بواری ژیانیان لەبەردەمدا تەسککرایەوە، ئەوان ئەگەرچی لە سەردەمی پارتی گەلی کۆمارییدا تەنها لەڕووی نەتەوایەتی دەچەوسانەوە، چونکە ئەوان هیچ نەبێت رازیی بە بنەما عەلمانییەکان بوون، بەڵام لە سەردەمی دیموکراتەکاندا خنکاندنی هەستی ئایینیشی هاتەبان. تەنانەت هەستی ئایینی سونیی مەزهەبەکانی کوردیش سست و لاواز دەکرا.. بۆنموونە لە کتێبی ئاغا و شێخ و دەوڵەتدا هاتووە: "شێخەکانی کورد تەنها کرابوونە داهۆڵ و بۆ





کۆکردنەوەی دەنگ کەویکرابوون، بەڕووکەشانە و زۆر کەم هەستی نەتەوەییان دەورووژاند تا بۆ مەبەستی خۆهەڵیانسووڕێنن[١٩٩]"، بەڵام ئیتر پارتی دیموکرات دژی هەستی ئایینیش کەوتە سەرپێچی و لاریی نواندن، ئیتر ئەو نەوڕەسییانەی لە ساڵانی ١٩٥٠ ـ ١٩٥٤ ـ ١٩٧٥ هۆکاری سەرکەوتنی پارتی بوون[٢٠٠]، لەبری پاداشت و دەستخۆشانەیان، بە فەرمانی فەرمی و بە بەرنامە چالاکییان قەدەغەکرا و سەرکردەکەیان کە سەعیدی نەوڕەسیی بوو قۆڵبەستکرا. سەبارەت بە نەقشبەندییەکانیش، ئەوا میریی ساڵی ١٩٥٤ هەستا بە شاڵاوێکی بەرفراوان بۆ سەرکوب و کێومالکردنیان لە ناوچە کوردییەکاندا.. بۆنموونە تەنها لە شاری مێردیندا ١٧ پێشەوای نەقشبەندییەکان قۆڵبەستکران[٢٠١] و سەرۆکی ڕێبازی سلێمانییەکانیش هەر لەونێوەندەدا بەندی بەندیخانەی میریی کرا[٢٠٢].

٢) تەکنەلۆژیای کشتوکاڵی و بووژانەوەی ئاواییەکان، ئەمەش خاڵێکیتری نیگەتیڤی سیاسەتی میریی بوو دژی کورد.. بۆنموونە چەندەها ئامێری وەك تراکتۆر و خەڵکی پسپۆڕی بواری کشتوکاڵ برانە ئاواییەکان و خودی سولەیمان دیمیرل موهەندیسی سەرپەرشتیاری بەنداوەکان بوو کە لە کوردستان دەکرانەوە. هاوکات ڕێگاکان بەسترانەوە تا بەرهەمی جوتیار زوو بگاتە شار[٢٠٣]، بەڵام دواجار ڕەوشەکە بوویە فاکتەری چەوساندنەوەی زێدەتری جوتیار، چونکە تەکنەلۆژیای کشتوکاڵی ڕێك وەك زەوییەکان بەکرێدەدرا پێیان، بەمپێیەش جوتیار دیسانەوە بوویەوە سەرمایەی دەرەبەگ، چونکە ٨٠٪ جوتیاران بەبێ زەوی و بەبێ ئامێری کشتوکاڵیی کاریاندەکرد بۆ دەرەبەگە خاوەن زەمینەکان[٢٠٤]. بۆیە ناچار گوند نشینەکان ڕوویانکردە شارەکان و ئەوێی پڕمەینەتیان بەجێهێشت بۆ ئاغەکانیان. ئەم ڕاکردنە لە چەوتی و سەختی ڕێسای دەرەبەگەکان بەجۆرێك بوو کە ڕۆژنامەکانی تورك نوسییان لافاوی ڕۆڵەکانی ئەنادۆڵ شارەکانیان داپۆشیوە[*٣١] [٢٠٥]. بەمجۆرە ئابووریی ناوچەکە داڕما، ئیتر پارتەکەی ئەتاتورك و پارتە بچووکە بەرهەڵستکارەکان دووبارە لە لادێکانی کوردستاندا هەواداریان زیادبوونەوە و لەبەرامبەردا دیموکراتەکان لە ساڵی ١٩٥٧ بەدواوە، ٢٥٠ هەزار دەنگی کوردی لەدەستدا، چونکە ڕکابەرانی دیموکرات هەمان ئەو شێوازەیان بەکارهێنا کە سەرەتای ١٩٥٠ پارتی دیموکرات بەکاریدەهێنا، لەلایەکیترەوە جیاوازی و دووبەرەکی خرایە نێوان بنەماڵە و هۆزەکانی کوردەوە و هەرلایەك پشکی دەنگی ئەوانی بۆخۆی ڕادەکێشا[٢٠٦].. بۆنموونە یەکێ لە بڕوبیانووەکانی کۆمیتەی یەکێتی نیشتیمانی بۆ داخستنی لقی پارتەکان لە گوندەکانی کوردستاندا ئەوەبوو کە

شێوەی حکومی دادگای و نامەی کەسی و گرێبەستی لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەوەی کە بەرهەمهاتووە لەو پارچە تابلۆ نووسراوانە ئەوەی لەبەردەستدایە تائێستا ئەدەبێك بووە کە دروشمی دینی پێوەدیارە و گرینگترین شت کە بەدەستمانگەیشتووە، لە دابونەریتیان و پێشینانیان کە لە کاتی هەستانی لافاوەکەدا ئەو پێشینانەی کە دەرکەوتن ئەسڵی ئەوانەبوون کە باسمانکردن و باسکراون لە تەوراتدا و چیرۆکی پاڵەوانی گلگامیش ئەفسانەی (ئەتانا) هەروەها هەندێك لەو دروشمی چاکە و خراپە کە ئاماژەپێیدەکرا لە سەفەری یعقوب. هەندێك دروشمی لاوانەوە کە دانرابوون لەوکاتەدا خواپەرستەکان دەیانکردن لەگەڵ هەندێك لە دروشم لە شارە گەورەکاندا هەموو ئەمانەش لە سجلی پاشاکاندا دۆزرانەوە کە نووسرابوون بە زمانی هۆنراوەیی، بەلاّم ئاشکرایە کە زمانی شیعریان نەبووە، بەڵکو دانرابوون بە شێوەی چیرۆك لە چەند لە دووبەیت کە یەك وەزنیان هەبووە و دەلالەتی دەکرد لەسەر یەك بیروباوەڕی بەیەکەوە بەستراوە و ئەدەبی سۆمەڕی کە کەمترین بەیتیان دەگاتە پەنجا دێڕ، بەلاّم لێرەدا چەند دێڕێکیتر هەن کە نزیکە لەم دێڕەی پێشتر کە دەگاتە (١٠٠٠) دێڕ، بە شێوەیەکی گشتی ئەدەب شوێنی خۆی داگیرکردووە لە شارەستانییەتی سۆمەری کە بەرهەمی ئەدەبی پلەیەکی باڵای هەبووە لەنێوان داهێنانەکانی مرۆڤ کە هۆگریانبووە، تاکو جیاوازی لەنێوان ئەوان و عیبری و ئیغریقییەکان نەبێتە ئەوەی کە حوکم بەسەریاندا نەکەن، نموونە لەوشتانەی کە باوبوو جیاوازی ژیانی ژن و مێردایەتی و جیاوازی بیروباوەڕی لە شارەستانییەتی کۆن گرنگی ئەو ئەدەبەش بۆ پێشکەوتنی شارەستانییەتی عەقڵ و ژیری لە سەرجەم ڕۆژهەلاّتی ناوەندی کۆندا بووەتە پێوانە بە شێوەیەکی جێگیر و ئەوەش نابێتە زیادەڕەوی ئەگەر بڵێین ئەکەدییەکان و ئاشورییەکان و بابلییەکان ئەم ڕێچکەی ئەوانیانگرتووە نزیکبوون لە وان، هەروەکو چۆن حسییەکان، حورییەکان، کەنعانییەکان هەندێکیان وەرگێڕاوەتەسەر زمانی خۆیان و لاسایی ئەوانیان کردووەتەوە بەلاساییکردنەوەی فراوان.

## بنچینەی دانان وپێشکەوتنی نووسینی بزماری

زمان وەك هۆیەك بۆ لەیەکگەیشتنی مرۆڤ لەیەکتری گرنگترین دیاردەیە لە ژیانی مرۆڤدا، هەربۆیەش بەبالاّترین کەرەسەی شارەستانێتی دادەنرێت، زمانی سۆمەرییەکان کۆنترین زمانە لە دەشتی لیتەییدا و بگرە لە تەواوی جیهاندا کە بە هێڵی مێخی هاتبێتە نووسین، نووسین





ڕەوتێکی زۆر مەزن بوو بۆ ئەوەی شارەستانێتی لە هەناگاوێکەوە بۆ هەنگاوێکیتر و مرۆڤ ماڵئاوایی یەکجارەکی لە سەدەکانی پێشمێژوو بکات و هەر بە هۆی نووسینەوە بوو کە سۆمەرییەکان مێژووی خۆیان تۆمارکردووە بە هۆی تەختە گڵێنەکانەوە بە دەست مرۆڤی ئەم سەردەمە گەیشت، لەبەرئەوەی مێژووی سۆمەرییەکان لە پاش لێکۆڵینەوەی کەلاوە کۆن و پارچە فەخفوری و گۆزە و دیزەکانیان، لەو تەختە گڵێنانەوە دەستپێدەکات.

ئاشکرایە کە سۆمەرییەکان یەکسەر نەگەیشتوونەتە داهێنانی نووسینی مێخی، بەڵکو وەك هەموو دەستکەوتێکی شارەستانیتر بە چەند هەنگاوێك و ماوەیەکی زۆردا تێپەڕبووە. پڕۆفیسۆر پاکیزە ڕەفیق حیلمی لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا دەربارەی سەرهەڵدانی نووسین دەڵێت: (ئەوەی کە لە هەمووی گرنگترە لە مێژوودا ئەوەیە کە لە کۆتایی ئەم دەورەدا، لە پەرستگای ئی. ئانا (E. ANNA) لە ئۆرۆك نووسین بۆ یەکەمجار لە شێوەی وێنەییدا دۆزراوەتەوە. د. پاکیزە دەڵێت: (مۆرەکان خەڵەف و تەپەی گەورە یەکەم پلەی نووسین بوون و خەتی وێنەیی (ئۆرۆك) دووەم پلەیە)، دیسانەوە بۆ ساغکردنەوەی مێژوو ویدۆزینەوەی یەکەم لاپەڕە دەبێ زیاتر لە شوێنەوارەکان بکۆڵینەوە. گومانی تیانییە لەوەدا کە ئەو نهێنییە ڕۆژێك هەر ئاشکرادەبێت! چونکە شتێکی لۆژیکی نییە کە وڵاتی (میزوپۆتامیا)، پاش ئەو ڕێگە دوورودرێژەی بڕیویەتی لە داهێنانی شارەستانیدا، لەئەنجامدا سیمای شارستانییەتی لەدەستبدات، بەلاّم دیارە هێشتا زانایانی ئارکیۆلۆژی و زمان هەوڵکیتریان لەبەردەستدایە بۆئەوەی ئەم تاکە نهێنییە ئاشکرابکەن و لە زۆر ڕووەوە باسکراوە کە سۆمەڕییەکان ئەوانە بوون کە دەستیانکردووە بە دانانی نووسینی بزماری و پێشکەوتووترین دەق کە دۆزرابێتەوە تاکو ئێستا زیاتر لە هەزار نووسراو لەسەر تابلۆ و تابلۆی تێکچوو (٣٠٠٠)پ.ز تۆمارکراون بە زمانی سۆمەری جگەلەوەی سۆمەرییەکان داهێنەری خەت بوون یان جگەلەوان کەسیتر هەبووە، بەلاّم بەدڵنیایی ئەوان لە هەزارەی ٣پ.ز چەندین پێستی ئاژەڵیان بەکارهێناوە بۆ نووسین و هەندێك لەو گەلانەی دراوسێیان بوون هەستیان بەگرنگی ئەمکارەکردوە و سۆمەرییەکان بیریان لەوە کردووەتەوە کە چۆن بیسازێنن لەگەڵ زمانی خۆیان ئەوەشیان لە هەزارەی ٢پ.ز ئەمجۆرە نووسینە بووە بە بلاّوترین و بەکارهاتووترین نووسین لە سەرتاسەری ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و سەرەتا نووسینی بزماری لەسەر شێوەی نووسینی وێنەیی بووە، هەروەکو چۆن هێمایەك بوو کە بەڵگە بووە لەسەر وێنەی شتێکی مادی یان زیاتر، بەلاّم هەموو وشەکانی واتایان یەك بووە نووسین،

بەڵام ئەوەی کە جیایدەکردەوە وێنەکە بوو کە نزیك لە نووسینەکە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم کەموکوڕییە لەدانانی ئەم نووسینەدا لاوازبووە لەبەر دوو هۆکار ١: بەوشێوەی نیشانەکە دانرابوون ئاڵۆزبوون ئەوجۆرە نووسینە توانای نەبووە کە واتای ئەمجۆرە نیشانانە دەرببڕێت، بەڵام بەنیسبەت لاوازی دووەمەوە ئەوان ژمارەی نووسینەکانیان و دانانیان لە چوارچێوەی سنوورێکی باوەڕپێکراو بەپەنابردن بۆ شێوازی تەواو جۆراوجۆرەوە گرینگترین شێواز کە پەیڕەوکرابوو شێوازی گۆڕینی بوو لە نووسینیدا.

### هەندێ شێوازی پێشکەوتو لە راڤەکردنی ئەم نیشانانەی خوارەوە

١. وێنەی ئەستێرە بە پلەی یەکەم وشەیەکی سۆمەرییە (ان) بە مانای ئاسمان دێت وەك هەمان نیشانە بەکاردێت بۆ دەلالەتکردن لە وشەی (دینجر) بە مانای (خوداوەند)

٢. وشە (کی) بە مانای زەوی هاتووە وەکو بەڕوونی دیارنییە کە ئەم نیشانەیە راستە

٣. وشەی کورتکراوەی (لو) بە مانای پیێ دێت.

٤. وێنەی شاخ کە لەوکاتەدا وشەی (کور)ی بۆ بەکارهاتووە

٥. جیمەت لە سۆمەریدا بە مانای گەل بەکارهاتووە

٦. وێنەی قاپ (اینا) بە مانای تێرخواردن دێت واتە وشەی (نیندا) بە مانای خواردن

٧. دوو نیشانی تێکەڵ لە دوو نیشانە وەکو دەم و خواردن بەکاردێت بە وشەی (کو) بە واتای خواردن

٨. وێنەی رۆیشتنی رووبار بەکاردەهێنرا بە مانای (ا) واتا ئاو





٩. وێنەی بەشەکانی خوارەوە پیێ کە بەکاردێت بۆ رۆیشتن بەکارهێنراون بەرامبەر بە وشەی (دو) واتا (رۆیشتن) وشەی (جەب) واتا (راوەستان)

١٠. وێنەی نینۆك بەکاردێت بەرامبەر وشەی (موشین) واتا فڕین

١١. وێنەی ماسی بەکاردێت بەرامبەر (خا) واتا ماسی و وشەی (لغل) واتا ماسی

١٢. وێنەی سەرو شاخی گا بە واتای (جود) بەکارهاتووە واتا (شور) گا

١٣. وێنەی سەری مانگا بە واتا وشەی (اب) واتا مانگا

١٤. وێنەی گوڵەجۆ بە مانای (شی) واتا جۆ و لە نووسینەکانی ئەکەدیدا چەند هێمایەکی دەنگ بەرچاودەکەون وەکو (sal-matd mat.kurik-kur) یان هێمای وەکو وشەی بەهێز وەك (matu) وڵات (sadu) شاخ.

ئەگەر ئەم گەورە نیشانانە لەکاتێکدا بەکارهێنرا بەیەکەوە ئەوا هەندێکیان ناتوانن بەرزترین دەنگ بەدەستبهێنن یان ناتوانن ببن بە وشەی دەنگدار و جگەلەویش ئەم وشانە نەهاتوون لە دەقەکاندا مەگەر بە سیفەتی نیشانەی هێمای نەبێت و هەر بەو هۆیەشەوە هەروەها بە هۆی فراوانی بوونی هێمای بزمارییەوە بوو بە هۆی بەکارهێنانی نیشانەی وەکو (دالە) یان بەڵگەی دەنگی.

## (گەورەتــــرین دەنـــــــــگ)

قسە کراوە لەزۆرترین ئەم جۆرە نیشانان کە خاوەنی چەند دەنگێکی جۆراوجۆرن بەرامبەر بەوەش شتێکی دەگمەن نەبووە کە ئەم جۆرە دەنگانە بەیەکەوە هاوبەشی چەند دەنگێکی جیاوازیان پێك هێناوە وەجۆراوجۆری ئەو دەنگانەش نیشانەیەکی ڕاست هەیە کەواتاکەی جۆراوجۆر دەبێت لەڕاستی دا .دەبینین ئەم جۆرە هێمایەش سۆمەریە بەڵام خاوەنی بیرو باوەڕێکی بنەڕەتی نیە وەکو ئەم بنچینەیەیی کەپشتی دەبەست بەوێنەی سەرەتایی ، بەلکو ئەوانە ژمارەیەك تێگەیشتنی بەهێز بوون ،دوو وشەی لەیەك چووبوون یان چەند مانایەکی دەدات بەدەستەوە( ) نیشانە بوو بۆ دەم .KA . هەروەها نیشانە بوو بۆ ددان (ZU) قسەکردن DUG 4 وشەی ( inim ) وە بەپێ ی ئەوەی لەپێشەوە باسمان کردن وە بەفراوان بوونی ئەم جۆرە ( ) دەتوانیت بیخوێنیتەوە بە (DUG4,ZU,KA) .

سەرەڕای ئەوەش ئەوجۆرە نیشانە جیاکراوانەش لەبنچینەدا تێکەڵ کراون بەچەند نیشانەیەکی تر ئەوەش سروشتی یە کە ئەم جۆرە نیشانانە کەکۆبکرێتەوە وە لەخۆیاندا جیاوازین لە نیشانە پێشکەوتوە گونجاوەکەی خۆیان ( ) BAD: کردنەوە( ) TIL : کۆتایی پێ هێنا ( ).

وە لەکاتێکدا کە ماناکان جۆراوجۆربوون بۆ نیشانەی هێمایی سۆمەریەکان وە تێکەڵ بوون چەند نیشانەیەکی تر بەم جۆرە ڕون دەکرێتەوە بۆ چەند بەشێك ئەوانەی خاوەنی چەند دەنگێکن لەڕێکخستنی سیستەمی ئاشوری و بابلی دا ئەم جۆرە کارە سەرەکیەش دەردەکەوێت لەزۆرترینی ئەو پێشکەتنەی کە ئەکەدیەکان خۆیان لێیان هەڵێنجاوە وە هەروەها ئەم جۆرە هێمایە ( ) دەتوانین بخوێنینەوە SAg پێشکەوتنی سۆمەری کۆن :( SAG ; (SAK وSAQ ، SAK, SAG, SAQ ،) ئەم پێشکەوتنی جۆراوجۆری وشەکان لەوشەی Sag,Res ( پێشکەوتنی نوێ(Resu ) ( ) : (پێشکەوتنی سۆمەری کۆن : KuR ) ولات ،شاخ ،(کۆن ( KuR ) MAT (پێش کەوتنی بنچینەی ئەصلی ئەکەدی ( matu ) وولات( SAD (SADU , شاخ uad ,uat, uat ) وەرگیراون لە( mat ) lot ,sad,lat, lad (وەرگیراوە لە sad ) .

دەنگەکان جۆراوجۆرن لەزمانی سۆمەری دا وشەی لەیەك چووی وەرگێڕدراو بەنیشانەیەکی جیاوازەوە A: ئاو ( ) A قوڵ( ) AB : پەنجەرە ( )
AB: مانگا ( ) ، u : دە . U( ) : گژوگیا ( )
u : (واو العطف ) ( ) ئەوەش بوون بەهۆی زیاد بوونی پێش کەوتنی دەوڵەتی ئەکەدی .





نووسین دۆزراوەتەوە بە شێوەی هەڵکۆڵین کە لەسەر بەرد کە نەخشەکراون دوای پشکنینیان دەرکەوتن و کە هەڵکۆڵدراون لەسەر بەرد و هەندێکیان بزمارین بە ژمارەیەکی گەورە لەسەر تۆپەڵی قوڕ نووسراون و بە شێوەیەکی ئەدەبی بەرز کە ئەوەش لە ئیشەکانی حاکمی عمرانییە و هەوڵ و تێکۆشانەکانی دەکات دروستکردن و بنیاتنانی ژیان کە کمتر نییە لە پەنجا پەرستگا کە گرنگترینیان پەرستگای (ئاییننو) بوو.

هونەری بیناسازی و زەقورە لای سۆمەرییەکان هونەرێکی زۆر باڵا و پڕلە تەکنیك و داهێنانی مەزنە، بوونی ئەو هەموو کارە هونەرییە مەزنانەی کە لە مۆزەخانەکانی جیهاندا هەن گەواهی بۆ پێشکەوتوویی هونەری سۆمەرییەکان دەدەن، سۆمەرییەکان لە دروستکردنی فەخفوری و گۆزە و دیزە و پەیکەر و خانوبەرەدا زۆر پێشکەوتوبوون. هونەری بیناسازی لە وڵاتی سۆمەردا گەیشتووەتە پلەیەکی وا کە ئەندازیارانی ئێستای سەرسامکردووە، دروستکردنی ئەو هەموو کۆشك و تەلار و پەرستگا و زەقورانە بە گەورەترین کاری بیناسازی کۆن دەژمێردرێت کە هەموویان بەپێی نەخشەی ڕێکوپێك و ئەندازەییانە دروستکراون، بەڵام لە هەموویان گرنگتر دروستکردنی پەرستگای زەقوڕەیە کە بەرزایی هەندێکیان دەگاتە (٨٠) پێ کە ئەمەش زۆرتر پێشکەوتوویی هونەری بیناسازی سۆمەرییەکان دەردەخات هەروەکو لەدواییدا باسدەکرێت. ئەوەی شایانی باسە ئایین ڕۆڵێکی باڵای بینوە لە پێشخستنی هونەر و پەیکەرتاشین و دروستکردنی پەرستگا و زەقوڕەکاندا بەو شێوە نایابانە هەر ئایینیە کە ڕۆڵێکی کاریگەر و ترسناکی لە مێژووی سۆمەرییەکاندا هەبووە و لە هەموو کون و قوژبنێکی وڵاتی سۆمەردا پەیکەری خوداوەندەکانی تێدابووە. بەنیسبەت پەرستگای زەقوڕە هەرچەندە مەزنترین پەرستگا و بڕبڕەی پشتی ئایینی سۆمەرییەکانە و دەچێتە نێو بابەتی ئایینی سۆمەرییەکانەوە، بەڵام لەبەرئەوەی باسێکی زۆر گرنگە و پەیوەندییەکی زۆر بەهێزی بە چیاکانی کوردستانەوە هەیە هەربۆیە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەسەری دەدوێین، پەرستگای بەرز یاخود بورج لە بابلیدا پێیدەوتراو (زیکورتو) کە واتای بەرز و بڵندی گەیاندووە.

زەقورە هەر لە هەزارەی چوارەمی پ.ز لەنێوان سۆمەرییەکاندا باویبووە واتا لەو سەردەمەدا کە سۆمەرییەکان بەتەواوەتی نیشتەجێی دەشتی لیتەیی بوون و تێیدابڵاوبونەوە، ئەم زەقورانە بە شێوەیەکی ئەندازەیی زۆر ڕێکوپێك دروستکراون و بەرزی هەندێکیان (٦٠)م بووە، هەندێکیتریشیان زیاتربووە لە زۆربەی شارە سۆمەرییەکاندا زەقورە هەبووە کە هەریەکەیان

خوداوەندێکی هەبووە. ئەو لیستەیەی کە لە زەقورە کۆنەکان دەدوێت و لە کتێبخانەکەی ئاشوربانیبالّدا دۆزراوەتەوە ئاماژەی ئەوە دەکات کە (٣٣) بورجی زەقورە لە ناوچەکەدا هەبووە، لە (٢٧) شاری جیاوازدا. بەراوردکردنی نێوان ئەم دوو ژمارەیە ئەوە دەگەیەنێت کە لەوانەیە لە یەك شاردا زیاتر لە زەقورەیەکی تێدابووبێت. لە زەقورە بەناوبانگەکانی کە تاوەکو ئەمڕۆ مابێت زەقورەی (ئور)ە کە لە سێ نهۆم پێکهاتووە و رووبەری تەختەکەی (٦٠ بە ٤٥ )م، بەلاّم بەرزایی ئێستای ئەم زەقورەیە نزیکەی (٢٠)م.

زەقورەی (ئور) سێ پلیکانەی لەڕووی باکوری رۆژهەلاّتدا هەیە کە یەکێکیان لە ناوەڕاستدایە و دووانەکەیتریشیان کەوتوونەتە لایەکانییەوە. زەقورە شوێنێکی زۆر پیرۆز بووە لەلایەن سۆمەڕییەکانەوە لەبەرئەوەی پەیکەری بەناوبانگترین خوداوەندەکانیان تێدابووە، ئەمە جگەلەوەی کە جێنزرگەی زەیوانی مەزنیش بووە کە بە نوێنەر و یاوەری خوداوەندان ناسراوە و شوێنی نزا و پاڕانەوە و تەنانەت حەجکردنی کۆمەلاّنی خەلّکی سۆمەڕبووە و تیایدا قوربانییەکانی خۆیانیان پێشکەشی خوداوەندان کردووە، هەروەها ئەم زەقوڕانە بە یەکەمین قوتابخانە و فێرگەی مێژوو دادەنرێن کە تێیدا سۆمەڕییەکان سرووتە ئایینیەکانیان تێداخوێندووەتەوە.

ئەم زەقورانە لە سێ نهۆم یاخود لە حەوت نهۆم پێکهاتووە کە هەر نهۆمێ کارێکی تایبەتی بۆ تەرخانکراوە، بۆنمونە یەکێك لەو نهۆمانە جێگای سەربڕین و پێشکەشکردنی قوربانییەکان بووە بۆ خوداوەندەکان. مرۆڤی کۆن بەتایبەتی مرۆڤی چیاکانی کوردستان هەر لە چاخە کۆنەکانەوە هەندێك لە دیاردە سروشتییەکانیان پەرستووە بەتایبەتی خۆر و مانگ و هەروەها ئاسمانیش کە ئەمانەی لەباوەشگرتووە، شانەدەرییە کۆنەکان لەسەر لوتکەی بەرزترین چیاکان ئەم ئەستێرانەیان پەرستووە، چونکە لەوبڕوایەدابوون کە زیاتر لێیاننزیکدەبنەوە و قوربانییەکانیشیان بۆ ئەم خوداوەندانە واتە خۆر و مانگ و ئەوانیتر، هەر لەسەر لوتکەی ئەم چیایانە بوو، پەرستگاکانی عێراقی کۆن سەرچاوەی هەموویان دەچێتەسەر باشووری کوردستان هەرچەندە هەندێك جیاوازییان لە نەخشە و شتیتردا هەیە کە ئەمەش بە هۆی تێپەڕبوونی کات و پێشکەوتنی زیاتری شارەستانی و بیروباوەڕە ئایینیەکان شتێکی سەیر نییە.

زەقورە لە هەموو پەرستگاکانیتر زیاتر پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە، چونکە هەروەك وترا لە ناوچە شاخاوییەکاندا لەسەر لوتکەی چیاکانەوە شانەدەرییەکان خوداوەندەکانیان





پەرستووە، لە پاش کۆچکردنی ئەم شانەدەرییانە بۆ ناوچەکانی دەشتی لیتەیی و نەبوونی چیا و گرد و هەر شوێنێکی بەرزیتر لە ناوچەکەدا وای لەو سۆمەرییانە کردووە کە زەقورە دروستبکەن بیکەنە ئەلتەرناتیڤی چیایەك کە بابوباپیرانییان خویان بە پەرستنی خواوەندەکانیان گرتبوو لەسەر لوتکەی چیاکان. تەواوی زانایانی ئارکیۆلۆژی و ئەو مێژوونووسانەی کە لە شوێنەواردا پسپۆڕن بەدلّنیاییەوە لەوباوەڕەدان کە زەقورە ئەلتەرناتیڤێکە بۆ ئەو چیایانەی کە بابوباپیرانی سۆمەری سرووتە ئایینییەکانیان لەسەر ئەنجامداوە.

زەقورە وەك بورجێکی مەزن لەنێو شارە سۆمەرییەکاندا دیاربووە، ئەوەی زیاتر رەسەنایەتی ئەم زەقوڕانە بۆ چیاکانی کوردستان دەگێڕێتەوە زەقورەی (ئور)ە، نەخشەی بەناوبانگی زەقورەی (ئور)ە بەتەواوەتی وادروستکراوە لەڕووی چیاکانی کوردستانەوە بەتایبەتی یەکەمین نیشتیمانی شانەدەرییەکان بێت کە هەروەکو لەپێشەوە باسکرا، ئەم زەقورەیە پێشەکەی ئاڕاستەی باکووری رۆژ هەلاّتکراوە کە بەتەواوەتی ناوچەکانی شانەدەر و هەزارمێرد و زەرزێ و جۆگەمامی و چەرموو و دەیان و سەدانی ئەو ناوچەیانە کە هەر لەنێو ملیۆن سالّەوە مرۆڤی کۆنی تێداژیاوە. ئاڕاستەی ئەم زەقوڕەیە بۆ ناوچە کۆنەکانی کوردستان و بەرەو چیاکان ئاڕاستەکراون. دیارە ئاڕاستەکردنی زەقوڕەی (ئور) کە بەناوبانگترین زەقوڕەی سۆمەرییە شتێکی ڕێکەوت نەبووە و هەلّبەتە لە چیاکانی کوردستاندا و بەلّگەیتری هەیە کە زیاتر رەسەنایەتی زەقوڕەی سۆمەری بۆ کوردستان دەگێڕێتەوە، ئەوەیە کە هەروەکو هەموومان دەەزانین کە کاشییەکان نەتەوەیەك بوون لە هەزارەی سێیەم و دووەمی پ.ز لە کوردستان ژیاون و لەکاتێکدا کە پادشا ئورنەمو هاتەسەر حوکم و لە سالاّنی ٢٠١٣-٢٠٩٦پ.ز دامەزرێنەر و بەناوبانگترین پادشا بووە کە گرنگیداو بە ئاواکاری و دروستکردنی ئەو کارانەی کە بەزۆری لە ئاواکاری بوو و هەروەها بۆ پایتەختەکەش کە (ئورمدنا) سۆمەری وەکو (وەرکا)و (لەگەش و نفر و ئەریدۆ) لە گرینگترین ئەو کارە ئاواکارییانە دروستکردنی زەقورە بووە لە پەرستگای خوای مانگ لە پایتەختەکەی (ئور) و شیاوی بیرهێنانەوەیە ئەو زەقورانە پێکهاتبوون لە سێ چین لەنێوان ئەم زەقوڕانەدا زەقورەی ئورە کە پێکهاتبوو لە (٧) چین، لەلایەکیترەوە (ئورنەمو) یەکێك بوو لە پادشا هەرە بەناوبانگەکان لە مێژوودا لەڕووەی ئاوەدانکردنەوە.

**گرنگی هونەری هەڵکۆڵین لای سۆمەرییەکان**

هونەری هەڵکۆڵین لە ساڵی ٢٠٠پ.ز مێژوویەکی تۆمارکردووە و لەمساڵانەدا هونەری هەڵکۆڵین دەرکەوت پاش ئەوەی بە سەردەمێکی سەرەتاییدا تێپەڕیکرد، هەروەکو ئەم داتا شینەش دیارە لە پاشماوەی گردی (عوبید) پاشماوەی سەردەمی (ئورنینا) ئەمجۆرە پاشماوانەش یارمەتیداین لەسەر ئەو پێشکەوتنە پلەپلەیانەی هەبوون، لەو نیشتمانەی کە دەرکەووتوە لە سەردەمی سەرەتایی و کە خاوەنی راستییەکی زیندووە تاکو ئەم پێشکەوتنە بووە بە پێشکەوتنی تەواو، بەلاّم ئەو شێوازە جیاوازە بەنیسبەت سۆمەرییەکان، چونکە ئارکۆلۆژییەکان لێرەدا چوونەدەرێ بۆ هەڵکۆڵین لە خۆڵ و دروستکردنی دەیان قاپ و قاپلەمەی قوڕ، لێرەدا راستە بڵێین لە٧٠٪ کەرەسە دروستکراوەکان پێکدێن لە پەیماننامەی ئابووری و ئیداری. ئەوەش گرنگی هەبووە لە ژیانی مرۆڤایەتی دانیشتوانی میسۆپۆتامیا، بەلاّم پێنج تابلۆی نووسراوی هەڵکۆڵراو بە شێوەی جیاواز لە کاری ئەدەبیات دیاردەکەون، بەلاّم چەند هەڵکۆڵراوێکی ئەدەبی گەورە دەردەکەوێت کە خاوەنی ١٢بڕگەیە لە چەند دەقێك لەسەری نووسراوە کە بە سەدان خەتی جۆراوجۆر، بەلاّم زۆر بچووکن جگەلەوەی چەند هێڵێکیان گەورەن، بەلاّم دانراوی ئەدەبیات دەگاتە سەدان هێڵ لەسەر رووبەری ئەم تاتەقوڕانە بە جیاوازی درێژیانەوە، بەلاّم دوابەدوای یەکترن. پادشا و فەرمانڕەوا سۆمەرییەکان و لیستەکانیان خشتەی پادشا سۆمەرییەکان بۆماندەگێڕێتەوە کە پادشایەتی بۆ یەکەمجار لە ئاسمانەوە بۆ شاری (ئەریدۆ) هاتووەتەخوارەوە. سۆمەرییەکان پادشاکانی خۆیانیان کردووە بە دوو بەشەوە بەشی یەکەمیان ئەوانەی پێشلافاوە بەناوبانگەکە فەرمانڕەوای سۆمەرییان کردووە لە پێشلافاوەکەدا.. هەشت پادشا لە شاری سۆمەریدا فەرمانڕەوابوون، هەریەك لەم پادشایانە چەند ساڵێکی خەیاڵی فەرمانڕەوایان کردووە بە هەر هەشتیان (٢٤١٢٠٠) ساڵی فەرمانڕەواییە، ئەو شارانەش بریتینلە (ئەریدۆ ) کە هەردوو پادشای (ئالوم)و (کار) (٦٤٨٠٠) ساڵ فەرمانڕەواییان تێداکردووە و شاری پادت پیرا-دورکوڕکوڕی) کە پادشایان (ئەئمینلو ئەننا و ئەتسمنە کالنا و دەموزی) بۆ ماوەی ( ١٠٨٠٠٠٩) ساڵ فەرمانڕەوایان تێداکردووە. پاشان لە (ڕاك) کە پادشا (ئەسنیز) (٢٨٠٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی تێداکردووە، هەروەها شاری (سپار) پادشا (ئەئمیندۆ راننا) (٢١٠٠٠) ساڵ و لەکۆتاییدا پادشا (ئۆبارتۆتۆ) لە شاری شروپاکدا (٢٨٦٠٠) فەرمانڕەوایی تێداکردووە لەڕاستیدا لە بنەماڵە بەناوبانگەکانی سۆمەر، بنەماڵەی (وەرکا) یەکەپێنجەمین پادشایە ناویدەرکرد لە





دەوروبەری (٢٧٠٠)پ.ز ئەو پادشایەش ( گلگامێشە) کە داستانی گلگامێشی سۆمەری بەناوبانگ دەگەڕێتەوەسەر ئەو.

**زنجیرەی پادشایانی ئوری سێیەم :**

١. ئورنامو (٢٢٩٠-٢٢٧٣)پ.ز
٢. شولکی (٢٢٧٢-٢٢٢٦)پ.ز
٣. بورسین (٢٢٢٥-٢٢١٧)پ.ز
٤. کیمیل سین (٢٢١٦-٢٢٠٨)پ.ز
٥. ای سین (٢٢٠٧-٢١٣٨)پ.ز

**هونەری مۆر و مۆری پەنجە لای سۆمەرییەکان**

بۆ هەموو پیاوێکی سۆمەری هەبووە مۆری تایبەتی بەخۆی هەبێت تەنانەت ژنانیش. زۆرترین خەڵك نەیاندەتوانی بنووسن، بەلاّم مۆر کارێك بوو لەوکاتەدا بەکاردەهێنرا بۆ بەهێزکردنی پەیماننامەکان. واتا مانای نووسین بوو لەسەر تابلۆیەك لە قوڕ و مۆرکردن لەلایەن کەسەکەوە، مۆر لەم سەردەمەدا بەڵگەبوو لەسەر خاوەندارێتی ئەو کەسە و لە شێوەی کەشتی دروستکرابوو کە درێژییەکەی لەنێوان (٣-٤) بوصە و بۆصە و نیو دروستکرابوو کە لە بەرد هەڵکۆڵرابوو و وێنەیەك لەسەری دیاریکرابوو کە کەسەکە ئاماژەی پێدەدات لەبەردەم خوای شارەکەدا وەکو نووسیویەتی ناوی خۆی و نازناوی لەپشت وێنەی خواکەی، بەلاّم هەڵکۆڵینی هەندێ لەم مۆرانە زۆر پێشکەوتوونەبوون، لەڕاستیدا ئەوانە جۆراوجۆر دانراوە لەگەڵ جۆرێکیتر لە بەردی بەنرخ وەکو مرواری، بەلاّم دوای دەرکەوتنی کانزا کە هۆکارێك بوو بۆ ئاسانکردن کە بەکاریبهێنن، ئەمجۆرە کانزایەش بە دەزوویەك دەبەسترایەوە و بە ملەوە هەڵدەواسرا و کۆمەڵێك خواوەندە سۆمەرییەکان لەسەر مۆرە لوولەییەکان دەبینران لە ماوەی (ئۆرۆك) یاخود ماوەی چاخی نیمچە مێژووییدا دۆزراونەتەوە، جگەلەو درەختە چیاییانە کە وێنەی بەران و بزنەکێویش لەسەر ئەم مۆرە لوولەییانە دەبینین کە ئەوە دەگەیەنێت کە کاتی خۆی لە ناوچەی چیاکاندا راوی ئەم ئاژەڵانەیان کردبێت و رەفتاریان لەکەڵ کردبێت.

### هونەری جلوبەرگ و کەلوپەلی ڕازێنەرەوە لای سۆمەرییەکان

پیاوان هەر لەدێرینزەمانەوە لەوکاتەی ژیان سەریهەڵداوە جلوبەرگیان بۆخۆیان لە پێستی گیانداران دروستکردووە کە ئەم بەرگەیان بەستووە لەژێر هەنگڵەوە کە زۆربەی جلوبەرگیان لە سوف بووە بە شێوەی خێتی جۆرارجۆر و دوابەدوای یەك بەستراون. ئەم جۆرە جلوبەرگانەش بە شێوازێکی تایبەت بۆ خۆڕازاندنەوەی خۆیان بەکاریانهێناوە لە ئاهەنگەکاندا، هەرئەوەبوو بە شێوازێکی پێشکەوتووتر چنرا و لەکۆتاییدا ئەمجۆرە جلوبەرگە بوو بەباشترین جۆر کە پیاوان لە چینەکانی سەرەوە لەبەریاندەکرد لەگەڵ عەبایەکی درێژ  کرێکارانی پیاو کراسێکی کورت و لەسەرویشەوە بە پشتێنێك دەیانبەست و هەژاان زۆر بەپەرۆشبوون بۆ ئەو جلوبەرگە چێنراوانە، بەڵام پیاوانی دسترِیشتوو لەبەریاندەکرد و جەمەدانە و کڵاوی خڕ و کڵاوی شەبقەداریان لەسەردەنا کە ئەمڕۆ هەندێك عەرەب لەسەریدەکەن و پادشاش ریشێکی درێژی دەهێشتەوە و شانەیدەکرد و خۆی دەچواند بە خوایەك کە دەرکەوتووە لەبەرامبەریان و قژیشی بەردەدایەوە تاوەکو هەردوو شانەکانی، بەڵام چینی گشتی و کۆیلەکان ریشیان کورتدەکردەوە و قژیشیان کورتدەکردەوە تاکو نیوەی ملیان، بەڵام ژنان لەوماوەیەدا دوو پارچە لە جلوبەرگیان لەبەردەکرد کە پێکدەهاتن لە کراسێکی ناوەوەی درێژ و هەردوو لای درێژبوو دەگەیشتە سەرزەوی و ئەمشێوازە باوبوو لای سۆمەرییەکان.

### دەرئەنجام و کۆتایی

وەکو دەرکەوتووە بەپێی هەندێ سەرچاوە کە کوردستان یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکانە و شوێنی نشتەجێبوون و کەللەتور و هونەر و ئایین و زمان و ژیانی کۆمەڵایەتییان لەسەر خاکی کوردستان بووە، کەواتە دەتونین بڵێین سۆمەرییەکان رەگەزێکی کوردن کەواتە ئەگەر بەپێی سەر چاوەمێژووییەکان سۆمەرییەکان کوردبن کەواتە پێویستە مێژوونووسەکان توێژەرە مێژووییەکان پێویستە گرنگی تایبەت بە سۆمەرییەکان بدەن لە هەموو ڕوەوەکانەوە چیتر گرنگی بە مێژووی بێگانە نەدەن و نەبێتە مێژوونووسێك و یان توێژەرەوەیەك تەنها گرنگی بە مێژووی بێگانە بدەین و مێژووی نەتەوەکەمان بخەینەپەراوێزەوە، بۆیە منیش وەکو هونەرمەندیکی کورد بەپێویستمزانی کە تیشکێك بخەمەسەر هونەری سۆمەرییەکان کە لەوکاتەدا هونەری سۆمەرییەکان کاریگەرێتییەکی بەهێزی هەبووە لەسەر نەتەوەکانیتر کە تائێستا پاشماوەکانی ئەم هونەرانە گەواهی بەهێزن بۆ بەرەوپێشچوونی هونەری سۆمەرییەکان لەم سەردەمەدا.

***





### سەرچاوەکان

١. رينية لابات، قاموس العلامات المسمارية، ترجمة الاب البير اوينا واحزة، منشورات المجمع العلمی، الطبعة السادسة، مطبعة المجمع العلمی، بغداد ،٢٠٠٤

٢. د. صالح احمد العلي، العراق في التأريخ، دار الحرية للطباعة – بغداد، ١٩٨٣

٣. صموئيل نوح كريمر، تاريخهم وحضارتهم وخصائصهم، ترجمة فيصل الوائل، دار عزيب للطباعة، ب.ت.

٤. للسير ليونادوولی، وادی الرافيدين وحضارته، ترجمة احمد عبدالباقی، مكتبة المثنی ،بغداد، د. ت.

٥. دكتور عامر سليمان دكتور احمد ملك الفتيان، محاضرات في التآريخ القديم، ١٩٧٨

٦. هاوڕێ باخەوان، کوردستان نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکان، بلاوکراوەی ئاراس، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣

٧. هورمزی بێگەری، چیانشینانی زاگرۆس، وەرگێڕانی حەمەی حەمە سەعید، کەیوان ئازاد ئەنوەر، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٤



**فایلی ژماره**

# شێخ ڕەزای تاڵەبانی





## شێخ ڕەزای تاڵەبانی کێیە ؟

**هێمن ئیبراهیم ئەحمەد**

شێخ رەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی کوڕی مەلا مەحمودی زەنگنەیە، لە ساڵی **١٨٣٧** لە گوندی قرخ لە نزیك شارۆچکەی چەمچەماڵ لەدایکبووە.

شێخ رەزا لە بنەماڵەیەکی کوردە کە تاڵەبانییە، بنەماڵەی تاڵەبانی دەگەڕێتەوە سەر ئێلی زەنگنەی کورد کە شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی شیخ رەزا لە نەوەی مەلا مەحمودی زەنگنەیە. بە بەڵگەی ئەو شیعرەی شێخ رەزاش کە خۆی لە نەوەی ئەو بنەماڵەیە بنەچەی تاڵەبانییەکان دەگەڕێتەوەسەر مەلا مەحمودی زەنگەنە، گوایە شێخ ئەحمەدی هیندی لاهوور کە لە هیندستانەوە هاتووە بە شەش مانگ گەیشتووەتە کوردستان، بۆئەوەی ببێ بە شاهیدی مەقسوود بۆ مەلا مەحمود، سەرئەنجام مەلا مەحمودی زەنگنە دەبێت بە موریدی شێخ ئەحمەدی لاهوور و دواترد بەجێنشینی. مەلا مەحمودی زەنگنە لە خۆشەویستی شێخ ئەحمەدی لاهووردا کوڕەکەی خۆی ناودەنێ شێخ ئەحمەد، شێخ رەزا بەمشێوەیە باسی زنجیرەی بابوباپیری خۆی دەکات و دەڵێت:

خوا وەختێ کە حەزکا بەندەیەکی خۆی بکا خۆشنوود
لە ڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بەپێی خۆی شاهیدی مەقسوود
لە هیندستانەوە شەش مانگەڕێ تا خاکی کوردستان
خوا شێخ ئەحمەدی هیندی رەوانکرد بۆ مەلا مەحموود
مەلا مەحموودی زەنگەنە، یەعنی قوتبی دائیرەی ئیرشاد
لە دەوری مەرقەدی هەر دەنگی یاهو دێت و یامەعبوود
لە پاش ئەو، ئەرشەدی ئەولادی شێخ ئەحمەد لەجێیدانیشت
بە عەینی وەك سولەیمان جێنشینی حەزرەتی داوود
بەڵێ بابی وەها ئەڵبەت دەبێت فەرزەندەی وابێنێ
ئیلاهی سەدهەزار رەحمەت لە قەبری والید و مەولوود

بەڕەحمەت چوون ئەوان، بابێنە سەرباسی ئەوڕەحمان

فیداتبـم نەتیجەی دوودمانی ئـــــەحمەد ومەحموود

نەتیجەم مەقسەدە، تالّی موقەدەم شەرتی تەحسیلە

ئەوانەی بۆیە ئیجادکرد خودا، تا ئەم ببێ مەوجوود

ئەمێستاش شێخ عەلی نەجلی کە پیری ساحێب ئیرشادە

ئەمیش وەك باوك و باپیری لە زومرەی ئەولیا مەعدوود

(رەزا)ش لەو نەسلەیە بیبەخشە یارەب، چونکە قەت نابێ

گـــوڵی بێخار و بەحـــری بێبوخار و ئاگری بێدوود.

## درەختی تاڵەبانییەکان








دێی تاڵەبان تاوەکو ئێستاش هەر بە دەستی شێخانی تاڵەبانییەوەیە بەتایبەت بەرەی شێخ رەزا. (شێخ ئەحمەد تاڵەبانی) یازدە کوڕ و چوار کچی هەبووە. دوای کۆچیدوایی (شێخ ئەحمەد) ( شێخ عەبدولرەحمان)ی کوڕە گەورەی بووە بەجێنشینی کە شاعیرێکی بەر و بالاّ بووە و بە زمانی تورکی و فارسی لە مەیدانی عیشق و خواپەرەستیدا شیعرێکی زۆری هەیەو هەروەها چەند کتێبێکی هەیە لەوانە: (دیوانی شێخ عبدولڕەحمانی تاڵەبانی و شەرحی مەسنەوی و مەولانا جەلالەدینی رۆمی و بەهجەتولئەسرار). شێخ عەبدولڕەحمان چوار کوڕی هەبووە (شێخ عەلی و شێخ قادر و شێخ رەزا و شێخ عەبدولواحید). لەم بنەماڵەیەدا بەتەنها شێخ رەزا شاعیر نەبووە بەڵکو چەند شاعیرێکی ناسراویان تێداهەڵکەوتووە لەوانە: (شێخ قادری برای شێخ رەزا) کە نازناوی (فائز)ە، شێخ محەممەدی کوڕی شێخ رەزا کە نازناوی (خالسی)یە. بە هەر چوار زوبانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی شیعریان هەیە.

ئەو وەختەی کە شێخ رەزا لەدایکبوو شێخ عەبدولڕەحمانی باوکی لەنێوان گوندی قرخ و کەرکووك دەژیا. شێخ رەزا سەرەتای خوێندنی لە تەمەنی حەوتساڵیدا لای باوکی دەستپێکردووە، پاشان هەندێ کتێبی سەرەتایی لای مامیشی خوێندووە، شێخ رەزا بۆ تەواوکردنی خوێندنی حزجرەی مزگەوت روویکردوووەتە کۆیە، لە کۆیە لای مەلا محەممەدی بلاّخ و مەلا ئەسعەدی جەلیزادە و حاجی عەبدوڵلاّی سەعید حەلیمیزادە قۆناغی فەقێیەتی بردووەتەسەر. هەر لەوماوەیەدا چووەتە سلێمانی دوای پێویستییەکانی بە مەلاییبوون ئارەزووی بینینی ئەستەمبوڵ دەکەوێتە خەیاڵیەوە.. ساڵی ١٨٥٦ بریاریدا بچێتە ئەستەمبوڵ، نزیکەی دوو ساڵ لەو شارەدا مایەوە هەرچەندە زانیارییەکی ئەوتۆ نییە لەبارەی سەفەرەکەی شاعیرەوە بۆ ئەستەمبوڵ، بەلاّم بێگومان چاویکراوەتەوە و گەلێ شت فێربووە و زۆر کەسی ناسیوە لە شاعیر و رۆشنبیرانی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی. لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ کەرکوك لە نێوان موسڵ و هەولێردا هەواڵی مردنی باوکی دەبیستێت لە ساڵی ١٨٥٨، ئەوەی پێویستە لێرەدا روونبکرێتەوە ئەوەیە کە شێخ رەزا تا ئەوکاتە شیعری داشۆرین (هەجوو)و کراوەی (ئیرۆتیك) نەوتووە.

بە هۆی مردنی شێخ عەبدولڕەحمانی سەرۆکی بنەماڵە و مورشیدی تەریقەت برا گەورەی شێخ رەزا لەجێی باوکی دادەنیشێت، گوندەکانی قرخ و تاڵەبان بۆ شێخ رەزا دادەنرێت شێخ عەلی برای هەندێ ئاقاری دەستدەکەوێت، شێخ رەزاش ئارەزووی ئەوەبوو ئەویش وەکو شێخ عەلی برای بەشێکی هەبێت لەو دەستەلاّتەدا، بەلاّم ئەمەی بۆ نەچووەسەر ئیتر ژیانی تەکیەی قورس

دەبێت.. بۆیە ناتەبایی دەکەوتێتە نێوان برایان شێخ عەلی و شێخ رەزاوە زیاتریش دەستوپێوەندی شێخ عەلی دەوریانهەبووە لە هەڵگیرساندنی ئاگری ئەو ناخۆشییەدا لەبەرئەوە نەیارانی شێخ رەزا زۆربوون و لە زمانی دەترسان هەروەکو لە هەندێ شیعریدا رەنگیداوەتەوە. هۆکاری گرنگتریش بۆ سەرهەڵدانی ناخۆشی لەنێوان هەردوو برادا ئەوەیە کە لە کاتی مردنی شێخ عەبدولڕەحمانی باوکیاندا شێخ عەلی میراتی باوکیانی بە یەکسانی لە نێوان خۆی شێخ رەزادا دابەشنەکردبوو. هەرچۆنێ بێت شاعیر هۆی نالەباری ژیان دەگەڕێنێتەوە بۆ (قەدەر و چارەنووس) یان کەمی پیاوی باش و دڵسۆز لەناو کۆمەڵدا وەکو خۆی دەڵێت:

ساغ لە دنیادا نەماوە گەر قسەی ساغت دەوێ
بێ هەزارت پێنیشان دەم گەر قورمساغت دەوێ

شێخ رەزا لە دوای مردنی باوکی تووشی گیروگرفتی ژیان دەبێ و ئەو ناخۆشییەی نێوانیان لەگەڵ شێخ عەلی برایدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە شێخ رەزا لە کەرکوك باربکات و رووبکاتە کۆیە. دواتر شێخ رەزا هێرشی کردووەتە سەر شێخ عەلی برا گەورەی خۆی و دایشۆریوە، ئەگەرچی راستەوخۆ جنێوی پێنەداوە، بەڵام لەجیاتی ئەو هێرشیبردووەتەسەر پیاوان و بەرێوەبەری کاروباری ماڵ و تەکیەکەی کە ناوی حەمەی وەستا فەتاح بووە، شێخ رەزا لە چوارینەکەدا دەڵێ:

شێخ عەلی خۆ تۆ منت ئاوارەکرد و دەربەدەر
چاکە هەجوێکت بکەم، ئەمما موفید و موختەسەر
بۆ حەمەی وەستا فەتاح ئێمەت هەموو ئاوارەکرد
ئەی حەمەی وەستا فەتاح دایکت بە کێری نێرەکەر

زۆربەی ئەو کەسانەی جنێوی شێخ رەزایان بەرکەوتووە دۆست و هاوڕێی شێخ عەلی برا گەورەی شێخ رەزا و شێخ غەفووری مامی بوون. ئەگەرنا ئەو کەسانە هیچ جۆرە ناخۆشییەکیان لەگەڵ شێخ رەزادا نەبووە.. بۆیە دەبینین کە شێخ رەزا لەم شیعرەدا لە پەنای حەمەی وەستا فەتاحەوە قسە بە شێخ عەلی دەڵێت، بەڵام بەناڕاستەوخۆ وەکو ئەو پەندە کوردییە وایە کە دەڵێ: (بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێتلێبێت).





**ژیانی شێخ رەزا لە کۆیە.**

شێخ رەزا شاری کۆیەی خۆشویستووە لە سەردەمی فەقێیەتیدا بەشێکی ژیانی لای مامۆستا مەلا ئەسعەدی جەلیزادە بردووەتەسەر، ئەوکاتەی کە شێخ رەزا روودەکاتە کۆیە شێخ غەفووری مامی مورشیدی تەکیەی کۆیە دەبێت و کیسەی هەمیشە پڕلە زێڕ و دراو بووە. شێخ رەزا دەیەوێت بە مەبەستی دووبارە سەفەرکردن بۆ ئەستەمبوڵ پارە لە مامی وەربگرێت. لە سەرەتادا مامی پێشوازییەکی گەرمی لێدەکات و هەموو ئارەزووەکانی بەدیدەهێنێ تادەگاتە ئەوەی کە بەڵێنی پێدەدات کە کچێکی خۆی لێمارەبکات، بەڵام ئەم خۆشییە درێژەناکێشێت و نێوانی شێخ رەزا لە گەڵ مامی تێکدەچێت بە شێوەیەك دەگاتە ئەو رادەیەی کە شێخ رەزا بەهێزترین و کراوەترین شیعری داشۆرین بنووسێ بەسەر غەفوری مامی و رەشیدی ئامۆزای. بەوەشەوە وازینەهێناوە و لە چوارینەیەکدا بە رەشیدی ئامۆزای دەڵێ:

رەشە رەششاشی کەری رەش بە رەشت
تا رەشت ماوە رەش و سوور بە رەشت
چڵ و چێوی چەمی رەشنەش بە رەشت
بە لەشت، هەم بە بەشت، هەم بە رەشت

شێخ رەزا لەم شیعرەدا بە سەرهاتی خۆی لەگەڵ مامە غەفووری دەگێڕێتەوە لەو سەردەمەی کە لە کۆیە لایبووە لە شیعرەکەدا دەڵێ:

لەورۆژەوە کە تۆرام و لە کەرکوك سەفەرم کرد
مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب حەزەرم کرد
گەردوون سنکیکردم و هێنامییە کۆیە
میوانی لەکن مامە غەفوری لەجەرم کرد
ویستم کە بڕۆم بۆ سەفەری رۆم بە سیاحەت
نەیهێشت و دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کرد
دانیشێ، نەچێ من کچی خۆم مارە دەکەملێی
ئەو تاڵیبی دونیایە ئەوا موعتەبەرم کرد

چورسا لەبەرم جوببە و فیسا لەسەرم فێس
نە فێسی لەسەرنام و نە جوببەی لەبەرم کرد
شەش مانگێ بە فسانە گلیدامەوە لای خۆی
نەمزانی ملم بشکێ تیاچووم، زەرەرم کرد
وەڵلاهی دەکەم دەرحەقی ئەو بەڵکو زیاتر
ئەو کارە کە دەربارەی رەشیدی پسەرم کرد
کارم تەڕدەبێ دەموت ئەگەر لوتفی ببێ مام
ئەی لاییقی ریشی بە خودا کاری تەڕم کرد
بۆ موجتەهیدان گەرچی موڕەخخەس نییە تەقلید
من موجتەهیدم، هاتم و تەقلیدی کەرم کرد
ئەی گووی خلە بەو لوتفە کە ئەو کردی لەگەڵ من
لەم مەرحەمەت و لوتفە ئەوا من گوزەرم کرد
سەد دەفعە گوتم وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی
یاڕەب لەگەڵ شێخ عەلی بۆچی شەڕم کرد
هەردەچمەوە لای گەرچی بلێ هاتەوە دیسان
ئەو خوێڕییە بێکارە کە من لێرە دەرم کرد
هەرچەندە (رەزا) باعیسی بەدنامییە عەودەت
لەم سووکی و بەدنامییە سەرفی نەزەرم کرد

وەکو لەو شیعرەدا هاتووە لەو سەفەرەیدا شێخ رەزا شەش مانگ لە کۆیە دەمێنێتەوە.. ئینجا دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك، ماوەیەك ژیان لەکەرکوك بەسەردەبات و دووبارە ئارەزووی سەفەرکردن بۆ ئەستەمبوڵی دەکەوێتەوەسەر.

بە هەر شێوەیەك بووبێت لەساڵی ١٨٦٦ شێخ رەزا جارێکیتر رووەدەکاتەوە ئەستەمبوڵ. ئەمجارەیان بۆ ماوەی شەش تا حەوت ساڵ دمێنێتەوە. لەماوەیەدا شێخ رەزا ناسیاوی لەگەڵ گەلێك لە ئەدیب و رۆشنبیران و پیاوە سیاسییەکانی کورد و تورك دەناسێت و لە کاروباری سیاسی ئەو سەردەمە شارەزادەبێت و وەکو لە م شیعرەدا باس لە رووداوەکانی ئەو سەردەمەی





ئەوروپا دەکات و دەڵێ:

به بزم عشق مگر جز حديث مهر و وفا
مرا بكار نيايد قران (ناپليون)
مرا از ان چ كه فيروز طشت (بسمارك)
مرا ازان چ كه پامال گشت (ماكماهون)

واتە: نەمانی ناپلیۆن و کەوتنی بسمارك بەکەڵکی من نایە، ئەوانە بە من چی؟ من بەزمی دڵداری و سۆز و وەفا دادی دەردی من دەخوات.

هەر لەوماوەیەی ژیاوە لە ئەستەمبوڵ لەگەڵ چەندین سیاسەتمەدار و ناوداریتردا ئاشنایی پەیدادەکات لەوانە (یوسف کامیل پاشا) کە سەرۆکوەزیرانی سەدری ئەعزەم بووە لە سەردەمی سوڵتان عبدولعەزیزدا، هەروەها دۆستایەتی لەگەڵ (ئەحمەد پاشای باباندا) هەبووە و تەنانەت شیعرێکی بەناوبانگی هەیە لە ستایشی ئەحمەد پادشادا، هەروەها (ئەمین فەیزی) کە جێگەیەکی تایبەتی لە دڵ و دەروونی شێخ رەزادا هەبووە تەنانەت هیچ کەس ئەوەندەی (ئەمین فەیزی) لای شێخ رەزا جێگەی رێز و خۆشەویستی نەبووە کە شێخ رەزا لە باسی پەیوەندی خۆی (ئەمین فەیزیدا) دەڵێت:

نسبت من به امین فیضی ازلی است
همچو سنی بعمر، نەچو روافض بعلی است

واتە: پەیوەندی من و ئەمین فەیزی هەر لە رۆژی ئەزەلەوەیە، وەکو هی سۆفییەکان لەگەڵ عومەر، نەك وەکو هی رافیزان لەگەڵ عەلی.

بەرامبەر بەمەش (ئەمین فەیزی) لە کتێبی ئەنجوومەنی ئەدیبانی کوردا بایەخی زۆری بە شیعری شێخ رەزا داوە، جگەلەمانە شێخ رەزای تاڵەبانی دۆستایەتی و ناسیاوی لەگەڵ چەندین توێژی کۆمەڵدا هەبووە بە کەسی ناودار و شاعیر و دەوڵەمەند و هەژار و خەڵکی ناوبازاڕەوە.

شێخ رەزا لە ماوەی ژیانی ئەستەمبوڵدا هەندێك جێ گەڕاوە بە هۆی سەرۆکوەزیرانەوە حەجیکردووە، لە کاتی گەڕانەوەیدا بە رێگەی میسردا گەڕاوەتەوە. شێخ رەزا لە ژیانی

ئەستەمبوڵیدا دۆستایەتی لە گەڵ زۆر کەسدا هەبووە، بەڵام دواتر نێوانی تێکچووە و دایشۆریون. تاوەکو شێخ ساڵی ١٨٧٤ بە یەکجاری ئەستەمبوڵی جێهێشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك.

پێش ئەوەی شێخ ڕەزا شارەزابێت بە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی، وەکو هەموو خەڵکێکیتر وایدەزانی کە دەوڵەتی عوسمانی پارێزەری وڵاتی ئیسلامە دژی گاوران و داگیرکەران.. بۆیە ستایشی سوڵتانی عوسمانی زۆر کردووە، بەڵام دوایی هاتوچۆکردنی بۆ ئەستەمبوڵ و شارەزابوون لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی پاشان بۆیدەرکەوتووە کە ئەم سیستەمی فەرمانڕەوایەتییە لەسەر لاشەی هەزاران میللەتی چەوساوە دامەزراوە و درێژەی هەیە.. بۆیە دەستدەکات بە ڕەخنەگرتن و پاشان هەجوو و نەعلەتیاندەکات، وەکو لە شیعرەدا دەڵێت:

دوشمنه قارشی کدی، ملته قاسشی اصلان
لعنه الله علی حضـــــرت هذا السطـــان

واته: بەرامبەر دوژمن پشیلە و بەرامبەر میللەت شێرە، لەعنەتی خوا لە حەزرەتی سوڵتان بێت.. یان دەڵێت:

کــاشی یك روزم بـمابین همایون رەدهـند
تا (حمید خان) رابگویم: ای (حمیر المؤمنین)
بعثــــــت بر خلاف بعثت ثـــيغمبر است
(انـــــت مـــا ارسلنا الا زحمه للعالمـین)

واتە: خۆزگە تاکە ڕۆژێك ڕێمپێدەدەن، تا بە سوڵتان حەمید بڵێم ئەی گوێدرێژی موسوڵمانان، ناردنی تۆ بە پێچەوانەی ناردنی پێغەمبەرەوەیە، تۆ بۆ ئازاری خەڵك نەبێت بۆ هیچیتر نەنێردراویت.





**ژیانی شێخ ڕەزا لە کەرکووك.**

شێخ ڕەزا ڕۆڵەی کەرکووکە، ژیانی منداڵی و هەرزەکاریی لە کەرکووك بەسەربردووە، هەر لە کەرکووکیش بەهرەی هونەری وەرگرتووە. کەرکووك گۆرستانی باوباپیرانیەتی و خۆیی و خێزانی زۆربەی تەمەنیان لە کەرکووك بەسەربردووە. بەگوێرەی ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستدایە و نووسیویانە: دیوەخانی شێخ ڕەزا لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك لە ژوورێك و هەیوانێك پێکهاتبوو، شیعری شێخ ڕەزا بە نووکی قەڵەم لەسەر دیواری ژوورەکە هەڵکەندرابوو، بەڵام دوای سپیکردنەوەی هەموو شیعرەکانی لەناوچوون کە ئەوەش بەڕاستی کارەساتە. گیروگرفتی ژیان تەنگی بە شێخ ڕەزا هەڵچنیبوو لە کەرکووکدا، دیارە خەڵکی ئەو سەردەمە لە کەرکووکدا ئازاریان پێگەیاندووە، لە شیعرێکدا بۆ حاڵی پەرێشانی خۆی دەلاوێنێتەوە و شێخ ڕەزا دەڵێ:

بەم حاڵە ئەگەر جارێکیتر بچمەوە کەرکووك
مەعلوومە بە مەردی نەڕواوە لە سەرم تووك
بۆچ بچمەوە کەرکووکی قورمەساغ کە لەگەڵ من
ئەهلی هەموو ناسازە وەکی ئاوی حەماموك

وەکو لە شیعرەکەدا هاتووە کە جارێکیتر شێخ ڕەزا ڕووناکاتەوە کەرکووك و لەبەرئەوە بریاریدا بە یەکجاری کەرکووك بەجێبهێڵێت و رووبکاتە بەغدا.

شێخ ڕەزا شۆڕشێکی ئەدەبی بەرپاکرد کە مایەی ئەو شۆڕشە جنێوبووە.. شاعیر توانیویەتی ئەم جنێوە لە قاڵبی جوانکاری (ئیتێتیکی) دابڕێژێ. بەوەش بوو بە شاعیرێك بەرز و داهێنەر. هەرچەندە بە شاعیرێکی هەجووکەر ناسراوە و زۆرێك لەوانەی کە باسیانکردووە هەربەوە ناسیویانە و هەجووەکانی ئەوەندە توندوتیژبوون کە بووە بە هۆی دڵگرانیی هەندێ لە بنەماڵە و پیاوی ناسراو، بەڵام دەبێت هەموو ئەوانە لە سووچی هونەرییەوە تەماشابکرێت، چونکە شیعرە جنێوەکانی شێخ ڕەزا ئەوەندە وێژەکەی بەرز و باڵایە کاتێك کە وێژەر خوێندییەوە ئاگای لە جنێوەکانی نامێنێ، بۆنموونە ئەم شیعرە جنێوێکی زۆر پیسە کە دەڵێت:

بەسە بۆ دەفعی ئەعدا چاوەکەم قەڵغانە، سیمنیت
هــەزار مارتین بە قوربانی تفەنگی لوولە چەرمینت

ئەگەر سەیرێکی دارشتنی ئەم شیعرە بکەین ئەوا بە شێوەیەك مەستتدەکا لە مانا و مەبەستدا کە لەوانەیە بیر لە جنێوەکە نەکەیتەوە.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیرێکی خاوەن پلەوپایە بەرزە لە ئەدەبیاتی کوردیدا. پیاوێکی بیرکراوە بووە و لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەلاٚتی ئەو سەردەمە شارەزا بووە و رەخنەی لە هەموو کەموکوڕییەکان گرتووە و شاعیرێك بووە لە دڵداریدا وەکو عاشقێك بووە و لە تەسەوفدا وەکو دەروێشێك بووە، لە وەسفدا وەکو وێنەگرێك بووە، لە ستایشکردندا راستگۆ و بەوەفا بووە و لە داشۆرینیشدا بێباکانە شیعری جوان و رەنگینی بەخشیوە بە جیهانی ئەدەبی کوردی.

یەکێك لە خەسڵەتە هەرە دیارەکانی شێخ رەزا ئەو پەیوەندییە کۆمەلاٚیەتییە توندوتۆڵە بوو کە لەگەڵ ناوداران و پایەبڵندانی بێگانە و خۆمانەدا هەیبوو. هەر لەبەرئەو شۆرەتەی کە لە هەردوو بواری ئەدەب و کۆمەلایەتیدا هەیبووە، جیاواز لە هەندێ لە شاعیرانیتری کورد بووەتە مایەی سەرنجڕاکێشان و تێڕامانی گەلێك لە نووسەران و لێکۆڵەرەوان لەوانە (ئەمین فەیزی و پیرەمێرد و عەلائەدین سەجادی و ئەدمۆنز)و ژمارەکانی (٤ و ٦ و ٧ و ١٠ و ١١ و ١٢ )ی ژمارەی سالّی یەکەمی (١٩٢٥).

شێخ رەزا لە ساڵی ١٩٠٠ کەرکوك جێدەهێڵێت و دەچێتە بەغدا و دەیکاتە دوامەنزڵگای ژیانی خۆی. لەگەڵ گەیشتنی بە بەغداد ئاشنایەتی لەگەڵ چەندین خەڵك و بنەماڵەدا پەیدادەکات، لەوانە(حەمدی بەگی بابان و سەلیم بەگی بابان و مفتی زەهاوی و.. هتد.. شێخ رەزا لە پارچە شیعرێکدا بەمشێوەیە ستایشی بەغدا دەکات و دەڵێ:

گەر بڵێم بەغدا لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە
چونکە سوکنای غەوس و کەرخی و ئیمامی ئەعزەمە
ئەی برادەر شاری بەغدا، بێحسادەت بێهەمە
زۆر ئەمینبە لەم حیسابە پێتبڵێم کورتە و کەمە
لەم ولاٚتە هیچ ولاٚتێ هەروەکو بەغدا نییە
حاکمی عەدل و عەدالەت زۆر ئەمین و بێغەمە

بێگومان شێخ رەزا لە بنچینەدا ئەم پارچە شیعرەی بۆ ستایشی شێخ عەبدولقادری





گەیلانی و شێخ مەعرووفی کەرخی و ئیمامی ئەبو حەنیفە نوسیوە، نەك بۆ ستایشی بەغدا، چونکە ئەوانە هەموویان لە بەغدا ژیاون و ئارامگەیان لەوێیە، لەبەرئەوە بەغدا بە لای شێخ رەزاوە شارێکی پیرۆز بووە.

شێخ رەزا لە پاش ژیانێکی پڕلە هونەر و داهێنان لە دواساڵانی ژیانیدا تووشی نەخۆشییەك بووە لە هەر دووپێی خستووە.. هەندێ لە نووسەرەکان ساڵی کۆچیدوایی شێخ رەزایان بە ساڵی ١٩٠٩ داوە لەقەڵەم، بەلاٚم هەریەکە لە (کەمال مەزهەر و ئەحمەد تاقانە و حەمەبۆر) بە شەوی هەینی ١٠ی موحەرەمی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچییان داناوە. کە دەکاتە رۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ زایینی کە لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا نێژراوە و لەسەر کێلی قەبرەکەی ئەم شیعرە فارسییە نووسراوە:

یـــا رسول الله چ باشد چون سگ اصحاب کهف
داخلــی جــنت شــود در زمر او اصحاب تــو
او رود جنـــت مـــن در جهنــم کــی رواست
او ســـگ اصحاب کـهف من سگ اصحاب تـو

واتە: یا رەسولەڵلاٚ چی دەبێت منیش وەکو سەگی ئەسحابولکەهف بچمە بەهەشتەوە، کەی ئەوە رەوایە من بچمە جەهەنەمەوە و ئەو سەگەش بچێتە بەهەشتەوە، ئەو سەگی ئەسحابولکەهفە منیش سەگی ئەسحابی تۆ.

شێخ رەزا بە چوار زمان شیعری وتووە: کوردی وتورکی و فارسی و عەرەبی لە هەر چوار زمانەکەدا پلەی شیعری گەیشتووەتە ئەوپەڕی نموونەی بەرزی بەرهەمی شیعر وەکو لەم شیعرەدا بەرچاودەکەوێ:

گــزر دوائر اقــلامی ارقـــەسندە دوات
مــدار اهـــل قلـــمدر مــدیر تحـــریـرات
نگفـــــتــمت کـــە حذرکن تبغ ناطقة ام
فـــاعن ناتقـــتي افـــة مـــــن الافـــات
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباکەتە هینم بە قنگی خۆت و عەبات

ئەم پارچە سێ دێرە شیعرە، واتە شەش نیوە دێرە. نیوە دێرەکانی یەکەم و دووەهەمی بە زمانی تورکین، نیوەی دێری سێیەم فارسییە، نیوەی دێری چوارەم عەرەبییە، نیوەی دێری پێنجەم و شەشەم کوردین.

جارێکیان دەگێڕنەوە دەڵێن زانایەکی گەورە لە شێخ ڕەزا دەپرسێ دەڵێ: شاعیری زۆر بەرز و ڕەوان لە کوردا کێیە؟ هەروەها لە فارسی و عەرەبی و تورکیدا کێن؟ شێخ ڕەزاش دەڵێت: شاعیری وا لە کوردا مستەفا بەگی ساحێبقڕانە، لە فارسیدا فیردەوسی و لە عەرەبیدا موتەنەبی و لە تورکیدا نامیق کەمال، لە هەر چوار زوبانەکەشدا کاکی خۆتە. ئەوەش بەڵگەیە بۆئەوەی کە بە هەر چوار زمانەکە شیعرەی نموونەیی و بالآی نووسیوە.

❊❊❊

**سەرچاوەکان**

١. د.مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، نیوەی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم،١٨٥١- ١٩١٤،٢٠١٠
٢. د.موکرەم تاڵەبانی، شێخ رەزای تاڵەبانی، ژیانی، پەروەردەیی، بیروباوەڕی و شیعری٢٠١٠
٣. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شێخ محمدی خاڵ، ئامادەکردنی بۆ چاپ ئومێد ئاشنا، پێداچوونەوەی د.کەمال فوئاد، ٢٠٠٣
٤. شێخ رەزا، گۆڤاری رۆڤار، ژمارە ٥٣، ئازاری ٢٠٠٩
٥. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چالاك تاڵەبانی، ١٩٩٩
٦. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، عەلی تاڵەبانی، بەغداد، ١٩٤٦
٧. سایتی www.pertwk.com





## هاوکێشەکانی دەسەڵات

## کاتێك شیعر هاوکێشەکان لاسەنگدەکات
## شێخ ڕەزای سەرکز
## شێخ ڕەزا و هێسترەکەی میر

ع. باخانی

ئەوەی بە ڕواڵەت لە ڕێگەی شیعرەکانیەوە وێنای شێخ ڕەزای تاڵەبانی بکات، پتر هەر لە وێنەی دەسەلاتێکی شیعریی بێوێنە، دەستپێشخەر، هێرشبەر و پتر سەرکەوتوودا بەرجەستەیدەکات و، کەمتر خوێنەر بەلای ئەوەدا دەڕوات کە ئەو کەڵەشاعیرە پتر و، لەدڵگیرترین و هونەریترین شیعرەکانیدا، سەرکز[1] و بێپەنا و بێهێز خۆی نواندووە و لەو ڕێگەیەشەوە دەستیکردووەتە لێدانی خاڵەکانی لاوازیی بەرانبەرەکەی بەوشێوەیەی کە بواری داکۆکی لەخۆکردنیشی بۆ نەهێشتووەتەوە. بە بۆچوونی نووسەری ئەم چەند دێڕە وردبوونەوە لەم لایەنە دەتوانێ ببێتە دەروازەیەکی باشی لێکۆڵینەوەی مەسەلەی غافڵگیرکردنی بەرانبەر - نەك دوژمن - لای شێخ ڕەزا و، هەوڵدانی ئەوەی بە بنکەنکردنی ئەو زەمینەیەی بەسەریەوە ڕاوەستاوە، ناچاریبکات خۆبەدەستەوەبدات. لەمرووەوە ئەم هەوڵە تەرخاندەکرێ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە: ئایا بەراستی شێخ ڕەزا شەڕگەیەکی ئاوەهای هەبووە یان نەء!؟و، ئایا ڕووبەری ئەو شەڕگەیە هێندەبووە کە شایانی ئەوەبێت حیسابی شەڕگەی بۆبکرێت!؟. گریمانەی ئەم نووسینەش ئەوەیە کە ئەوشێوازە، بەکردەوە چەکێکی نهێنیی ئێجگار کارای شاعیر بووە و، سەرەڕای ئەوەی زۆریش بەکاریهێناوە، نەیارانی لەم شەڕگە شیعرییەدا، نەیانتوانیوە ئەو چەکەی بدۆزنەوە بەو مەبەستەی کاریگەریی کەمبکەنەوە، یان دژی خۆی بەکاریبهێنن، ئەمەش لە ساکارترین شێوەیدا ئەو ڕاستییە دەگەیەنێ کە شێخ ڕەزا تاقەسواری ئەو شێوازەی شەڕ تایبەت بووە کە خۆی دایهێناوە و، هێندەی دەق لە بواری شیعری داشۆرین (هەجا) لەبەردەستی خوێنەری کورددا بێت، پێناچێ کەسیدیکە - واتە غەیری شێخ ڕەزا لەنێو شاعیراندا - پەی بەو ڕازە گرنگە بردبێت.

"هێسترەکەی میر"ئامالژەیە بۆئەو شیعرەی"شێخ رەزا"کە، بەپێی مەعنای راستەوخۆی شیعرەکە هێسترێکە، لەو سەردەمەدا، میری شەقلاوە بۆ شێخ رەزای ناردووە و، ئەمەی خوارەوە یەکەمین"بەیت"ی ئەو شیعرەیە:

میـر بە سەد مننـەت هەناردی ئێسترێکی رووتوقووت
دەستوپا سست و سەقەت ئەندامی هەر وەك عەنکەبووت (٢)

لـە نوسـخەکەی (کـوردی - مـەریوانی)دا بەمـشێوەیە چیرۆکی ئـەم شـیعرە گێڕدراوەتەوە:"محمد بەگی قادر بەگ، کە قایمقامی رانیە بوو، ئێسترێکی لاواز دەنێرێ بۆ تالەبانی، حەمە ئاغای ئاکۆ کە پێدەزانێ ئێسترێکی چاکتری بۆ دەنێرێ، ئەمجا ئەوی - واتە هێستره لاوازەکـە - ناردەوە لەگـەڵ ئـەم هەڵبەستەدا:، ل ١١". دوکتـۆر (موکـەڕەم تالەبانی)"میر"ی ئەو بەیتە بە (میری شەقلاوە) دەزانێ و مەسەلەکەش بە چیرۆکی ناردنی ئێسترێکی لاواز لەلایەن میرەوە دەبەستێتەوە، بەڵام بەرانبەرکێ پێکردنەکەی لە ناردنی، بەروالەت، دوو هێستر - یەکێکی زیندوو و یەکێکی مردوو! - لەلایەن عادیلە خانمی هاوسەری وەسمان پاشای جافەوە بۆ شاعیر دەبینێ (ل ٢٧٩)، وەکو شاعیر لەم بەیتە و بەتەکانی پاشەوەیدا باسیدەکات:

ئێسـتری زیندوو بلێـم، بۆم چاکـە، یا مردووم دەوێ
ئیحتیاجـم زۆرە خانـم، بابلێـم هەردووم دەوێ
تالەبانی ١٣٤

پێدەچێ، وەکو د. تالەبانی بۆیچووە، هەرگیز، وشەی"هەردوو"ی دووەمین بەشی ئەم بەیتە پەیوەندیی بە "ئێستری زیندوو و مردوو"ی یەکەمین بەشیەوە نەبێ (ل ١٣٤)، چونکە هێستری مردووە "بار"ە نەك "خەلات"، کەواتە روونە مەبەستی شاعیر ئەمەیە: "خانم زۆر پێویستە، بۆیە هەردوکیانم دەوێ"، بەڵام بۆ شاردنەوەی مەبەستەکە و دروستکردنی"تەوریە" وشەی "خانم"ی دواخستووە بۆئەوەی وەکو قسە لەگەڵکراو - مخاطب - بێتەپێشچاو، لەخودی





ئەم شیعرەشەوە، کە مەبەستی ئەم خوێندنەوەیەیە، دەردەکەوێ کە شێخ رەزا تەنانەت هێستری لاوازیشی ناوێ، جا چ جای هێستری مردوو!؟ ئەگەرچی زانینی داشۆردراو - هەجوکراو - لەم شیعرەدا رەنگە بۆ زانینی رادەی جیددیبوون و نەبوونی شاعیر لەم هەجوەدا و جۆری پەیوەندیی لەگەڵ بابەتی شیعرەکەی پێویستبێت، بەڵام مەسەلەی بەرانبەرکێ پێکردنەکە، بەوشێوەیەی لای کوردی - مەریوانی و د. تالەبانی/دا بەدیدەکرێت - تەنها بۆ سەلماندنی پەیوەستیی شاعیر بە بەخششی کەسانی داشۆردراو یان ستایشکراوەوە هەیە و، هەردوو مەبەستیش لە بیرۆکەی بناغەیی ئەم خوێندنەوەیە دوورماندەخەنەوە، بۆیە لەم هەڵوەستە کورتە بەولاوە بەجێیدەهێڵین.

دەسپێك راستەوخۆ، راپۆرتئاسا، رووشکێن و رکوڕەوانە. "میر" پایەیەکی کۆمەلایەتیی گرێدراو بە هەردوو دەسەلاتی ئابووری و، بە پێوەری ئەو سەردەمە، سیاسیشە. ئەگەر وەکو نوسخەکەی مەریوانی بۆیچووە قایمقام بووبێت، ئەوا بەرپرسیاریی ناوچەیی گەوەی حکوومەتیشی دێنەپاڵ و، لە هەردوو حالەتیشدا دەتوانرێ پێشبینیی ئەوە بکرێت کە هێزێکی سەرکوتکەرانەی لەبەردەستدابووە. لە یەکەمین بەیتی ئەم شیعرەدا، بەم کورتی و پوختییە راپۆرتە هەواڵی ئەم پیاوە خاوەنپایە تایبەتە راگەیەندراوە: "میر بە سەد مننەت هەناردی ئێسترێکی رووتوقووت". پێکهاتەکانی ئەم هەواڵە ئەمانەن: "کێ - میر"، "چی - هەناردی ئێسترێك"، "کەی - رابوردوو - هەناردی"، "کوێ - لای میرەوە بۆلای شاعیر"، "چۆن - بە سەد مننەت (بۆ چۆنێتیی ناردن)و رووتوقووت (بۆ چۆنێتیی هێسترەکە)". پێکهاتەکانی "کات"و "شوێن"، ئەگەرچی بەپێی پێویست روونین، بەڵام ئالۆزیشنین، چونکە پێدەچێ هێندە بەسەر "ناردنی هێستر"ەکە لەلایەن میرەوە بەسەرنەچووە کە پرۆسەی "ناردنەوەی هێسترەکە"، بەم شیعرەشەوە، بووەتە وەلامی راستەوخۆی هەڵوێستێکی ناچاوەروانکراو لە میرەوە. واتە "کات"ەکە رابوردوویەکی نزیکە. شوێنەکەش "لە شەقلاوە" یان "رانیە"وە بۆ "کۆیە" یان "کەرکووك"ە، کە پتر پێدەچێ لە "شەقلاوە"وە بۆ "کۆیە" بێت، کە ماوەی نێوانیان هێندە دوورنییە، بە پێوەرەکانی ئەو سەردەمە، بەڵام هەموو هەواڵەکە لێرەدا کۆتاییپێدێت و پاشماوەی ئەم شیعرە، بە دووەمین بەشی ئەو یەکەمین بەیتەشەوە، یان وەسفە یان هەڵوێستنواندن، هەڵبەتە بە توانایەکی شیعریی بەرزەوە. هەردوو ئاراستەکەش لە خزمەتی تاقە مەبەستی بنکەند و مایەپووچکردنی "میر"و پایە کۆمەلایەتی - سیاسی - ئابوورییەکەی "میر"دان.

"میر بە سەد مننەت هەناردی.."، بێپەردە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات میر خۆبەخشانە و

بەخواستی خۆی هێسترەکەی نەناردووە، بەڵکو کاریگەرییەکی دەرەوەی ناخی خۆی بەسەرەوەبووە، ئەگەرچی بەدڵنیاییەوە نازانرێ کاریگەرییەکە ترسی میرە لە زمانی شاعیر، حیسابکردنە بۆئەوەی خەڵکیدیکە هەن رەنگە شتی باشتر بۆ شێخ رەزا بنێرن و بەوەش ئەگەر ئەم هیچ نەنێری ئیدی شاعیر بەتەواوی "تیغی زوبان"ی بۆ لە کێلانی دەمی دەربێنێت و کەس نەزانێ دەرەنجامەکەی چبێت بۆئەم، یان هەر هۆیەکیدیکەیە. تەنها شتی بەدڵنیاییەوە هەڵێنجراو لەو بەیتەوە ئەو راستییەیە کە هێشتاش "میر" ئاراستەیەکی دژی خواستی خۆی گرتووەتەبەر، بەلاّم بەهای "نێردراو" لە روانگەی ئەم شیعرەی "شێخ رەزا"وە چییە!؟

هەر لەو یەکەمین نیوەیەی ئەو بەیتەدا بەشێکی ئەو بەهایە دەخاتەڕوو: "ئێسترێکی رووتوقووت". لێرەوە خوێنەر ئەو بۆچوونەی لاگەلاڵەدەبێت کە "میر" چاکەکەی بە "نیوەچڵی"هێشتووەتەوە، بەلاّم بەلای شاعیرەوە ئەمە تەنها دەروازەی ئەو وێنە گشتییەی "میر"یش کە شاعیر دەیەوێ بیخاتەڕوو. بەپێی ئەو دەروازەیە ئەو ئێسترە تەنها "رووتوقووت" نییە بەڵکو: "دەستوپا سست و سەقەت، ئەندامی هەروەك عەنکەبووت"یشە. هەرهێندەش گوترابێت، دەبێ بە چ جۆرێك بیر لەو "میر"ە بکرێتەوە!؟ تائێرە، ئەگەرچی "میر" لە سەنگەری رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆدا نییە، بەڵکو بواری شەڕەکەش هەر بواری ئەو نییە، بەلاّم شاعیر دووچاری هێرشێکی کوتوپڕ، ناچاوەڕوانکراو و هەناسەبڕی کردووە. پلانی هێرشەکەی شاعیر تەنها غافڵگیرکردن و کوتانەسەر بەرانبەر نییە، بەڵکو داماڵینیەتی لە ئەگەری بەخۆداهاتنەوە، خۆکۆکردنەوە و رووبەڕووبوونەوەی هێرشەکە لە روانگەی ئەوەی هەرچەندە هێرشەکە کوتوپڕ و بەربلاّو و قورسبێت، هێشتاش چەند خاڵێك دەمێننەوە کە لە بەرژەوەندیی هێزی داکۆکیکاردایە، لەوانەش نهێنییەکانی ئەو شوێنەی هێرشیکراوەتەسەر، بەلاّم بەوردبوونەوە لەم شیعرەی شێخ رەزا ئەو راستییە ڕووندەبێتەوە کە "شەڕگە"کەکەی ئەم نەك هەر لە دەرەوەی جوگرافیایە، بەڵکو رەنگە لە دەرەوەی هەموو مەوداکانی وێناکردن و بیرکردنەوەی "میر"یشدا بێت. تەنها بە وشەی "هەناردی - ناردی"، نێردراو "ئێستر"ەکەش لەو شوێنەدا نەماوە کە میری لێیە و، گەیشتووەتە قەڵەمڕەوی دەسەلاّتەکانی شاعیر و، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەسەلاّتە شیعرییەکەی. جگەلەمەش، ئەم هەلومەرجە تازەیە هەلی وردبوونەوەی تەواوی شاعیر لە چەکە بەکارهێنراوەکانی خۆی - عەیبەکانی هێسترەکە -، بە توانای گەورەتر و زەقترکردنی ئەو عەیبانەشەوە، بەشێوەیەك رەخساوە کە "میر" ناتوانێ چاودێریبکات. ئەوەی لەم رووبەرەی





شیعرەدا روودەدات هەرگیز توانای"سیخوڕیکردن" یان "سیخوڕدانان" بۆ بەرانبەر بەجێناهێڵێ، چونکە ئەو شتانە لە مێشکدا روودەدەن و مێشك/یش بواری دزەبۆکردنی نییە. ئەم خاڵی هێزە، هەر لە یەکەمین چرکەی غافڵگیری و دەستەپاچەیی بەرانبەردا بەئەوپەڕی زیرەکییەوە، لەلایەن شاعیرەوە دەقۆزرێتەوە و، شەڕگەکە بەسەرکەوتوویی تەواو و بەئیفلیجکردنی هەر توانایەکی بەخۆهاتنەوە و کاردانەوەی، دەگوازێتەوە بۆ شوێنی ئەو و، لە رێگەی خستنەڕووی فلاشباکی مامەڵەکردن و رەفتاری "میر" لەگەڵ ئەو هێسترە و لە رێگەی پلانێکی چەند قۆناغی بەوردی دارێژراوەوە پەرە بە مەسەلەی پیادەکردن دەدات:

خاوەنی ئالیکی، نالێم، پێینەداوە موتڵەقا
داویەتی، ئەمما وەکو بیستوومە، قووتی (لایموت)
پووش لەلای حەڵوایە حەتتا گەر پەلۆشەی چنگکەوێ
بایدەدا، لوولیدەدا، قووتیدەدا، مانەندی حووت
گەرچی ناتوانێ ببزوێ هێند لەڕ و کەمقووەتە
دەنکەجۆیێکی نیشاندەی، تا قیامەت دێ لەدووت

تا ئێرە قۆناغێکی ئەو پلانە بەدیدەکرێت و، شاعیر زۆر زیرەکانە دەیەوێ ئەو راستییە بخاتەڕوو کە رەزیلی و دەستگیرۆیی و قرچۆکیی "میر" زکماکییە و پەیوەندیی بەوەوە نییە کە ناچاربووە ئەو هێسترە بۆ شاعیر بنێرێ، بەڵکو لە سەرەتاوە هەرهێندە "ئالیك"ی پێداوە کە نەمرێ و، بۆئەوەی نەگوترێ شاعیر ئەم قسەیەی بۆ هەڵبەستووە، بە گوتنی "وەکو بیستوومە" شایەتێکی ناونەبراو دێنێتە نێوانەوە و، هەر لەو شوێنەشدا، پاش وەرگرتنی ئەو شایەتییە کورتوپوختە، لە شانۆی رووداو دووریدەخاتەوە و دێتە گۆڕەپانی پشکنینی گشتیی ئێسترەکە بۆ ئەوەی ئەو شایەتییە پشتراستبکاتەوە. بەلاّم بەچ شێوەیەك ئەو ئەرکە ئەنجامدەدات!؟ بەشێوەیەکی ناراستەوخۆی ئێجگار دڵگیر لە رێگەی بەرجەستەکردنی برسێتیی هێسترەکەوە: "پووش لەلای حەڵوایە حەتتا گەر پەلۆشەی چنگکەوێ بایدەدا، لوولیدەدا، قووتیدەدا مانەندی حووت". شاعیر بەوەوە نەوەستاوە برسێتیی ناسایی هێسترەکە بخاتەڕوو، بەڵکو "پووش" لێبووەتە "حەڵوا"و، تەنانەت ئەو "پەلۆشە"یەی لە حاڵەتی ئاساییدا بەهۆی ئەستووری و بەهۆی

درکەکەشیەوە ئەوجۆرە ئاژەڵە خۆی لێدەپارێزن، لەم هەلومەرجە نائاساییەی برسێتیدا "هێستر"ەکەی "میر" بەو "چێژ"ە نائاساییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات و، بەشێوەیەکی نزیك لە ئاهەنگ بۆگێڕان دەیخوات. ئەمەش، بەوردی دەکرێ بە (ئاوڕدانەوە لە سایکۆلۆژیی "ئاژەڵ"ی بێبەش - محروم - لە هەلومەرجە پێویستەکانی بەردەوامیی ژیانی ئاسایی) لەقەڵەمبدرێت و، داهێنانێکی دەگمەنە لەو بوارەدا.

یەکەمین هەڵکشانی وێنە داینەمیکییەکانی بەرجەستەکردنی برسێتیی هێسترەکە لە چوارەمین بەیتدایە. یەکەمین بەشی بەیتەکە راستەوخۆ و دوور لە هەوڵی داڕشتنی هونەری و راپۆرتئاسا راستییەکی باری هێسترەکە دەخاتەڕوو: "گەرچی ناتوانێ بزوێ هێند لەڕ و کەمقووەتە"، بەڵام کرۆکی ئەو وێنەیە کە لە دووەمین بەشی بەیتەکەدا بەدیدەکرێ بەتەواوی لەسەر بناغەی ئەم داڕشتنە راپۆرتئاسایە بنیاتنراوە: "دەنکەجۆیێکی نیشاندەی تا قیامەت دێ لەدووت". شاعیر رۆڵێکی سیحریی بەو "دەنکەجۆ"یە بەخشیوە.. رۆڵی بەخشینی وزەی رۆیشتن (چ رۆیشتنێکیش!؟) بە ئاژەڵێك برسێتی برستی بەتەواوی لێبڕیوە و لەڕ و بێهێزی کردووە تا ئەو رادەیەی ناتوانێ ببزوێ. ئەمە بەرجەستەکردنی "هێنانەدیی مەحاڵ"ە لە ئاستێکی دیاریکراودا. لەگەڵ ئەوەی لە چەند بەیتێکیدیکەی ئەم شیعرەدا شێخ رەزا زوومەکە دەگوازێتەوە بۆ لایەنێکیدیکەی هەلومەرجی گشتیی هێسترەکە (شوێنەواری نەخۆشی و ئازاری جەستەیی)، بەڵام دەرەنجام بەهێزترین هەڵکشانی وێنە داینەمیکییەکانمان دەخاتەپێشچاو:

پشتی رێش و شانی زامدار و جدەو بوو، ناعیلاج
چەند قورووشێکم هەبوو، بۆمدا بە نەوت و عەنزەرووت
مەسڵەحەت وایە، هەتا نەیخواردووم، بینێرمەوە
زۆر دەترسم دەفعەیێ قووتمبدا، بمکا بە قووت
سەی فەتاحی مەیتەرم رۆژێ بە حینجەت(٣) لێینەوی
کلکی دەرهێنا لەبن، ئەمجا بە ئاستەم گوێی بزووت

شاعیر زۆر بە وریایی و، هەنگاوبەهەنگاو بەرەوپێشەوە دەڕوات. لە سەرەتای ئەم چەند





بەیتەوە لەلایەکەوە بێباکی و بێبەزەیی بوونی "میر" بەرانبەر بەو "هێسترە خراوەتەڕوو کە هەر بۆ بەرژەوەندیی خۆیشی بووبا دەبوو ئاوەها نەبا. لەلایەکیدیکەشەوە شاعیر ئەو دیارییەی بە "بەلا" نەك "خەلات" بۆخۆی لەقەمداوە. پشت و شانی ئێسترەکە بەوشێوەیە زامداربووبێت بەڵگەی ئەوەیە "میر" بە هەموو توانایەکی و بۆ هەموو کارێکی قورس بەکاریهێناوە، بەڵام کە ئەوشێوە بەکارهێنانەش بووەتە مایەی دروستبوونی ئەو برینانەی سەر پشت و شانی هێسترەکە مەسەلەکەی پشتگوێخستووە بۆیە برینەکان بوونەتە مایەی سەرهەڵدانی نەخۆشیی پێست.. کە شاعیریش پاشەکەونی خۆی - پارەی هەڵگیردراو - لەسەر هێسترەکە خەرجبکات: "چەند قورووشێکم هەبوو بۆمدا بە نەوت و عەنزەرووت"، ئەوا نەك هەر قازانجی بۆی نەبووە بەڵکو بووەتە مایەی رووتاندنەوە و سەرێشەش. هەرئەم بەیتەی بۆ مەسەلەی تەندروستیی ئاژەڵەکەیە و، لە جەوهەریشدا هەر لە خزمەتی بەرجەستەکردنی قرچۆکیی میردایە. پاش ئەمە دیسانەوە هەر دەگەڕێتەوە سەر برسێتیی لەڕادەبەدەری هێسترەکە، بەڵام لە رێگەیەکیدیکەوە:"مەسڵەحەتوایە هەتا نەیخواردووم بینێرمەوە زۆر دەترسم دەفعەیێ قووتمبدا، بمکا بە قووت". ئەم ئاوڕدانەوەیە لە ئەگەری پەرەسەندنی درامیی برسێتی بۆئەوەی ببێتە مایەی کارەساتێکی چاوەڕواننەکراو، بەڕواڵەت، پێشوەختە و دەبوو هێندێك دوابکەوێت، پێ دەچێ خودی شاعیریش حیسابی بۆئەمە کردبێ بۆیە دوابەدوای ئەمە هەڵکشانی وێنە دەگاتە لوتکەیەکی سەیر: چ وێنەیەکی داینەمیکییە ئەوەی ئاژەڵێك بگاتە ئەو رادەیەی کلکی لەبن دەربهێنرێ و هەموو کاردانەوەکەی بریتیبێتلەوەی تەنها گوێی ببزوێ، ئەویش "بەئاستەم"!؟ با ئەم وێنەیە، لە مێشکی خۆماندا بە بەیتێکیدیکەی ئەم شیعرە کە پێشتر هەڵوەستەی لەئاستدا کراوە، گرێبدەین: "گەرچی ناتوانێ ببزوێ هێند لەڕ و کەمقووەتە دەنکەجۆیێکی نیشاندەی تا قیامەت دێ لەدووت"، لەم پێکەوەگرێدانەوە چ ئەنجامگیرییەك دەتوانرێ بکرێ!؟

بەئاسانی، پەیبردن بە نموونەیەکی ئێجگار سەیر و تایبەتی رەزیلی و قرچۆکی. نموونەیەك بەئاسانی ناتوانرێ هاوشێوەی بەدیبکرێت. لە هەجوی زمانی عەرەبیدا ئەو بەیتەی (الآخطل، أبو مالك غياث بن غوث بن الصلت بن طارقة التغلبي ١٩ - ٩٢ ك، ٦٤٠ - ٧١٠ ز) کە دەڵێ:

قَومٌ إذا استنبح الأضيافُ كَلبَهُمُ
قالوا لِأُمِّهِمُ بُولي عَلى النَّارِ

واتە:"خەڵکانێکن کە ئەگەر هاتنی میوان سەگەکەیانی وەڕاند (بووە مایەی وەڕینی سەگەکەیان)، بە دایکیان دەڵێن میز بەسەر ئاگرەدا بکە"، بەلای بەشێکی زۆری رەخنەگرانەوە بە بەهێزترین بەیتی هەجوی عەرەبی لەقەڵەمدراوە. با هەردوو بەیتەکە شیبکەینەوە. خودی تیرەکەی (جریر، أبو حرزة جرير بن عطية بن حذيفة الخطفي الكلبي اليربوعي التميمي ٣٣ - ١٣٣ ك، ٦٥٣ - ٧٥٠ ز)، کە بەنی تەمیمن لەبارەی ئەو بەیتەوە گوتوویانە: "بەهیچ شتێك هەجونەکراوین کە لەم بەیتە، بۆ ئێمە، سەختتربێت"، "چەند روویەکیش بەخۆوەدەگرێت: لەنێو گوندەکاندا بە رەزیل و قرچۆك ناویبردوون، دایکی خۆیشیان کردووەتە ئەو کارەکەرەی فەرمانی دەرخستن و پیشاندانی عەورەتی خۆیان پێکردووە، واش خستوونیەڕوو کە لەخەرجکردنی ئاویشدا بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە هەر قرچۆکبوون بۆیە فەرمانیانپێکردووە بە میز بیکوژێنێتەوە، العسكري، بلا تأريخ، ١/٤٢٣". هێندێك لە مێژوونووس و رەخنەگرانی ئەدەب ئەو بەیتەیان بەتوندترین هەجوی گوتراوی عەرەب داناوە (النويری ١٤٢٤ ك، ٢٠٠٤ ز، ٣/٢٥٧و، إبن منظور، بدون تأريخ ١ / ٤١٦)، لای خودی "جەریر"یش زایەڵەیەکی گەورەی هەبووە و لێیدەگێڕنەوە کە: "ئەو بەیتە زۆری ئازارداوە و گوتوویەتی: چەند جۆرە هەجو و جنێوێکی بەم بەیتە کۆکردووەتەوە لەوانە رەزیلیی لەڕادەبەدەر و، ناپەسەندترین ئازاردان و پڕکێشی دژی دایك و، پیس و چەپەڵیی شوینی تێداژیان و، خراپە لەوەی لەبارەی دایکەوە باسیکرد، المبرد ١٤١٧ك، ٣/١١٦". رەخنەگریدیکەش لەو بەیتەدا ئاماژە بۆ سووکی و هیچوپووچیی خۆیان و دایکیان، لە روانگەی خۆیانەوە، دەکات (العسكری ١٤٠٦ك، ١/٤٢٣". شتیدیکەش لەبارەیەوە گوتراوە، بەڵام هەر لە سنووری ئەو مەعنایانەدا، بەڵام ئەو بەیتەی شێخ رەزا چیی گوتووە!؟

رازی گەورەی ئەو بەیتە لەوەدایە کە کۆششی دابراندنی لە بەیتەکانیدیکە زۆر سەرناگرێ، پێش هەموو شتێکیش لەبەرئەوەی خودی بەیتەکە هێندە کراوەیە کە لێکدانەوەی ئێجگار زۆر هەڵدەگرێت و رەنگە بۆ شوێنیدیکەی ناپێویست پەلکێشمانبکات، تەنها گرێدانی بە بەیتەکانیدیکەی شیعرەکەوە سنووورە وردەکانی مەبەستی شاعیر دەتوانرێ دیاریبکرێن. بۆنموونە، نەبزووتنی ئەو ئاژەڵە، یان "بە ئاستەم بزووتنی گوێی"، سەرەڕای "لەبندەرهێنانی کلکی"، ئایا لە نەمانی "هەست بەئازارکردن"ەوەیە، یان لە بێبایەخدانانی ئەو بەشەی جەستەی، یان لەدەستدانی کاردانەوەی ئاسایی ویست - الارادە - یان پەککەوتنی شانە تایبەتە بەرپرسەکانی





هەست بە ئازارکردن!؟ بێگومان، هەر یەك لەم ئەگەرانە لە هەلومەرجیدیکەدا بۆیان هەیە راستبن، بەڵام لەم بەیتەدا نەخێر و، ئەمەش تەنها لە بەیتەکانیدیکەوە ئەنجامگیریدەکرێ. لە چوارەمین بەیتی ئەم شیعرەدا شاعیر باسی "لەڕی و بێهێزیی"ی لەڕادەبەدەری هێسترەکەی کردووە و سەرەڕای ئەوەش گوتوویەتی: "دەنکەجۆیێکی نیشاندەی تا قیامەت دێ لەدووت". لەو بەیتەدا هەمان ئەو برسێتییەی هێندە لەڕ و لاوازیکردووە کە ناتوانێ ببزوێ بووەتە مایەی ئەوەش کە تەنانەت "دەنکەجۆ"یەکیشی لابکاتە ئەو شتە هێندە بەنرخەی خۆی لەبیربکات و تا ئەودیو سنووری نەمان/یش لەپێناوی وەدەستهێنانیدا هەنگاوبنێ. ئەمە لایەنێکی چارەنووسی ئاژەڵێکی بەستەزمانە، هەڵبەت لە روانگەی شاعیرەوە، بەدەست خاوەنەکەیەوە، دووەمین لایەنی ئەو چارەنووسە لەم بەیتەیدیکەدایە.

هەمان ئەو برسێتییەی بەو رادەیە لەڕ و لاوازیکردووە گەیاندوویەتییە لێواری ئەوەی چەمکی "جیاوازی"ی نێوان مەبەست یان شتە هاودژەکان مەعنای خۆی لەدەستبدات. راستە ئەو بەستەزمانە توانای لێکدانەوەی نییە، بەڵام، بەگشتی، شێوازێکی تایبەتی تەعبیرکردنی هەیە بە "کاردانەوە" دەناسرێت."هێستر"یش، بەتایبەت، لەنێو ئەوانەی لە ناوچە شاخاوییەکاندا زۆری بەکاردێنن، بەوە ناسراوە کە کاردانەوەی بەرانبەر بەپتر لەڕادەی ئاسایی ماندووکردنی دەگاتە ئەوەی بە"خۆ هەڵدێران لە بەرزاییی"یەوە خۆبکوژێت، کەچی لەم بەیتەدا، نەك بەهۆی پتر لەڕادەی ئاسایی ماندووکردن، بەڵکو بۆ کلك لەبن دەرهێنانیش هیچ جۆرە کاردانەوەیەکی ئەوتۆی لا بەدیناکەین. ئەمە لە شیعرێکدا ئاماژەی بۆکراوە کە باس لەوەدەکات بۆ بینینی "دەنکەجۆ"یەك لای هەرکەسێك، تا قیامەت دوویدەکەوێ. ئایا ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە، لەم بەیتەدا مرۆڤێندراوە - خراوەتە پێستی مرۆڤەوە -و، ئیدی ئەوەی بۆ روونبووەتەوە کە "مان"و "نەمان"ی جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە و "لەدەستدانی کلك"ی هەر هێندە دەهێنێ تەنها "بەئاستەم" گوێی بۆ ببزوێنێ، وەکو ئەوەی بڵێ: "ئەوەش نەما"، وەکو هەموو ئەو شتانەیدیکەی کە پێشتر نەمابوون: "قەڵەوی - تەندروستی"، "هێز و تین"، "شان و پشتێکی ئاسایی و بێبرین"، "توانای بارهەڵگرتن"و، تەنانەت توانای رۆیشتن و غاردان و.. تاد.

هەر لە سنووری ئەم شیعرەدا، ئەو کاردانەوە نائاساییەی هێسترەکە دەتوانرێ بەوشێوەیەش لێکبدرێتەوە ئەوە ئەوپەڕی وزەی ئەو ئاژەڵەیە بەرانبەر بەوەی بەسەریدا هێنراوە. بەمەش شاعیر دەیەوێ ئەوە رابگەیەنێ کە "میر"، بە رەفتاری ئاسایی بەرانبەر بەئەم ئاژەڵە، سەرەڕای

هەوڵدانی شاعیر بۆ چاکردنەوەی بە "نەوت و عەنزەرووت"، هێسترەکەی بەوڕادەیە گەیاندووەتە لێواری مەرگ کە بەرانبەر بە کارەساتێکی گەورەی وەکو "کلك لەبندەرهێنان" تەنها توانای "بەئاستەم بزووتنی گوێ"ی ماوە، کەواتە ئەمە چ تراژیدیایەکە بۆ ئاژەڵێکی بەستەزمان بەدەست کەسێکەوە هیچ حیسابێکی بۆ ئەوەش نەکردووە کە چەندی خزمەتکردووە و چەند بە کەڵکیهاتووە. هەڵبەتە، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی شێخ ڕەزا تەنها ئەم هێسترەی، لە سەرجەمی ئەو شتانەی "میر" ڕەفتاری لەگەڵ کردوون، لەبەردەستدایە ئەو بەستەزمانەش ئەمە حاڵیەتی، دەبێ ڕەفتاری هەمەلایەنەی "میر" چۆنبێت!؟

ئێستا، پاش ئەم شیکردنەوە خێرایەی ئەو بەیتەی شیعرەکەی شێخ ڕەزا، ئەگەرچی تەنها لە پەیوەندی لەگەڵ بەیتێکی پێشووتر ئەنجامدراوە و هێشتا بەیتی پاش ئەمەش ماوە، دەبێنین ڕەزیلییەکەی تیرەکەی جەریر، کە بەنی تەمیم/ن لە ڕوانگەی بەیتە شیعرەکەی (الاخطل)ەوە، تەنها بۆ میوان بەوشێوەیە ڕەزیلن، کەچی "میر" لە گرنگترین مەسەلەی چارەنووسسازی خۆی، کە ڕاپەڕێنەری هەموو کاروبارە گرنگەکانیەتی، هەر ڕەزیل و قرچۆکە و، ئەم مەسەلەیەش گەیشتووەتە ئەو ئاستەی مرۆڤ دەگاتە ئەو ئەنجامەی، بەپێی پێوەرەکانی ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا، تەنانەت گومان لە هۆشمەندی و دامەزراویی کەسایەتیی "میر"یش بکات، چونکە ئەگەر ئەو بتوانێ بەشێوەیەکی گونجاو و دروست بەرژەوەندییەکانی خۆی هەڵبسەنگێنێت نابێ بەوشێوەیە لەگەڵ یەکێك لە گرنگترین پێویستییەکانی ئەو سەردەمە ڕەفتاربکات. ئەمەی "میر"، بە هەموو مەعنایەك "لەقە لە بەختی خۆدان"ەو، ناکرێ لە عەقڵێکی دروست و بارێکی دەروونیی دامەزراو و ئاساییەوە هەڵقوڵابێت. بەو هەلومەرجە عەقڵی و دەروونییە نائاساییەش ناتوانرێ باس لە ڕەفتاری دامەزراوی "میر" لەگەڵ هیچکەس و شتێکی دەوروبەری بکرێت و، عەرەب گوتەنی: "حَدِّث وَ لا حَرَج"دەبێتە پێوەری ڕاستەقینەی هەڵسەنگاندنی هەر ڕەفتارێکی "میر". لەلایەکیدیکەشەوە، ئەو بەیتەی "الأخطل"دا کۆمەڵ "تیرە"یەك دەبێتە مایەی نائومێدکردنی کەسێك و، لەمەی شێخ ڕەزادا تاکەکەس دەبێتە مایەی کارەساتی تراژیدی بۆ هەموو دەوروبەری ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەم بەیتەدا ناتوانرێ بە ڕاستی پێشبینیی ئەوە بکرێت تا چ ڕادەیەك ئەگەری قووڵبوونەوی تراژیدیی تاك - با ئاژەڵیش بێت -و کۆمەڵیش هەیە، چونکە ڕەفتاری نائاسایی گرێدراو بە باری عەقڵی و دەروونیی نائاساییەوە هەمیشە پەیوەندیی بە هەڵکشانی کاریگەریی دەوروبەر و هەلومەرجی دەروونیی ناوەوە هەیە. بۆیە هەمیشە ئەگەری ئەوە لە





ئارادایە ئەو کاریگەرییانەی ناو و دەرەوە ڕەفتارەکە بگەیەننە ئاستگەلێکی ناچاوەڕوانکراو.

لەدوا سێ بەیتی ئەم شیعرەدا ڕووبەڕووی سێ ئاراستەی جیاواز دەبینەوە: درێژەدان بە گیانی گشتیی شیعرەکە، واتە ڕەفتاری نالەباری میر لەگەڵ ئەو ئاژەڵە، هێنانەناوەوەی کەسێك - حاجی ئەحمەد ناوێك - کە هیچ لەبارەی خۆی و هۆی ئامادەکردنی لەم گۆڕەپانەدا چییە و، نواندنی سەرکزی و "بێوەی"بوونی خۆی - شاعیر - کە لە سەرجەمی ئەم شیعرەدا، بێجگەلە دوا دوو بەیت، هەر لە حاڵەتی هێرشکردندا بووە. لەدرێژەدان بە گیانە گشتییەکەی ئەم شیعرەدا شێخ ڕەزا ڕووبەڕووی لایەنێکی شاراوەی خەسڵەتە گرنگەکانی ئەو ئێسترەمان دەکاتەوە کە هەر ئەو ڕەفتارە نائاساییەی "میر" بووەتە هۆی خەفەکردن و داپۆشینی، ئەمەش ئەو بەیتەیە:

گەر قەڵەو بێ ئەم ئەجننە نێرە تەسخیرناکرێ
غەیری چەند دەروێشی ڕەففاعی بە زەبری جەلجەلووت

لێرەدا ڕووبەرووی ئەگەرێکمان دەکاتەوە کە لە بناغەدا بە مەرجێکەوە بەستراوەتەوە. ئەگەرەکە نەتوانینی "تەسخیرکردنە، واتە کۆنترۆڵناکرێت، دەستەمۆ و ڕامناکرێت و ناتوانرێ بهێنرێتە ژێر بارەوە"، مەرجەکەش "قەڵەوبوونە - گەر قەڵەوبێت". ئاسانە سەرنجی ئەوە بدرێت مەرج لەم شیعرەدا پێش "ئەگەر" خراوە چونکە لەباربراوە لە لایەن "میر"ەوە و، بەلەباربردنی ئەم مەرجە ئەگەرەکەش لەباربراوە. بەڕواڵەت ڕەنگە بتوانرێ لەم بەیتەوە ئەو ئەنجامگیرییە بکرێت کە "میر" بەمەبەستی دەستەمۆ و ڕامکردنی ئێسترەکە برسی و لاوازکردووە، بۆیە کارەکەی ڕەنگە بەجێبێت، بەڵام شێخ ڕەزا بواری سەرکەوتنی ئەنجامگیریی لەم شێوەیەی نەهێشتووەتەوە، چونکە ئەگەر ئاوەهابێت، ئەدی برینی پشت و سەرشانی هێسترەکە بۆچی بووە!؟ کەواتە ئەمەشیان هەر بەمەبەستی قووڵکردنەوەی ئەو ستەمە دەگمەنەیە کە "میر" لەم ئێسترەی کردووە.

شیکردنەوەی ئەو بەیتە پێویستە لەبەرئەوەی، بەلای کەمەوە دوو زاراوەی نائاسایی بەخۆوەگرتووە "دەروێشی ڕەففاعی"و "جەلجەلووت". هێندەی ئاگام لێبووبێ کەس ئاوڕی لە لێکدانەوەی ئەو دوو چەمکە نەداوەتەوە غەیری مامۆستا "شکور مستەفا"[٣] . دەروێشی

ڕەففاعی ئەو دەروێشەیە کە پەیڕەوی لەو تەریقەتە دەکات کە دەدرێتەپاڵ (الرفاعی، السید احمد بن السید أبی الحسن الرفاعی/ی لەدایکبووی گوندێکی سەر بە شاری (واسط)ی عێراق، ساڵی ٥١٢ك و، کۆچکردووی گوندی "أُم عُبیده"ی نێوان "واسط"و "بصره"ی ساڵی ٥٧٨ کۆچییە)، یەکێکە لە سۆفی و خاوەن تەریقەتە سەرەکییە ناسراوەکانی شەشەمین سەدەی کۆچی. سۆفییەکی سلووکی - خاوەن ڕێوڕەسمی عەمەلی - بوو و پاش وەفاتی خۆی پەیڕەویکارانی تەریقەتەکەی بنەماکانی ڕێچکەکەی ئەویان لە سێ کتێبی گرنگدا کۆکردەوە ناسراوترینیان بە (جمع أثار الشریعة و الحقیقة و الطریقة)یە کە بە "البرهان المؤید" ناسراوە و، ڕەفاعی لەو کتێبەدا داکۆکی لە پێویستیی پابەندبوونی "تەریقەت"بە "شەریعەت"ەوە دەکات. ناوبراو ئەوەی ڕەتدەکردەوە ڕێبەری هیچ کەسێك بێت و، لە ژیانی سۆفیگەرانەیدا هەمیشە بڕوای بەوە هەبوو گومانی خراپ لە خۆی بکات و، لە بەرانبەریشدا بەرانبەر بە خودا گومانی هەمیشە باشبوو و، سەبارەت بە خەڵقیش هەر گومانی باشبوو تەنانەت ئەگەر بەڕواڵەت خراپەشی لێدیتبان. تائێستا خەڵکانێکی زۆر لە عێراق و میسر و سوریا و مەغریب هەن خۆیان بە پەیڕەویکاری تەریقەتی ڕەفاعی دەزانن، بەڵام بەشێکیان زۆر دوورکەوتوونەتەوە لە ڕێچکە بناغەییەکە. "جەلجەلووت"یش لە بناغەدا "جەلجەلوتییە"یە و، بەپێچەوانەی ئەوەی ڕەنگە وێنابکرێت چەکامەیەکی شیعرییە و بەمەبەستی نزا - دوعا -و پاڕانەوە دەخوێنرێتەوە و، لەنێو بڕوادارانی سۆفیگەریدا، ئەگەرچی کەسانێك هەن بە جادووی لەقەڵەمدەدەن، بەڵام پتر بەپەسەند ناودەبرێت. شانبەشانی دوعای (حِفظ البَحر) کە لە نزا ناسراوەکانی (الشاذلي، أبو الحسن علي بن عبدالله بن عبدالجبار المغربي ٥٧١ - ٦٥٦ کۆچی)یە، بە یەکێك لەو دوعایانە دادەدەنرێ کە بەکاریگەر ناسراون. نازانم بۆئەو دوعایە لەو بەیتەدا بە پەیڕەویکارانی ئەو تەریقەتەوە بەستراوەتەوە، چونکە هەمووان بەکاریدەهێنن و، ناشزانرێ کەی ئەو چەکامەیە دانراوە و هی کێیە، بەڵام توێژەرانی ئەو بوارە لەو بڕوایەدان کە لە پێنجەمین سەدەی کۆچیدا دانرابێت و، پاشتریش بەیتیدیکەی خراوەتەسەر و، لەکۆتایی شەشەمین سەدەی کۆچیدا لە کتێبی (منبع اصول الحکمە، پاشکۆی کتێبی "شمس المعارف الکبری)ی (البیرونی، ابو العباس احمد بن علی بن یوسف، کۆچکردووی ساڵی ٦٢٢ی کۆچی) ئاماژە بەو چەکامەیە کراوە. پێدەچێ شێخ ڕەزا هەوڵیدابێت ئەو گەرمی و تینی دەروێشانەیەی لای دەروێشانی ڕەفاعی هەیە و، ئەو کاریگەرییەش کە دوعای "جەلجەلوتییە" هەیەتی ـ لە یەك بۆتەدا کۆبکاتەوە بۆئەوەی هێزی ئەو هێسترە بخاتەڕوو ئەگەر ئاوەها بەدەست





"میر"ەوە لاواز و زەلیل و ڕیسوانەکرابا.. بەمەش ڕووبەڕووی تیرێکی کوشندەی شاعیر دەبینەوە کە ئاراستەی "میر"ی کردووە.

لە نۆیەمین بەیتدا هێنانی نێوی "حاجی ئەحمەد" لە هیچ ڕوویەکەوە پاساوی نییە. ئەم بەیتە لە نوسخە چاپییەکاندا بە چەندین شێوەی جیاواز خراونەتەڕوو (٤)و ئەو جیاوازییەش لێکدانەوەکە، تاڕادەیەك، دەگۆڕێت. بەڵام بەو ئاقارە نا کە لە هیچیاندا هێنانەنێوانی نێوی "حاجی ئەحمەد" بکاتە مەسەلەیەکی گونجاو. با بەیتەکە لەسەر بناغەی کۆنترین نووسخەی چاپی (کوردی - مەریوانی/١٩٣٥، ١٢) لێرەدا بخەینەپێشچاو:

ئەم مەتاعە چاکە هەر لایق بە حاجی ئەحمەدە
جووتی پێبکا هەروەکو تۆ هەردوو لنگت کرد بەجووت

هەموو جیاوازییەکان تەنها لەو دوو شوێنەدان کە هێڵیان بە ژێردا ڕاکێشراوە. تەنها لە نووسخەکانی مامۆستایان "خاڵ ٢٠٠٣"و "شکور مستەفا ٢٠٠٠و ٢٠١٠"دا ئۆباڵی "جووتکردنی هەردوو لنگ"ەکە خراوەتەئەستۆی "حاجی ئەحمەد"ەوە و، ئەو داڕشتنەی لەوێدا دەیبینین "زۆرلەخۆکردن"ی پێوەدیارە نەك "ڕەوانی" کە یەکێکە لە تایبەتمەندییە دیارەکانی شیعری شێخ ڕەزا. تەنانەت ئەگەر ئەوەش بە داڕشتنە ڕاستەکە بزانین ئەوا هیچ شتێك ناگۆڕێت و، پێدەچێ شاعیر پلارێکی نەشیاو و نابەجێی لە کەسێك گرتبێ پەیوەندیی بەم شیعرەوە نییە، یاخود ئەو پەیوەندییە شاردراوەیە و ئەو شیعرە هیچی لەبارەوە نەدرکاندووە، جگەلەمەش پێدەچێ تۆڵەکردنەوەیەکی لابەلا بێت بەو مەبەستەی وشەی "جووت" لەلایەکەوە سەرەوای ئەو شیعرەی پێدەوڵەمەندبکرێت و، لەلایەکیدیکەشەوە جیناسی تەواوی نێوان هەردوو "جووت"ەکە ڕازاندنەوەی داهێنەرانەی بواری ڕەوانبێژیی شیعرەکە دەوڵەمەندتربکات.

بەپێی هەموو نوسخەکانیدیکە، "میر" دەخرێتە قەفەسی تاوانبارییەوە، بەڵام چۆن!؟ "هەردوو لنگت کرد بەجووت"ی دووەمین بەشی بەیتەکە زۆر بەڕوونی باس لەوە دەکات کە ئەو هێسترەی تەنها "دوو لنگ"ی هەیە بۆیکراوەتە جووتێك "دوو لنگ"، ئەوکەسەش کە ئەمکارەیکردووە خودی "میر"ە کە بە "تۆ" ئاماژەیبۆکراوە. مامۆستا "شکور مستەفا" بە لێکدانەوەی "لنگی پێبکا بە جووت: بیتۆپێنێ یا..، ٢٠٠٠/٣١، ٢٠١٠/٤١" ناڕاستەوخۆ

مەبەستەکەی روونکردووەتەوە، چونکە مانای "هەردوو لنگ جووتکردن" تۆپاندن نییە. کەواتە شێخ رەزا تۆمەتی ئەخلاقیشی داوەتەپاڵ "میر"و، بەمەش چی ماوە بە قوڕبەسەرەی نەکات!؟ کەچی لەدوادێڕدا خۆی "سەرکز" دەنوێنێنێت و ئۆباڵی ئەم ستەمەش دەخاتەئەستۆی "میر"ەوە، ستەمێك کە بە "لایقی شانی من - شاعیر"و "شایانی شەئنی تۆ - میر"ی نازانێت، بەڵام چبکات!؟ بە نووکە قەڵەمێك هەموو شتێك دەسڕێتەوە:

لایقی شانی من و شایانی شەئنی تۆ نەبوو
چاوەکەم چیت پێبڵێم، چارمنییە غەیری سکووت

ئەمە"سکووت - بێدەنگی"یەکەی شاعیرە سەرکزەکەیە!

***





## پەراوێزەکان

(١) لەم شیعرەشدا هەر شاعیر "سەرکز" خۆی دەنوێنێ، بەڵام وەکو دەرەنجامی ئەم کۆششە روونەدەبێتەوە، ئەو لایەنە گرنگە "سەرکزی" دەکاتە پەردەپۆش بۆ ئەوەی دزەبکاتە نێو گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی "میر" کە لەخستنەڕوویان خۆی دەپارێزێت: "مەسەلەی رەزیلی - دەستگیرۆیی - ئاسایی و نائاساییبوون لەڕووی ئەخلاقییەوە"و، بەمەش بناغەی کەسایەتیی ئەو بنکەندەکات.

(٢) لە نوسخەکانی دیوانی شێخ رەزادا کە لەبەردەستماندان هەر بەشێوەی "ئێستر" (کوردی - مەریوانی ١٩٣٥/١١ و١٢)، (عەلی تاڵەبانی ١٩٤٦/١٠و ١١) (تاقانە ١٩٩٩/٢ - ١٢٣)، (کاکەڕەش ١٩٩٩/٦٧)، (مستەفا٢٠٠٠/ ٣١)، (د. تاڵەبانی ٢٠٠١/٦ - ٢٧٧)و (خاڵ ٢٠٠٢/٤٢) هاتووە و، لەئەمڕۆی کوردستانیشدا هەر وشەی "هێستر" بەکاردەهێنرێ.

(٣) لە هەموو نوسخە چاپکراوەکاندا نووسراوە "حوججەت"، "جیججەت"یان"حججەت"، بەندە ئەوە بەخەڵەت دەزانم چونکە هەر یەکێك لەو سێ وشەیە بۆئەو شوێنە ناگونجێت مەگەر بە شێوەیە لێکبدرێتەوە کە مامۆستا شکور مستەفا بە "تەوژم" لێکیداوەتەوە" دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی/٤١"و، هێندەی ئاگاداربم وشەی "حوججەت" لەچ ناوچەیەکی کوردستاندا بەو مەعنایە بەکارناهێنرێ. لە ناوچەی گەرمیاندا ئەو رستەیە بەتەواوی: "بە حینجەت لێینەوی"، تا سی، چل ساڵێك پێش ئێستا بەکاردەهێنرا بە مەعنای "بەهەموو هێزی خۆی لێینەوی - واتە بەهەموو هێزی خۆی گرتی بەمەبەستی بەرزکردنەوەی". شێخ رەزا لە شوێنیدیکەشدا وشەی ناوچەیەکی تایبەتی بەکارهێناوە کە ئاوەها خاوەن دەلالەتی بەهێز بوویێت و، لە ناوچەکانیدیکەدا هیچ بەدیلێکی هاوشێوەی نەبووبێ، بۆنموونە:

گەردوون سنکیکردم و هێنامیە کۆیێ
میوانی لەکن مامە غەفوری لەجەرم کرد

کە ئەو وشەی "سنك"ە لە زۆربەی نوسخەکاندا بەشێوەی "سنگ" یان "سینگ" نووسراوە و،"سنك"یش دارێکی تاڕادەیەك درێژە تەوقی ملی سەگی پێوەدەکرێت بۆئەوەی

سەگەکەی پێناچاربکرێت بە دووی ئەو کەسەدا بڕوات کە رایدەکێشێت و، درێژیی دارەکەش بۆئەوەیە سەگەکە هێندە دووربێت کە راکێشەرەکەی گلاۆنەکات. بەگشتی "سنککردن" درکەیە بەمەبەستی "پەلکێشکردن بۆ سووکایەتی پێکردن".[٣] بڕوانە (شکور مستەفا ٢٠١٠، ٤١)، بەداخەوە هەردوو لێکدانەوەکە پشتی بە زانیاریی سەرزارەکی و راگوزاری بەستووە و بەمشێوەیەن: "رەفاعی: ئۆلێکی دەروێشیی عەرەبانە، دەروێشیان سەریان گەرمە و مار و دووپشك و ئاور دەخۆن. جەلجەلووت: جەلجەلووتییە: دوعای بەپرتەپرتی جادووگەر و کولەنانی لە دیوانەکاندا"، بەلاّم راستیی لێکدانەوەی هەردوو چەمك گەلێك لەمەی ئێرە دوورن. لەسەرەوە لیکدراونەتەوە و ناکرێ دووبارەبکرێنەوە.

(٤) هەموو جیاوازییەکانی نووسخەکان پەیوەندییان تەنها بە دوو وشەی دووەمین بەشی بەیتەکەوە هەیە، لای نوسخە چاپەکەی چاپخانەی مەریوانی بەم شێوەیەن "تۆ"و "لنگت" ل١٢، لای شێخ عەلی "جوت"و "لنگت" نووسراوە، کە دیارە وشەی "جوت" هەڵەی چاپە و "خۆت"ە، بەلاّم مامۆستا ئومێدی کاکەڕەش ئەو هەڵەیەی بەهەمانشێوە نووسیوەتەوە "١٩٩٩/٦٧)، د. موکەڕەم بە "خۆت" راستیکردووەتەوە. لای خوالێخۆشبوو "خالّ ٢٠٠٣/٤٢"، "خۆی"و "لنگی"ن و، لای مامۆستا شکور مستەفاش"٢٠٠٠/٣١و ٢٠١٠/٤١"، "تاوەکو چۆن"و "لنگی"ن.

## سەرچاوەکان


١. إبن منظور (محمد بن مكرم المصري الأفريقي)، لسان العرب، دار صادر، بيروت، ط ١ بلا تأريخ.
٢. تاقانە (ئەحمەد)، شێخ رەزای تالەبانی.. کەڵە شاعیری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، دەزگای ئاراس، هەولێر، چ ١، ١٩٩٩.
٣. تاڵەبانی (د. موکەڕەم)، شێخ رەزای تالەبانی.. ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری، دەزگای ئاراس، هەولێر، چ ١، ٢٠٠١.
٤. خالّ (شێخ محەممەد)، دیوانی شێخ رەزای تالەبانی (کۆکردنەوە و لێکدانەوە)، ئامادەکردنی بۆ







چاپ: ئومێد ئاشنا، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بلاّوکردنەوە، سلێمانی، چ ١، ٢٠٠٣.
٥. الزبيدي (مرتضى)، تاج العروس من جوهر القاموس، دار الهداية، تحقيق: مجموعة من المحققين، بلا تأريخ.
٦. الطالباني (علي)، دیوانی شیخ رضای تالەبانی (کۆکردنەوە و چاپکردن)، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا ١٩٤٦.
٧. العسكري (أبو هلال الحسن بن عبدالله بن مهران)
٨. ديوان المعاني، دار الجيل، بيروت، بلا تأريخ.
٩. كتاب الصناعتين.. الكتابة والشعر، تحقيق: علي محمد البجاوي ومحمد أبو الفضل إبراهيم، دار المكتبة العصرية، بيروت، ١٤٠٦هـ، ١٩٨٦م.
١٠. کاکەڕەش (ئومێد)، دیوانی شێخ رەزای تالەبانی (ئامادەکردن، پەراوێز دانان و پێشەکی بۆ نووسین)، لە بلاّوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٩٩.
١١. کوردی – مەریوانی، دیوانی شێخ رضای تالەبانی، چاپخانەی مەریوانی، بەغدا، ١٩٣٥.
١٢. المبرد (أبو العباس محمد بن يزيد)، الكامل في اللغة و الأدب، تحقيق: محمد أبو الفضل إبراهيم، دار الفكر العربي، القاهرة، ط٣، ١٤١٧هـ - ١٩٩٧م.
١٣. مستەفا (شکور)
١٤. دیوانی شێخ رەزای تالەبانی (ساغکردنەوە و شەرح)، ئامادەکردنی: کۆڕی زانیاریی کوردستان، بلاّوکراوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، چ ١، ٢٠٠٠.
١٥. دیوانی شێخ رەزای تالەبانی (ساغکردنەوە و شەرح)، دەزگای ئاراس، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، چ ١، ٢٠١٠.
١٦. النويري (شهاب الدين أحمد بن عبدالوهاب)، نهاية الارب في فنون الأدب، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ٢٠٠٤م.

# شێخ ڕەزا

## شایەتحاڵێکی وریای سەردەمی خۆی

**ئەمین شوان**

نەردەوانی هەر شاعیرێك بۆ بانی نەمریی شیعرەکانێتی، ئەمە بڕینەوەیەکە کە گومانی تێدانییە و بەسەر ئاکار و دەسکردی هەر مرۆڤێکدا دەڕوا کە لە مەیدانێك یان بوارێك لە بوارەکاندا ئەفراندن و کارێکی لەڕادەبەدەری لەدەستهاتبێ. دیارە شیعروتنیش کارێکە دەکەوێتە سەرووی هەموو ئەڤڕاندنەکانەوە.

کورد دەڵێ: حەیران نە دەمرێ نە پیردەبێ. ئەم قسەیە دەقاودەق بۆ شیعریش راستودروستە. ئەوا نزیکەی هەزار ساڵ بەسەر مردنی شاعیری گەورەی عەرەب (متنبی)دا دەگوزەرێ، کەچی دەڵێی شیعرەکانی دوێنێ وتراون و باسی ئەمڕۆ دەکەن.

شێخ رەزاکەی خۆشمان، واتە شێخ رەزای تاڵەبانی چ خۆی چ شیعرە مەزنەکانی بەشێکن لەم دیاردە سەراپاگیرە. پارچە شیعرییەکانی چ ئەوانەی بە کوردی وتراون، چی بە فارسی، چ بە تورکی، تەنانەت ئەو چەند کورتە پارچە و تاکەی بە عەرەبیش وتوونیەتی، هەموو پڕنلە هونەر و هزررەنگینی و هەستی زیندووی مرۆڤانە. خۆشی وەکو مرۆڤێك بەو ڕێبازە کەسێتی و ئەدەبییەی گرتوویەتی ئێستاش لەناو بیر و لەسەر زاری خەڵکە.. کردەوە و قسە نوکتەئامێزەکانی ئێستاش پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە سەدەیەك بەسەر مردنیدا هەر باسدەکرێت و دەگێڕرێنەوە بە نموونە دەهێنرێنەوە. "شێخ رەزا وتەنی " یان "شێخ **رضا** دێمشلی" ئێستاکەی لە زۆر بوونە و رووداودا هەر باو و ویردی سەر زمانن.

ئەو ئاوەسووی ناو رووداوەکان بووە. ژیانی منداڵێتی لە لادێ و دواییش لەبەر تەکیە و ئینجا بە فەقێتی بە دوای دەرس و مەلای پڕ و زاناوە زۆربەی شار و شارۆچکە و دێهاتە ئاوەدانەکانی کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات گەڕاوە. بێگومان راتبەگردکردنەوەشی کردووە. بەرتوانج و شەڕفرۆشتنی چەندین کەیبانوو و کچۆڵەی راتبەهێن کەوتووە.. لەلایەن برا و کەسوکارەوە غەدریلێکراوە و هەقی خۆی نەدراوەتێ:





ئەو رۆژە کە تۆرام و لە کەرکوك سەفەرم کرد
مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب حەزەرم کرد
گەردوون سنکیکردم و هێنامیە کۆیە
میوانی لە کن مامە غەفوری لەجەرم کرد

لێرەدا دەمەوێ هەڵوێستەیەك لەسەر وشەی (سنك) بکەم کە لەم پارچەیەدا هاتووە. (سنك) بریتیبووەلە دارێکی درێژ کە بە دار دەولك دەناسرا و پەتێکی قایمی پێوەدەبەسترا و بۆ رسکردنی سەگ و گواستنەوەی لە جێیەکەوە بۆ جێیەکیتر و خۆپاراستن چ لە گلاوبوون چ لە پەلاماردان و گەستنی سەگەکە بەکاردەهێنرا. بەداخەوە گەلێ کەس کە ئەم پارچەیەیان گواستووەتەوە بە هەڵە بەکاریانهێناوە. هەندێك بە (سُبُك)ی فارسی واتە (سووك)ی کوردی خوێندوویانەتەوە.

بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، ئەم واقیعە تاڵ و پڕمەینەتییە لەپاڵ بەهرەی تایبەتی زاتیی شێخ رەزادا کە هەر لە منداڵییەوە چەکەرەیدەرکەوتووە، هەروەها گەڕانی بە وڵاتانی عوسمانییدا و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسایەتی و رووداوی جۆراوجۆر و خشانی لەگەڵ مەدەنیەت و کەلتوورەکانی ئەو وڵاتانەدا مەودای تێگەیشتنی و ئاسۆی هزری ئەویان فراوانترکردووە و دیدی رۆشنبیرانەیان زیاتر خەملاندووە و لەئەنجامدا توانا هونەرییەکانیان لە بواری شیعروتندا دەوڵەمەندتر کردووە و باشتر زاخیانداوە.

دەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێ کە ئەو سەردەمەی شێخ رەزا تیایدا پێیناوەتە ژیانەوە و دوایی خۆی ناسیوە و لە رووداو و دیاردەکان تێگەیشتووە، سەردەمێکی یەکجار ئاڵۆز و رووداویی بوو، چ لەسەر ئاستی سیاسی چ لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی چ لەسەر ئاستی رۆشنبیری. بە هەموو وڵاتی کەرکوك و کوردستان و دەوروبەری و گشت سەرزەمینی عوسمانیدا رەشەبای گۆڕانکاری و نارەزایەتی و ئاشووب و فرتەنە گڤەگڤی دەکرد.

کۆمەڵگای کوردی بە سستی و بەرەبەرە خەریکبوو لە قۆناغی دەرەبەگایەتی و عەشرەتگەری توندەوە بەرەو قۆناغی مەدەنییەت و گۆپکەکردنی بورجوازییەت (توجار و کاسبکار و هەندێ فەرمانبەری دەوڵەت) دەچوو، بەڵام هێشتا سەروسیمای قۆناغی پێشسەرمایەداری پێوەدیاربوو چ لەباری ماددی، چ لە ئاستی فەرهەنگدا.

ئەم واقیعە پڕڕووداو و کاریگەرییە لەسەر کەسایەتی و بیرکردنەوە و ڕەفتاری پیاوێکی پڕهەستی وەکو شێخ نەدەکرا بێ شوێندەست بێ.. بۆیە دەبینین ئەو چ لە بەرهەمە ئەدەبییەکەیدا کە بریتینلە شیعرەکانی، چ لە رەوتی کەسێتی خۆیدا رێبازێکی تایبەتی گرتووەتەپێش. رێبازی کاردانەوەی زەقی بێپەردە و سەرپۆش. یەکێکی خۆشویستبێت و ئیتر لەبەر چ هۆیەك بووبێ، ستایشیکردووە. هەندێجار لەسەر سەبکی هیندی کە ماوەیەکی زۆر بوو ئەدەبی فارسی سەراپاگیر داگیرکردبوو، لە ستایشەکانیدا زیادەڕۆیی و خەیاڵبافیدەکرد. یەکێکی خۆشنەویستبا، ئیتر ئەویش لەبەر چ هۆیەك ببا، ئەوا بە یاسای چی پێبکا "دۆمبێ و کلاش بۆ خۆی بکا" دەیبرد بە ناخی زەمیندا. خۆی دەیوت: "زمانی من لە بۆ تەعەدا، وەکو مارێکی زوحاکە" یان " **جعلناها رجوما للشياطين**" ە.

گەر بکەوتایەتە تەوس و تەهزییش ئەوە هەر مەپرسە نموونەکانی ئەوەندە رووی قایمیان دەوێ بۆ هێنانەوە کە خۆی وتەنی "دەبێ هێند قایمبێ شمشێری میری نەیبڕێ و گەر بە کەوشیکەی تا قیامەت نەدڕێ".

شێخ رەزا لە ناو ئاسیاوی ئەو گێژەنگە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکری و ئابورییەدا هاڕراوە و هاتووەتەدەرەوە. لە (بەرتەکیە)ی کەرکوك گەورەبووە، لەناو فەزای مەجلیسی باوکیی ئەولیاڕەفتار و میوان و هاودەمی زانا و پارێزکەر و جا بەڕاستیبێ یان رواڵەت ئەوە لە مەسەلەکە ناگۆڕێ پێگەیشتووە دوایی هەر لەوێوە هاتووەتە ناوخەڵکە رەشوڕووتەکەی ئەوێ، کە زۆربەیان نەوەی شۆرباخۆربوون یان ئاوارەی سنە و مەریوان و بانە و هەورامان و ئەو ولایانە بوون و وەکو ریشۆڵەی زستان. لیسیان لە تەکیە و دەوروبەریدا بوون، لەوانەی کە شێخ رەزا پێیاندەڵێ: حەرامزادە و داکی خۆ (....) لە بەرتەکیە زۆرە، خلە و بلە و فشەگاڵتە و عەزە دەمبۆرە. ئەو ئەگەر لە ئەدەبیاتی عەوامانەی ئەم بابەتە ئەگەر هەیە کەی وشەیەك فێربووبێ، دەبێ بووبێتە چ خاوەن فەرهەنگێك؟! خەڵکەکەیتریش هەر لە نەدارای دەوروبەری کەرکوك بوون.

جگەلەمە، بە فەقیایەتی کونوکەلەبەر نەماوە لە کوردستاندا بەمدیو و ئەودیویەوە بە دوای مەلا چاك و دەرسبێژی پڕدا نەگەڕێ، ئەوەندەی کە لەم گەڕانەشدا دەستیکەوتووە سامانێکی بێپایانە لە هەموو بابەتێك، بە بابەتی جنێوفرۆشی و توانەوە و لە فەرهەنگی جنێوبازی و هەجوو و تەوس و تەنزدا. ئەمەم تەنها بۆئەوە هێنایەوە تا سەرسوڕمانی ئەوانە بڕەوێنمەوە کە پێیانسەیرە لەو کانگای زوهد و عیرفان و خۆپارێزی و تەسەوفەی شێخ





عەبدوڕەحمانی تاڵەبانییدا، زاتێکی ئاوها جنێوباز و حازردەست و زماندرێژی وەکو شێخ رەزا دەرچێ.. شێخ رەزایەك کە تا دنیا دنیایە ناووبانگی هەر بزرنگێتەوە. ئەو بەهرە مەزنەکەی لە هەموو بوارێکی شیعردا بەکارهێناوە. لە هەموو مەیدانەکاندا ئەسپی تاوداوە و لەوسەر بەوپەڕی سەرکەوتوویەوە دەرچووە، سەرکەوتوییەك کەس نەیتوانیوە ئەوسا و ئێستاش، بە بڕوای خۆم ببێ بە هاوکوفی.

لە هەجوودا، ئەوەندە وەستایانە کردوویەتی (کە تەنانەت) ئەوانەش کە بەر تیری (**قەضای**) کەوتوون، بەخۆشییەوە وەریانگرتووە و ناچار لە خۆشیدا داویانە لە قاقاپێیکەنین.

دەڵێن فەتاح ئاغای سەید وەڵەدی کاکەیی، کە دوای سەید موحەممەد قایەچی، بە بەدینترین پیاوی خزمانی کاکەیی دەژمێررێ، کە چامە دوورودرێژەکەی "هەجووی کاکەیی" دەخوێندەوە و لە پێکەنیندا بەپشتدا دەکەوت. سەید ئەحمەدی خانەقا، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای بیستدا دیارترین رووی کۆمەڵایەتی و ئایینی کەرکوك بوو و خۆشی پیاوێکی ئەدەبدۆست و فرەزمان بوو، کە هەجوەکانی خانەقا و نان و خوانی سەید ئەحمەدی دەخوێندەوە ئەوەندەیتر شێخ رەزای خۆشدەویست. هەر بەوجۆرەش ساداتی سلێمانی و بنەماڵەی کاکە ئەحمەدی شێخیش. هەر لەوڕووەشەوە، گەورە پیاوانی ئەستەمولّ و دوایی بەغدا و موسڵیش هەر رێزیان لێدەگرت و لە تەنگانەدا دەهاتنە فریای.

چونکە مەبەستی ئەم باسە زۆرچوون و قوڵبوونەوە و بەتاناچوونی ژیانی و شێوە و مەبەستەکانی شێخ رەزا نییە، بۆیە دەبێ لادەم و شێخ وەکو شایەدێکی مێژوویی بۆ هەندێ بابەت و رووداو لە دەروازەی هەندێ پارچەیەوە بناسێنم.

دیارە شێخ رەزا لە دوو توێی شیعرەکانیەوە شایەدێکی بەچاودیتە و بە رووح هەستکەری هەموو واقیع و رووداوەکانی سەردەمی خۆیەتی. بەڵام ئەگەربێتو بچینە ناو هەموو باسەکەوە، ئەوا نەك بەم نووسینە بەڵکو بە کتێبێکی گەورەش دەرهەقی نایەین، بۆیە من لە ئەو بابەتە لادەدەم و بەهیوای ئەوەی لە دەرفەتیتردا بە بەشبەش بێمەسەری، باسی لایەنێکی زیرەکانەی ئەو شایەدییە و هونەری شیعری ئەو دەکەم کە ((تأريخ مجوهر)) بە فارسی یان ((جوهرلی تأريخ) بە تورکی کە بە کوردی "مێژووی گەوهەردار یان گەوهەربار" دەگرێتەوە. ئەم هونەرە لە ئەدەبیات و نەریتی گەلانیتریشدا باوە.. زۆر لە بینا کۆنەکان و شاکارە میعمارییەکان، پرد و مزگەوت و تەکیەکان، گۆڕی پیاوچاکان و مەردانی بەناوبانگ بەمجۆرە نووسینە مێژووبەندکراوە. ئەو تاقە

پردەی کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم و لە سەردەمی والییەتی نامیق پاشادا بەری قەڵای کەرکوکی بە بەری قۆریەوە دەبەستەوە و ئەمساڵ سەرلەنوێ بیناکرایەوە، کاتی خۆی بە **(فأعبروا هذا صراط مستقيم)** مێژووی دروستکردنی مێژووبەندکراوە. ئەمە جگەلەوەی زۆربەی مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانی کەرکوکیش هەر بەمە رازێنراونەتەوە. تا ئەم دواییەش خوالێخۆشبوو مەلا مەجیدی قوتب کە خەتخۆشێکی خامەزێڕین بوو و بۆ مردووەکان نووسینی سەر کێلەقەبری دەنووسی و دەیدایە شاگردەکانی تا هەڵیکەنن، لە گۆڕستانەکانی کەرکوك یادگارێکی زۆری بەجێهێشتووە، لەوانە یەکێك بە نموونە دێنمەوە کە پیرەمێرد بۆ کێلی قەبری سەید نووری نەقیب نووسیویەتی:

نووری میری سوور چوو بۆ ناو جەنەت

(عەقدی سیادەت کەوتەبەر رەحمەت)

شێخ رەزاش ئەو رووداوانەی بۆ مێژوو و رێزگرتن، بە شیعری جوان و رەوان دەخستە تۆماری نەمرییەوە. زۆر جاریش بە شێوە کۆمیدی و کاریکاتێرییەکەی خۆی، لەپەنای بەکارخستنی ئەوپەڕی توانای هونەرییەوە، بابەتەکەی دەخستەسەر زمانی خەڵك و مەجلیسی ئەدەبدۆستان.

سەیر ئەوەیە، ئەوانەی شیعرەکانی دەیانیگرتەوە هەرگیز لێیاننەدەگرت و دەیانخستە بابەتی سەنعەتە بڵندەکەی شێخ رەزا و بەخۆمانە دایاندەنا. بۆنموونە دەڵێن کە سەید موحەممەدی دێرینە سەرداری خزمانی کاکەیی کە بە سەید محەمەد تایەچی بەناوبانگە کۆچیدوایی دەکا، بە ئاماژە و ویستی کەسانێك کە ناکۆکی نێوان کاکەییەکان و تاڵەبانی لەسەر ئاو و بەراو پاڵنەریانبووە و ویستویانە شێخ رەزا بۆ مەبەستی رکەبەرێی عەشرەتگەری بەکاربێنێ یان شێخ رەزا خۆی لەمڕووەوە دەستپێشخەریکردووە یان مەسەلەکە لە گیانی گاڵتەجاڕی باوی ئەو دەرنەچووە، بەم شیعرەی خوارەوە کۆچیدوایی ئەوی بە تورکی مێژووبەندکردووە:

**مطبخ** نار جحيمه شد رحل ايتدى أوكيم

لحم خنزيرى كباب ايچون چكردى **مطبخه**

نش ناپاكى گورنجه سويادم تأريخ تام

(کاکەیی سید محەممەد گیردی دوز دوز دۆزەخە)

سەید محەمەد لە ساڵی ١٣٠٩ ی کۆچییدا کۆچیدواییکردووە.





واتە:

وابارگەی بەرەو چێشتخانەی ئاگری جەهەنم لێنا

ئەوکەسەی بۆ کەباب گۆشتی بەرازی دەکێشایە چێشتخانەوە

هەر کە تەرمی ناپاکیم دیت، یەکسەر مێژووەکەیم بە تەواوی وت

(سەید محەممەد کاکەیی یەکسەر چووە دۆزەخەوە)

گەر دوا بەیتی دەقە تورکییەکە بە حیسابی ئەبجەد لێکبدرێتەوە، ئەو ساڵە (تەنانەت هەندێجار مانگ و رۆژیش) دەردەچێت کە مردووەکە تێیدامردووە یان رووداوەکە تێیداڕوویداوە. بێگومان ئەو مەسەلەی کەبابی گۆشتی بەرازەی کە شێخ رەزا بە مەبەست و بەدەستی ئەنقەست ئاخنیویەتییە ناو شیعرەکەوە رەنگدانەوەی ئەو تۆمەتە هەڵبەستراوەیە بۆ خزمانی کاکەیی کە گوایە گۆشتی بەراز دەخۆن. ئەمەی لە ئەو قەسیدە بەناوبانگەشیدا بەزەقی دەربڕیوە کە بەناونشیانی (هەجوی کاکەیی) لە دیوانەکەیدا بڵاوکراوەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن: فەتاح ئاغای کاکەیی کە سەرگەورەی هەرە بەدیمەنی کاکەییەکان بوو لە کەرکوك و دەوروبەری شێخ رەزای زۆر خۆشویستووە کە ئەمە و بابەتەکانیدیکەی ئەویان بۆ خوێندووەتەوە داویەتە تریقەی پێکەنین. دیوانەکەی و ئەو شیعرانەی بەم دوادواییانە دۆزراونەتەوە چەندین بابەتی لەم شێوەیەی تێدایە. لەم دەرفەتەدا ناکرێت هەموویان هەڵخەینە بەردیدی خوێنەران.. بۆیە تەنها چەند بابەتێکیان کە گرنگی مێژوویی خۆیان هەیە و زۆرتر پەیوەندیدارن بە هەندێ کەسایەتی و بنەماڵەی کەرکوکیەوە، لێرەدا دەخەینە بەردەست:

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە بە بۆنەی هاتنی عەبدولقادر و کەمالی پاشاوە بە موتەسەڕیفییەتی بۆ کەرکوك لە ساڵی (١٣٠٦)ی هیجریدا نووسیویە:

سالها از سر اخلاص دعا ميكردم

كه خدايا گره **ضعيفان** بگشا

متصرف بفرست أمل دليران توى

متصرف بهمه كون و مكان كيف يشا

مژده امدن اصف **ثانى** چورسيد

شاعران جمله فشادند بفكر انشا

ارایوب بولدی (**رضا**) تام تأريخی
(گلدی کرکوکه سلامتله کمالی پاشا)

واته:

سالّەها بوو بەدڵ دوعامدەکرد
که خودایه: گرێی بێدەسەڵاتان بکەرەوە
موتەسەریفمان بۆ بنێرە، تۆ ئومێدگای دلێرانی
دەسڕۆیوبێ بەسەر گشت لایەکا، چۆنی دەوێ
موژدەی هاتنی ئاسەفی سانی کە گەیشت
شاعیران گشت کەوتنەخۆ
گەڕا (رەزا) مێژووەکەی چاك دۆزییەوە
(بە سەلامەتی گەیشتە کەرکوك کەمالی پاشا)

لە قەڵای کەرکوك و لە گەڕەکی مەیدان بنەماڵەیەك هەبوو کە بە ئەحمەد بەگی کەمالیزادە ناسرابوون. ئێستاش کۆشکەکەیان لە نزیك (گوپ تاپو)ەوە هەرماوە و بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارەکان بە شوێنەواری هێشتوویەتییەوە. بەوە لە دەست بێل و باڵتە و بیلدۆزەری سەردەمی سەدام رزگاریبووە. باپیرم دەیگوت ماڵی ئەحمەد بەگ خەڵکی دەوروبەری رەواندز و حاجی ئۆمەرانن. ئیتر نازانم ئەم عەبدولقار پاشا لەوانە یان نا. ئێستاش لە کەرکوك بنەماڵەیەك بە ناوی (کەمالی)یەوە هەیە. یەکێکیدیکە ئەو مێژووبەندییەیە کە بۆ مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغای گەڕەکی بلاغی کەرکوك نووسیویەتی. ئەم مزگەوتە لەبنەڕەتدا لەلایەن مستەفاغای برای حاجی بنیاتنراوە. ئەم بنەماڵەیە خەڵکی دێی (یەنزە)ی ولاتی پشدەرن، هەر بەوناوەشەوە لە بلاغ بەناوبانگن زەوییەکانی پشت باغەکە تا خۆی دەدا لە دامێنی بازاڕی خەنجەرچییەکان و گەڕەکی قەرەغاچی پیریادی مولکی ئەوان بووە و بە (ئاغا باغی) بەناوبانگبوو. ئێستاش هەروایە. هەرچەندە لە دیوانەی (١٩٤٦)ی شێخ رەزادا وا نووسراوە کە قەسیدە هەشت بەیتییەکە بۆ نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکە نووسراوە، بەلام شێخ رەزا بە (ساخت مسجد) باسی دروستکردندەکات:





أگر خواهی سعادت سعیها کن در نیکلوکاری
که یزدان (**لیس للانسان الآ ما سعی**) فریود
ببر رنج و بیفشان گنج در راه خداوندی
که در پاداش نیکی وعدەها فرمود
مگو زحمت کشید و ساخت مسجد **مصطفی آغا**
بگو جنت خریده با خدا بیع و شرا فرمود
جواهر پاش شد **طبع (رضا)** و گفت تأريخش
(مزین معبدیرا **مصطفی آغا** نبا فرمود)

واته:

گەر لە بەختەوەری دەگەڕێی، هەوڵی چاکە بدە
چونکە یەزدان فەرموویەتی (**لیس للآنسان الآ ما سعی**)
رەنجبدە و گەنج ببەخشە لە رێگای خوداوەندێکدا کە
لە پاداشتی چاکەدا، گفتێکی زۆری داوە
مەڵێ خۆی ماندووکرد و مزگەوتی کرد مستەفاغا
بڵێ بەهەشتی کڕی و لەگەڵ خودادا خەرید و فرۆشی کرد
تەبعی رەزا کەوتە گەوهەرباران و مێژووەکەی وت
(مستەفاغا مزگەوتێکی رازاوەی بینا فەرموو)

یەکێکیدیکە ئەوەیە کە بۆ شاکیر ئەفەندی مەکتوبچی نووسیویەتی. شاکیر ئەفەندی خەڵکی گەڕەکی (أخی حسینی)ی کەرکوکە. ماڵەکەی لەسەر ئەو رێگایە بووە کە لە مزگەوتی نائیبەوە بەرەو ئیمام قاسم هەڵدەکشێ. ئێستاش ئاسەواری ماوە. جاران ماڵی ئەکرەم بەگی توتنچی تێدابوو کە لە نەوەی ئەون. هەر لە تەنیشتی ماڵەکەیەوە مزگەوتی (سید غنی) هەیە کە هی ئەوانە و سەردەمانێك مەدرەسەش بووە. ئەم بنەماڵەیە بەڕەچەڵەك خەڵکی دێی (شێخ جگیری)ی قەرەسەنن و بە سەیدی (چاگیری) ناسراون. دیارە هەر چاگیرییەکەیە بۆتە جێگیری شاکر ئەفەندی، مەکتوبچی، واتە باشکاتبی ویلایەت بووە لە بەغدا و دواییش لە بەسرە:

أيام چو **برورده** خودرا کشد **آخر**
ای دوست، دل **آن** یه که به أيام نبندی
دیدی که چسان بسته فران أجل شد
مکتوبچی بغداد به **آن** پایه بلندی
سید نسب أز سلسلئه **خواجهء** چارگر
معروف نجوش خلقی و مشهور برندی
تأريخ مجوهر ز (**رضا**) خواستم و گفت
(شد زیب گلستانی جنانی شاکر افندی)

واته:

چونکه ڕۆژگار سەرەنجام پەروەردەی خۆی دەکوژێ
ئەی دۆست، وا چاکە دڵ بە ڕۆژگار خۆشنەکەی
بینیت کە چۆن بوو بە دەسبەستی تەنوورەوانی ئەجەل
مەکتوبچییەکەی بەغدا، بەو پایە بڵندییەیەوە؟
پشتاوپشت سەیدزادە لە زنجیرەی خواجەی چاگیر
ناسراو بە خۆشڕەفتاری و ڕەندی
مێژووی گەوهەربارم لە (ڕەزا) خواست وتی
(بوو بە گوڵی گوڵزاری بەهەشت شاکیر ئەفەندی)

هەر لەم بوارەدا، دوو بابەتیدیکە لە دیوانەکەیدا هەیە یەکەمیان لەسەر نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی (خادم، السجادە)ی کەرکوکە لە گەڕەکی بلاَغ. ئەویدیکە بە بۆنەی کۆچکردنی حاجی عومەر ئەفەندی یەعقووبی کەرکوکییەوە. ئەوەی مزگەوتی خادم بە دوو پارچەی جیاواز ناسراوە کە نازانم هۆیەکەی چییە، ئایا مزگەوتەکە دووجار نۆژەنکراوەتەوە، یان یەکێکیان بۆ مزگەوتێکیترە کە ئەویش هەر بەرماڵی پێغەمبەری تێدایە. ئەمە لێکۆڵینەوە و باسی جیاوازی گەرەکە کە ئێرە جێگەی نییە.





**پارچەی یەکەم:**

سجادەو شریفه تقبيل ايدنلره
بی شبهەدر **شفعت** سجاده صاحبی
زحمت ویرردی زائرینه چیقت مکان
دگمز دی **ذیل** پاکنه هری شقك یی
تا استلام شهر اول انشا بیوردیلر
عبدالحمید خان بو مقام مرتبی
واردی سمای هفتمه تأریخکز (**رضا**)
(بیتدی گوافخانەو سجادەو نبی)

واته:

گومانی تێدانیە هەر کەسێ ئەم بەرماڵە شەریفە ماچکا
خاوەنەکەی دەیخاتە بەر شەپۆلی شەفاعەتی خۆی
تەنگیی جێگاکە زیارەتکەرانی خستبووە کێشەوە
لێوی هەر عاشقێك ناگەیشتە دامەنی پاکی
تا لە مانگی یەکەمدا، بینایان فەرموو
عەبدولحەمید خان ئەم مەقام ڕێکوپێکە
مێژووەکەت گەیشتە ئاسمانی حەوتەم (ڕەزا)
(تەواوبوو تەوافخانەی بەرماڵی پێغەمبەر)

**پارچەی دووەم:**

پادشاه آل عثمان یعنی خان عبدالحمید
قابل انکار دگل احسان فوق العادەسی

پادشاه انبیای حس ایدەن سجادەیە
گورمدی لایق زیارتخانە مقادەسی
بر زیارتخانە شاهانە انشا قیلدیلر
**آسمان** دوردقچە دورسون شاه ایلە شهزادەسی
پك گوزەل دوشمش (**رضا**) بو تأریخكز
(**أمجد** پیغمبرانك موقف سجادەس)

واته:

پادشای ئالی عوسمان، واته عەبدولحەمید خان
چاکەی لەڕادەبەدەری ئینکارناکرێ
بەو بەرماڵەی لە پادشای پێغەمبەران کەوتووە
زیارەتگاکەی لایق نەبینی
زیارەتگایەکی شاهانەی بۆ بنیاتنا
تا ئاسمان وەستاوە، شا و شازادە هەر راوەستاوبن
زۆر جوان هاتووە (رەزا) ئەم مێژووەت
(مەقامی بەرماڵ سەرگەورەی پێغەمبەرانە)

هەرچی ئەو مێژووە گەوهەردارەیە کە بەبۆنەی مردنی حاجی عومەر ئەفەندی یەعقووبی کەرکوکەوە نووسیویەتی، بەمجۆرە:

حجدن گلوب گیچندی
تأریخ ایچون دنیلدی
باغ جنانە گیردی
(حاجی عومەر ئەفەندی)





واته:

هەر لە حەج هاتەوە ئەمری خوایکرد
بۆ مێژوو نووسرا

(حاجی عومەر ئەفەندی)
چووە باخی بەهەشتەوە

حاجی عومەر ئەفەندی یەعقووبی باوکی عەبدوڵڵا سافی ئەندامی ئەنجومەنی تەئسیسیی عێراق بووە کە دوای هەرای ساڵی (١٩٢٤)ی تیارییەکان لە کەرکوك کە بە خۆڕایی و هەڵە بە هەرای ئەرمەنییەکان ناسراوە، لەسەر راسپاردەی ئینگلیزەکان بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە دەوریبینیوە. مەجید پاشای برای سەردەمێك موتەسەڕیفی سلێمانی و سەرۆك شارەوانی کەرکوك بووە. شامیلی برایانیش لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا شارەوانی کەرکوك. لەم بوارەدا ئێستا و ئەوجاش شوێندەستی دیارە و خەڵك بە سەرۆك شارەوانییەکی چالاك و دڵسۆز و سەرکەوتوو باسیدەکەن.

***

# باسوخواسواسێکی شێخ ڕەزا لە هەڵەبجەدا

حەکیم مەلا ساڵح

## سەرەتا

### مافپێدانێك بەم شاعیرە گەورەیەمان

کاتێك کە دێینەسەر قسەکردن لەسەر ئەم شاعیرە مەزنە نابێت لە جێگەی هیچ وشەیەکیدا (نوختە نوختە) دابنرێت و دەبێ سانسۆر بخرێتە کەنارەوە، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەوا خوێنەر چێژ لە شیعرەکان وەرناگرێت و شیعرەکانیش هونەری بەرزی خۆیان لەدەستدەدەن و نەزۆك دەکەون.

ئەم شێخە باڵا هەڵچووەی شیعری کوردی کاتێك کە شاعیرانی پێش خۆی خوێندووەتەوە، دیتویە بەشی هەرە زۆری شیعرەکانیان بریتییەلە پەسنی (ئافرەت، میرخاس، شێخ، سەید و هاوڕێکانی خۆیان) لەبەرئەوە لێنەویوە ئەم پەسن و پیاهەڵدانە بگۆڕێتەوە بە زمانی (داشۆرین) و توانیشی گەورەترین سەرکەوتنی تێدابەدەستبێنێت.

لەوڕۆژگارە تەلبەندکاری و داخراوەدا هەرایەکینایەوە کە شیعرەکانی دەخوێنینەوە ئەم پرسیارەمان لەلادروستدەبێت و دەڵێین: ئایا ئەگەر ئەم شێخە ئازاد و ئازایەمان نەبوایە گۆشەیەکی ئەدەبەکەمان بۆشنەدەبوو؟ لە وەڵامدا دەبێ بڵێین: بەڵێ وادەبوو. هەروەك لە ئەدەبی عەرەبیدا (جریر و فرزدق)و لە فارسیدا (عوبەیدی زاکانی)و بەدوایدا (ایرج میرزا) هەبوون و دەستی خۆیان لە ئەدەبی گەلەکەیاندا وەشاندووە، ئەمیش هونەرێکی گەورەی بەخشی بە گەلەکەمان.

لە شیعری کوردیدا راستە بەر لە ئەم (خانای قوبادی، نالی، سالم و حاجی قادری کۆیی) شیعری داشۆرینیان تۆمارکردووە، بەڵام وەکو ئەم:





**یەکەم:** ئەم تەرزە شیعرەیان نەکردووەتە پیشە و درێژەپێیبدەن، واتە وەك ئەم خەرمانەکەیان سوورنییە.

**دووەم:** نەیانتوانیوە وەکو ئەم دەمنەپارێزن لە بەشیعرکردنی گەلێ وشەی زەقوڕەق و ئەمتەزێن و ئەوبەزێن.

**سێیەم:** ئەم لەو بوارەی خۆیدا هەر بە زمانی کوردییەوە نەوەستاوە، بەڵکو بەهەمان هێز و تواناوە بە زمانەکانی (عەرەبی، فارسی و تورکی)یش شیعری هەیە و ئەوەش شایەتی (شا) یەتی ئەم دەدات لە پایتەختی شیعری رۆژهەڵاتدا. بۆخۆی لە خۆڕا نەیگوتووە:

(شێخ رەزام و بە فەساحەت لە جیهانا مەشهور)

**چوارەم:** رادەی داشۆرینەکەی بە ئاستێك گەیاندووە کە لەگەڵ هەڵکوتانە سەر ئەموئەودا بە خۆیشیدا هەڵداوە: وەك دەڵێ:

لەخەوهەستام خورابوو گوێزەبانە
هەڵیدا ئاگری جوعم زەبانە
دەهات دەنگی ترِم هەروەك تەرانە
سەحەرگاهان کە مەخموربێ شەبانە

(جوع = برسێتی، زەبانە = بڵێسە، تەرانە = گۆرانی، سەحەرگاهان = بەرەبەیان، شەبانە = پاسەوانی شەو).

**پێنجەم:** ختوکەی هەندێ شاعیریدیکەی داوە و ئەوەندە بەسەریاندا داباریوە ئەوانیشی هێناوەتەدەنگ و فێری شیعری داشۆرینی کردوون، ئەو شاعیرانەش وەکو (شوکری فەزڵی، مەستی ئەفەندی، حاجی سەلیم خان، پیرۆز خانمی حەسەن کەنۆش، کەیفی جوانرۆیی، وەستا شەفێی سنەیی) مەبەستی سەرەکیشی لەمەدا ئەوەبووە کە کۆڕی شیعری داشۆرین گەرموگەرمتر بکات.

**شەشەم:** نالی و سالم و حاجی دژی نەیارانی خۆیان ئەو شیعرانەیان نووسیوە، بەڵام ئەم بەپێچەوانەوە زۆرتر سەر و دڵی هاوڕێ و دۆستە خۆشەویستەکانی گرتووە. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە لەرِقەوە نەیگوتوون، بەڵکو بۆئەوەی کردووە کە برەو بەم شێوە شیعرە بدات.

**حەوتەم:** زۆر ئازادانە شوولّی لەم و لەو هەلّکێشاوە و بێپەردەپۆشکردن قسەی خۆی کردووە. کورد واتەنی هیچی تیانەهێشتۆتەوە. ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەلّ (ایرج میرزا) هاودەورەی خۆیدا کە فارسەکان شانازی پێوەدەکەن، ئەوا دەبینین تای ترازووی هونەرەکە زۆرتر بە لای ئەمدا دەنەوێ، چونکە ئەو هەندێکی زۆر لە شتە نەوتراوەکانی نەگوتووە.. با بلّێین شێخەکەمان ئازادی زالّبووە بەسەر خۆپارێزیدا. ئەو بە شێوەی ئەم پڕ نەیداوە لە بنی هەمانەکە.

**هەشتەم:** ئەم بلیمەتە جگەلەوەی کە خۆی و باوانی تەکیەنشین بوون، لەگەلّیدا زانستە ئیسلامییەکانیشی تەواوکردووە، واتە (مەلا شێخ) بووە. کەچی بێگوێدانە یاسا و رێسای سەپیوی ئەورۆژگارە بە کامی دلّی خۆی ریشەی شەرمی خێمەکەن کردووە و لە هیچ شتێ نەسلّەمیوەتەوە.

**نۆیەم:** ئەگەر ئەم مەلا شێخە شیعراوییە دەستیشی نەدایەتە شیعری داشۆرین ، ئەوا لە شیعری پەسن و پیاهەلّدانیشدا هەر یەکێك دەبوو لە شاعیرە سەرکەوتووەکان. بۆئەمەش هەندێ شیعری لێبەجێماوە کە ئەو راستییە مۆردەکەن. وەك نموونەی خەرمانێك لاگوێلی بەیتێ لەمبارەوە دەنووسینەوە بە مەبەستی ئەوەی کە چەند دەسەلّاتداربووە لە شیعری پەسندا.
لە پیاهەلّدانی شۆڕەسوارەکانی جافدا دەلّێ:

چونکە رەسەنن ورد و درشتیان هەموو جەنگیین
مەی سارییە نەشئەی چ لە (دورد)ا، چ لە (ساف)ا
وا بێخەم و پەروا دەچنە عەرسەیی هەیجا
تۆ ناچیە سەر دۆشەکی بووکی لە زەفاخا
رەحمێ بکە با (شێخ رەزا) بێتەوە گوفتار
حەیفە بڕزێ تیغی موجەوهەر لە غیلافا[١]
کارێ کە غەم و دەردی فیراقی بە منی کرد
سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا
دێوانەیە شەخسێ کە بە غەیری لەبی لەعلی
وەك شاهی (سکەندەر) تەلّەبی ئاوی بەقاکا[٢]





**دەیەم:** یەکێکیدیکە لە هونەرە بەرزەکانی ئەم کەلّە شاعیرە ئەوەیە کە لەگەلّ داشۆریندا بابەتەکانی رەوانبێژیشی داڕشتووە، لە گەلێ شوێندا هونەرمەندانە (تەورییە، کینایە، ئیستیعارە، جیناس، تیباق، حوسنی تەعلیل، تەشبیه و مەجاز)ی بەکارهێناوە، واتە زمانی داشۆرینەکەی بە (موحەسسیناتی بەدیعی) دەولّەمەند و پڕ زەوقکردووە.

شێخ رەزا دۆستایەتی و خۆشەویستی بەتینی لەگەلّ هەردوو پاشای جاف (مەحمود وەسمان)دا هەبووە. بەو (بۆن)و بۆنەوە گەلێجار سەردانی هەلّەبجەی کردووە و لە کۆشکی پاشادا رێزی تەواوی لێگیراوە، تەنانەت وەك پێویست خەلّات و بەراتیشیان کردووە. لەمڕووەوە دەبینین لە دیوانەکەیدا ئەو شارانەی داشۆریوە کە تێیاندا ژیاوە یا سەردانی کردوون، وەکو (سنە، کۆیە، کەرکوك و سلێمانی) کەچی هەلّەبجەی بواردووە و هیچی بەسەردا هەلّنەداوە. جگەلەو شارانەی کە ناومانبردن لە بەیتە شیعرێکیدا (سەقز) و (سابلّاخ)یشی پێزیادکردووە، هەروەك گوتوویە:

حیزە ئەو شارەی ئەوەلّی (سین)ە
سلێمانی و سەقز، سابلّاخ و سنە[٣]

کۆیە لەو شارانەیە کە چەندجار لای شێخ ناویهاتووە و لە دژی خودی شارەکە و هەندێ لە خەلّکەکەی سەنگەری گرتووە. ئەم بەیتەی بلّاویدەکەینەوە یەکێکە لەو شیعرانەی کە لەسەر زاری پیرەمێردێکی هەلّەبجەییدا مابوویەوە دەلّێ:

کۆیی تا ماون بمێنن بە مەمنوونیی ئێمەوە
ئاوی (سوور)ی ئێمەیە دەڕژێتە (زێ)ی ئێوەوە[٤]

ئاوی (شیوە سوور) تێکەل بە زێی نزیك کۆیە دەبێت. شاعیر لەم بەیتەدا وشەی (سوور)و (زێ)ی بە شێوەی کینایەش بەکارهێناوە. سوور = کێر، زێ = کوز.

**

**چوار نوکتە**

خستنەڕووی ئەم نوکتانە و هیدیکەشی باشتر رۆشنایی دەخەنەسەر ژیانی ئەم شێخەمان و نزیکن لە دنیای شیعرە داشۆرینەکانیەوە. ئەم چوار نوکتەیە لە بیرەوەری خەلّکی هەلّەبجەدا مابوونەوە، وائێمەش لەم گۆشەیەدا تۆماریدەکەین بە هیوای ئەوەی خزمەتێك بن بە جیهانە پڕ سەمەرەکەی ئەم شاعیرە گەورەیەمان.

شێخ ڕەزا و وەسمان پاشا دەکەونە شەڕەشیعرەوە. شێخ بە تیغی زمانی بەردەبێتە گیانی پاشا و لە مەیداندا دەیبەزێنێ. پاشایش هیچی بۆ نامێنێتەوە ئەوە نەبێ دەڵێ: شێخ ڕەزا.. شێخ ڕەزا من ئەوەندە سەرم لە شیعر و میعر دەرناچێ و کوردی هەردووگونم وەقنگت.

هەندێکەس نیوەناتەواو شیعرەکانی دەخوێننەوە. ئەویش دەدابەگوێیاندا و دەڵێ: هەرکەسێ شیعرێکم بخوێنێتەوە و نەیکات بە چەند دانەیەك، ئەوا گوی من کلاویبێ، پلاویبێ.

کەسێك دەڕواتە مێوانی شێخ ڕەزا و دەدا لە دەرگا. شێخ دەڵێ: ئەوە کێیی؟ ئەویش دەڵێ: ئەوە منم. شێخیش دەڵێ: کێرت بە کوزی ژنم.

ژنەکەی دەڵێ: هەیرۆ نامبارك ئەوە چتگوت؟. ئەمیش دەڵێ: ئێ قابیلە لەبەر خاتری تۆ قافیە تێکبدەم.

جارێکیان لەگەڵ وەسمان پاشادا دامەدەکەن، واڕێدەکەوێ چەندجارێ وەسمان پاشا داش دەجووڵێنێ و دەڵێ: سوارم. دواجار شێخ ڕەزا دەوەستێ و پاشا پێیدەڵێ: بجووڵێ. شێخیش دەڵێ: جا چی بجووڵێم.. تۆ ئەوەندە سوارم بوویت بڕستت لێبڕیم.

* *

### سێ ڕوونکردنەوە

پارچە شیعری (خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا)[٥] نیشانەی سۆز و خۆشەویستی شێخ ڕەزایە بۆ ئەو عەشرەتە و سەرانی، شەڕەکە لەنێوان عەشرەتی (جاف) و (فەیزوڵڵا بەگی) ناوچەی سەقز و موکریاندا بووە و شێخیش ئەم پارچە شیعرەی بۆ (حاجی سەلیم خان)ی شاعیر و یەکە پیاوی عەشرەتی فەیزوڵڵا بەگی نووسیوە.

بەسەرهاتی ئەم شەڕە و وەڵامە شیعرییەکەی حاجی سەلیم خان لە لایەن کاك (عومەری فارقی)یەوە لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری (سروە)دا بڵاوکرایەوە. پاش چەند ساڵێ (حەمەی حەمە باقی) بێئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوەیە بکات وەك ئەوەی هەنگوینی لە داردا دۆزیبێتەوە بڵاویکردەوە. ئێستە لە دیوانەکەی شێخدا - ئامادەکردنی ئومێد کاکەڕەش - باسەکە بەناوی (حەمە)وە تۆمارکراوە و ناوی (عومەر) لە گۆڕێدا نییە کە ئەوە ئەمانەتی مێژووییە و پێویستە ڕاستبکرێتەوە. بەداخەوە ئەو ژمارەیەی گۆڤاری (سروە)م لە بەردەستدا نییە تا دیاریبکەم و خوێنەر بچێتەوەسەری.





پارچە شیعری (میر بە سەد میننەت هەناردی ئێسترێکی ڕووتوقووت)[٦]، هۆی دانانی ئەم پارچە شیعرەیش ئەوەیە کە شێخ ڕەزا مەحمود پاشای جاف ئاگاداردەکات کە هێسرێکی بۆبنێرێ. پاشایش داواکەی بەجێدێنێ و لە ترسی ئەوەی شێخ ڕەزا دەمی لێنەکاتەوە هێسرێکی باشی بارەبەری بۆ دەنێرێ، کاتێك کە دەگاتە دەستی لە باتی سوپاس و پێزانین ئەم شیعەری بۆ دەنێرێ کە جارێکیدی لێرەدا دەینووسینەوە چونکە لەگەڵ چاپکراوەکەدا هەندێك جیاوازییان هەیە.

(میر) بە سەد میننەت هەناردی ئێسترێکی ڕووتوقووت
دەستوپا سست و زەعیف مانەندی تاری عەنکەبووت
خاوەنی ناڵێم کە پێینەداوە ئالیك موتڵەقا
داویەتی، ئەمما وەکو بیستوومە قووتی لایەمووت
پووش لەلای حەڵوایە، حەتتا گەر پەلۆشەی چنگکەوێ
بایدەدا، لوولیدەدا، قووتیدەدا، مانەندی حووت
گەرچی ناتوانێ ببزوێ هێند لەڕ و کەمقووەتە
دەنکە جۆییەکی نیشاندەی تا قیامەت دێ لەدووت
پشتی ڕێش و، شانی زامدار و جدەوبوو، ناعیلاج
چەند قروشێکم هەبوو بۆمدا بە نەوت و عەنزەرووت
مەسلەحەت وایە هەتا نەیخواردووم بینێرمەوە
زۆر دەترسم دەفعەیە قووتمبدا بمکا بەقووت
(سەی فەتاح)ی مەیتەرم ڕۆژێ بە قووەت لێینەوی
کلکی دەرهێنا لەبن، ئینجا بە ئاستەم گوێی بزووت
گەر قەڵەوبێ ئەم ئەجیننە لێرە تەسخیرناکرێ
غەیری چەند دەروێشێ (ڕەففاعی) بەزۆری جەلجەلووت
ئەم مەتاعە چاکە، هەر لایەق بە (حاجی ئەحمەد)ە
جووتبکا پێی هەروەکو (جووت) هەردوو لنگت کرد بەجووت
لایەقی شەئنی من و شایانی شانی تۆ نەبوو
چاوەکەم چیت پێبڵێم؟ چارم نییە غەیر سکووت

گەر (ڕەزا) ڕازیدەکەی خەلعەتی شاهیی دەوێ

نەك ئێسترێکی چەمووش و سك قوپاوە و کەللەپووت

(زەعیف = لاواز، مانەند = وەکو، تاری عەنکەبووت = داوی جاڵجاڵۆکە، موتڵەقا = هەرگیز، قووتی لایەمووت = خواردنی مەمرەومەژی، پەلۆشە = گیایەکە لاسکەکەی دەکەنە پووش، جدەو = وڵاخی پشت بریندار، قروش = پارەیەکی کۆنە، عەنزەرووت = شیلەی دارێکی دڕکاوییە بۆ دەرمان بەکارهاتووە، قووت = خواردن، مەیتەر = ئەسپ بەخێوکەر، بزووت = جووڵا، ئەجیننە = جنۆکە، تەسخیر = ڕام، کەویی، ڕەففاعی = شێخێکی بەناوبانگ بووە، شەئن = شان و شکۆ، غەیر سکووت = جگە بێدەنگی، خەلعەت = خەڵات، شاهی = شاهانە، چەمووش = هێسری جووتەوەشێن، پووت = پووچ وخاڵی).

### بەیتە شیعری

ئەسبای تەڕەب (زیر)و (بەم)ە ئەی بەگی جافان

بەزمێ بگێڕین چاکە لە من زیر و لە تۆ بەم(٧)

ئەم بەیتە بۆ داشۆرینی وەسمان پاشای جاف وتراوە.. جارێکیان شێخ میوانی وەسمان پاشا دەبێت و پێیدەڵێ: شێخ ڕەزا حەزدەکەم شیعرێکم بەسەردا هەڵبدەی. شێخیش دوای تاوێ بیرکردنەوە ئەو بەیتەی پیادەڵێت.

زیر = دەنگی نزمی مۆسیقا، بەم = دەنگی بەرزی مۆسیقا، شێخ جگەلە واتا ڕاستییەکەی زیر و بەم، (زیر)ی لەباتی (تس)و (بەم)ی لەباتی (تڕ) بەکارهێناوە. مەبەستی ئەوەبووە کە لەو بەزمەدا دەیگێڕن من تس لێدەدەم و تۆیش تڕ.

هەروەها (لە تۆ بەم) بەسەر یەکەوە واتای (لە تۆ ببەم) دەگەیەنێت.

وەسمان پاشا کاتێ سەر لە مەبەستەکەی شێخ دەردەکات دەداتە قاقاپێکەنین و دەڵێ: ماڵوێران ئەمجارەش دەستی خۆت وەشاند.

لە دیوانەکەیدا هەندێ شیعر و نوکتەیدیکەی هەیە کە پەیوەندییان بە خەڵکی هەڵەبجەوە هەیە، ئێمە نامانەوێت لێرەدا بچینەوەسەریان و خوێنەر دەتوانێ بیانخوێنێتەوە.

**





لە کۆتایی ئەم باسەدا بە چاکمزانی کە ئەم شیعرە بڵاونەکراوەی بکەمە دیاری. شیعرەکە لەڕووی دەستنووسێکی کۆن نووسراوەتەوە و لە شیعری شێخ ڕەزا بەولاوە لە هی کەسیدیکە ناچێت، دەڵێ:

براگەل عیلم غەڕرایە بە هەر مانگاملی نادەن

شەریعەت جەوهەرێ پاکە بە پیاوی ڕەنگگولی نادەن

تەریقەی نەقشبەندییە سوننەتی بوبەکری سیدیقە

بە سۆفی دووفلیقانە و بە شێخی زگزلی نادەن

شیعاری شێوەیی غەوسە کە یەعنی قوتبی گەیلانی

بە دێوانەی قورمساغ و خەلیفەی کەرملی نادەن

لە دەشتی وەحدەتا عەنقا شکا باڵی نەما قووەی

بە کاروانی بەلگدار و قەتار و مەحمەلی نادەن.

***

### ژێدەر


١. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئامادەکردنی: ئومێد کاکەڕەش (١٩٩٩) لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر، ل/ ٤٩

٢. هەمان سەرچاوە ل/٥٤

٣. لە زاری خوایار (ڕەحیم پاوەیی) هەڵەبجەیی وەرگیراوە لە دیوانەکەیدا نییە

٤. لە زاری مامۆستا شەفیق ڕەشید هەڵەبجەیی وەرگیراوە لە دیوانەکەیدا نییە

٥. ژێدەری (١) ل/ ٤٩

٦. هەمان سەرچاوە ل/٦٧

٧. هەمان سەرچاوە ل ٢٣٣.

# چاکشوێن و بەدشوێنی شێخ ڕەزا

لەتیف فاتیح فەرەج

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە بواری هەجودا گەورەترین شاعیری کوردە، دواتر ئەحمەدی ناڵبەندیشمان هەیە. ئەمە جگەلە هەموو ئەوانەی بەناچاری هەجوی شێخ ڕەزاشیان کردووە. هەجوەکانی شێخ ڕەزا هەندێکیانی لێبترازێ کە جۆرێك لە ستەمیان تیایە بەرانبەر خەڵکێك، دەنا بە گشتی نەبوونەتە هۆی ئەوەی کەسێك بە مانای ڕەنجان بڕەنجێ. ئەم بۆچوونە دەشێ بۆئێستا تاڕادەیەك ڕاستتر بێت، لە دەم و گاڤی خودی شێخ کە ڕەنگە لەوسەردەمەدا وانەبێ، شێخ لە شیعرەکانیا هەجوی کەسایەتی، خەڵك خزم و کەسوکاری خۆی، خێڵ و هۆز و بنەماڵە، شار و ناوچەی جیاجیای کردووە، لێرەدا من لەسەر هەجو و پیاهەڵدانی شوێن لای شێخ ڕەزا هەڵوەستەدەکەم. چەند نموونەیەکی زۆر کەمیش لە دیوانەکەی وەردەگرم، مەرجیش نییە کە یەکجار بڕیاری بەدشوێنی لە شوێنیکدا بێت، ئیدی لە جیگەیدیکە پێیداهەڵنەدابێت، شێخ ڕەزا چەن هەجووەکانی جەرگبڕ و کاریگەربوونە هێندەش لەپیاهەڵدانا زیدای پێوەناوە. ئەمە ئەگەر لێکۆڵەرێك بیەوێت، بەوردی لەسەر ئەو بابەتە قسەبکات، ڕوونتر ئەو پرسەی بۆ دەردەکەوێت، هەرچەند پێموایە لەوەشدا لێکۆڵەرەوە و توێژرەکان تووشی گێروگرفتی خۆیان دەبن، ئەمەش بەشێکی پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەوە هەیە لەبارەی شاعیرانی کوردەوە. ئێمە ئەگەر ئەمینی فەیزی بەگ و مامۆستا عەلائەدینی سەجادی و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و هەندێك ناویدیکە لە ڕاڤە و شیکاری ئەدەب و شیعری کوردی بینینەدەرەوە، ئیدی هیچمان بۆنامێنیتەوە. هەرچەند ئەم ساڵانەی دوایی درکدەکرێت بەگوڕتر لەوبارەیەوە تەقەلای جۆراوجۆر هەیە، شێخ ڕەزای تاڵەبانی تاڕادەیەك ڕەنگە شانسی لە شاعیرانی کلاسیکی بەرلەخۆی و ماوەیەکی کەم دوای خۆیشی باشتربێت، یەکەم لەبەرئەوەی زۆربەی شیعرەکانی بەسەر زاری خەڵکەوە بووە و هەندێجار ئەمە خراپەکەشی ئەوەبوو کە هەرچی گوتراوە دراوەتەوەپاڵ شێخ ڕەزا. دووەم کەمتر لە پەنجا ساڵ بەرلە مەرگیدا یان هەر ماوەی چەند ساڵێك تێپەڕبووە کاتێك شێخ عەلی تاڵەبانی دیوانەکەی چاپکردووە، ئەمە چاپی دووەمی دیوانەکەیەتی و ساڵی ١٩٤٦ لە بەغدا چاپکراوە. سێیەم دیوانەکەی لەلایەن کەسێکی بنەماڵەکە و خوێنەوارێکەوە چاپکراوە،





چوارەم شانسی ئەوی هەبووە هەر کەسێك باسی ئەدەبی کوردی کردبێت بە هۆی تایبەتمەندی ئەو شاعیرەوە ناچاربووە هەڵوەستە لەسەر ئەویش بکات، ئەگەرچی خودی شێخ ڕەزای شاعیر جگەلە لایەنی شیعری هەجوو لە بواریدیکەشدا خاوەنی توانا و ئاستێکی بەرزی داهێنان بووە. لەم کورتە نووسینەدا ئاوڕێکی خێرا لە یەك لایەنی شیعری شێخ ڕەزا دەدەمەوە کە پەیوەندی بە شوێنەوە هەیە، خۆ ڕەنگە لای شێخ ڕەزا چاککەس و بەدکەسیش ئەوە بهێنێ کە قسەی لەسەربکرێت، بۆنموونە لەکوێدا کێی پێچاکە و لەکوێدا پێیخراپە، چۆن جارێك بەسەر مامیدا هەڵدەدات و جارێکیدیکە دەیەوێت وردوخاشی بکات، ئەمەیان بابەتێکی دیکەیە، شێخ ڕەزا بەمجۆرە باسی کەرکوك دەکات کە لێیتوڕەدەبێت:

بەم حاڵە ئەگەر جارێکیتر بچمەوە کەرکووك
مەعلومە بە مەردی لەسەرم نەڕواوە تووك
بۆ چ بچمەوە کەرکوکی قوڕمساغ کە لەگەڵ من
ئەهلی هەموو ناسازە وەکو ئاوی حەمامووك

شێخ سەرەڕای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك دەژێت و تاڕادەیەکی زۆریش زیاتر کەرکوك بە شوێنەزای حیسابە. لە قرخ لەدایکبووە و قرخیش سەر بە کەرکوکە یان سەر بە چەمچەماڵە و چەمچەماڵیش سەر بە کەرکوکە. کەچی کە تووڕەدەبێت وەکو شوێنێکی زۆر بەد لێیدەڕوانێ و دەڵێ پاش ئەو هەموو دەردیسەرییەی لە کەرکووك بەسەرم هات، ئەگەر جارێتر بچمەوە ئەوێ دیارە بە مەردی لەسەرم نەڕواوە تووك، ئەم بەشەر هەجووکردنی خۆیەتی. لای شێخ ڕەزا کەرکوك بەدشوێنە لەبەرئەوەی یەکەم شوێنێکی قورمساغە، دووەم ئەهلەکەی لەگەل شێخ ناسازن، سێیەم کەس بەلایدا ناچێ و لێیناپرسێ. بەمجۆە داخی دڵی خۆی بە کەرکوك دەڕێژێ و ڕوودەکاتە کۆیە بۆ لای شێخ غەفوری مامی گەرچی دواتر سەروگوێلاکی ئەویش دەکوتێتەوە.
لە شێوێنێکیدیکەدا هەر لەسەر بەدشوێنی کەرکوك دەبێژێ:

کەبابی گۆشتی بزن فاکیهەی بەری خڕنووك
لە من بپرسە سەفای شارە حیزەکەی کەرکووك

دەبی ئەوەش بڵێین شێخ رەزا لەپێشوودا کە هەجووی خۆی دەکات کە نەچێتەوە کەرکوك، بەڵام دووبارە دەگەڕێتەوە کەرکوك. ئەو پێشتر ئەگەر بچمەوە بە مەردی لێمنەڕواوە تووك، بەڵام لە گەڕانەوەدا دەڵێ:

هەر چەند رەزا باعیسی بەدنامییە عەدوت
لەم سووکی و بەدنامییە سەرفی نەزەرم کرد

شێخ رەزا سەرەڕای پەیوەندی پتەوی بە کەرکوکەوە و هەمیشە گەڕانەوە بۆ ئەو شارە، بەڵام لە چەندین شوێن وەك بەدشوێنێك لێیدەڕوانێ و هەجووی دەکات. ئەمە دیارە سەبارەت بە شاری سلێمانیش وایە.

شێخ رەزا لە چاکشوێنیدا بۆ سلێمانی دەڵێ:

مەربووتە حەیاتم بە سلێمانی و خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپێکەی ئەحمەدی کاکی

دەبینی ئەو هەموو ژیانی خۆی گرێدەدا بەو شارەوە و تەنانەت خۆزگە بە سەگی قاپێکەی کاك ئەحمەدی شێخ دەخوازێ. هەرسەبارەت بەم سلێمانییە شێخ لە چەندین شوێنی وەکو بەدشوێن لێیدەڕوانێ کە رەنگە یەك نموونەی زۆر دیار بەسبێت بۆ راستی بۆچوونی ئێمە، شێخ رەزای شاعیر لە شوێنێکدا سەبارەت بە سلێمانی دەڵێ:

هەر مەتاعێ کە تەڵەبکەی لە سلێمانی هەیە
ئیلا کوزی بیکر و کونی نا موستەعمەل

شێخ رەزا زۆرجار بەپێی دۆخی خۆی بڕیاری لە چاکشوێنی یان بەدشوێنی جێگەیەك داوە، ئەگەر کەرکوك لەگەڵ بەختی شێخ بگەڕێ کەواتە کەرکوك چاکشوێنە، بەپێچەوانەشەوە





هەندێجاریش، هۆیدیکە هەیە بۆئەوەی بەدی و چاکی شوێنێ نیشانبدرێت. بۆنموونە کە بڕیاری چاکشوێنی بەغدا دەدات هۆیەکەی ئەوەیە شوێ و تەرگەی غەوسی گەیلانی و کەرخی و ئیمامی ئەعزەمە. ئەوەتا بۆ بەغدا دەڵێ:

گەر بڵێم بەغدا لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە
چونکە سوکنای غەوسی و کەرخی و ئیمامی ئەعزەمە

وەك چۆن لە شوێنێکیدیکەشدا هۆی چاکشوێنی سلێمانی بۆ کاك ئەحمەدی شێخ دەگێڕێتەوە.

بەگشتی شێخ رەزای شاعیر زۆر شوێن لە تیری تیژی ئەو دەربازی نەبووە و شەنی خۆی پێکردووە، هەروەك شانازی بە زۆر شوێنیدیکەشەوە کردووە، من بەو نیازە ئەم لایەنەم لە شیعری شێخ رەزا هەڵبژارد تا کەسانیدیکە زیاتر لەبارەیەوە بدوێن. دەبێ ئەوەش بڵێم کە من بەتەنێ چەند نموونەیەکی کەمی شیعرە کوردییەکانیم هێنا، گەرنا نموونەیدیکەشی چ بە کوردی و چ بە زمانەکانیدیکە هەیە. هەڵبەت ئەو لەسەر کۆیە و سنە و هەولێر و شوێنیدیکەش قسەیکردووە، لێ ئێمە هەر نموونەی سلێمانی و کەرکوکمان هێنایەوە، جگەلە تاکە شیعرەکەی کە بۆ بەغدای وتووە.. ئێمە دەبێ دان بەو راستییەدا بنێین کە شێخ رەزای شاعیر وەکو پێشەنگ و رابەری شیعری هەجووی کوردی، هەندێکجار بەمەبەست، رەنگە زۆر بەمەبەستیش هێرشیکردبێتە سەر لایەك، ئەمە هەرچەندە لە شاعیری و پایەبەرزی شێخ رەزا کەمناکاتەوە، بەڵام جۆرێك لە لایەنگری پێوەدیارە. من وایبۆدەچم ئەمەش هۆی خۆی هەیە، بەڵام جارێ بۆ ئێمە روونییە، هەرچەندە ئەوە بەسە کە شێخ دەستی لە برا و مام و ئامۆزا و برازای خۆیشی نەپاراستووە و هەرچی بە خەڵکیدیکەی گوتووە بە کەسوکاری خۆی زیاتری گوتووە. ئەو کە بە مامی خۆی بڵێ: "مامەکەم قەحپەژنە" ئیدی هیچ بۆ کەس نامێنێتەوە.

***

# مژمۆری چاوی شێخ ڕەزا و دیدەی ڕۆشنی مەولەوی سونبولی ئایینی کاکەیی لە نێوان تێڕوانینەکانی شێخ ڕەزا و مەولەویدا

هومایۆن ساحیب

لە ئەدەبیاتی نووسراوی یارسانەکاندا کە لە سەدەی دوەمی کۆچییەوە دەستپێدەکات ڕابەرانی ئەو تەریقەتە هەوڵیانداوە بیروڕا دینی و پرسوجۆ و تێڕوانینەکانیان بۆ کەون و کائینات لە زمانێکی تایبەتی نەکراوە بپێچن و دنیایەکی جوان لە شاری سرِ درووستبکەن و لەڕێی مەجازی مەییەوە عەشق ڕۆکەنە نێو پیاڵەکانی فیکر ودڵەوە. ئەمەش بووەتە پشتێکی شیعری جوان بۆئەو شاعیرانەی بەو دیالێکتە نووسیویانە و لە پێچوپەناکانی ئەو زارە شارەزابوون. مێژووی ئەدەبی کوردی پڕە لەناو و نموونەی ئەو شاعیرانە کە دیارترین و بەرزترینیان جەنابی مەولەوییە. پیرشالیاریش پردی پەیوەندی ئەو مەسەلەیە لەنێوان شاعیرانی دوای خۆی بە یارسانی و سوننەوە و لەگەڵ ڕابەرانی یاریی پێش خۆی و زیرەکانە بنچینەی (ڕامان و ئەندێشە) بۆ ئێمە دادەڕێژێ و تێکڕای پرسیارە گرنگەکان دەبنە کەڵکەڵەی و دواتر لای شاعیر و عارفانیتر دەردەکەونەوە. عیشق چییە؟ عاشق و مەعشوق کێن؟ ئەوەڵ کامەیە وئاخری کوێیە؟ ژیان و مردن چین؟ دروستکەر کێیە و خیلقەت چۆن؟ لەم نێوەندەدا ئێمەچی؟ چۆن بپرسین و چ بەرپرسیارییەکمان هەیە؟ گومان چی دەکات و یەقین کەی دێت؟ ختووورە چییە؟ وتن و زمانی دەربڕین چۆن؟ ڕەمز و نوشتە و سیحری وشە و زمانی جنۆکەئاسای شەیدا و عاشقان بۆ هاتووەتەئارا و کێ چاری نەزان و تێکدەران دەکات و بەکێ بڵێین: داران گیاندارن و لەکوێ لە هێلکە ڕامێنین و تاکەی چاو لە پەردەودەرکەوتنی دانەی زەردبین؟

"باوەیادگار"سومبلی هاوبەشی شیعە و سوننە و کاکەیی دەکەینە تەوەری باسەکەمان و وەك یەکەمین پیر و دوایین پیری ئەم بازنەیە باسدەکەین و دەیخەینە نێوان دوو بینین و دیدی جیاوازەوە. وەك ڕەمزێکی ئایینی "یارسان" کە دوو خوێندنەوە و تێڕوانینی لە ئەدەبیاتی ئێمەدا دروستکردووە. تێڕوانینێکی شایستە و حاڵییانە کە "مەولەوی" خاوەنیەتی و تێڕوانینێکی





ناقابیل کە عەبدوڵڵا حەسەنی مامۆستا و شێخ ڕەزای قوتابی خاوەنیەتی. مەولەوی وەك عارفێ بەو تەریقەتە کەڵکی لە هزر و زمان و ئەندێشەی ئەوان وەرگرتووە. بۆ ڕازە پەنهانەکانی خۆی سەبارەت بە پرسەکان (خیلقەت، ژین، مەرگ، عیشق، ئیخلاس، عاشق و تیر و زام و دەرد و دەرمان) ڕۆچووەتەناو ئەو کلتورە. ئەو شاعیرێك نییە تەنیا دەرچووی قوتابخانەی (سەییدی، خانا، بێسارانی) بێت بەڵکو زیاتر درێژدەبێتەوە بەجۆرێ کە دەگاتەوە بە ئەدەبیاتی (ماچۆ)ی سەدەی دوەمی کۆچی. بە هەورامی نووسین لەو ئینتیمایەوە بووە بەو پاشخانە هزری و ئەخلاقی و ستاتیکییەوە. ئەو شەیدا و عەودالی ئەو ئەمارەتی عیشقە بووە کە دوورترین چرای شیعری هەورامی لە هەواری یارسانەکاندا هەڵکردووە. مەولەوی هێژا و ڕێزدارانە لەقەڵەمڕەوی دینی یاری دەڕوانێت. چوون لە کانیلەی ئەو نیشتمانە شیرینەوە تەڕی بۆ شیعر و بەهرەی خۆی هێناوە. وەفادارەپێیان و بەردیانتێناگرێت. گوتاری مەولەوی و هاوڕێ و قوتابییەکانی پێچەوانەی گوتاری عەبدوڵڵا حەسەن و شێخ ڕەزا و قوتابییەکانی ئەوە. گەر شێخ ڕەزا بکەوێتەبەر لێبوردنی زمانە تایبەت و جنێوفرۆشییەکەی کە کەمکەسی بواردووە تابە برا و مامەکانیشی دەگات. ئەوە دەبێت دانا و زاناکانیتر لە دادگای ویژدانی نەتەوەییماندا بوەستێنین!.

سان سەهاك (سلتانی ساق) لە گەورە مریدانی دەوروبەری حەوت بازنە لە پردیوەر دروستدەکات. باوە یادگار یەکێکە لە زاتەکانی بازنەی یەکەم بەناوی (هەفت تەن-حەوت تەن) کە بە حەوت تەنی جاویدان ناسراون و لە سەرەتای دنیاوە تاکۆتایی دنیا ڕۆحیان لەگەڕاندایە. ناوەکانیان لە سەردەمی سوڵتاندا ئەمانەن (پیربنیامین-پیرخدری شاهۆ، پیرداود-داودی ڕەهبەر، پیرموسا- روکنەدینی دیمەشقی، ڕەمزبار- خاتوودایراك، مستەفادەودانی، شائیبراهیمی ئێوەت-مەلەك تەیار، باوا یادگار (یارسان ئەیوب ڕۆستەم ل ١١٩) پیربنیامین یان پیرخدری شاهۆ: ناوی (سەیید محەمەد زەهیرەدین)ە. دەچێتەوەسەر ئیمام عەلی نەقی کە لە ساداتی حسێنییە و نەوەی ئەمیرولموئمینین حەزرەتی عەلییە.(تاریخ مردوخ جلددوم ل٣٢) دۆنی ئەم پیرە لە سەردەمی حەزرەتی عەلیدا لە تەنی سەلمانی فارسیدا بووە.(یارسان ل ١٢١) ئەمەش ئەو ڕەهەندەمان دەداتێ کە یارسانەکان و سەییدانی حوسەینی دەخاتەسەر یەك هێڵ و خۆشویستنی حەزرەتی عەلیش لەو سەرچاوەیەوە هەڵقولاوە.

باینجۆیەکان و جەبارییەکانی گەرمیان و گورگەدەری و شاڵی شلییەکان و پارسانییەکان و مودییەکان و چۆڕییەکان و تاوگۆزپەکان لە وەچەی ئەو پیرەن.(چەمکێکی مێژویی هەورامان و

مەریوان سەیید عەبدولسەمەدی تووداری محەممەدی مەلا کەریم ل ٣٦-٣٩) مەولەوی تاوگۆزی نەوەی ئەو پیرەیە. ئەمەش دەرگای خزمایەتی نێوان نووسەرانی دیالێکتی (ماچۆ) بۆئێمە دەخاتەسەرپشت و لەقەڵەمڕەوی نووسین بەو زارەش تێدەگەین و ڕێگەی زانستی و لاکردنەوەمان بۆئەو کلتورە لێدەکاتەوە. ئەم لاکردنەوەیە لەلایێکەوە چەندانی وەك مەولەوی ناساندووە بە سەرچاوەکانی ئایینی یارسان و گەر ناوی ئەو ناوە هاوبەش و بەشدراوانە ریزکەین کە موسڵمانن و بەئاگایی و ڕێزی زۆرەوە دەسیان بۆ سەرچاوەکانی ئەو ئایینە بردووە بە چەند لاپەڕە تەواونابێت. لەلایەکیتریشەوە لەو هەموو مرید و پیر و سەییدانە تێدەگەین کە لای تێکڕای دانیشتوانی کوردستانەوە پیرۆزن و جێنەزرگەی خۆشەویستی هەموانن. ئەمەش دەبێتە پشتێکی گرنگ و شوناسی کەلتوری ئاشتی و یەکڕیزیمان دەداتێ کە گەورەترین زامنی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردە. ئێستەش پێمخۆشە بزانین باوەیادگار کێیە و چ شوێنێکی لای یارسانەکان گرتووە.

باوایادگار: دواین زاتی بازنەی یەکەمی پردیوەرە و بێباوك لە ساڵی ٧٦١ کۆچی لەدایکبووە. کانی پیرۆزی (غەسلانی) لە تەشار هەڵکەندووە و دواجار لە گوندی سەرانە کوژراوە.(یارسان ل١٣١=١٣٤). چیرۆکی لەدایکبوونەکەی هاوشێوەی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسایە و لە بەرگی موعجیزەدایە. خواردنی دەنکەهەنارێکی کەوتووی ناوجەم لەلایەن (شارا-سارا) خاتوونەوە بووەتە مایەی لەدایکبوونی یادگار. پۆشینی بەرگی کاری ناباوەڕی و ناعادەتی لەسەرجەم ئایین و ئایینزاکاندا هەیە و ئەمەیان کاری ئێمە نییە.

باوەیادگار: پایەیێکی بەرزی لای یارسانەکان هەیە و خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی وخەرقەی نووری لەبەرە. پشتەکانی لای موسڵمانان کەسی پیرۆز و ڕێزلێگیراون. یارسانەکان بە کەلاٚم و سروودی پیرۆز و چەندین خوێندن ستایشی دەکەن و بۆ خۆیشی سەرگوزەشتەی ژیانی عیرفانی و پشتەکانی دەگێڕێتەوە. گوتراوەکانی ئەو زاتە زولاڵ زولاڵن کە چاپنەکراون.(مێژووی وێژەی کوردی ب١ ل١٨٧) موسڵمانەکانیش چ ئەوانەی خۆیان بە خۆیشی دەزانن و چ ئەوانەش کە دەروێشی ئەون ڕێزدار سەیری دەکەن و شیعری (سەرشاری سەهبای بەزم موناجات)ی مەولەوی بەرجەستەی ئەو ستایش و ڕێزەیە. ئەمەش لەو بڕوایەوە سەرچاوەیگرتووە کە هەوارێکی هەمان ئەو ڕۆحەی حسێن باوەیادگارە. ئەم ڕۆحە لە هەرسات و شوێنێکا دەرکەوت، شەهیدبوون بەشێکە لە چارەنووسی.(سەرئەنجام – تەیب تاهیری ل٦٠٩). یادگار مەزهەری یەقینە و هابیلی کوڕی ئادەم و ئیرەجی کوڕی فەرەیدون و سیاوەشی کوڕی کەیکاوسە، یەحیایە لە





سەردەمی عیسادا، ئەسغەری لەعلپۆشە لە سەردەمی ئەسکەندەردا حوسەینە لە کەربەلادا، سەعدانی فەرماندەی لەشکری موختار سەقەفییە، باباتاهیرە لە سەردەمی شاخۆشیندا، چەندین دەرکەوتەیتری هەیە. لەقەبەکانی (زەردەبام و پیری نێرگس چەم و نازڕەوا و پیری ڕەنگینەیە) (سەرئەنجام تەیب تاهیری ل ٤٥٩) بەداخەوە ئەم کەسایەتییە وەك بوویەکی مێژوویی کۆمەلاٚیەتی لای هەندێ لە دەور و سەردەمەکاندا بەرپلاردراوە و ناشیانە زمانی پیسیان لێخستووەتەگەڕ. واتە دیدێکیتر پێچەوانەی دیدگای مەولەوی لەو کەلتورەی ڕوانیوە. دیارترینیان "شێخ ڕەزا و عەبدوللاٚ حەسەن"ن.

**شیعرەکەی شێخ ڕەزا**

بابان باشندە بر باتمان یشیل وار
امام القوم فی تقسیم شەلوار
هەتانە هەروەکو بیستوومە بەزمێ
لە ساڵێکا شەوی یارانی دیندار
عەمودێکم هەیە وەك توولی داود
کوتامە ژێری کوڕکەی دایەڕیزوار
تسێکی کەند بە ریشی سەی براکە
تڕێکی دا بە یادی باوەیادگار
دەبەستن حەلقەیێ وەك عەقدی پەروین
لە جێگایەکی خاڵی لەیسە دەییار
بەچۆکادێ قوتەی مل نێرکە کاردو
وەکو بولبول دەخوێنێ وەعز و گوفتار
دەخوێنێ مەرسییەی مالۆسی مەرحوم
یەکانەی گونڕەش و گاحۆلی شاخدار
وەکو باران بە کلکی پیرەسەگدا
بەڕیشیدا دەچۆڕێ ئەشکی خونبار
لە پاش ئیکمالی ڕەسم ماتەم و شین

وەڕین دەسپێدەکا وەك کەلبی هەوشار
(مەعزەڵڵاً، دەڵێ یائەیوهالقەوم
درۆیە حەشر و نەشر و جەننەت و نار
لەگوێ مەگرن قسەی ئاخونی شیعە
بەئاشووبن مەلای سەرلنگە دەستارِ
غەرەز لەم جرتوفرت و فاکوفیکە
ئیتاعەی ئەشقیایە و دەفعی ئەشرار
حلولی مەزهەبێکە بێگرێ و قۆرت
تەناسوخ ڕێگەیێکە ڕاست و هەموار
"بیحەمدیللا" نەما کاك "ئەحمەدی شێخ"
"زەهاوی" مرد و گۆڕی گومبوو "چاومار"
ئەگەربێو شێخ عەلیش دەفعولبەلاَبێ
ئیتر دنیا دەبێتە عەینی گوڵزار
بمێنێ یا نەمێنێ چی لەدەستدێ
بەتەنها شێخ ڕەزاکەی هەرزەگوفتار
ئەگەرمشتە و مشاریش بێزمانی
عیلاجدەکرێ بە مشتی پڕلەدینار
بە دیناری عیلاج کەن یا بە سمتی
بلوورینی کوڕێکی سادە روخسار
ئەزیزان ئایینی یارانی جەمجەم
لەسەر سێ روکنە، ئەوەڵ تەرکی ئازار
دووەم ئیکرامی زەیف و شەرتی "سالس"
لەهەردوو عومدەتر کیتمانی ئەسرار
ئەمانەش جوملە پەشمن ئەسڵی مەقسەد
چوارە پێتبڵێم ئەی پیری هوشیار
شکستەی جەوز و، توولی سەوز و، کەڵبەی





بەرازی بۆز و کەللەی خوگی مردار
ئەگەر دەرچێ لەسەر ئەم دینە ڕۆحت
دەچێتە قاڵبێکی شۆخ و نازدار
زەعیفبێ خوانەخواستە ئعیتیقادت
بە ئایین و بە ئەرکان و بەئەتوار
نەکەی تەرسێ بە ریشی خەلفەباپیر
نەدەی گانێ لە ڕێگەی باوەیادگار
شیاکەی گاوەحۆل نەگری لە ریشت
نەچیتەژێرکولێنی دایەڕیزوار
قەپۆزت دانەپۆشێ بەرسمێڵت
بەسەرملتا نەیێ وەك یاڵی کەمتیار
لە قیبلەی موستەفا ڕووەرنەگێڕی
لە ڕێگەی شەرعدا دەمری گوناهکار
لە پەشمی ریخناکی بەرسمێڵت
نەڕێسن سەرکەلە و دەسبەند و هەوسار
کە مردی ڕۆحی ناپاکت بەچوستی
لە ئینسانی دەچێتە شکڵی سەگسار
وەرن یاران شەوی میعادە ئەمشەو
لەپێ دەرپێ فڕێدەن خزم و ئەغیار
شەرواڵی زەردوسوور وەك خەرمەنی گوڵ
لەسەر مافووری زەرد ڕۆیکەن بە خەروار
شەواڵی خامەك و زەربەفت و خارا
لەسەریەك دابینێن وەك ماڵی توججار
کەنیز و خانم و خاتوون و خادیم
فەقیر و مونعیم و دەروێش و سالار
نەدیم و نۆکەر و ئاغا و ئەفەندی

لەدەوری دانیشن وەك خەتی پڕگار
لە نەزمی بەزمی جەم ساقی بگێڕێ
شەراب و لێبدا، موتریب لە میزمار
نەبیز و شەربەت و نوقڵ و مەزە و نەی
دەف و تەمبوور و ساز و بەربەت و تار
دەبێ ئەم بەزمە هەربەم نەزمە بڕوا
هەتا دوو حیسسە رابووڕێ لە شەوگار
کە دنیا بوو بە رووی قەیماسی زەنگی
سەرەی بەشکردنی شولّوارە ئەمجار
بە قورعەی مەعدەلەت یەك یەك بەشیکەن
مەپرسن ئەقرەبا و قەوم وکەسوکار
مەپرسن دایك و پوور و خوشك و خوارزا
لەژێر کورکەی بەرن بێقەول و گوفتار
بە قەولی "باوەباوە" و "میرە میرە"
میسالی کێر و کوز هەروەك کون و مار
بە شەرعی "مەزدەك"و ئاییینی "بابەك"
دوو خوولی جائیزە ئیسمی کونادار
"فهیا ساداتي للوطيء والنیك"
"لقدعلمتکم تقسیم شلوار"
چرا پفلێکەن و شێرانە هەستن
شەقێ هەڵدەن لە پەردەی عیسمەت و عار
سەرودەرپێ بەرن بێفەرق و تەمییز
دەمودەست ساحیبی دەرپێ بکەن دیار
شەروالّی هەرکەسێ بەر هەرکەسێ کەوت
ئیتر فەرقی نەکا بیداتە بەرکار
کە ئەم وەعزەی تەواوکرد پیرەئاخوون





ئیتر هەر پف لە شەمعە و تف لە حەیتار
ئیتر هەر دەتکێ دین و کەسری ناموس
ئیتر هەر تەرکی شەرم و عیففەت و عار
ئیتر هەر لنگ دەبێتە لامئەلفلا
ئیتر هەر کێر دەبێتە باسکی هاوار
ئیتر هەر گومەزەی سمتە دەسووڕێ
بە سوورەی سەرخڕا وەك چەرخی دەوار
ئیتر هەر لێپەڕینە و لێخوڕینە
بەرەوژوور و بەرەوژێر و بەرەوخوار
ئیتر هەر دایکە پیرە و هەڵدەنیشێ
بە کەللەی کێرەوە وەك ورچی سەردار
ئیتر پاوانەیی زیوە و زڕەی دێ
لەبەر کوتپێوەدان دەخشێ لە دیوار
ئیتر خەپلەی کوزە وەك جاوی کازر
بە مەترەق دەیکوتن ساداتی ئەبرار
ئیتر هەر ناوگەڵی خوبانی بیکرە
لە خوێندا سووردەبێ وەك بەرگی گوڵنار
ئیتر هەر کێرە وەك پەیکانی گۆشتین
بەژێر بنیا دەچێ وەك پەڕی سوفار
ئیتر یاخوا نەسیبی دوژمنتبێ
بڕینی نیزە و نوزەی بریندار
منالێ لەو شەوە پەیدابێ لایان
دەبێتە "سەیید"و "ڕێزدار"ی موختار
لە وەسفی کاکەیی گەر سەرفی عومرم
بکەم ناکەم بەیانی عوشری میعشار
(دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی ئومێدکاکەڕەش ٢٠٠٥ چ٢ ل٩٧-١١١)

ئەم شیعرە لە سەرچاوەکانی کۆلّیاری لە شیعری شێخ رەزا جیاوازی تێدایە و هەندێ وشە و گوزارە مەرام و مەبەستی جیا دەبەخشن. لەبەر درێژنەبوونەوەی بابەتەکە ئاماژەیان پێناکەین. تکایە خوێنەر بڕوانێتە(دیوانی شێخ رەزای تالّەبانی ئومێدکاکەڕەش ٢٠٠٥ چ٢ ل٩٧-١١١و شێخ رەزای تالّەبانی ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری، د موکەرەم تالّەبانی ل١١٣-١٢١و دیوانی شێخ رەزای تالّەبانی- بەشی کوردی و دوو پاشکۆ،٢٠٠٣، کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شێخ محەممەدی خالّ.. سلێمانی ل١٧٩-١٨٣). سەبارەت بە شێخ رەزا ئێمە رەخنەیەکمان نییە چوون ئەو لە شیعرە هەجوەکانی خۆیدا زیاتر لە کاکەییەکان لە "براژن و ئامۆژن و کاك و مامە و برای خۆی" پەڕیوە، ئیتر ئەمە دەبێتە پاکانە بۆ جنێوەکانی و جنێویش چەند ناشیرینبێت مەرامەکەی قووڵ نییە هەڵەشەییێکی سەرزاری و روالّەتیانەیە، گواستنەوەی بۆ مەیدانی نووسین، باوێکی ئەدەبی ناپەسەندە و هەموو میللەتان هەیانە، با ئەدەبی ئێمەش ئاوچەشمان کەمنەبێ! دەبێ ئەوەش بوترێت کە مامە شێخ زۆر هونەریانە و لەوپەڕی دەسەلاّتی رەوانبێژییەوە توانیویەتی هەجوی کاکەیی بکات. هەموو ئەو هێژایانە زەوقیان لە ئەدەبی شێخ هەیە و شیعرەکانیان کۆکردووەتەوە، وەك پارێزەرێك پەنای شێخ دەدەن و تکاشیان لە کاکەییەکان هەیە زویر و دلّگیرنەبن.(شێخ رەزای تالّەبانی ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری.د موکەرەم تالّەبانی ) تەنانەت کوڕەزای شێخ عەلی برای شێخ رەزا پۆزشی بۆ کاکەییەکان هێناوەتەوە.(دیوانی شێخ رەزای تالّەبانی- بەشی کوردی و دوو پاشکۆ ٢٠٠٣ کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شێخ محەممەدی خالّ.. سلێمانی ل١٧٩) بەندەش نامەوێ ببمە پارێزەری کاکەییەکان و هەربەڕاستیش شیعرەکەی شێخ رەزا سەرباری لایەنی بەهێزی هونەری، شارەزایی لێدەچۆڕێ لە ناسینی سومبولەکانی ئەو مەزهەبە، بەلاّم بەباری سلبی و ناهەقیکردنێکی مەزن بە نەریت و رەمزەکانی ئەو مەزەبە، هەروەها پێشموانییە تەماگرتن بۆ داوای لێبوردن لەسەر هیچ پارچەیەکی ئەدەبی داشۆرین تەمایەکی دروستبێت و هەرکەسێ تەمایەکی وەهای هەبێت لە دنیای ئەدەبیاتناسیدا دەبێتە گەمژە. دروستتر ئەوەیە عەودالّی راستەقینە بین و لە دژەکانەوە هەولّبدەین دەلاقە جوانەکان بکەینەوە یانی هەجوەکان وەك هەجو چاولێکەین و بۆگەڕان بچینە ئەودیوی وشەکان. ئەم شیعرەی شێخ رەزا لای حەمەبۆر گرفتی تێنەگەشتن وساخکردنەوەی هەیە، کە شەهید مەلاجەمیل کاری قیامەتی راسبێ هەندێکی بۆ راستکردووەتەوە(دیوانی شێخ رەزای تالّەبانی- بەشی کوردی و دوو پاشکۆ ٢٠٠٣ کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شێخ محەممەدی خالّ..





سلێمانی ل١٧٩-١٨٣) لەگەلّ ئەمانەشدا هێشتا پەیی بەهەندێ لەو شوێنانە نەبراوە کە شێخ لە ئەدەبیاتی"ماچۆ یان هەورامییەوە" وەریگرتوون وەك: بێژەکانی (وار، کولین، میرە میرە، باوە باوە،) من لێرەدا نامەوێ ساخکردنەوە و راڤە بۆ شیعرەکەی شێخ رەزا بکەم، بەلّکو دەمەوێ لەو تێڕوانینە وردبیمەوە و کە ئەو دیدەی بەرهەمهێناوە و مامەشێخیش لەوپەڕی هەجوودا تێڕوانینەکەی تەوزیفکردووەتەوە، بەبڕوای من هەمان دید و تێڕوانینە لە سەردەمی عابدیندا لە پانتایی حوجرە و هزری ئێمە و جەنگەکانی ئەو ئەندێشەیە لەگەلّ دەوروبەریدا سەریهەلّداوە. لای مەلا و زاناکان بە شێوازی خۆی و لای شێخیش بە شێوازی خۆی. هەرچەندە لە چەند شوێنێ نەفرین و جنێو و بۆهتانەکانی پێشین کتومت لای شێخ رەزادەردەکەونەوە. ئێمە دەمانەوێ لەبەرامبەر ئەو تێڕوانینەی مەلا بەڕێزەکانی شارەزووری سەردەمی "عابدین" تاسەردەمی شیعرەکەی شێخ رەزا کە دیدێکی ناپەسەند و لێلّە، تێڕوانین و دیدێکی رۆشنتر بخەینەبەردەم شەیدایانی حەقیقەت و جوانی. نوێنەری ئەو دیدە رۆشنە بۆئەم نووسینە "حەزرەتی مەولەوییە" کە پایەی زانستی و ئەدەبی جێیگومان و چەندوچوون نییە. لەنیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ئەوکاتەی "فەقێ عابدین" دەپێکرێت و تەسلیمی تەریقەتەکەی سلّتانی ساق دەبێت شەپۆلێکی نەفرین لە دژی لەلایەن مامۆستاکانیەوە بەرپادەبێت.. بێگومان هەڕەشە و جنێویشیان پێداوە کە زیاتر لە "٥٠٠"سالّ پێش شێخ رەزایە. بۆئەوەی بزانین شیعرەکەی مامەشێخیش تەنها بە "داشۆرین" بەرلێبوردن ناکەوێت و ئەو پشتەڕیشەدارە، گفتوگۆ و چەندوچونێکە لە رابردووی مەدرەسەکانی ئێمەدا. بەداخەوە مەیدانی رەخنە و لێکۆلّینەوەی لێبەرتەسککراوەتەوە و نەمانتوانیوە بیکەینە خەرمان، خۆ سەرهەلّدانی ئیخوان سەفا و موعتەزیلە و لەودورەوەش سۆفستاییەکان کە ئەو هەموو بەرهەمەی بە مێژووی بیر و کەلتوری گەلانیتر بەخشیوە لە سات و دەرکەوتەیەکی وەهادابووە. دیسان بەداخەوە لەوەی کورد لەگەلّ سەرهەلّدانەکەی "سلّتانی ساق"و تەریقەتەکەی "مەولاناخالد"دا نەیتوانی کەمێ وردتر و کراوەتر هەلّسەکەوت بکات، هەموو دەرکەوتە و دژەباوەکانی مێژووی ئێم ەخرانە بازنەی خێلّ و عەشیرە و ناوچەگەری و شاری و پێدەشت و کەناری بیرنەکردنەوە و تائێستاش نەگوازراوەنەتەوە بۆ عەقلّ و ماریفە. بۆیە لەسەر ئەوپرسە یان دەبێ بلّێین ئەو مەلا بەڕێزانە دەمپیس و جنێوفرۆش بوون؟! یان دەبێ بێژین نەخێر داشۆرینی کاکەیی و سووکایەتی بە رەمزەکانیان دیدێکی نیازدارانەیە و هەر لەسەرەتاوە لەپانتایی هزری هەندێکدا ناحالّیانە جێیگرتووە

ودژایەتیکراوە. بۆ دروست بەڕێوەچوونی ئەو بابەتەش دەبێ لە جەستەی وشەکان گەڕێین و لە تووڕەبوونی جنێوئامێز حەماسەی دژایەتی و پێداگری ئەو دوو بەرەیە دوورکەوینەوە. ئێمە دەمانەوێ ئەو دیدە بگوازینەوە بۆ نیقاشێکی نیان و "دیدەلێڵەکان" بەیارمەتی "دیدەرۆشنەکان" بڕەژین و مێژووی ئەدەب و ئەندێشەکانی کوردەواری سووکنەکەین.

مەلا ئەلیاس بەرامبەر عابدین:

سەوگەند بە خودا کاکەیی کافر و بێ دینن
دینیان حایلە پەڕپووتە چینی فەرەنگە
ئیسحاق نییە لەو عیسا نوتفەیی زۆڵە
توخمی چوار دەروێشی دگان ژەنگە

مەلا جەمیل بەرامبەرعابدین:

ئەم جادوویانە کردگەلێت کاکەیی بێدین
چونکە غەزاتکردگە لێیان تۆبە ئەڵماس

مەلاسوورەی شارەزووری بەرامبەر عابدین:

بۆ دەکەی کفری خودا و پیرانە
ئێژی کە سەهاك شای کەبیرانە

مەلاغەفوری شارەزووری بەرامبەر عابدین:

عابدین مەکە جەهدت بۆ کاکەیی دین پەستە
هەموو ریشبەڵم و سمێڵشۆڕ و ددانزەرد هەروەکو خەستە
شێتبووگی بۆ ئیسحاق بۆ جادووی ناپاك
بۆ ساحیری شەیتان بووگی چاوبەستە
ئەمە ئەمری خالقە بێدینی وەشەیتاندا
وەرە ئەم کاکەییانە شەیتانپەرستە





مەلا نەسوری شارەزووری بەرامبەر عابدین:

کەمبکە مەدحی کاکەیی پیس و دڕن
هەموو بێتەهارەت و نوێژ، بەخێڵ و دەغەڵە
دینیان بەدروستی دەرپێ و تێکەڵی بە کۆبێ
ئەمە کەی بووگە بەشەرتی دینی ئەزەڵە
وەرە مەیکە قەبووڵ ئەم دینە کە هیچە
بدە رووی ئیسحاق و داودە کەچەڵە

دواجار "مەلا شەفیعی شارەزووری" دەردەکەوێت، گەرچی ئەویش عابدین بە تابیعی شەیتان ناودەبات و داوا لە مەلاکانی هاوڕێی دەکات، بەربەرەکانێی عابدین کۆتاکەن و زەم و داشۆرینی بێسوودە و تەسلیمی مەلا ئەلیاسی خەزووری بکەن باخۆی لەناویبەرێت.

کاکە مەلاگەل بەسە ئەم داوایە کۆتاکەن
هیچ چارەنەماوە و قەتڵی فەناکەن
هەرچی زەمی کاکەییمان کرد سوودی نەبوو
عاری نییە؟! کە ئێوە بەحس و خەتاکەن
دارێ کە لە ریشە دەرچوو نایێتە جێیخۆی
کەڵکی نەماوە بە حەدیس کەم زاروزناکەن

بۆ خوێندنەوەی تەواوی تێکستەکان بڕوانە(مێژووی وێژەی کوردی بەرگی ١ چاپی دووەم ٢٠٠٨ ل٣٦٠-٣٧٤)

عەبدولاَحەسەن بەرامبەر بە کاکەییەك:

- ئەیوهالحیمار ...

ئەی بەنی نەسیر ئەیوهالحیمار
ئیخلاسی بارگەی "باوەیادگار"
کوانێ موچەبەش باوەیادگاری
شەیتان شەرمەندەن نەکەرد وەکاری

بڕوانە(کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ب٢ل١٩٣-٢١٣)

سەرچاوەکان "عەبدوللاّحەسەن"یان بە هاوڕێ و هاودەمی مەولەوی ناساندووە. دەشێ قسەیێکی لێبکەین. ئەویش لەوڕووەوە کە ناوبراو دەکەوێتە بازنەی سەرمەستی خانەقاکانی تەوێڵە و نزیکبووە لە شەوقی ئیرشادی ئەو هێژایانە. ئەم زاتەی کە پیسترین زمان بەرامبەر"یارسان و پیرۆزییەکانیان" دەخاتەگەڕ و لە جنێودانەکانی بە کەسێکی هاواری بازدەداتەسەر زۆر کەسیتر کە یەکێکیان "باوەیادگار"ی ئێرەیە کە مەولەوی بەپێچەوانەوە ستایشی دەکات. لە یەکێ لە شیعرە جنێوییەکانیدا "مورشدی کاملّی تەوێڵە" دەکاتە دەسەبرا بۆ جنێودانەکانی بەرامبەر بە کاکەی هاواری.

مرشدی کاملّ پیری تەوێڵە

دەیفەرموو"مچە"دینەکەت فێڵە

(کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ب٢ل٢٠٦)

ئێمەدەمانەوێ بڵێین: چۆن لە یەك مەیخانەی عیشق و خۆشەویستیدا دووکەس پەروەردەدەبن "مەولەوی و عەبوللاّ حەسەن" هەردوکیان پێکراوی "سراج و بەهابن" سەبارەت بە پیرۆزی و عاریفەکانی سەر ڕێگەی یار، دوودیدی دژیان دەبێت. ئەی مرشد کە دەستی بەسەر زمان و دڵ و جیهانی مریدەکانیدا ڕۆشتووە، چۆن "عەبدوڵلاّ" ئەم درۆیەی بەدەمەوە دەکات؟! یان دەبێ ئەویش هاوڕای "عەبوڵلاّ" بوویێت و بەو تێڕوانینە رازیبوویێت؟ ئەم رایەش لاوازدێتە پێشچاو، چوونکە دیدی مەولەوی دەبێتە تاشی (بەردی زۆر گەورە) بەردەمی و لە دژیا دەوەستێت!

ئەم تێڕوانینەی شێخ گەر راستە، چۆن نەبووەتە دیدی ئەو و نەگوازراوەتەوە بۆ کەسانی زانای چوون مەولەوی کە زمانحاڵیان بووە و شاسراج لە وەسیتنامەکەیدا بەڕززان و مەحرەم ناویدەبات. تائەم تێڕوانین و دەرکەوتنەش وەك رەچە و بۆچوونە کەلامییەکانیتر لە بەرهەمە زانستییەکانیدا جێبکاتەوە و لەوانیتر جوانتر و زانستییانەتر موناقەشەی بکات؟ بۆیە دەبێ جنێوەکانی ئەمیش پەیوەندی و شەڕی نێوان دووکەس بێت لەباری نائاسییدا. ئەوەی کە ئەو کردوویەتییە پشت بۆ جنێوەکانی راست نییە و چەنین کەسی چوون مەولەوی شایەتی پاکێتی ئەو زاتەن. شیعرەکەی مەولەوی لەبەردەستە و رەنگە مەولەوی لە هوشیارییەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بۆچوونانەی دەوروبەری لەبری چەلەحانێ و شاتەشاتکردن، ئەم شیعرەی بە یادگاری بۆ ئێمە بەجێهێشتبێ.





شیعرەکەی مەولەوی

١. سەرشار سەهبای بەزم موناجات

سەرمەستی بادەی بەزمی موناجات

مەلجەی ئیلتیجای ئەرباب حاجات

پەناگای پەنای ئەربابی حاجات

سەرشار و پڕ و مەستی خوماری بەزمی موناجاتی، پەناگە و پەسیوی خاوەن پێداویستییەکان و ئەوانەی رووتلێدەنێن. جەنابی مودەڕیس نووسیویەتی لەسەر مەزاری باوەیادگار نووسراوە. باوەیادگار یەکێکە لە ئیمامزادەکان.(دیوان ل٣٠٨) ئێمەش پێشتر ئەم شیعرەمان لەپاڵ چەند بەڵگەیەکیتردا، کردە دەلیلی ئاگاداری مەولەوی لە پاشخانی ئەدەبیاتی نووسراوی هەورامی و زەخیرەی ئاییینی یارسان.(گۆڤاری هەورامان ژمارە ١١سالی ٢٠٠٨ل١٤٧-١٥٢)

٢. جای رجای جەرگەی پادشا و دەروێش

جێی تکای جەرگەی پادشاودەروێش

بارەگا و پەناپەی بێگانە و خوێش

بارەگا و پەنای بۆ بێگانە و خوێش

ئەی کەماڵت جێی تکایە بۆ پادشا و دەروێشان و وەی بارەگات پەنا و پەسیوە بۆ داڵدەدانی خزم و بێگانان! کەسێ خاوەنی ئەو پلە مەعنەوییە بێت دەشێ مرۆڤ دەخیلی بێت و تکای بەرێتەلا.

٣. ئاهووی خووتەنی فەیز ئیلاهی

ئاسکی خوتەنی فەڕی ئیلاهی

نافەی ناف راهی جەمەهـ تا ماهی

ناوبانگی بۆنت لە ماهـ تا ماهی

تۆ ئاسکی خوتەنی لە فەیزی ئیلاهی دەخۆیت و خودی ژیان بۆنی میسکی ناوکتە. واتە تۆ کە سەرت لە ئاسمانە لای مانگ و پێت لە دەریایە لای ماسی. واتە سەرت لە ئاسمان و پێت لە دەریایە، سەرزەوی دەکاتە بۆنی خۆشی ناوکت چوون سەرزەوی دەبێتە نیوەی ڕێ. (ناوەڕاستی بەژن و بالاٚ) بەنزیکی (ناوك) دەکەوێتە ناوەڕاستی بەشی لای سەروخواری بنیادەمەوە. بەگوێرەی ماه تا ماهی دەبێتە نیوەی ڕێ. تەنانەت لەباری ڕەوانبێژیدا ئەم وەسفە گوازراوەتەوە بۆ زمانە میللییەکە و زۆرجار لە وەسفی جوانادا دەوترێت پێی لە ئەرزە و سەری لە ئاسمان، بۆ حۆریانی بەهەشتیش هەروا دەوترێت. مامۆستا حەکیمیش بەمشێوەیە ڕاڤەی دیوانەکە ڕاستدەکاتەوە: ئەی ئاسکی خوتەنی بەرەکەتی خودایی کە بۆنی میشکی ناوکت لە ئاسمانەوە تابنی زەوی ڕۆشتووە.(مەولەوی و تەقینەوەی زمان ل١١١)

٤. شکۆفەی وەشبۆی ڕەیحانەی ڕەسوول
شکۆفەی خۆشبۆی ڕێحانەی ڕەسوول
نەوباوەی نەمام تیبەی بەتوول
نەوباوەی نەمام پاکیزەی بەتوول

قوتولەی بۆنخۆشی ڕێحانەی ڕەسولی و شاتی جوان و تازە و تەڕی نەمامی پاکی فاتیمەی. بەمپێیە مەولەوی یادگار دەبەسێتەوە بە درەختی حەزرەتی عەلی و فاییمەوە کە یادگاری بەجێماون لە باخچەی پێغەمبەر. مەولەوی یادگار بە حەزرەتی حوسەین وەسفدەکات و لە عەقیدەی مەرزییەشدا ڕۆحی حوسەین دەکاتە فریادڕەس و ئیسماعیل و پێغەمبەرایەتی پێدەپارێزێت. هەرئەم دیدەش لەبەردەم هزری دۆنادۆندا ڕاماندەگرێت. واتە ئەو قۆچەی کە خوا ناردی بۆ ئیبراهیم لە بەدەلی سەربڕین لەجێی ئیسماعیل. لەبرئەوەی عەقیدەکە بە زمانی سۆرانییە لەسەری ناڕۆین بۆ زیاتر تێگەشتن خوێنەر دەتوانێ ڕاڤەکەی عەللامە مودەڕیس بۆ عەقیدەی مەرزییە بخوێنێتەوە.

ڕۆحی حوسەین هات فەرموی های خەلیل
من بەدەل نەیکەی وەختی خۆی دەخیل





چون نیسبەت بە فەزل مەعریفەی ئەو زات
دەدوت بەدەل بۆی نەکیرەی لێهات
(قل واصفا حضرة العليم:
"وفديناه بذبح عظيم"
پەز ئەرچی چەرای ڕەوزەی نەعیم بێ
دەشێ بۆچ لایق وەسفی عەزیم بێ
ئەڵبەت ئەو زەبحە حوسەین بوو ، ڕاسە
ئەصفیا هەرچی دەفەرمون واسە
(عەقیدەی مەرزییە ل ٥١٦)

جێی سەرنج و تێڕامانە ئەم بۆچوونەی مەولەوی لە وەسف و شەهیدبوونی حوسەیندا فەرموویەتی، لە سەربڕینی ڕەوانشاد دەروێش "حەبیب"ی کاکەییدا دەردەکەوێتەوە. دەڵێن قەسابەکەی وتویەتی کاوڕم سەربڕیوە! ئەم شوناسەش بۆ دەرکەوتەی ئەو ڕۆحە هابیلییە ڕاستدێتەوە کە لەگەڵ هەر دەرکەوتەیەکیدا شەهیدبوون چارەیەتی. لەبەر ڕۆشنایی خانەدانی "حەزرەتی عەلی"یشدا دەتوانین بڵێین: دایکی حوسەین کە دەکاتە حەزرەتی فاتیمەم پاکە و بێخوێن (بێنوێژ نابێت و ناکەوێتە حەیز) هەم بە ناوەکەیدا دیارە ئاگری دۆزەخی لێدوورە و ئەم پارێزراوە لەو گڕە. کەواتە سارا یان شارا خاتوونی دایکی یادگاریش بە وێنەی مریەم پاکە و لە بوهتانەکان دوورە، یادگارەکەشی لە تەنوری گڕدا نەسووتا و ناسووتێت.

٥. سەرو سایەدار نیشاندەی وەلی
سەروی پڕسایەی دەسنێژی وەلی
یەعنی یادگار(مورتزا عەلی)
واتە یادگاری پڕشکۆی عەلی

سەروی سێبەرداری، دەسنەمامی دۆستی، واتە تۆ یادگاری نێژراوی عەلیت. لە تۆدا ئەومانبیردەکەوێتەوە، یادگار دەبێتە بیرخەرەوەی ئیمامی عەلی یان یادگاری خاوێن و جوان و بەناز لە عەلی بەجێماوە و دەسەنەمامی ئەو نازدارەیە. مەولەوی لە پەسن و مەدحی عەلیدا لە

مەرزییەدا دەفەرموێ:

ئەگەر مەدحیبکەم مەدحی خۆمەفاش
نوری ئەو لەکوێ و بینایی خەففاش

یانی نووری ئەو لەکوێ بە بینایی منی شەمشەمەکوێرە وەسفدەکرێ؟ بۆیە دەلیل لە قورئان و پەسنی حەزرەت و یارانیتر دەکاتە مەدح بۆ پایەی حەزرەتی عەلی.. بۆیە خۆشەویستی حەزرەتی عەلی لای سەرجەم مەزهەب و بزووتنەوە و رەچە عیرفانی و تەنانەت هەولەکانی تەریقەتەکانیتریش کە لە ئیسلام هەندێ دابڕانیان هەیە، دەگەڕێتەوە بۆئەو پێگە دینییەی عەلی کە لای سەرجەمیان هاوبەشە. واتە عەلی مۆمی پەروانەی رەچەکانە. لای هەموویان عەلی بەوجۆرەی کە مەولەوی دەیناسێنێ ئەستێرەی بورجی سیفەتە جەمالییەکان و شێری بێشەی سیفەتە جەلالییەکانی خودایە.

کەوکەبی بروج ئەوسافی جەمال
ئەسەدی بێشەی نعوتی جەلال

تەنانەت دەڵێن: کەس بێڕپێپێدانی عەلی لە "سیرات" ناپەڕێتەوە و ئەو لە رۆژی خۆیا ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ لێکجیادەکاتەوە.(مەرزییە ل٥٠٤) ئەم دید و پەیلوایە (بۆچوون) لە بەرهەمی عاریفانی یارسان و موسڵمانانی سونی مەزهەب و شیعە مەزهەب و تەواوی تەریقەتەکانیتری کوردستاندا هەیە. ئەم سەیر و بینینەش بۆ عەلی پەیوەندی نییە بەودەرکەوتە و کەسیتییە مێژووییەی کە شیعەکان لێیدەڕوانن، بەڵکو یەکەمین شێوە و روخسارشیرینی مرۆڤەکە بەناوی ئادەمەوە بەئیزنی خوا کەوتووەتە جووڵە. لەسەرئەنجامدا هاتووە: بنیامین مەرەمۆ:

موسا وەقەڵەم..
موسا بکێشۆ نەقش یار وەقەڵەم
سورەت وێنەی عەین، لام و یا وەهەم





(ع، ل، ی=علی)
ئاب و خاك و باد جیهان مەوۆجەم
وەئیقرار حەق مەیل ساحیب کەرەم
مەدرۆشۆ جەسە دڕاس مەوۆئادەم
(سەرئەنجام، تەیب تاهیری، ل ٣٣٥)

هەر لەبەرئەوەشە مەعدوم و یادگار و تەواوی هێژایانیتر با لەڕواڵەتا لە هەواری جیای ئایین و رەچەکاندابن، ئەوە لەناخەوە دەچنەوەسەر سەرچاوەکەی خۆشەویستی و یەکبوون.

٦. وەڕەوزەتانا هەر نور واران بۆ
بەسەر مەزارتا هەر نوربارانبێ
تادەفع زوڵمەت دیدەی یاران بۆ
زوڵمەترەوێنی دیدەی یارانبێ

بەسەر باخچەی مەزارتانا هەر نوربارانبێ، بەڵکو لابەری تاریکایی دیدەی یارانبێت . نور بەسەر مەزارتا بباریێ، بەڵکو تاریکایی چاوی یاران (منیش وەك یاریێ) لابەرێت. جەنابی مودەڕیس نووسیویەتی وادەردەکەوێ لە سەردەمی کوێریدا ئەم شیعرەی نووسیبێت.(دیوان ل ٣٠٩)

٧. هەوای سایەتان هەر مەمدوم مانۆ
شنەی سێبەرتان مەودای بمێنێ
سەبوون بوردەی جورم نەك زەرەر سانۆ
گڕبردەی تاوان نەك زەرەربێنێ

هەوای فێنك و سایە و سێبەرتان یاخوا هەر بەرفراوانبێت، باجێی ئەوانە بێتەوە کە

سەبوون و گرەی گوناه لێیداون سایەفراوان بۆ ئەوانەی گرەی گوناه بردوونی. ئێمەی یاران گوناهبارین و سەبوون و گرەی گوناه لێیداوین، سێبەری ئێوە نەبێت گرەی ئەو گوناه و سەبوونی تاوانانە لە گۆمان دەخەن و دەمانپرووکێنن. ئێوەن تکامان بۆئەکەن و ئەمانخەنەبەر سێبەرتان، لەسای ئێوەیە زەرەرناکەین.

٨. ناپوختەکاری و شەرمەساری من
ناپوختەکاری و شەرمەزاری من
خەجلەت غەفلەت گوناه کاری من
رووزەردی و غەفلەت گوناهباری من

کاری گەن و پیس و شەرمەزاری من، خەجاڵەت و رووزەردی و بێئاگایی من یان منی شەرمەزاری کاری گەنوپیسکردوو، خەجاڵەت و رووزەرد و شەرمەزاری بێئاگاییم یانی ئەم هەموو کارە ناپوختانە کەڵەکەبوون لەسەرم و زۆریان بۆهێناوم.

٩. کەفتەن وەهەمدا یەند زۆر ئاوەردەن
کەوتووەتە سەریەك نیمە دەرەتان
رووی رجام وەپای بارەگات کەردەن
روی تکام هێنا بۆ بارەگاتان

کارەگەنەکانم بەسەر یەکاکەوتوون و ئەوەنە زۆریان بۆهێناوم هەڵەداوان رووی تکا و لاڵەم بۆ بارەگای تۆ هێناوە وەرگێڕانەکەی لای پیرەمێرد بەمجۆرەیە:

سەریەك کەوتووە بەدکاریم وەك کۆ
رووی هیوام کردە بارەگاکەی تۆ

١٠. تۆ چوون جە ئەولاد ئەمجاد مەولای
تۆ چوون زنجیرەی شێری یەزدانی
پەی رجا وەجا پەی هیممەت ئەولای





بۆ تکا و هیمەت بەجێ و شایانی

تۆ چوون لە نەوەی خاوەنشکۆیانی مەولایت، ئەوە بۆ رجا و تکا و لالانەوە شایانی پەنا بۆ هاوردنی و کەسیتر لەولاتەوە نییە، ئەو ناز و رەواجەی تۆ هەتە، کێیتر هەیەتی؟! تۆ کە لەئەولادە شەریف و بەرێز و شکۆکانی مەولای، ئەوە بۆ تکا و رجا بەجێیت و بتەوێ هیمەت و ئیرادەی تکا بگریتەدەست کەس لە تۆ شایان و شیاوتر نییە و تۆ لەهەمووان لەپێشتر و ئەولاتری و سەرپەرت گرتوە.. لە سروودەکەی یارساندا هاتووە کە خوا رەواجی بەو ناز و نازدارییەی یادگار داوە. پیرەمێرد (بەجا)ی بە وەسفی (رجا) هێناوە و بەمجۆرە وەریگێڕاوە:

چونکە تۆ نەوەی شیفاعەتکاری
بۆ رجای بەجا دەستەلاتداری

١١. زاری و زگاری و زوێری کەردم
زاری و زەبوونی شێلای حەیاتم
وەبارگەی پاکت پەنائاوردم
بەرەو رووی پاکی بارگەکەت هاتم

کز وکەنەفت و دڵ بەخەم، دڵپڕ و زویر و گرەوەگڵ، پەنامهێنایە بارەگای پاکت یان کەسەر و کەنەفت و پیری و خەم عاجز و دڵتەنگی کردووم، بەم عاجزییەوە هاتمە بارەگات.

١٢. ئامام سەرنیام وەبارەگاوە
هاتم وسەرم نابەوبارەگاوە
غەریو، موو سفید، وەرووی سیاوە
مووسپی، غەریب، بەرووی سیاوە

تێگەشتن لەم بەیتە هێندەی ناوێ و تەرجەمەکەی بەسە، ئەوەندە گرنگە بزانیین: کە غەریب، مووسپی، رووڕەشی. ئەو سێ مەرجەن کە شمولی بەزەیی دەکەن و ئەوەی ئەو سێ

مەرجەی هەبێت قابیلی تکابۆکردن و تەشەبوزبۆکردنە. تەنانەت ئەوەش دەوترێت کە پێغەمبەران لەودنیا زیاتر بۆ سوککردنی باری گرانی گوناهبارەکان لەکرد و کۆشان. چوون خاوەن پێداویستی و خەجاڵەتبار و گەنەکاران زیاتر پێویستیان بەتکا و رجا و لێخۆشبوونە.

١٣. تەن مەعسییەتبار دەروون پڕ جەدەرد
تەن پڕگوناه و دەروون پڕ لەدەرد
دیدە تەڕ، لەب خوشك، دڵ گەرم، نەفەس سەرد
دڵ گەرم و تینوو چاوتەڕ، نەفەس سەرد

لاشە بارگران و قورس بەگوناهەوە و دەروون پڕ لەدەردەوە، چاوتەڕ و فرمێسکاوی و لێو بەبار و وشك و هەناسەسارد، بەلاّم دڵگەرم دڵگەرمی تەما و ئومێدێکە بەدەس لەخۆنەشۆردن و هیوابەرنەدان و دەسمایەی روونانە، هەرئەوەشە مرۆڤ تا ئەوکاتەی دڵی زەرەیەك لە گەرمی و شەوقی تیابمێنیّ، هەر بە هیوای لێخۆشبوونە. چوون تۆسقاڵیّ ئیمان لەتوانایدا هەیە دڵ لەبەردبوون بپارێزیّ.

١٤. های چەند پلەی سەخت هانەڕێمەدا
های چەن پلەی سەخت وا لەسەرڕێما
جەڕووی ئیلتیفات بدیەپێمەدا
لەڕووی ئیلتیفات بڕوانەپێما

های لەکوێمە هێشتا چەند پلەی سەخت وا لەڕێما، لاییّبکەرەوە و بڕوانەپێما. رێگە زۆری ماوە و منیش تواناکانی بڕینی رێم لەدەستداوە، ئەو بارەگران و قورسەی سەرشانم بۆ ناچێبەڕێوە، گەر تۆ سەیرمنەکەیت و هەوڵی سووکی بارەکەم یان توانابەخشینم بۆ دەسەبەرنەکەیت.

١٥. بەڵکم جەڕووی ئەو ئیلتیفاتەوە
بەڵکو لەڕووی ئەو ئیلتیفاتەوە
مەولام حازر بۆ وەنەجاتەوە





مەولام حازربیّ بەنەجاتەوە

بەڵکو بەولاکردنەوەی تۆ مەولام ئامادەبێت بۆ نەجاتدان و رزگارییم. تۆ لە نەوەی مەولای گەر چاوێکت لێمانبێت، مەولا بۆ رزگاربوونم ئامادەدەبێت. واتە دەستی عەلی دێتەمەیدان.

١٦. دەس شای مەردان مەدەدکارم بۆ
دەستی شای مەردان مەدەدکارم بیّ
پلەئەوپلە، ئەو دەسوارم بۆ
پلەبەپلە، ئەو دەسبارم بیّ

دەستی شای مەردان (حەزرەتی عەلی) دەبێتە دەستی یارمەتی و پلەبەپلە دەسبارێکم دەدات. "دەسوار- دەسبار" ئەوکاتەی بار بەهۆی قورسییەوە لاسەنگدەبێت و بارەبەر ناتوانێت بیبابەڕێوە، دەسی دەدرێتە ژێر و راستدەکرێتەوە و بەو یارمەتییە بارەبەر بارەکەی بۆدەچێت بەڕێوە. هەر بەنە (کەسیّ بەدوای کەرەوەبێت) ولاّخدارەکان چەندینجار دەسدەدەنە باری ولاّخەکانیان تاسەر هەوار. مەولەوی زۆر لە عادەتی ولاّخدار و بارەبەرەکان کەڵکیوەرگرتووە بۆ تەیکردن و بڕینی رێگە بەو هەموو باری گوناهەوە.

١٧. مەعسییەت نیەن چوون هیچ سەدمەتیّ
گوناه قەد نییە وەك هیچ سەدمەتیّ
خەیلیّ مەلوولم یاپیر هیممەتیّ
گەلیّ زەبوونم یاپیر هیممەتیّ

هیچ بارێك گران و قورس نییە وەك مەعسییەتباری، مەینەت و زەحمەتی هیچ باریّ وەك باری گوناه قورس نییە و هیچ باریّ ئەو زەحمەت و تەحەمولکردنەی پێویست نییە، لەبەرئەوە زۆر پەشێوم یاپیر هیممەتیّ! هەوڵ و تێکۆشانێکم بۆبکە ئەی پیر هیمەتکە یارمتیمبدە. ئەو هیممەتەی کە دەرباز و رزگارمبکات.

١٨. هیممەتت بایس ڕستگاری بۆ
هیممەتت باهۆی رستگاریبێ
یار بۆ دیار بۆ یادگاری بۆ
یار بێدیار بێیادگاری بێ

هیمەتت بێتەبایس و هۆی رزگاریم، بەوەی مەولا ئامادەبێت و بێتەیارم، یاری دەسباردەر و یارمەتیدەرم، هیمەتەکەت گەورە و دیاربێت، خۆت ئاساییبێت. بینیمان سەرەتا و کۆتای شیعرەکەی مەولەوی و سروودەکەی باوەیادگاری یارسان بە دوای یەك ئامانجەوەن و زمانی گوزارشت و وەسفەکان لەیەکنزیکن، جیاوازییێکیان گەر هەبێ ئەوەیە کە شیعرەکەی مەولەوی بەهێز و زیاترە.

لە کۆتاییدا بە هیوام ئەم نووسینە کرچوکاڵە چاوی حەقیقەتبینی بڕەژێت و جوانتر و دروستتر بڕوانینە ئەدەبیاتی نووسراوی کوردی، خوا ئاگادارە ئێمە هیچ کات لەم باسانە نیازی خراپمان بەرامبەر هیچ تاك و گرۆیەکی نێوئەندێشەی ئاییني و تەریقەت و بڕواکانی کوردەوارییەوە نییە، خوای گەورە لە هەڵەی مردووان و من و ئێوەش ببووڕێت و هەموو ئەوانە ببەخشێت ناویان لەم نووسینەدا هاتووە.

***





**سەرچاوەکان**

**١.** یارسان، ئەیوب رۆستەم
٢. تاریخ مردوخ، جلد دوم

٣. چەمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، سەیید عەبدولسەمەدی توودا‌ری، محەممەدی مەلا کەریم
٤. مێژووی وێژەی کوردی

٥. سەرئەنجام - تەیب تاهیری
٦. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ئومێد کاکەڕەش، ٢٠٠٥، چ٢

٧. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، بەشی کوردی و دوو پاشکۆ،٢٠٠٠، کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شێخ محەممەدی خاڵ، سلێمانی
٨. شێخ رەزای تاڵەبانی ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری، د موکەڕەم تاڵەبانی

٩. کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب٢
١٠. دیوانی مەولەوی، مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس

١١. وەرگێڕاوی مەولەوی بۆ سۆرانی- پیرەمێرد
١٢. دیوانی مەولەوی بۆ سۆرانی، وەرگێڕاوی محەممەدئەمین ئەردەلانی

١٣. شەریعەتی مەیل، ٢٠١٠، سلێمانی
١٤. شەریعەتی مەیل، بەرگی دووەم و سێیەم چاپنەکراوە- دەسنووس

# ئاوڕێك له دیوه شاردراوەکەی شێخ ڕەزا

## خوێندنەوەی غەزەلێك

ع. قەرەداغی

لەنێو کۆمەڵی ئێمەدا و پێدەچێ لە سەرتاسەری ڕۆژهەلاتیشدا هەروابێت، نێوبانگ (شوهرەت) پتر لەنێوەڕۆك کاری لەسەردەکرێت و کاردەگاتە ئەوەی ماهییەتی شتەکان بەتەواوی بزربن. هێندەی پەیوەندیی بە"شێخ ڕەزا"وە هەیە، دەتوانین بەدڵنیاییەوە جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە لە دوو ئاستی جیاوازدا بە دوو شێوەی جیاواز دەناسرێت: لەنێو سەرجەمی خەڵکدا بە شاعیری"شەڕەجنێو" ناسراوە و شیعرەکانیشی بە"جنێونامە" لەقەڵەمدەدرێت، هەڵبەتە ئاستە بەرزەکەی ئەو هەجوەش بەتەواوی فەرامۆشدەکرێت. لەنێو ئەو کەسانەشدا کە تاڕادەیەك ئاشنا و خوێنەری شیعری شێخ ڕەزان، ئەگەرچی ئەو بۆچوونە باوە کە شاعیری هەجوە و هەجوەکانیشی ئاستێکی هونەریی بەرزیان هەیە، بەلاّم بەتەواوی ئەو ڕاستییە فەرامۆشدەکرێت کە شێخ ڕەزا هەم شیعری زۆر بەرزیدیکەی هەیە، لەوانەش غەزەلەکانی و هەم ئاستی شیعرە جیدییەکانیشی، بە هەر چوار زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی، بەرزە و شایانی ئەوەیە ئاوڕێکی هەمەلایەنەی لێبدرێتەوە. ئەو ئاوڕدانەوەیە تەنانەت ئەگەر لە شیعرە جیدییەکانی یەکێك لەو زمانانەش بێت، لە دەرەوەی بوار و توانای ئەم بابەتەیە، بۆیە لێرەدا تەنها هەوڵی ئەوە دەدرێت کە لە ڕێگەی خوێندنەوەی تەنها یەك غەزەلی کوردیی شاعیرەوە ئەو ڕاستییە بسەلمێنرێت کە شێخ ڕەزا بە هەموو پێوەرێك شاعیرێکی بەرزە و ئەمەش بکرێتە دەروازەی کۆششێکی هەمەلایەنەی ئاوڕدانەوە لەو لایەنەی شیعرەکانی شاعیر و لێکۆڵینەوەیان بەپێی پێوەرە زانستییەکان.

**ئەو غەزەلەی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژێردراوە ئەمەیە:**





ڕۆژێ نەبوو ئەم دلبەرە بێڕەحمە وەفاکا
جارێ نەبوو ئەم کافرە شەرمێ لە خوداکا
حەیرانن ئەتیببا لە عیلاجی مەرەزی دڵ
لوقمانی ویسالت مەگەر ئەم دەردە دەواکا
کارێ کە خەم و دەردی فیراقت بە منی کرد
سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا
دێوانەیە کە بە غەیری لەبی لەعلی
وەك شاهی سکەندەر تەڵەبی ئاوی بەقاکا
تاب و تەبی ئاتەشکەدەیی هیجری وەکو شەمع
نەزدیکە منیش واریدی سەحرایی فەناکا
لەم ڕێگەیە، تەقدیری ئەزەل وا بوو کە ئێمە
پامالّی جەفا بین و، ڕەقیب سەیر و سەفاکا
ڕوح و دڵ و دین، هەر سێ دەکەم بەزل و نیساری
کامی دڵی من گەر لە لەبی لەعلی ڕەواکا
سەردانی لە ڕێی عیشق (ڕەزا) لازمە عاشق
بۆ یار، سەروماڵی سپەری تیری قەزاکا

ئەم غەزەلە، بەگشتی، کۆمەڵێك خەسڵەتی جیاوازی هەیە کە بە شایستەییەوە دەیپاڵێون بۆئەوەی بە یەکێك لە غەزەلە جوان و سەرکەوتووە کوردییەکان و سەرەڕای ئەوەی هەموو خەسڵەتە بەرزەکانی غەزەلی کلاسیکیی کوردیی تێدایە، بەلاّم وەکو پاشتر ڕووندەبێتەوە، دەتوانرێ چەند خەسڵەتێکیدیکەشی تێدا بەدیبکرێ کە بە هەموو پێوەرێك تازەن و بەداخەوە ڕەخنەگرانی کورد ئاوڕیان لێنەداوەتەوە.

یەکەمین دوو بەیتی ئەم غەزەلە، بەوپێیەی دەروازە و پێشەکیی غەزەلەکەن، ئاساین – واتە لەڕووی شێوە و ناوەڕۆکەوە پەیڕەوی لە هەموو بنەما سەرەکییەکانی غەزەلی کوردیی تێداکراوە –، بۆیە تەنانەت مانا ئاساییەکانی غەزەلی تێدا بە شێوازە ئاساییەکەی

دووپاتکراوەتەوە. سەرەڕای ئەوەی لە یەکەمین بەیتدا سکالاَ لە"بێوەفایی"ی یار کراوە، بەلاّم لە دووەمین بەیتدا راشکاوانە جەخت لەسەر ئەو راستییە دەکاتەوە کە وێڕای ئەوەی ئەو بارە تایبەتەی بووەتە مایەی "نەخۆشیی دڵ"، بەلاّم ئەو نەخۆشییە دوکتۆرەکانی سەرسامکردووە و تەنها "لوقمانی ویسالت مەگەر ئەم دەردە دەواکا - مەگەر لوقمانی بەیەکگەیشتن و ژوانی تۆ ئەم دەردەی من چارەبکات". مەبەست لە لوقمان/یش لوقمانی حەکیم/ە، کە لە قورئانی پیرۆزدا سوورەتێك بەناویەوە هەیە - سوورەتی ژمارە ٣١ - کە تەنها ئاماژە بۆ ئامۆژگارییەکانی بۆ کوڕەکەی دەکات و لە لێکدانەوەکانیشدا پتر بە "پیاو چاك - صالح" دانراوە، نە پێغەمبەر و نە دوکتۆریش[١]، کەواتە بە دوکتۆر دانانی "لوقمان" لەلایەن شاعیرەوە رەنگدانەوەی بۆچوونە باوەکەی نێو خەڵقییە کە جاران بە پزیشك دەگوترا "حەکیم"و تائێستاش لێرەو ئەوێی ولاّتی شامدا ئەو وشەیە بەو مەعنایە بەکاردەهێنرێ.

وێڕای ئاساییبوونی ئەو دوو بەیتە، بەلاّم لە مرۆڤاندن" أنسنە"ی "ویساڵ - واتە دیدار و ژوان و پێکگەیشتن" کە کراوە بە پزیشکی چارەسەرکردنی نەخۆشیی دڵ، جۆرە دینامیکییەتێکی نائاسایی - لەڕووی شێوەوە - بەدیدەکرێت، ئەگەرچی لەڕووی ناوەڕۆکەوە دووبارە بوونەوەی هەمان مەبەستی سۆفییانەی بوونی مەعشووق بە هۆی دەردەداربوون و هۆی چارەکردنی عاشق بەدیدەکرێت.

لە سێیەمین بەیتدا ئاراستەکە راستەوخۆ و بە گۆشەیەکی کراوە دەگۆڕێت و لە رێگەی دوو وێنەی دینامیکیی ئاوێزانی یەکدی و بەتەواوی تازەوە هەلومەرجی تایبەتی خۆی بە دەست دووریی یارەوە دەخاتەڕوو:

" کارێ کە غەم و دەردی فیراقی بە منی کرد
سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا [٢]".

ئەم گواستنەوە راستەوخۆیە بەسوودوەرگرتن لە دیمەنە کاریگەر و زەق و بەرجەستەکانی ژیان، جگەلەوەی یارمەتیی ئەرکی تازەکردنەوەی"وێنە"و خودی چەمکی غەزەلیش دەدات، بە شێوەیەکی بەرچاو مەبەستەکەش کە کاریگەریی کوشندەی دووریی یارە، بەرجەستەتر دەکات. دەلالەتی هەردوو وێنەی" کاریگەریی سەرما بەسەر هەتیو - کە توانای کڕینی جلوبەرگی باشی





نییە بۆ خۆپاراستنی لە سەرما نییە"و " کاریگەریی با - بەتایبەت رەشەبا - بەسەر دەواری شڕەوە کە مەرجەکانی خۆڕاگرتنی بەرانبەر بە بای ئاسایی/شی نییە"، ئەگەرچی بە رواڵەت زۆر ئاشکرایە و پێویستی بە روونکردنەوە نییە، بەلاّم لە پەناوە ئاماژەیەکی زۆر بەهێزی تێدابەدیدەکرێت بۆئەوەی چیدی شاعیر توانای بەرگەگرتنی شەپۆلە بچووکەکانی خۆشەویستیی نییە، چ جای ئەوەی بکەوێتە بەر شەپۆلە توند و بێبەزەییەکانی دەریای بێپایان و نائارامی دووری و جودایی لە یار.

ئەگەرچی دەکرێ لای"نالی"، بۆنموونە، ئاوڕدانەوە لە"بێبەرگی/ی هەتیو" لەم بەیتەدا بەدیدەکرێ:

هەرچەندە کە رووتم، بە خودا مائیلی رووتم
بێبەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە
"دیوانی نالی ٢٣ هـ ٤/ ٥٣٤"

بەلاّم ئەگەر دووەمین بەشی ئەو بەیتە"عەجزەکەی" بەتەنێ وەربگرین ئەوا تەنها رووبەڕووی هۆبینی" تعلیل"ێکی رووکردنی هەتیو لە هەتاو -خۆر- بەدیدەکەین، واتە شاعیر گوتوویەتی"ئارەزووکردنی هەتاو لەلایەن هەتیوەوە بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە بێبەرگە"، بەلاّم ئەوە خامەی هونەرمەندانەی"نالی"یە کە" رووتیی خۆی"و "روو"ی وەکو هەتاو گەشاوە و تینی چاوهەڵپڕووکێنی یاری کردووەتە مایەی ئەوەی لێچواندنێکی زیهنیی دڵگیر لەنێوان حاڵەتی خۆی و بێبەرگیی هەتاو بەرپابکات و وەکو مامۆستایانی لێکدەرەوەی دیوانیش ئاماژەیان بۆ کردووە"لە هێنانەوەی نیوەبەیتی دووهەمدا بەدوای نیوەبەیتی یەکەمدا حوسنی تەعلیل هەیە، پەراوێزی ژمارە ٤ی لاپەڕە ٥٣٤ی دیوانی نالی".

لە سەرجەمی ئەم غەزەلەدا ئەمە تاقەبەیتە ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە ئاماژەی بۆکرا، واتە تازەگەری لە شێوازی چارەسەرکردنی مەسەلەی هاوتایی هونەرمەندانەی پەیوەندیی شێوە و ناوەڕۆك، بەلاّم وێڕای هاوشێوەیی بەیتەکانیدیکە لە خەسڵەتە گشتییەکانیاندا لەگەڵ غەزەلەکانی شاعیرانی پێش شێخ رەزا و شاعیرانی هاوچەرخی، هەمیشە دەتوانرێ جێپەنجەی تایبەتی شێخ رەزا بەدیبکرێت، یەکێکیش لەو تایبەتمەندییانە شێوازی تایبەتی شاعیرە لە ئاماژەکردن بۆ

کەسایەتی و شوێن و چەمك و رووداوە مێژووییەکان کە پڕبەپێستی وشەکە دەکرێ ناوی"ئاماژەی شێخ رەزایانە"[٣]ی لێبنرێ، بۆنموونەش لە چوارەمین بەیتدا کە دەڵێ:

" دێوانەیە شەخسێ کە بە غەیری لەبی لەعلی
وەك شاهی سکەندەر تەڵەبی ئاوی بەقاکا"

زۆر بەڕوونی دەیەوێ ئەو مەبەستە چڕبکاتەوە کە گەیشتن بە کانی لێوی لەعلئاسای یار ئاوی مانەوە و نەمریی راستەقینەیە و لەمە بەولاوە هەرکەسێك، وەکو شای ئەسکەندەر لە شوێنێکیدیکەدا بۆ "ئاوی نەمری" بگەڕێت، ئەوا بێگومان شێتە. ئاماژەی شاعیر بۆ"سکەندەر – ئەسکەندەر" دەبێ بۆ یەکێك لە دوو کەس بێت: ئەسکەندەر کە سوورەتی " الکهف" قورئانی پیرۆزدا بە "ذو القرنین – خاوەنی دوو شاخ" ناوبراوە و ئەویش هەربەوە ناسراوە کە لەڕێی خوای گەورە هەر کاری چاکەی کردووە و ئەسکەندەری ماسادۆنی – مەقدۆنی- ( Macedonia Alexander , Alexander ||| of Macedon، ٣٥٦ – ٣٢٣ پێشزایین) ی مەزنترین پاشاکانی ماسادۆن/ی باکووری یۆنانی کۆن، کە قوتابیی فەیلەسوفی گەورەی یۆنان (ئەرستۆ – Aristotle، ٣٨٤ – ٣٢٢ پێشزایین) بوو و تەنها ٣٣ سی و سێ ساڵ ژیاوە و لە بابل کۆچیدواییکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە تەمەنی بیست و دوو ساڵییەوە دەستیداوەتە جەنگێکی گەورە و ئیمپراتۆریی ئەخمینیی فارسی لە زنجیرە شەڕێکی گەورەدا تێکشکاندووە کە بەناوبانگترینیان "شەڕی گۆگمیلا"یە و بووەتە مایەی لەناوبردنی شا داریووشی سێیەم و تەنها سەرکردەیە کە لە هیچ جەنگێکدا شکستینەخواردووە. ئەسکەندەری مەزن بەو شەڕانەی بووە مایەی ئامێتەکردنی هەردوو فەرهەنگی رۆژئاوا – یۆنان –و رۆژهەڵات و دەوڵەمەندترکردنی زەمینە فەرهەنگییە هاوبەشە لەوڕێگەیەوە و چەندین شاریشی بە ناوی خۆیەوە دروستکردووە لەوانە شاری"ئەسکەندەرییەی میسر. خەونێکی گەورەی هەبووە، بەڵام تەمەنی کورتی ڕێگەی بەجێهێنانی نەداوە. هیچ یەکێك لەم دوو کەسایەتییە بە دوای نەمریدا نەگەڕاوە، ئەگەرچی کارەکانیان، بەپێی ئەو سەرچاوەیانەی لێیانیدەگێڕنەوە، ناویانی لە ریزی ئەو کەسایەتییانەدا پاراستووە کە بە شایستەییەوە ئەرکی گەورەیان بەجێهێناوە.





یەکێك لە تایبەتمەندییەکانیدیکەی ئەم غەزەلە سوودوەرگرتنی شاعیرە لە هێندێك لە بنەما گرنگەکانی چەمکی عیشقی سۆفییانە، وەکو"ناکامیی عاشق"و "پێویستیی سەردانان – خۆفەوتاندن –ی لەوپێناوەدا"، لەگەڵ بەکارهێنانی چەند چەمکێکی تایبەتی ئەو بوارە، وەکو"فیراق"، "ویساڵ"، "بەقا"، "فەنا"، "تەقدیری ئەزەل"، "لەب – لێو"، "جەفا"، "سەفا"و.. تاد، بەڵام بەڕاشکاوییەوە پابەندیی خۆی بە وەدەستهێنانی دەسکەوتی جەستەیی رادەگەیەنێت، بەتایبەت کە دەڵێ:

رۆح و دڵ و دین، هەر سێ دەکەم بەزل و نیساری
کامی دڵی من گەر لە لەبی لەعلی رەواکا

بەڵام وێڕای ئەمەش لە کۆتایی غەزەلەکەدا دەگەڕێتەوە و راستییە نکووڵی لێنەکراوەکەی‌س، کە پێویستیی سەردانانە بۆ یار – فەنا –، دووپاتدەکاتەوە و بەوەش، بەناوهێنانی خۆی"رەزا" لەلایەکەوە، بەپێی خەسڵەتەکانی غەزەل، غەزەلەکەی قفڵداوە، واتە ئەو مەبەستەی کردووەتە مەبەست و لەلایەکیدیکەشەوە، دەلالەتی وشەی"رەزا"ش ناکرێ فەرامۆشبکرێت کە هەم رەزامەندییە بەوەی "سەردان – سەردانان" لەپێناوی یاردا ببێتە دوا مەبەستی خۆی و هەم دەکرێ ئاماژەش بێت بۆ مەقامی (الرّضا)ی سۆفیگەری کە لە بناغەدا، بەدەر و دوور لە هەرجۆرە ویستێکی عاشق، رەزامەندیی رەها و بێمەرجی ئەوە بەرانبەر بە هەرشتێك کە بۆ ئەمی بڕیاردەدات و دیاریدەکات.

[١]. لە لێکدانەوەکانی قورئانی پیرۆزدا تەنها لە ئەگەرەکانی پێغەمبەربوون و پیاوچاکبوونی لوقمان قسەکراوە و پتر ئەو بۆچوونە زاڵکراوە کە پیاوچاکە نەك پێغەمبەر"إبن کثیر ٣ / ٤٤٤"، هەر لای هەمان لێکدەرەوەش بە (لقمان الحکیم) ناوبراوە ١/٤٣٩". زۆربەی لێکدانەوەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە کۆیلەیەکی رەشپێست بووە و لای خاوەنەکەی دانایی بەوە دەرکەوتووە کە داوای لێکردووە لە مەڕێکی سەربڕاودا خۆشترین و پاکترین دوو شتی دیاریبکات، ئەو دڵ و زمان/ی دەستنیشانکردووە کە داواشی لێکراوە دوو پیسترین شتی مەڕێکیدیکە دیاریبکات هەر "دڵ"و " زمان"ی دەستنیشانکردووە. وشەی"الحکیم"یش بە مەعنای "دانا – ژیر" بەکاهێنراوە نەك بە مەعنای "پزیشك". سەرچاوەی ئەو هەڵەیە رەنگە لەوەوەهاتبێ کە

جاران بە پزیشك دەگوترا "حەکیم"و تائێستاش لە هێندێ شوێنی ولاّتی شامدا بەو مەعنایە بەکاردەهێنرێ. ژیریی لوقمانیش کە لە سوورەتی ناوبراودا ئاماژەی بۆکراوە، بەپێی لێکدانەوەکانی قورئانی پیرۆز بە چەند شێوەیەك هاتووە، لەوانە "تێگەیشتن و زانیاری و دارشتن، قوولّبوونەوە لە ئایین، القرطبي ١١ / ٣١٩" یان"هۆشمەندی و پێکانی راستی لە قسەکردندا، الطبري ٢١/ ٦٧".

٢. رەنگە بگوتری کە"با بە دەواری شرِی نەکا، ناکا" شێوە پەندێکە لە زمانی کوردیدا و ئەمەش شێخ رەزا لە پێگەی شاعیری "تازەکەرەوە"وە دەگوازێتەوە بۆ شاعیرێك کە تەنها ئەو پەندەی خستووەتەگەر، بەلاّم لەلایەکەوە هیچ بەلّگەیەکی"پەندبوون"ی ئەو قسەیە نییە و هیچ کتێبێکی چاپکراوی تایبەت بە "پەندەکانی پێشینان"ی پێش سالّی (١٩٠٩ - ١٩١٠) نییە ئەو پەندەی تێداتۆمارکرابێت، بۆیە ئەوجۆرە بۆچوونانە خەملاّندنە بەپێی واقیعی ئێستا. لەلایەکیدیکەشەوە، گریمان ئەوە پەندیش بووبێت، ئایا لەوجۆرە وەگەرِخستن (توظیف)ەی پەندیشدا جۆرە تازەکردنەوەیەك نییە.

٣. "ئاماژەی شێخ رەزایانە"، بە بۆچوونی نووسەری ئەم چەند دێرِە ئاماژەیە بۆ کەسایەتی و شوێن و رووداوی مێژوویی بۆ دەولّەمەندکردنی مەبەستی شیعری بێئەوەی راستیی ئەو مەبەستەی ئاماژەی بۆکراوە، بە پەیوەندی لەگەلّ زەمینە مێژوویی، زۆر مەبەست بێت. لە چەندین شیعری شێخ رەزادا ئەو راستییە بەدیدەکرێت و ئەگەر تەمەن مەودابدات، نووسەر بەنیازە لە بابەتێکی سەربەخۆدا ئەو لایەنە چارەسەربکات.

***

### سەرچاوەکان

سەرجەمی دیوانەکانی شاعیر، چاپەکەی مەریوانیی سالّی ١٩٣٥، چاپەکەی شێخ عەلی تالّەبانی ١٩٤٦ و ئەوانەی دوکتۆر موکەرِەم تالّەبانی.. شکور مستەفا، شێخ محەممەدی خالّ، ئەحمەد تاقانە و ئومێدی کاکەرِەش بەوردی بەراوردکراون بۆئەوەی گونجاوترین دەقی تەواوی غەزەلەکە هەلّبژێردرێت. لەگەلّ تەفسیرە بەناوبانگەکانی (ابن کثیر (ابو الفداء اسماعیل بن عمر بن کثیر الدمشقي)، تفسیر القرآن العظیم، دار الفکر، بیروت، ط١، ١٤٠١هـ. القرطبي (أبو عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري )، الجامع لأحکام القرآن، دار الشعب، القاهرة، بلا تأریخ. الطبري (أبو جعفر محمد بن جریر بن یزید بن خالد)، جامع البیان عن تأویل آي القرآن، دار الفکر، بیروت، ط ١، ١٤٠٥ هـ)ش سوودیانلێوەرگیراوە.





# ئەرکی وێنەی شیعری لە دوو هەجوی کوردیی شێخ رەزادا[1]

عەبدوڵلا قەرەداغی

١

### زەمینەی گشتی

لە ناونیشانەکەوە سێ لایەنی گرنگ کراونەتە مەبەستی ئەم نووسینە: یەکەمیان: شاعیرێتیی(شێخ رەزای تالّەبانی ١٨٣٧ - ١٩١٠ز)، دووەمیان: ئەو لایەنە لە هەجوە کوردییەکانیدا یان بەلایکەمەوە ئەو شیعرانەی کە بەگشتی کوردین و ئەگەر بەیتێکی بە زمانێکیدیکە تێکەوتبێ ئەوا بۆ بەرجەستەکردنی مەبەستێکی تایبەتی شاعیر بووە، سێیەمیشیان: وێنەی شیعرییە و ئەمەی سێیەمیش ئەو لایەنەیە کە لێرەدا چەقی هەموو بابەتەکەیە و لەسەر بناغەی دوو هایپۆتیز(گریمانە) بنیاتنراوە:

- شاعێرێتیی شێخ، لەرِووی هونەرییەوە هێندە بەرزە کە پتر خوێنەر بەوئاستە نائاساییەوە خەریکدەکات و کەمتر بواری ئەوەی لەبەردەمدا دەمێنێتەوە پەی بەو هەجووە زەقانە ببات و لەو وشانە رابمێنێت کە لە دەرەوەی ئەو شیعرانەدا بەکارهێنانیان و گوێلێگرتنیان کاردانەوەیەکی دەروونیی نائاسایی لێدەکەوێتەوە و مرۆڤ دووچاری بێزاربوون دەکات.

- ئەو وێنە شیعرییانە، بە هۆی ئەو تایبەتمەندییانەیانەوە کە لە یەکەمین هایپۆتیزدا ئاماژەی بۆکرا، ئەرکێکی تایبەتیان هەیە کە جیاوازە لە ئەرکە جوانیگەری - ئێستەتیکی - یەکە و شانبەشانی ئەرکی جوانیگەری خوێنەر بۆ بەئاساییدانانی هەجووەکە ئامادەدەکات، واتە، بەروالّەت مۆرکی"جنێونامە"ی لە هەجوەکانی شاعیر دامالّیوە و مۆرکی دەقی رەسەنی پێبەخشیوە. رەخنەگری پشتبەستوو بە پێوەرە مەوزووعییەکانی رەخنە هەمیشە، لەو روانگەیەوە، ناچارە ئەو تایبەتمەندییە رەچاوبکات، بەتایبەت بە هۆی دوو خالّی زۆر زەقی پەیوەست بەم لایەنەوە:

أ. بەئاساییدانانی شیعری شێخ ڕەزا، تەنانەت لە سەردەمی خۆیشیدا و نەبوونی بەمایەی ئەوەی بە غەیری شێوازە ئاساییەکەی خۆی، واتە هەجوی شیعری، وەلاّمبدرێتەوە. شارەزایانی شیعری شێخ ڕەزا و ئەو سەردەمەی ئەوی تێداژیاوە باش ئاگایان لەوڕاستییە هەیە کە بەشێکی زۆری ئەو هەجوانەی ئەو جنێوی هێندە زەق و سەرودڵگری ئەوتۆی لە ئامێزگرتووە کە ئەگەر بەو شاعیرییەتە دەگمەنە پەردەپۆشنەکرایە، هەرگیز نەدەتوانرا بازی لەسەر بدرێت و خۆی لێنەبانبکرێت.

ب. تەنانەت لەم سەردەمەی ئێمەشدا خەڵکانێکی زۆری نێو کۆمەڵی کوردەواری کە گوێیان لە جنێوێکی ئاسایی دەبێت یان تەنانەت کە گوێ لە جنێونامەیەکی شیعریی ناهونەریش دەگرن، هەرگیز نیشانەی بێزارییان پێناشاردرێتەوە، کەچی لە کاتی خوێندنەوەی شیعری شێخ ڕەزادا ئەو ڕەفتار و بێزاریدەربڕینەیان لا بەدیناکرێ، ئەگەر گەشانەوەیان بە روخساردا نەبینرێت. سەلماندنی ئەو خالاّنی ئاماژەیان بۆکرا، لەڕووی پەیڕەویکردن لە پێوەرە زانستییەکانی ڕەخنەی بابەتییەوە ئەرکی ئەم چەند لاپەڕەیەیە، بەلاّم پێش ئەوەش پێویستە گوزەرێك، با خێراشبێت، بەنێو چەند بیروبۆچوونێکی چەندین نووسەری ناسراوەوە، سەبارەت بە خودی ئەم مەسەلەیە، بکرێت.

ئەمین فەیزیی هاوڕێی نزیکی شاعیر، وێڕای ئەوەی جەخت لەسەر شاعیرێتیی شێخ ڕەزا بە چوارزمانی جیاواز (کوردی، عەرەبی، فارسی و تورکی) دەکات، سەبارەت بە شیعرە کوردییەکانیشی دەڵێ:"هەموو عیبارەتە لە فەساحەت و بەلاغەت، لە نیکاتی دەقیق و زەرافەت و سیعەتی قەریحە و مەعلووماتی خاریجی تەقریرە"(٧/٦). جەختکردن لەسەر"قەریحەی کراوە"و "فراوانیی زانیارییەکانی شێخ ڕەزا، بەوەی کە لە سنووری پەیپێبردن زیاترن"لەلایەن کەسێکی وەکو خوالێخۆشبوو "ئەمین فەیزی"[٢]یەوە کە شاعیری زۆر لەنزیکەوە ناسیوە، خالێکە ناتوانرێ فەرامۆشبکرێت یان نادیدەبگیرێت.

سی. جەی. ئەدمۆنز[٣] شیعری شێخ ڕەزا دابەشدەکاتە سەر پێنج جۆر:

١. یادداشت و ئۆتۆبایۆگرافی
٢. دلّداری
٣. داشۆرین و دوژمنایەتی خێلاّیەتی
٤. نامەی داوا کردن و پیاهەڵدان و هەڕەشە
٥. داشۆرینی زادەی ئێرەیی شاعیر(١/٢١٠).





پاشانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە "باشترین شیعری شاعیر لە جۆری سێیەمن، ١/٢١٤". سەیر لەوەدایە کە پیاوێکی وردی وەکو ئەدمۆنز، لەسەرجەم شیعرەکانی شێخ ڕەزادا هەڵوەستەیەکی تایبەت و نائاسایی لە ئاستی ئەو قەسیدەیەدا دەکات کە هەجوی "کاکەیی" دەکات و بەم بەیتە تورکییە دەستپێدەکات:

بابان باشـــــندە بیر باتمان یشـــــیل وار
إمامُ القوم فی تقســــــیم شـــــــلوار
(٤/١١٧ تا ١٢١) و(٥/٥٤ تا ٥٩)(٤)

لەبارەی ئەمەشەوە دەڵێت: "پێویستە دانبەوەدابنێم کە لە ئەدەبی هیچ میللەتێکدا شیعرێکی هێندە سەمەرە و رووهەڵماڵراوم نەدیوە"(١/٢١٤). بە گەڕانەوە بۆئەو راستییەی کە لەو سەردەمەی ئەدمۆندز ئەم بابەتەی نووسیوە، هیچ دیوانێکی چاپکراوی شێخ ڕەزا لەئارادانەبووە، بۆیە ئەو تەنها پشتی بەو شیعرانە بەستووە کە لە گۆڤاری (دیاری کوردستان)ی ژمارەی ئاداری ١٩٢٥ - مایسی ١٩٢٦ی چاپی بەغدا و (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)ی ئەمین فەیزی/ی چاپی ئەستەمبوولّدا بلاّوکراونەتەوە. بەگەڕانەوەش بۆئەو راستییەی کە، وەکو ئەدمۆندز لە کۆتایی ئەو نووسینەیدا ئاماژەییبۆدەکات، شێخ حەبیبی تالّەبانیی سەرۆکی ئەو سەردەمەی شارەوانیی کەرکووك (ساڵی ١٩٣٤) بەیازێکی شیعری شێخ ڕەزای بۆیناردووە، ئەگەرچی نەیگوتووە ئەو بەیازە چەند شیعری تێدابووە، بەلاّم بێگومان بەشێکی ئێجگار زۆری ئە شیعرانەی تێدانەبووە کە ئەمڕۆ لای خوێنەران ساغبووەتەوە کە هی شێخ ڕەزای تالّبانی/ن. لەمەوە ئەو راستییەمان بۆ رووندەبێتەوە کە قەناعەتی پێشووی ئەدمۆندز لەبارەی شیعری شێخ ڕەزای تالّەبانی/یەوە زۆر پایەدارنەبووە، چونکە پاش خوێندنەوەی بەیازەکە دەیگۆڕێت و دەڵێ: "ئەگەر بەیازەکانی شاعیر بەوردی بخوێنرێنەوە ئەوا دەردەکەوێ کە شێخ ڕەزا زۆر زیاتر بووە لەوانەی کە من لەبارەیەوە وتوومن. خوێنەر، بەڕاستی، سەرسامدەبێ لە توانا و شێوە و زمان و تەکنیکی شیعری و رووهەڵماڵراوی و قسەی ڕەق و رووت و داشۆرینی ئەم پیاوە نائاساییە"(١/٢١٩).

بەلای پیرەمێردی شاعیریشەوە تایبەتمەندێتی و ڕەسەنایەتی و جیاوازیی دەنگی مەسەلەیەکی حاشاهەڵنەگرە و بەم وشە هەڵبژێردراوانە ئەو راستییە دەردەبڕێت: "شێخ ڕەزا

گەوهەرێك و جەوهەرێکی بوو دەتوانم بڵێم نەك لە خاکی کوردستاندا، سایەی ئەو لە جیهاندا بوو. لە جیهاندا مانەند - واتە هاوشێوە -ی نەبوو. جاریٚ هەرچی وتووە هی خۆیەتی و لە کەسی نەدزیوە و لە فارسیشدا شێوەیەکی بۆ خۆی داناوە، دوای ئەو کەس نایگاتیٚ"(٨/١١).
ئەم ددانپێدانانەی پیرەمێرد، کە بە هێڵ بە ژێدا راکیشان دەستنیشانکراوە کە بۆچوونی شاعیرێکی بەسەلیقە و ورد و شارەزایە، بایەخێکی ئێجگار گەورەی هەیە چونکە لەلایەکەوە شۆڕەسواریی ئەو لە شیعری کوردی و داهێنانی گەورە و لاسایینەکراوەی لە شیعری فارسیشدا دەخاتەڕوو.

نووسەری ناسراوی تورکمانی کەرکووك پارێزەر "عەتا تەرزی باشی"، بە نیسبەت شیعرە تورکییەکانی شێخ رەزاشەوە بۆچوونێکی ئاوەها دەردەبڕیٚ: "شێخ رەزای شاعیری کەرکووکی، لە سەرجەمی ئەدەبیاتی تورکیدا، لەپاش "نەفعی"یەوە، بەگەورەترین مامۆستای هەجو دادەنریٚ"(٦،ب٣/١). پێموایە مامۆستا، لەم بۆچوونەیدا، وێڕای کەمیی ئەو شیعرانەی شێخ رەزا کە تاکاتی دانانی بەرگەکانی ئەو کتێبەی کەوتبوونە بەرچاوی خوێنەرانی، شوێنێکی ئێجگار دەگمەنی لەڕووی چۆنایەتییەوە بە شیعرەکانی بەخشیوە. ناوبراو باسی ئەوە دەکات کە شێخ رەزا، "بە چوارزمان شیعری نووسیوە و شیعرە بە تورکی نووسراوەکانی، لەڕووی ژمارەوە، لەچاو ئەوانەی بەو زمانانەیدیکە نووسراون زیاترن"(هـ. س/٣). بەروالەت و ئەگەر رەچاوی ئەوە بکرێت کە تەرزی باشی بە کردەوە، لە دووەمین و سێیەمین بەرگی هەمانکتێبیدا تێکڕا (١٨٨) سەد و هەشتا و هەشت تاکبەیت و چوارین و پارچە شیعری کورت و درێژ، (١٢٩) سەد و بیست و نۆیان لە دووەمین بەرگ (٦ب٢/٧٥ تا ١٧٦)و (٥١) پەنجا و یەکیشیان لە سێیەمین بەرگدا (٦ ب ٣/١٧٩ ا ٢٢٩)ی تورکیی بەوەی هی شێخ رەزان، جێکردووەتەوە، رەنگە پاساوی ئەوەی هەبیٚ کە شیعرە تورکییەکانی شێخ رەزا لەوانەی زمانەکانیدیکە زیاترن، بەلاّم بە هۆی ئەوەوە کە مامۆستای ناوبراو خۆیشی ددانبەوەدادەنێت کە شاعیر راستەوخۆ و سەرزارەکی و بیٚ خۆئامادەکردن "ارتجالی" شیعرەکانی گوتووە(٦ب ٣/١ و ٤)و ئەمەش بێگومان بووەتە مایەی ئەوەی تەنها ئەو شیعرانەی هەلی رزگاربوونیان بۆڕەخساوە کە لە دڵی عاشقانیان، یان لە هێندیٚ بەیازی ئەموئەودا پارێزراون. تەرزی باشی بۆ بەڵگە ئاماژە بۆ هەردوو نوسخە چاپکراوەکەی (کوردی- مەریوانیی ساڵی ١٩٣٥ز، هـ. س/٣)و نوسخەکەی (عەلی تاڵەبانی/ی ساڵی ١٩٤٦ز) و نوسخەکەی مەهابادی ساڵی ١٩٧٥ز/ی دیوانی شێخ رەزا دەکات (هـ. س/٤) .





لەلایەکیدیکەشەوە بەشێکی بەرچاوی ئەو شیعرە تورکییانەی مامۆستا تەرزی باشی لە هەر سیٚ بەرگی کتێبەکەیدا جێیکردوونەتەوە، لەڕووی هونەرییەوە زۆر لەوە لاوازترن کە شەقڵی هونەرمەندانەی شێخ رەزایان پێوەدیاربێت و پێدەچیٚ نووسەر هێندە بە ساخکردنەوەی شیعرەکانەوە خۆی خەریکنەکردبووبێت و وەکو خۆیشی ئاماژەیبۆکردووە، سوودی لە چەند سەرچاوەیەك وەرگرتووە کە لە یەکەمین بەرگی کتێبەکەیدا ناویبردوون (هـ. س، ٨/١ تا ١٥)، بەلاّم بێگومان ئەم کۆششەی نووسەر لەم سیٚ بەرگەی کتێبەکەیدا خزمەتێکی گەورەی ئەرکی پێکهێنانی سکێچی گشتیی شاعیرە و شایانی رێزی تایبەتە.

مامۆستای کۆچکردوو عەلائەددین سەججادی/ش شیعرەکانی شێخ رەزا بەرز دەنرخێنێت و هێندە بەلایەوە گەورەیە کە شاعیرێکی بەناوبانگی وەکو جەریر (أبو حِرزة جرير بن عطيـة، ٣٣ - ١٣٣ ك، ٦٥٣ - ٧٥٠ز) لەگەڵ شێخ رەزا نابینیٚ: "ئینکارناکریٚ کە شاعیری بەرزی عەرەب (جەریر) لە باسی جنێودا زۆر بەناوبانگە، من لامولیە ئەگەر لە دەوری شێخ رەزادا بووایە نەیدەتوانی لە خاکی (یەمامە)وە پێبنێتە خاکی عێراق"(٩/ ١٥٩).
پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەددین مستەفا رەسووڵ ئەو قەناعەتە دەخاتەڕوو کە "دانانی شێخ رەزا بە شاعیری (شەڕەجنێو)، بڕیاری سەرزارەکیی خەڵکە، لەبەرانبەری ئەمەشدا رایدەگەیەنیٚ کە: "ئەو نووسینانەی بەگشتی سەرچاوەی مێژووی ئەدەبیاتن یان سەرچاوەی باسی شێخ رەزان، زیاتر لەوڕووەوە سەیری شێخ رەزایان کردووە کە شاعیرێکە، وەك هەموو شاعیرە کلاسیکییەکانیتر و ئەسپی خۆی لە مەیدانی شیعردا تاوداوە"(٦/٧).

یەکێك لەوکەسانەی کە رەنگە، لەپەناوە، وەلاّمی چەند سەرنجێکی گشتی، تەنانەت هی نووسەرانیشی - لەوانەش پیرەمێرد - سەبارەت بە شیعری شێخ رەزا دابێتەوە، بەتایبەت لەوڕووەوە کە ناوبراو شاعیری هەجووە، کۆچکردوو مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ بێت. بەلای ناوبراوەوە ئەوە زۆر ئاساییە و دەڵیٚ: "هەموو گەلێك شاعیری زەمی هەیە بەزۆری، بەلاّم ئێمە هەر شێخ رەزامان هەیە. لەلایەکیترەوە ئەمجۆرە ئەدەب و وێژەیە زۆر جیاوازە لە هەموو شێوەکانیتری ئەدەب. نەخوازەڵلاّ ئەم وردەکارییەی کە شێخ رەزا لە جنێودا کردوویەتی"(١٥/٤).
سەبارەت بەتایبەتمەندیی هەرەسەرەکی و بەرجەستەی ئەو وردەکارییەش دەڵیٚ: "شیعرە جنێوەکانی شێخ رەزاش ئەمەندە وێژەکەی بەرز و والاّیە، ئەگەر یەکێك لە کوردیدا وێژەربیٚ کە خوێندیەوە، ئاگای لە جنێوەکانی نامێنیٚ"(١٥/٧). لەم داکۆکییە دەگمەنەدا مامۆستای

کۆچکردوو بەم سنوورە قایلنابێت، بەڵکو زۆر بوێرانە و بەراشکاوییەوە، شێخ ڕەزا بە شاعیرێکی خاوەن تایبەتمەندیی بەتەواوی جیاواز و داهێنەر و تازەگەری ڕاستەقینە دادەنێت: "دیوانەکانیتر هەموو شیعرەکانیان لەیەکدەچن، دەڵێی بە گوێچکەی یەکیاندا چرپاندووە، دیوانی شێخ ڕەزا وا نییە، زۆر شتی وای تیایە کە نەبیستراوە و نەوتراوە لە کوردیدا.(٧/١٥).

مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی/ش، لە هەمان بواری داکۆکیکردن لە شیعر و شاعیرێتیی شێخ ڕەزادا، جەخت لەسەر هونەرمەندیی شاعیر لە هەجوەکانیدا دەکات: "ڕاستە ئەدەبی شێخ ڕەزا پڕە لە قسەی بێئەدەبانە و جنێو، بەلاّم جنێوەکانی ئەوەندە هونەروەرانەیە هەردەڵێی دانەی مروارین و زەڕینگەری هونەرمەند خشڵی تەلاّی پێنەخشاندووە"(٩/١٦٠). ئەم تەعبیرەی مامۆستای کۆچکردوو پتر لە هەموو بۆچوونەکانیدیکە لەوڕاستییەوە نزیککەوتووەتەوە کە شێخ ڕەزا تەنها شاعیرە کە بەو زەقی و بێپەرواییە لەگەڵ چەمك و وشەبێزراوەکانی نێوکۆمەڵ مامەڵەیکردووە و بەکاریهێناون، بەلاّم لەو بەکارهێنانەدا بەرگێکی بەتەواوی جیاوازی لەبەرکردوون، ئەمەش تایبەتمەندیی هەرەبەرجەستەی شیعری شێخ ڕەزایە.

ئەمانەی بەبەڵگەهێنرانەوە، تێکڕا، مشتێکن بە نیشانەی خەروارێك. هەڵبەتە نووسەری خاوەن پایەی دیار و خەڵکی زۆریش هەن کە لەناخەوە شیعرەکانی شێخ ڕەزایان پێخۆش نییە و چەندین دەستەواژەی نەخوازراوی وەکو (ئەدەبخانە)و (شاعیرە بێئەدەبەکە) بۆ شێخ ڕەزا و شیعرەکانی بەکارهێنراون، بەلاّم هێندەی ئاگام لێبووبێت، لەلایەن کەسانی شارەزا و خاوەن پێوەری ڕەخنەگرانەی زانستییەوە، هەرگیز نکوولّی لە پایەی هونەریی بەرزی شیعرەکانی نەکراوە و ئەو پایەیەش پشتگوێنەخراوە.

٢

### ئەرکی وێنەی شیعری

ئەگەرچی ئەو پرسیارە کە بۆچی هەجوی شێخ ڕەزا لە سەرجەمی شیعرەکانیدیکەی (یان جۆرەکانیدیکە - بە تەعبیری ئەدمۆندز)، لەڕووی هونەرییەوە، باشترە و پتر بایەخی دراوەتێ، تائێستا وەلاّمێکی هەمەلایەنەی نەدراوەتەوە و ئەمەش پێویستی بە هیممەتی لێکۆڵەرەوەیەکی تایبەتە کە دەبێ بە شێوەیەکی جیددی خۆی بۆتەرخانبکات و کەرەستەی پێویستیشی بۆ ئامادەبکات(٥)، بەلاّم لێکۆڵینەوەی خودی ئەو دیاردەیەش، بێ ئەوەی وەلاّمی ئەو پرسیارە





بدرێتەوە، بە بۆچوونی بەندە لایەنێکە هێشتا بەپێی پێویست چارەسەرنەکراوە و پێویستی بەوەهەیە لە چەندین ڕووی جیاواز و تەنانەت لە چەندین ڕوانگە و گۆشەنیگای جیاوازیشەوە چارەسەربکرێت و سنوور بۆ زاراوە و چەمکەکانیش، بەروونی، دابنرێت. گرنگیی ئەو پرسیارە لەوەدایە بە جۆرە پۆلێن (تصنیف)کردنێکی جیاوازی هەجوەکانی قایلە، بۆیە وەلاّمدانەوەی ئەو پرسیارە، پێش هەموو شتێك، ڕووبەڕووی ئەرکی گەڕان بە دوای تایبەتمەندییەکانی هەجوەکانی دەکات، ئەو تایبەتمەندییانەی لە شیعرەکانیدیکە جیایاندەکاتەوە. بەندە پێموایە ئەو تایبەتمەندییانە پتر لە "وێنە شیعرییەکان"دایە کە هەم لەڕووی جوانیگەرییەوە و هەم لەڕووی پاساوی مەنتیقیشەوە ئەرکێکی گەورەیان بینیوە لەوەی هەجوی "شێخ ڕەزا" کە لە نێوجەرگەی ڕووبەری "حەرام - قەدەغە"دا لەنگەریگرتووە، ئاوەها لە دیدی ڕەخنەگرانەی ڕەخنەگرانی قوتابخانەی "دووڕراگەرتن لە خراپ - النهی عن المنكر"و لە سزای پێشەنگانی سەپاندنی سزاکانی ئەو قوتابخانەیەش دەربازبووە. ئەمە کرۆکی گریمانەی بەندەیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا و لە چەند لاپەڕەی داهاتوودا هەوڵدەدرێت وەلاّمی خاڵە ئالۆزەکان بدرێتەوە و لەئێستاشەوە ددانبەوەدادەنێم کە لەناخەوە حەزم لەوەنییە کە دەقە بێپەرواکانی ئەم شاعیرە بهێنمەوە، بەلاّم پابەندی بە "دەستپاکی - الامانە"ی زانستییەوە ناچارمدەکات بەپێچەوانەی ئەو خواستەم ڕەفتاربکەم، بەلاّم "وێنەی شیعری"چییە ؟و لەچ ڕوانگەیەکەوە مەبەستمانە!؟

### وێنەی شیعری و ئەرك.. زەمینەی تیۆری

ئەگەرچی دەتوانرێ لە کۆنترین دەقەکانی شیعردا وێنەی شیعریی جوان بەدیبکرێت، بەلاّم خودی ئەو چەمکە زۆر کۆن نییە. ئەرستۆ ( Aristotle، ٣٨٤ - ٣٢٢ پ،ز) کە هێندەی سەرچاوە کۆنەکان ڕێگەدەدەن، یەکەمین کەس بووە لە کتێبێکی سەربەخۆدا (Poetics)، بە شێوەیەکی سیستماتیکی باسی هونەری شیعری کردووە، سەرەڕای ئەوەی باس لە هەموو پێکهاتە ئاساییەکانی وێنەی شیعری دەکات، بەلاّم تەنانەت وشەی "وێنە - Image)یشی لا بەدیناکرێت. ئەرستۆ لە چەند شوێنێك، بەپێی پێویستییەکالنی مەبەستی خۆی، شیعر دابەشدەکاتە سەر چەند بەشێکەوە، لەوانەش ئەوەی دەڵێ: "کۆنترین شاعیرەکان دابەشدەکرانە سەر شیعری پاڵەوانانە) (Heroic) یان شیعری هەجو "داشۆرین - Lampooning) ١٢/٩"، بەلاّم بەدڵنیاییەوە مەبەست لەو وشەیە (Lampooning) شێوەی باسکردنی

خەڵکییە بە خراپتر لەوەی خۆیان و شاعیرانی هەجویش بەوانە دەزانێت کە لەبارەی تاکە دیاریکراوەکانەوە دەنووسن و بەمەش هەجو لە شیعر دووردەخاتەوە، چونکە بەلای ئەوەوە بواری راستەقینەی شیعر گشتییە نەك تایبەتی. ئەگەرچی ئەم لایەنە بەدرێژایی مێژووی هەجو یەکێك بووە لە بنەما گرنگەکانی ئەوجۆرە شیعرە، بەلاّم ناتوانێ ببێتە سیمای راستەقینەی. ئەرستۆ تەنها لە ئاوڕدانەوە لە کارەکانی نووسەرێکی بەناوبانگی وەکو هۆمیرۆس ( Homer - هەشتەمین سەدەی پێشزایین) لە ئیلیادە (Iliad)و ئۆدیسە (Odyssey)دا مەسەلەی ئەرك ( Function) دێنێتەئاراوە: "ئەرکی شاعیر گواستنەوەی ئەوەنییە کە روویداوە بەڵکو ئەوەی دەبێ روویدات - ئەوەی شیاوە بەپێی یاسای شیاوبوون - Probability - یان یاسای پێویستبوون - Necessity - روویدات ١٢/١٨"و هەر لێرەشەوە شیعر لە مێژوو جوادەکاتەوە، کە "شیعر گشتی Universal دەردەبڕێت و مێژووش بەش Particular ە. س/١٨". گرنگیی ئەم جوداکردنەوەیە لەوەدایە کە شیعری هەجوی "شێخ رەزا" دەتوانرێ بهێنرێتەوە ژێر چەتری شیعری راستەقینە، ئەگەرچی ئەرستۆ پێشتر داشۆرین (هەجو)ی لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا دانابوو.

هێنانەوەی پێناسەیەکی دیاریکراوی ئەوتۆ بۆ "وێنەی شیعری" کە ببێتە مایەی رەزامەندیی هەموو لێکۆڵەرەوە و خوێنەرێکی جیاواز، کارێکی دژوارە، ئەگەر بە مەحاڵیش دانەنرێ. لە کۆششێکی زانستیی گرنگدا خانمە دوکتۆر (ئەننا پیترزیکۆوسکا)، پاش ئەوەی راوبۆچوون و پێناسەی چەندین نووسەری خاوەن پێگەی دیار دێنێتەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی "وێنە - Image"چەندین "مانا - Meaning"و "ئەرك - Function "بەخۆوەدەگرێت ١٦/١٤١". لە "رەی فرێزەر -Ray Frazer/لەدایکبووی١٩٤١ز"یشەوە ئەو بۆچوونە دەگوازێتەوە کە "رۆڵی وێنە لە پرۆسەی داهێنەرانە و ئەزموونی جوانیگەرانەدا، یەکەمینجار، لەلایەن فەیلەسووف و بناغەرێژی فەلسەفەی سیاسیی رۆژئاوا لە روانگەی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی/یەوە "تۆماس هۆبز - Thomas Hobbes، ١٥٨٨ - ١٦٧٩"ەوە جەختی لەسەرکرا کە وێنەی بەوە پێناسەکرد کە رایەڵی پێکەوەگرێدانی ئەزموون و مەعریفەیە ١٦/١٤١".

پسپۆڕانی بواری "وێنەی شیعری" ئاماژە بۆ هەردوو راستیی نێوبانگی گەورە و ئالۆزیی ئەو چەمکە دەکەن و یەکێك لە وریاترینیان دەرگا بەسەر هەرجۆرە داوەرییەکی یەکلاکەرەوە لەم





بوارەدا دادەخات: "هیچ رێگایەك نییە بۆ بڕیاردان لەوەی کە وێنەیەك لەکوێ دەستپێدەکات و لەکوێ کۆتاییپێدێت، هەروەها هیچ پێوەرێکی یەکلاکەرەوەش نییە کە لەسەر بناغەی بتوانین بڵێین چ شتێك لە شیعردا وێنەیە و چ شتێك وێنە نییە ٢١/١٦١". ئەم دەرگاداخستنەش، لەهەمانکاتدا بریتییەلە ئاوەلاّکردن و خستنەسەرپشتی کۆششی قووڵبوونەوەی زیاتر لەو چەمکە. بۆیە سەیر نییە شاعیرێکی وەکو "سیمیك -Charles Simic/ی ئەمریکیی بەرەچەڵەك یۆگسلاڤیی، لەدایکبووی ١٩٣٨" کە بە "شاعیری وێنە شێتەکان" ناسراوە، جەخت لەسەر ئەوە بکات کە "وێنە شیعرییەکان مانای ماناکان - Meaning of Meanings " دەگۆڕن: ئەو زمانەی کە وێنەی شیعری شکۆمەند و جوانتر دەکات زمانێکە بەدوای گرنگیی دابینکراودا دەگەڕێت بۆئەوەی پایەداریبکات ١٣/٤٤". کێڕنی لەدووپاتکردنەوەی ئەوجۆرە بۆچوونەدا، مەسەلەی "ئەندێشە - Imagination" دێنێتەئاراوە و وایباسدەکات کە لای فەیلەسووفێکی وەکو "پۆڵ ریکۆر - Paul Ricoeur، ١٩١٣ - ٢٠٠٥ز"ەوە "وا خەملێنراوە کە توخمەیەکی پێویستە لە پرۆسەی داهێنانی مانا لەنێو زماندا و لە رێگەی خودی زمانیشەوە ١٥/٣٥". نەك تەنها لای ریکۆر، بەڵکو لای تێکڕای فینۆمینۆلۆجیستەکان، هەڵبەت ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ زمان و ئەدەب هەیە، ئەوجۆرە رایەڵە بەهێزەی نێوان زمان و ئەندێشە و مانادا بەدیدەکرێ، "لێکۆڵینەوە فینۆمینۆلۆژییەکان ئەندێشە بە یەکێك لە رەهەند - Dimension - ەکانی زمان دادەنێن و رۆڵی ئەندێشە لە داهێنانی مانا تازەکان لە زماندا دەدۆزنەوە. ئەم دۆزینەوەیە چەندین نموونەی لەو شیعرانەدا هەیە کە زمان تێیاندا داهێنەرانە بەکارهێنراوە و مانای تازە لە بەکارهێنانی داهێنەرانە و ناچاوەروانکراوی زمان لەلایەن شاعیرەوە هێنراوەتەئاراوە.. بەهەمانشێوە، وێنەی شیعری/ش لە شیعردا بە شێوەیەك خراوەتەڕوو کە وێنەیەکە مانا کۆنەکانی دەرکپێکردن - Perception - دووبارەناکاتەوە ٢٣/١٠٠". واتە لە وێنەی شیعریدا، نەك تەنها شێوەی خستنەڕوو و دەربڕینی شتەکان تازەن، بەڵکو ماناکانیش دەگۆڕێن. ئەمە وەکو "کاسیی- Edward S. Casey لەدایکبووی ٢٤ی شوباتی ١٩٣٩ز" بۆیچووە لە جەوهەری تایبەتمەندییەکانی میتۆدی فیلۆلۆژی لە فەلسەفەدا کە مەبەستێتی "ئەو شتانەی لە ئەزموونی مرۆڤایەتیدا وای بۆمان روانیون کە شتی نەگۆڕ و گومانلێنەکراو - Granted -ن بکرێنە شتگەلی دانراو - داهێنراو -و گرێدراو بە بابەتێك - بیرۆکەیەك -ی سەرەکی ١٤/٨"، دەکرێ بە بەکارهێنانی نائاسایی زمان شێوە و ناوەڕکێکی

تازەیان پێببەخشرێ. ئەندێشە (Imagination)، وەکو خانمە دکتۆر ئارەزووزالیپوور سەرنجیداوە: "لە سیستمی هێرمینیۆتیك - لێکدەرەوەکار، تەفسیری - کە لەلایەن پۆل ریکۆر/ ەوە گەشەیسەند، بە یەکێك لە چەمکەکانی زمان دانراوە نەك خەون - - Visio ٢٣/١٠١"، ئەمەش ئەو شتەیە کە ریکۆر ناوی "داهێنانی واتاساز - Semantic Innovation"ی لێناوە. هێرمینیۆتیك/یش، وەکو ریکۆر خۆی باسیلێوەدەکات، لە ئەرکی زمانەوانیی ئەندێشە دەکۆڵێتەوە، ئەمەش لە رێگەی سووسەکردنی رۆڵی داهێنەرانەی ئەندێشە لە زماندا، لە هەر شێوازێکیدا، وەکو هێماکان - Symbols-، ئەفسانە، شیعر، گێڕانەوە - Narrative - و.. تاد. ریکۆر بەسووربوونەوە دەپرسێ: "ئایا ئامادەنین ددان بە دەسەلاتی ئەندێشەدا بنێین کە چیدی وێنەگەلێك نییە لە ئەزموونی هەستیارانەی ئێمەوە سەرچاوەیانگرتبێ، بەڵکو ئەوە توانای رێگەدانە بە جیهانگەلێکی تازە بۆئەوەی شێوازی تێگەیشتنمان لە خۆمان دابڕێژن؟ ئەم دەسەلاتە لە رێگەی وێنەکانەوە پێیناگەین، بەڵکو لە رێگەی ئەو واتایانەوە کە لە زمانەکەمانەوە هەڵدەقولێن. بەمشێوەیەش ئەندێشە دەبێتە رەهەندێکی زمان ١٨/١٨١". واتە لێرەوە وێنەکان کە پێکهێنەری راستەقینەی ئەندێشەن، لە رێگەی خودی ئەندێشەوە لە جیهانی واتاسازیدا دەبنە هۆکارێکی گرنگ، ئەویش بە پێکهێنانی واتا (مانا)ی تازەوە، نەك دووبارەکردنەوەی واتا کۆنەکان. ئەمە خاڵێکی بەرچاوی گۆڕانی چەمکەکانە لە مێژووی بیری مرۆڤایەتیدا.. لەکاتێکدا کە "لە لوتکەی پێکەوەنانی وێناکان - Conceptualizations لە سەردەمی رۆمانسیدا ئەندێشەی داهێنەرانە لە شیعردا لکێنرابوو بە زمانی رەمزیی سروشتەوە ٢٢/٨٦"، لە هێرمینیۆتێکدا سروشت بۆ بەرژەوەندیی زمانی ئاسایی دەستی لەو پلەوپایەیەی خۆی هەڵگرت. لێرەوە و بە هۆی ئەمەشەوە پێویستیی هاتنەگۆڕێی هونەرێکی تازە سەریهەڵدا کە "هونەری کردنەوەی جفرەی مانا ناراستەوخۆکان"ە و ئەمەش "هێزی داهێنەرانەی ئەندێشە جیادەکاتەوە ١٧/٩٠"، بەڵام خودی ئەو هێزەی ئەندێشە چییە! ؟

هێزی داهێنەرانەی ئەندێشە لە زماندا، لەلایەن ریکۆرەوە، بەو شێوەیە پێناسەکراوە کە توانای دروستکردنی هاوشێوەیی Similarity لە جیاوازی Dissimilarityدا نموونەی خوازە Metaphor لە شیعردا پوختەی ئەو شێوازەیە کە ئەندێشە دوو بواری واتاساز Semantic یەکدەخات بۆ دروستکردنی ئەوەی کە بەدڵنیاییەوە لە ئاستی واقیعیدا





Literal Level نەگونجاوە Impertinent بۆ شتێك کە لە ئاستێکی تازەدا گونجاوە ١٥/٤٩". بە تەعبیری ریکۆر، ئەندێشە "ئاوڕدانەوەی کوتوپڕی ئینتیمایەکی تازەیە، واتە شێوازێکی بنیاتنانی پایەدار (Pertinence)ە لە ناپایەداردا (Impertinence) ١٩/٢- ١٧٣". ئەم جەختکردنەی ریکۆر کە داهێنانی وەدیهاتوو هێندە کاریگەرە رەوتی مەعنا بە لایەکدا دەگۆڕێت کە شتی ناپەسەند و نیمچە بێزراو دەگۆڕێ بۆ شتێکی پەسەند و ئەمەش لە شیعری شێخ رەزادا بە زەقی دیارە.

گاستۆن باشلار (Gaston Bachelard١٨٨٤-١٩٦٢) فەیلەسووفێکی فەڕەنسییە لە بناغەدا بە فەلسەفەی زانست دەستیپێکرد و پاشتریش، شانبەشانی ئەوەش بایەخی بە ئەیستەتیك "Aesthetic"-زانستی جوانی -دا و خاوەنی چەندین کتێبی گرنگە لەو بوارەدا کە بەناوبانگترینیان "Poetics of Space"ە کە بە "جماليات المكان" وەرگێڕدراوەتە سەرزمانی عەرەبی. فەلسەفەی جوانیی ئەو بەو شێوەیە دەروانێتە هونەر "کە وێنەیەکی خاوەن توانای دەربڕینە، بەڵام بەپێچەوانەی شێوازی خستنەڕووی ئەم روانینە لە مێژووی بیری جوانیگەرانەدا، چونکە تیۆرییەکەی ئەو پێ لەسەر تیۆریی ئاگایی دادەگرێت بەوپێیەی بایەخ بەو وەسفەی "وێنەی شیعری" دەدات کە لە ئەزموونی ئاگایی یان خود "خوێنەر"دا بە شێوەیەك روودەدات کە دوولایەنیی خود و بابەت فەرامۆشدەکات و بەو شێوەیەش کە ئاگایی بە بابەتەکەیەوە دەبەسترێتەوە و لە رێگەی ئەزموونێکی مەبەستئامێزەوە روویتێدەکات. بەمەش، بەو شێوازە لە وێنەی شیعری دەگات کە لە ئەزموونی خوێنەردا دەردەکەوێت و روودەدات پێش ئەوەی بیرکردنەوەی لە چوارچێوەی ئالۆزی ویناکردن "تصور" بیشێوێنێت، چونکە وێنەی - بە بۆچوونی باشلار - بابەتی وێناکردن نییە ٢/١٤".

باشلاری بواری فەلسەفەی زانست، لە بواری وێنەدا بەتەواوی دەگۆڕێت، ئەو لەمبوارە تازەیەدا دڵنیایە لەوەی ناکرێ بەو گیانەوە روو لە ئەندێشە - خیال -ی شیعری بکرێت، چونکە ئەمیان ناسنامەی جیاوازی خۆی هەیە و دەبێ رێز لەو تایبەتمەندییە بگیردرێت: "وێنەی شیعری دەرکەوتنێکی هەڵمەتبردووی کوتوپڕە بە رووی دەرووندا و تائێستاش بە شێوەیەکی باش، لە هۆکارە دەروونییەکانی ئەو دەرکەوتنە نەکۆڵراوەتەوە ٣/١٧".

بەلای باشلارەوە شیعر نە پەیوەندیی بە شێوازی بنەڕەتی - Archetype-ی قووڵاییەکانی نائاگاییەوە هەیە و نە زایەڵەی رابوردووشە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لە رێگەی

درەوشانەوەی وێنەکانەوە رابوردووی دوور بە زایەڵەکانی دێتە نێوانەوە و ئاسان نییە بزانرێ لەچ قوولاّییەکەوە ئەو زایەلاّنە دەگەڕێنەوە. باشلار ئەمە بۆ "تازە و پاراوی"و "کردار"ی وێنەی شیعری دەگێڕێتەوە و لەمەشدا ناسنامە و دینامیکییەتی وێنەی شیعری دەبینێ کە بووەتە ناسنامە و ئۆنتۆلۆژی - زانستی بوون - Ontologyیەکی راستەوخۆ و ئەمەش بە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەی دەزانێ ٣/١٨". بە هۆی ئەم تایبەتمەندییەی "وێنەی شیعری"شەوە جۆرە "سەرکەشی"و "نادەستەمۆیی"یەکی تێدابەدیدەکرێت و ئەو سنوورانە دەبەزێنێ کە لەڕووی تیۆرییەوە بۆی دەستنیشاندەکرێن: "ئەو هۆکارانەی دەروونناس و دەروونشیکاران باسیانلێوەدەکەن ناتوانن بەتەواوی سروشتی ناچاوەروانکراوی"وێنەی شیعری"ی تازە راڤەبکەن و ناشتوانن ئەو هێزی راکێشانەی ئەو وێنەیە بۆ مێشکێك راڤەبکەن کە بەدەست داهێنانیەوە دەردی نەچەشتووە، ٣/١٨". باشلار لە ئاستی ئەو قسەیەی ناسراو و سۆفی مەشرەبی فەرەنسا (پییێر جان جۆڤ - Pierre Jean Jouve ١٨٨٧ - ١٩٧٦) هەڵوەستەدەکات کە دەڵێ: "شیعر گیانێکە شێوە (فۆرم)ێك دەکاتەوە"و جەخت لەسەر رۆڵی "شیعر" دەکات لە بەخشینی "گیان"بە "فۆرم"، بەوپێیەی ئەو فۆرمە ئەگەر پێشتریش زانرابووبێت یان دۆزرابووبێتەوە، ئەوا تەنها چەند شێوازێکی چەند پێکهاتەیەکی پووچە و ئەوە رووناکیی ناوەوەی شیعرە کە فۆرم لەو بارە رزگاربکات کە تەنها بابەتیك بێت لە بابەتەکانی عەقڵ و دەبێتە مایەی ئەوەی "گیان - رۆح - بێت و شێوە - فۆرم - بکاتەوە، تێیدانیشتەجێببێت و چێژی لێوەربگرێ ٣/٢١".

وێڕای پێداگرتن لەسەر "ئەرکی سایکۆلۆژی"ی شیعر و ئەو راستییەی کە "چامە بە چڕی و بەپیتیی خۆی لە ناخماندا قوولاّیی تازە دەبووژێنێتەوە"، بەلاّم میتۆد و بەتایبەت میتۆدی دەروونشیکاری Psycho analysis، بەلای باشلارەوە، ناتوانێ پەی بە رازە تایبەتەکانی "وێنەی شیعری" ببات و ئەمەش دەروازەی تێگەیشتنی ئەو راستییەیە کە "ئەو دەروونشیکارەی بووەتە قوربانیی میتۆدەکەی خۆی، بەناچاری پەنادەباتەبەر ئەوەی "وێنەی شیعری" بکاتە وێنەیەکی زادەی ئاوەز - عەقڵ -٣/٢٣". هەر لەم بوارەدا پێویستیی دەرککردنی راستیی موڵکداریی چامە (قصیدە) لەلایەن خوێنەرەوە دەکات، بەوپێیەی ئەگەرچی کەسێکیدیکە ئەو وێنە شیعرییەی بە ئێمە بەخشیوە، بەلاّم لە رێگەی خوێندنەوە دەبێتە موڵکی ئێمە، نەك هەر هێندە، بەڵکو هەستەکە لای خوێنەر هێندە بە قووڵی دەبینێ کە بڵێ: "وا هەستدەکەم من دەمتوانی وێنەکە دابهێنم". شیعری مەزن کاریگەریی بەسەر گیانی زمانەوە





هەیە.. "وێنەگەلێك بێداردەکاتەوە کە پێشتر سڕدراونەتەوە"، ئەمەش سروشتی چاوەڕواننەکراوی قسە - الکلام -ە، ئەوەی "شیعری هاوچەرخ ئازادیی ئاخنیوەتە نێو جەستەی خودی زمانەوە٣/٢٥".

بە هەمان ئەو شێوازەی ژنە شاعیر و چالاکی سیاسیی جووی ئەمریکا (موریێل روکەیسەر Muriel Rukeyser ١٩١٣ - ١٩٨٠)دووپاتیدەکاتەوە کە "وێنەی شیعری شتێکی راوەستاو نییە، بەڵکو لە کاتدا دەژی، بەهەمانشێوە کە شیعر دەژی، هەر کە یەکەمین پیتی ئەو وێنەیەش دەستپێبکات، ئەوا سەرجەمی ئەو رۆڵە دەگێڕێ کە وێنەکان و مۆسیقای کارەکە تێکڕا بخاتە جوولە٢٠/٣٣"، باشلار "ژیانی تەواوی وێنەی وێنەی شیعری"لە "درەوشانەوەی بروسکئاسایدا دەبینێت و "لەوەدا کە هەموو سنوورێکی دەرکپێکردن دەبەزێنێ ٣/٢٩".

لە دەرەوەی فەیلەسوف و تیۆریسین - خاوەن تیۆری -یە گشتگیر و خودی شاعیرە داهێنەر و قاڵبووەکانی هەردوو لایەنی داهێنان و بنەمای تیۆری، هەمیشە خەڵکانیدیکەی دۆستی راستەقینەی داهێنانی شیعریش هەبوون، لە دەرەوەی تیۆریزەکردندا، بۆچوونی گرنگیان لەبارەی "وێنەی شیعری"یەوە هەیە کە بە کەڵکی ئەم مەبەستەی ئێمەش دێت. شاعیر و وەرگێڕ و رەخنەگری ناسراوی ئەڵمانیا (ئۆگەست ڤیلهێلم شلیگڵ August Wilhelm Schlegel) دروشمێکی بەنێوبانگی هەبوو کە "شیعر بیرکردنەوەیە بە وێنە"و رەنگدانەوەی ئەمەش بەڕوونی بەسەر چەند گوتەیەکی بلینسکی/یەوە دیارە: "شاعیر بە وێنە بیردەکاتەوە"و "هونەر بیرکردنەوەیە بە وێنە٨/١٠". لە هەمان خولگەشدا ئەم قسەیەی س. د. لویس دەخولێتەوە: "سەرچاوەی بناغەیی شیعری تەواو وێنەیە، هـ. س/٨".

سوریالییەکان رەهەندی دەروونییان لە ئەدەب و هونەردا زاڵکرد. (ئەندرێ بریتۆن) لەدایکبوونی "وێنە" بە پرۆسەیەکی ئاڵۆزتر لەوە لێکدەداتەوە کە راهاتووین لەسەر وێناکردنی و پێیوایە"وێنە داهێنانێکی تایبەتی مێشکە و تەنها دەرەنجامی بەراورد و لێکچواندن نایەتەئاراوە، بەڵکو دەرەنجامی لێکنزیککردنەوەی دوو راستیی، کەم یان زۆر، لێکەوەدوورە. هێندەی پەیوەندییەکانی ئەو دوو راستییە لێکنزیکخراوەش دوورتر و راستگۆتر بن، هێندە ئەو وێنەیە بەهێزتردەبێت و دەتوانێ لەڕووی هەڵچوونەوە کاریگەرتربێت و مەرجی شیعربوون بەدیدێنێ١٦/١٠". دوکتۆر محەمەد مەندور/ی پسپۆڕ و رەخنەگری ناسراوی میسری پێ لەسەر زیندوویی و داینەمیکبوونی "وێنەی شیعری" لەچاو "وێنەی" وێنەکێش دادەگرێت و بۆ

بەرجەستەکردنی ئەو مەبەستە ئەم گوتەیەی (لیسینگ Lessing دێنێتەوە: "وێنەکێش ئاوڕ لە شوێن دەداتەوە و شاعیر ئاوڕ لە کات دەداتەوە.. وێنەکێش دەتوانێ وێنەی گوڵێکی تەڕ و گەش یان گوڵێکی سیس و ژاکاو بکێشێ، کەچی شاعیر دەتوانێ دوای ئەو وێنەیە بکەوێت - واتە لەڕووی مێژووییەوە -و وەکو خونچە پاشان گوڵ و پاشتریش کۆمەڵە پەڕەگوڵێکی هەڵوەریو وەسفیبکات١١/٣٤". ئەم دوورکەوتنە مێژووییەش هەڵبەتە هەرگیز بە شێوەی چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافیی لێکدابڕاو - بە کات و شوێن - ئەنجام نادرێت، بەڵکو هەمیشە گیان - ڕۆح -ێك لەئارادایە کە بەتەڕی و پاراوی و گەشاوەیی و بریسکەداری دەیهێڵێتەوە.

**وێنە شیعرییەکانی هەجوی شێخ ڕەزا**

لە هەجوی شێخ ڕەزادا بێپەروابییەکی سەیر بەدیدەکرێت دەگاتە ئاستێکی سەیری ئازادیی ڕەها و نەسڵمینەوە لە بەکارهێنانی هەر وشەیەك، بە هەر شێوەیەك بۆی ڕێکەوتبێ. ئەم بێپەروابییە لە شیعرە فارسییەکان، بەتایبەت کە هەجوی "شیعە"یان تێدادەکات و لە شیعرە تورکییەکانیشی کە هەجوی چەند دەسەڵاتدارێکی باڵای عوسمانی دەکات، ڕەنگە زەقیی زیاتریان پێوەدیاربێت، بەڵام بە بۆچوونی بەندە، لایەنی هونەریی هەجووە کوردییەکان، بەتایبەت وێنە شیعرییەکان، بەرزترە. بەپێچەوانەی بۆچوونی هێندێك لە "شێخ ڕەزاناسان"، بەندە پێمواپە شێخ ڕەزا هێندێك سنووری هەبووە نەیبەزاندوون.. لەوانەش خودی شێخ عەلیی براگەورەی بە شێوەی پەردە لەڕوو هەڵماڵراو هەجوونەکردووە و "ئەمین فەیزی"شی نەخستووەتە بازنەی هەجووەوە.

یەکێك لەو دیاردە گرنگانەی لە شیعری شێخ ڕەزادا بەدیدەکرێ ئەو کۆششە تایبەتەیە، کە جگە بەدیهێنانی ئەرکی جوانیگەری و تێرکردنی خوێنەر بە "وێنەی شیعری"ی بەتەواوی تازە و سەرنجراکێش - ئەمەیان ناوی قەناعەتپێهێنانی جوانیگەرانەی لێدەنێم -، ئەرکێکیدیکەشی گرتووەتەئەستۆ کە بریتییەلە قەناعەتهێنان بە خوێنەر بەوەی شاعیر پاساوی مەنتیقیی خۆی هەیە بۆ هەجوی ئەو کەسانەی بەکردەوە هەجویکردوون - ئەمەش ناوی "قەناعەتپێهێنانی مەنتیقی"ی لێدەنێم -، بۆ ئەمانەتیش دەڵێم ئەم پاساوهێنانەوەیە پتر لەو حاڵەتانەدا دەردەکەوێ کە شاعیر دەیەوێ هەجوی خزمە نزیکەکانی بکات. لەو شیعرانەیدا کە تیری شیعر - بە مەبەستی هەجو کردن - ئاراستەی هەر سێ مامی (شێخ غەفور، شێخ حەسەن و شێخ ساڵح) کراون، ئەو مەنتیقە زۆر بەزەقی و ڕوونی دیارە، ئەگەرچی پێدەچێ هەجوی (شێخ حەسەن و شێخ





ساڵح) زیاتر بۆ سوعبەت بووبێت و هەجوی (شێخ غەفور)یش کە گەیاندوویەتییە سەرئێسقان، دەرەنجامی ڕاستەوخۆی مەسەلەیەك بووبێت کە پێدەچێ شاعیر، لەڕووی دەروونییەوە زۆری بەدەستەوە ناڵاندبێ. سەرەتای ئەو پەیوەندییە لەم چەند دێڕەدا بەمشێوەیە خراوەتەڕوو:

گەردوون سنکیکردم[٦] و هێنامیە کۆیێ
میوانی لەکن مامە غەفوری لەجەرم کرد
خواستم کە بڕۆم بۆ سەفەری ڕۆم بە سیاحەت
نەیهێشت و دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرمکرد
دانیشێ بانەچێ، من کچی خۆم مارەدەکەم لێی
ئەو تالیبی دنیایە، ئەوا موعتەبەرمکرد
چووسا لەبەرم جوببە و فێسا لە سەرم فێس
نە فێسی لەسەرنام و نە جوببەی لەبەرمکرد
(٦/٤٦)

بەرواڵەت و لە یەکەمین تێروانینی سەرپێیدا، وا دێتەپێشچاو کە تائێرە شاعیر هەموو شتێکی لەجێی خۆی دانابێت.. گەورەترین پاساوی مەنتیقیی ئەم گلەیی و گازندەیەی شاعیر هەر ئەوە نییە کە تەنها ڕێگەی پێنەدراوە سەفەری ڕۆم "ئەستەمبووڵ" بکات، ئەگەرچی ئەوەش کەمنەبووە، بەتایبەت بۆ ئەو سەردەمەی شێخ ڕەزا کە ئەو شارە سەنتەری فەرهەنگ و دەسەڵات و شارستانی و تازەگەری "مۆدێرنیتە"و پاشماوەی شوێنەواری ئیمپراتۆریی ڕۆمان و شوێنی سەیران و کاتبەسەربردن و.. تاد، بووە، ئەوەش نییە کە نەکراوەتە "مەلا"و ئەو شوێنە شیاوەی پێڕەوا نەبینراوە، بەڵکو ئەوەیە کە کچی خۆی نەداوەتێ، چونکە ئەگەر کردبایە زاوای خۆی ئەوا، بۆ بەرژەوەندیی کیژەکەشی بووبا، هەم لەڕووی دارایی و هەم لەڕووی شوێن و پایەشەوە درێغیی لێنەدەکرد و بەوکارەش هەرگیز شێخ ڕەزا نەدەگەیشتە ئەوەی بەو شێوەیەی پاشتر هەجویکرد، هەجویبکات.

بەڵام ئەم چیرۆکە لایەنێکیدیکەی هەیە، کە پتر مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە، ئەویش وردەکارییەکانی ئەم شیعرەیە، با هێمنانە شییبکەینەوە: لە یەکەمین بەیتدا ئۆباڵی سەرجەمی

ئەو هەلومەرجەی ئێستای دەخاتەئەستۆی هێزێکەوە کە زۆر لەسەرووی سنووری دەسەڵاتی ئەو و هەموو کەسێکیدیکەشەوەیە. "<u>گەردوون سنکیکردم و هێنامیە کۆیێ</u>" وێنەیەکی بەتەواوی تازە و واتابەخش و پڕبەپێستی هەلومەرجەکەی شاعیرە. وشەی "سنك" بەتەنێ بەو دارە دەگوترێ کە سەرێکی بەو تەوقەوە بەستراوە کە بە ملی "سەگ"/ەوە دەکرێت و سەرەکەیدیکەی بە دەستی ئەو کەسەوەیە کە سەگەکە رادەکێشێ بەدوای خۆیەوە و بەهۆی درێژیی دارەکەشەوە دڵنیایە لەوەی سەگەکە نەك تەنها ناچارە ئەو ئاراستەیە بگرێت کە ئەو کەسە مەبەستێتی، بەڵکو لەوەش دڵنیایە کە ناشتوانێ گلاۆیبکات. لەئەنجامی ئەمەوە "سنککردن" بە دوو جۆرە" زەلیل و سەرشۆڕ"کردنەوە گرێدراوە، یەکەمیان داماڵین لە هەرجۆرە "ویست - ئیرادە"یەك و دووەمیشیان سەپاندنی ئەو سزایە بەهۆی گلاۆیی سزادراوەوە. شاعیر ئەگەر ئەم"سنککردن"ەی نەدایەتە پاڵ "گەردوون"ەوە ئەو مەعنایە هەرگیز هێندە قووڵنەدەبوو.. بۆنموونە، ئەگەر گوترابا "مامە غەفور سنکیکردم" ئەوا هێندە کاریگەر نەدەبوو چونکە ئەو کە هەجووکرا ئیدی پرۆسەی "سنککردنەکە پووچەڵدەبێتەوە بەهۆی ئەوەی خودی پرۆسەی "هەجو - داشۆرین" خۆی جۆرە "گلاۆ "و "بێزراو "کردنێکی بەرانبەرە لەلایەکەوە و لەلایەکیدیکەشەوە شێوە دەربڕینێکی راشکاوانەی "ویست"ە، چونکە ئەوەی ویستی لێدابماڵرێت هەرگیز ناتوانێ لە فەرمانی خاوەن دەسەڵات دەربچێ چ جای ئەوەی سووکایەتیی پێبکات. شاعیر ئەمەی لەگەڵ "گەردوون" پێناکرێ. خاڵێکیدیکە مەسەلەکە لەمەش خەستتردەکاتەوە. سنککردنەکە لە کەرکووکەوە بۆ کۆیەیە، شاعیر لە یەکەمین بەیتی ئەم شیعرەدا دەڵێ: "ئەو رۆژە کە تۆرام و <u>لە کەرکووك</u> سەفەرمکرد"، دوابەدوای ئەوەش راستەوخۆ ئەو بەیتە دێ کە باس لە "سنککردن"ەکە دەکات. ماوەی نێوان "کەرکووك"و "کۆیە"، بەتایبەت بۆ ئەو سەردەمەی ئەوان گەلێك زۆربوو بەتایبەت بۆ "سنککراو "ێك. خۆئەگەر ئەوەشی بخرێتەسەر کە شاری "کۆیە" بە قەرینەی سەرجەمی ئەو بەیتانەی "شێخ رەزا" کە "کۆیە" بووەتە بابەتیان، ئەوا پتر قووڵیی نەهامەتییەکەی شاعیرمان بۆ بەرجەستەدەبێت. ئەمەش، تێکرا، ئەوەمان بۆ روونەدەکاتەوە تا چ ئاستێك "شێخ رەزا" "مەعنای مەعنا"ی گۆڕیوە لەم وێنەیەدا.

وێڕای هەموو ئەوانەی ئاماژەیان پێکرا، پێداگرتنی شاعیر لەسەر "لە کەرکووك سەفەرمکرد" بۆی هەیە وا لێکبدرێتەوە کە ئەو "زەلیلی ریسوایی و سەرشۆڕی"یەی ئەم کە گەردوون بەسەریهێناوە، لەلایەن شاعیرەوە بەدەرەنجامی کردەوەی نابەجێ و خراپی خۆی بە





"بەجێهێشتنی کەرکووك، یان شێخ عەلیی براگەورەی" لەقەڵەمدراوە، پێدەچێ پتریش هی بەجێهیشتنی "شێخ عەلی" بێت، چونکە، هەر لە هەمان شیعردا دەڵێ:

هەر چەندە وتم کە وەختێ دیم نەخوەتی قەلبی

یارەب لەگەڵ شێخ عەلی بۆچی شەڕمکرد؟

کەواتە، لەلایەکەوە خۆی بە شایانی ئەو "سنککردن"ە دەزانێت و لەلایەکیتریشەوە، لەسەر بنەمای فەرهەنگە بناغەییە ئایینییەکەی بنەماڵەکەیان، وەکو لە دوو بەیتی پاش ئەوەدا دەردەکەوێ، تۆبە لەو "بەدگومانی"و هەڵەشەییەی خۆی دەکات.

لە بەیتێك پاش سکاڵای لە گەردوون، کە بە رواڵەت زۆر ساکار و راستەوخۆیە، شێخ رەزا داڕشتنێکی زۆر دەگمەن و نائاساییمان رووبەڕوودەکاتەوە "<u>دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کرد</u>". لێرەشدا نەك تەنها وێنەیەکی نائاسایی بەدیدەکەین، بەڵکو لە ئامێتەکردنی وشە خاوەن واتا سنووردارەکان جۆرە بێپایانییەکی واتا دێنێتەکایەوە و جۆرە دینامیکییەتێکی دەگمەن بە وێنە پێکهێنراوەکە دەبەخشێ. لێکدانەوەی سادەی "ئەهلی عەمامە" راستەوخۆ "مەلا"یە و رەنگە هێندێك لەو شێخانەش بگرێتەوە کە حەزیان لەوە هەبووە خۆ بە خاوەن هەردوو فەزڵی رەچەڵەك و زانستیش بنوێنن. "مەلا"ش بە شێوەیەکی ئاسایی بە رێبەری رۆحی و جێنشینی پێغەمبەر(ص) ناسراوە و بەگشتیش خاوەن پایەیەکی کۆمەڵایەتیی پارێزراو و گرێدراو بە جۆرە "پیرۆزی"یەکی دەگمەن بوون و ئەمەش هەم لەڕووی دەسەڵاتی رۆحی و کۆمەڵایەتییەوە رەنگدانەوەی خۆی هەبووە کە جاربەجارێ گەیشتووەتە ئاستی بەربەرەکانێکردنی ئاغا و شێخەکان، هەم لەڕووی داڕشتنی کەسایەتیی تایبەتی "مەلا"وە کە قسەزان و قسەکەر و زمانپاراو و خاوەن مەنتیقی تایبەت بوون و پیرۆزییەکەش جۆرە یەکلاکەرەوەییەکی بە قسەی "مەلا" بەخشیوە. لەسایەی ئەم لێکدانەوەیەدا با ئەوە بێنینەپێشچاوی خۆمان کە بە جارێك دووسەد "مەلا"ی لێکۆببنەوە، بەپێی راپۆرتی خودی شاعیر، بەڵام "**لەسەرم کرد**" دەبێ چ بگەیەنێ!؟

بەکارهێنانەکە نائاساییە. ئەگەر "عەمامەی لەسەرم کرد" با، ئەوا هیچ ئاڵۆزییەکی دروستنەدەکرد، بەڵام "ئەهلی عەمامە" چۆن لەسەردەکرێت!؟ وێڕای نائاساییبوونی بەکارهێنانەکە لەڕووی زمانییەوە، بەڵام بۆی هەیە بە یەکێك لە دوو شێوە لێکبدرێتەوە:

یەکەمیان، دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کۆکردەوە، واتە گەلەکۆمەی ئەو ژمارەیەی مەلایانی بۆ ڕێکخستم. دووەمیشیان، ئەو ژمارەیەی مەلایانی خستەنێو سەرمەوە، واتە هەموو ئەو قسەزانی و مەنتیق و قسەکەری و زمانپاراوی و یەکلاکەرەوەیی و زانایی ئەو ژمارە گەورەیەی مەلایانی خستەنێو سەرمەوە و جەنجاڵی و ورەبەزێنییەکی بڕستبڕی تێئاخنی و مێشکی پێپڕکردن، بەوەش بواری سەرپێچی و بێگوێییکردنم بۆ نەمایەوە. ئەمە چ شێوە دەربڕینێکی مەبەستی "گەیشتنە بنبەست"و "مایەپووچبوون"ە لە بەربەرەکانێکردنی ویستی مامی کە شاعیر دەیەوێ بڵێ لە سەرەتاوە پێچەوانەی خواستی ئەم بووە. ئەو مانا تازەیەی ئەم وێنەیە پێیئاشناکردووین بەکردەوە بەڵگەی بەکارهێنانی داهێنەرانە و ناچاوەڕوانکراوی زمانە بەشێوەیەك کە سەرلەنوێ، ریکۆر گوتەنی "ڕێگەدانە بە جیهانگەلێکی تازە بۆئەوەی شێوەی تێگەیشتنمان لەبارەی خۆمانەوە دابڕێژن"و سنوورەکانی توانای مرۆڤیش لە بەرگریکردن لەخود بەرانبەر دەسەڵاتە چاوەڕواننەکراوەکان کە بەکردەوە توانایەکی سنوورداره و مرۆڤ بە ئاسانی پەیپێنابات، دەکاتە ڕاستییەکی بەرجەستە.

ئەگەرچی بەیتی "دانیشێ، با نەچێ، من کچی خۆم مارەدەکەم لێی ئەو تالیبی دنیایە ئەوا موعتەبەرمکرد "تەنها گێڕانەوەی بۆچوونی مامی شاعیرە و لەڕووی هونەرییەوە هیچی تازەی تێدابەدیناکرێت، بەڵام گرێیەکی گرنگی کەسایەتیی شێخ ڕەزا دەکاتەوە کە بووەتە مایەی نامۆیی شاعیر لە سەرەتاییترین ژینگەی "ماڵی باوکی و تەکیەی سەردەم و پاش باوکی و ماڵ و تەکیەی زۆربەی خزمانی نزیکی". ئەم مەسەلەیە، لە چەندین شوێنی کتێبەکەیدا، دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی زۆر بە وردی ئاماژەیبۆکردووە کە دەقەکانی خۆی بێدەستکاری لێرەدا تۆماردەکەم، لەوانە: "بەڵام پاش باوکی، نە ئەم - شێخ ڕەزا - بەو ژیانەی دەروێشانە ڕازیدەبوو و نەیش مام و برا وەکو باوکی نازیاندەکێشا ٤/٤٠"، "شێخ ڕەزا وەکو شێخ قادر نەبوو - شێخ قادری فائض/ی برای کە شیعری سۆفییانەی بەرزی بە تورکی هەیە و بەکردەوەش ژیانی دەروێشانەی بۆخۆی هەڵبژاردبوو -، بەشداریی لە سامانی برا و مامەکانی بە مافێکی ڕەوای خۆی و کەموکورتی لە چاوی ئەوانی دەزانی ٤/٣٠". شێخ ڕەزا بەو مافناسییەی خۆی لە سامانی کەسوکاردا و بەو بێپەروایییەی لە پلارگرتن لە خەڵکان و داشۆرینیان و شێخ عەلیی برا گەورەی بەو هیوایەی شێخ ڕەزا بە ژیانی دەروێشانە قایلببێت و پلار لە کەس نەگرێت لەلایەکەوە و شێخ غەفوری مامی بەو پارێزکارییە و بەوەی، پێدەچێ پاڵپەستۆی ژنەکەی و شێخ ڕەشیدی





کوڕی بەسەرەوە بووە بۆ ئەوەی ملنەداتە داخوازی خەونەکانی شێخ ڕەزا، دەرەنجام ئەوەیان لێکەوتەوە سەرەتا کەرکوك جێبهێڵێ و ڕوو لە کۆیە بکات و پاشتریش لە مامی و خێزانی تووڕە ببێت و بە چەندین شیعری زۆر بێپەروایانەی هەجوکردنیان بەگشتی - لای کەم دوانیان زۆر بەنێوبانگن - وەڵامی نائومێدیی تەواوی خۆی لەوان بداتەوە و پاشانیش بگەڕێتەوە بۆ کەرکووك.. ئەم هەلومەرجە بەگشتی، بە چەندین وردەکاریی زانراو و نەزانراویدیکەوە، تانوپۆی ئەو نامۆییەن کە دوا جێپەنجەی خۆی بەسەر ڕووکردنی زۆر سەیری شێخ ڕەزا، بەشێوەیەکی سەرەکی، لە شیعری هەجو و داهێنانی گەورەشی لەو بوارەدا بەجێهێشتووە. ئەو گرێیەی لە گوتەی مامیدا: "ئەو تالیبی دنیایە ئەوا موعتەبەرمکرد" ئاماژەی ورد و ڕاستەوخۆی شاعیرە بۆئەوەی مام هەم بە باشی برازای خۆی ناسیوە: "ئەو تالیبی دنیایە"و هەم لەڕووی ڕاگەیاندنیشەوە، بەگەواهیی ئەو ژمارە گەورەیەی خەڵکی هەڵبژاردە - نوخبە ی کۆیە، ئەگەرچی زێدەڕۆیی نائاسایی لەو ژمارەیەدا کراوە، گرەوی خۆی بردووەتەوە کە ڕایگەیاندووە "ئەوا موعتەبەرمکرد - واتە شوێن و پایەی باشم پێبەخشی و ئارەزووی دنیاخوازیی ئەوم بەجێهێنا". لە بەرانبەریشدا، بە پێوەری داهاتووی پەیوەندییەکانی مام و برازا، لە هەردوو ڕووەوە شێخ ڕەزا بەشکستخواردوویی دەرچوو بەڵام ئەمیش بە هەجووەکانی حوکمی مەرگی ڕەمزی بەسەر مامیدا دەسەپێنێت، بەڵام بۆئەوەی زیاتر ئازاریبدات، لە هەجوێکیدیکەدا، بەرواڵەت بۆخۆی - مامی - نیمچە ڕووسوورییەك بەجێدێڵێ: "خۆی بەهەر صوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە"، کەچی پاش ئەوە لەگەڵ خۆی و ئەوانیدیکەش: "ئامۆژن و ئامۆزاکانی و پاشکۆکانیان" دەیگەیەنێتە سەرئێسقان.

هەر کە لەگێڕانەوەی ئەو گوتەیەی مامی دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ شاعیرێتیی خۆی:

"چووسا لەبەرم جوببە و فێسا لەسەرم فێس
نە فێسی لەسەرنام و نە جوببەی لەبەرم کرد".

با بە وریاییەوە لەم وێنە دەگمەنە وردببینەوە: چووسا، بەپێی لێکدانەوەی مامۆستا شکور مستەفا مەعنای "چرووسا، رزی و چرووسایەوە"(٧) دەبەخشێ و فێسا/ش - بە فیسا دەیخوێنێتەوە - بە مەعنای "خیسا و خووسا" لێکدراوەتەوە، لە شاری سنەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بە هەردوو مەعنای "خووسا"و "تلیسایەوە" بەکاردەهێنرێ کە دەگوترێ "چە بووگە

ڕەحمەت فیسا؟ لەڕوویەکەوە، هەڵبەتە پێش هەموو شتێك، شاعیر ئاماژە بۆ کاتی دووورودرێژی چاوەڕوانی و ئارامگرتنی خۆی و پابەندنەبوونی مامی بە بەڵێنە ڕاگەیەندراوەکەیەوە دەکات، بەڵام لە ڕێگەی کاریگەریی کات بەسەر "جوببە"و "فێس"ەوە بەوشێوەیەی هێندەی لەبەر و لەسەرکردوون  کە چیدی بە کەڵکنەماون. لەڕوویەکیدیکەوە ئاماژە بۆئەوە دەکات کە نەك تەنها مامی بەڵێنەکەی نەبردەسەر، بەڵکو بەرجەستەترین ڕواڵەتەکانی بە "مەلا"بوون"و "موعتەبەر"بوون"یش کە جوببە و فێس/ن و موڵکی خۆی بوون و مامی پێینەبەخشیون، چیدی بە کەڵکی ئەوە نەماون کە ببنە ڕواڵەتی گونجاوی مەبەستەکان. سێیەمین لایەنیش هەڵبەتە ئەوەیە کە "جوببە" هی ڕۆژهەڵاتە و "فێس"یش هاوردەی دەوڵەتی عوسمانی و ژێر کاریگەریی ڕۆژئاوا کەوتووانیدیکەیە، ئەمەش ڕەهەندێکی تازەی گۆڕان و گەشەسەندنی واتایە. ئایا ئەم وێنەیە لە هیچ واتایەکی کۆنی دەرك کردنەوە وەرگیراوە ؟، چ وێنەیەکی دیکە دەیتوانی وا هونەرمەندانە مەبەستی شاعیر ڕابگەیەنێت کە مامی هەم لە هەلی"مەلایەتی"و ئەو شوێن و پایە شایان "موعتەبەر"ەی نێو کۆمەڵی کوردەواری بێبەشیکردووە و هەم هەلی چوون بۆ ڕۆم و ژیانی سایەی ئەو فەرهەنگە و تەنانەت هەلی وەدەستهێنانی پلەوپایەی دەوڵەتیی هەڵێنجراوی ڕاستەوخۆ لەو فەرهەنگەش بێبەشیکردووە!؟

بەیتی پاش ئەمە:

"شەش مانگ بەم ئەفسانە گلی دامەوە لای خۆی

نەمزانی ملمبشکێ، تیاچووم، زەرەرمکرد"

راستەوخۆ و ڕاشکاوانە ئەو مەبەستە ڕووندەکاتەوە کە لە بەیتی پێشوودا لە ڕێگەی رزین و فەوتانی "جوببە"و "فێس"ەکەوە لەپەناوە ئاماژەیبۆکردبوو بەڵام شتی تازە ئەوەیە کە شێوازی مامی بۆ هێشتنەوەی لەو ماوە زۆرەدا بە "ئەفسان - ئەفسانە"و دەرەنجامەکانیشی بە"تیاچوون"و "زەرەرکردن" ناودەبات. ئایا مەبەستی شاراوە لە پشت ئەم "ناوبردن"انەوە هەیە؟

وشەی "ئەفسانە" وشەیەکی فارسی - کوردی/یە و لەبناغەدا هەر مەعنای "چیرۆك"و "گێڕانەوە - حیکایەت"و "داستان"و "سەرگوزەشتە" دەبەخشێت. وەکو ئاشکراشە هیچ یەکێك لەو وشانە ناتوانێ مەبەستی ئەو شوێنەی شاعیر ڕوونبکاتەوە، ئەگەرچی لە کوردەواریدا ئەفسانە





چیرۆك و سەرگوزەشتەیەکی تێکەڵ بە خەیاڵ و زێدەڕۆییە. ئەگەر وردتر بڕوانینە ئەو بەیتە دەبینین نووسراوە "بەم ئەفسانە - بە ئەم ئەفسانە". لە کوردیدا ئەم/ی ئاماژەی نزیك وا دەخوازێ وشەی ئاماژەبۆکراو بزوێن"ە"یەکی بەدواوە بێت، واتە لەوانەیە وشەکە "ئەفسان" بێت نەك ئەفسانە، ئەگەرچی لای شاعیران، پێویستیی شیعری، چ بۆ ڕاگەرتنی کێش بێت یان سەروا، نموونەیەکی زۆری وشە بۆسووككردنەوەمان، لە زمانی کوردیدا، دەخاتەپێشچاو. ئەگەر "ئەفسان" بێت، ئەوا ئەو وشەیە لە زمانی فارسیدا مەعنای "بەردەهەسان - ئەو بەردەی تا سنووری مووکردن چەقۆ تیژدەکات" دەبەخشێت، ئەمەش بۆئەم بەیتە هیچی ئەوتۆی لێناکرێندرێ. لە زمانی کوردیشدا، بەتایبەت لە گەرمیانی خوارەوە، ئەو وشەیە لەگەڵ وشەی "ئەفسسون" بەمشێوەیە ئامێتەدەکرا: "ئەفسان و ئەفسوون" کە پێکهاتەکە مەعنای "جادوو - سیحر - و فێڵ و.. تاد" دەبەخشی و خودی وشەی "ئەفسوون"یش لە زمانی فارسیدا ئەو مەعنایانە دەبەخشێ. کەواتە، ئەگەری ئەوە گەورەیە کە شێخ ڕەزا ئەم مامەڵەیەی نێوان خۆی و مامی بە "جادوو " لێکدابووبێتەوە و بەمەش ئەم شکستەی خۆی لەم سەودا - مامەڵە - ناسەرکەوتووەدا دەخاتە ئۆباڵی "جادوو "ەوە و هەم پاساو بۆئەو شکستەی دەهێنێتەوە و هەم بۆئەو هەجوە پڕزێدەڕۆییەی مامی. ئەگەر بەم لێکدانەوەیە قایلببین ئەوا ڕووبەڕووی "وێنەیەکی شیعری"ی ئێجگار نائاساییی دەبینەوە کە پتر مۆرکی دەروونی بەخۆوەدەگرێت و سیمای کەسێکمان بۆ دەخاتەڕوو کە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی بەرانبەرەکەی نابێتەوە، بەڵکو لە پشتی پەردەی جادووەوە، ئەمەش لە کوردەواریدا بە کاری مەردانە لەقەڵەمنادرێ.

ئەوەی ڕێگە بەوجۆرە لێکدانەوەیەی سەرەوە دەدات ئەوەیە کە شێخ ڕەزا، تەنانەت ڕاستەوخۆش، لە چەندین شیعردا کاری "ئەفسوون"و "جادووگەری"ی داوەتەپاڵ ئەو کەسانەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بوونەتە مایەی شکستی، لەوانە "مەلا" ناوێك کە لە یاریی "سینی وزەرف"دا لە "شێخ ڕەزای بردووەتەوە":

داوەکەی موویین و گوویینت بە کاری هیچ نەهات

گەرچی هەر لایێ دووسەد ئەفسوون و جادووی پێوەبوو

یان"حەمەی وەستا فەتاح" پیاوی جێیمتمانەی شێخ عەلی/ی برا گەورەی:

هەزار ئەفسوون و جادووی پێوەئاوێزانە ئەم ریشە

عیلاجی گەر ببێ با گووزە یا گوێزانە ئەم ریشە

لەڕاستیشدا "شێخ رەزا" بەڕوونی و بێپەردە، لە هەجوێکی "شێخ حەمە عەلییە کەڕە"ی برازای، کوڕی شێخ عەلی/ی براگەورەی هەردوو وشەی "ئەفسانە - نەك فسانە"و "ئەفسوون" تێکەڵدەکات و بەلایکەمەوە یەك ئاستیان بۆ بڕیاردەدات کە دەڵێ:

شێخ کە قودسییەتی پیرانی تەریقەت لەکنی

هەموو ئەفسانە و ئەفسوون و هەموو گاڵتەوگەمە بێ

لە دووەمین بەشی بەیتەکەشدا بەڕوونی ئاماژە بۆ شکستی خۆی لەو سەودایەدا، بەم وشە خاوەن دەلالەتە روونانە دەکات "نەمزانی ملمبشکێ، تیاچووم، زەرەرمکرد".

حەوتەمین بەیتی ئەو شیعرە تەنها هەرەشەیە و ئاماژەیە بەوەی شتێکی بەرانبەر "رەشید"ی کوڕی "شێخ غەفور"ی مامی کردووە، کە ناتوانرێ بەدڵنیاییەوە بزانرێ چییە(٨)، بەڵام لە هەشتەمین بەیتدا، یاخود لەو بەیتەوە، شاعیر دەرگای هەجوە هەرەتوندەکەی، لەم شیعرەدا، دەکاتەوە:

کارم تەڕئەبێ، ئەموت، ئەگەر لوتفی ببێ مام

ئەی لایقی ریشی، بە خودا، کاری تەڕم کرد

"کاری تەڕ" لە کوردیدا، بەپێی شوێن و شێوەی بەکارهێنانی، مەعنای کاری جوان یان بەکەڵك یان باش یان خۆش دەبەخشێ. خوی وشەی "تەڕ" لە رستەگەلێکی وەکو "تەڕی زانی"، "تەڕی پێکا"و "تەڕی خوارد"و.. تاد، بەگاڵتەپێکردنەوە، هەمان ئەو مەعنایانەی "باش"و "خۆش"و "جوان" دەبەخشێت. بەمەش، یەکەمین بەشی ئەم بەیتە تەنها خەونێکی شاعیر بووە لە سەرەتای هاتنی بۆ لای "مامە غەفور"ی. ئەم خەونە کە لە بناغەدا بە "ئەگەر"ێکەوە گرێدراوە، سەرجەمی ئەم شیعرە بەهۆی نەهاتنەدیی ئەو ئەگەرەوە هەڵبەستراوە. لە دووەمین بەشدا ئەندێشەی شاعیر، بە داهێنانی جیناسێکی تەواو بۆ "کاری تەڕ"، بە مەعنایەکی بەتەواوی جیاواز، وێنەیەکی زیهنیی بەتەواوی تازەی داهێناوە و تەنها فرێزێکیش کە رێنماییماندەکات بۆزانینی ئەو وێنەیە، لەم هەلومەرجە تایبەتەی هەڵچوونی رقی برازا بەرانبەر بە مامی، ئا ئەمەیە: "لایق بە ریشی". کردنی چ "کارێکی تەڕ" گونجاو و شیاو و شایانی ریشی کەسێکە کە کەوتبێتەبەر لافاوی رقی کەسێکیدیکەوە[٩]!؟ بێگومان شێخ رەزا دەیەوێ، بە





قسەی مەشهووری ناوچەی گەرمیان، بڵێ "ریامە ڕیشی"، "گوو "ش هەم دەکرێت و هەم شێی هەیە، واتە "تەڕ"ە. لە دوو بەیت پاش ئەوەدا راشکاوانە ئەو وشەیە بەکاردێنێ، بەڵام دەرحەق "لوتف"ێك کە نەیکرد، نەك "ریش"ی:

ئەی گووی خلە بەو لوتفە کە ئەو کردی

لەو مەرحەمەت و لوتفە ئەوا من گوزەرمکرد

بەڵام ئەو بەیتە تەنها هەڵسەنگاندنێکی دەروونیی بەرانبەرە و پاش دڵڕەقانەترین داشۆرینی ئەم شیعرە و پاش ناچاوەڕوانکراوترین وێنەکانیشی دێت. ئەو وێنەیە لەچ جۆرێکە!؟ باجارێك بەیتەکە بخەینەپێشچاو:

بۆ موجتەهیدان، گەرچی جەوازی نییە تەقلید

من موجتەهیدم، هاتم و تەقلیدی کەرم کرد

هیچ گرێیەك لە نێواندا نییە جگەلەوەی هەردوو چەمکی "موجتەهید"و "تەقلید" پێویستیان بە روونکردنەوەی مەعنای زاراوەیی "إصطلاحي"یان هەیە، چونکە هەردوکیان زاراوەی زۆر تایبەتی بواری لقەکانی ئایینی ئیسلامن (فروع الدين - افقه)ن. بەگشتی بەو کەسە دەگوترێ "موجتەهید" کە شارەزایی تەواوی لە قورئانی پیرۆز و لێکدانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ص)و کردەوەکانیشی - رەفتاری لە ئاستی مەسەلە شەرعییەکانی موسلماناندا - هەبێت و لە بواری مەنتیقیشدا، بەتایبەت لە قیاس[١٠]و هەڵێنجان (ألإستنباط)[١١]دا، پسپۆڕبێت و بزانێ چۆن پیادەدەکرێن و بەکارهێنانی ئەم لایەنانە بۆ هەڵێنجانی حوکمە شەرعییە تایبەتەکان لە بەڵگە هەمەلایەنەکانەوە. بەمپێیەش "موجتەهید" دەبێ هەم زانا و هەم کارامە و هەم خاوەن توانای عەقڵیی گەورە و ورد و هەمەلایەنە بێت. بەشێوەیەکی گشتیش دوو جۆر موجتەهید هەیە: موجتەهید بە رەهایی (المجتهد مطلقا) و موجتەهید لە بواری تایبەتدا (المجتهد في المسألە)و دیارە چەندین مەرجی گەورەیتریش هەیە، وێڕای ئەوەی دەرگای ئیجتیهاد بەتەواوی دانەخراوە، بەڵام زۆر کاریگەریی گەورەیان هەبووە، شانبەشانی ئەو مەرجانەیدیکەش کە باسمانکردن، لەوەی بیکەنە ئەرکێکی ئێجگار دژوار و ستەم. چەمکی "تەقلید"یش، لەهەمان

بواردا مەعنای پەیڕەویکردن لە موجتەهیدێك لە رەفتارکردنی شەرعیی هەمەلایەنە. ئێستا ئەگەر، بەپێی ئەو بەیتە، شێخ رەزا خۆی بە "موجتەهید" بزانێت و دیارە مەبەستی موجتەهید بە رەهایی/شە و وای لەقەڵەمدابووبێ کە لەو سەودایەی لەگەڵ مامی وەکو ئەوەوایە "تەقلید – پەیڕەوی"ی "کەر"ی کردبووبێ، ئایا ئەمە کردنەوەی دەروازەیەکی دارشتنی شێوازێکی تازەی تێگەیشتنی خود و دەوروبەر نییە!؟ ئەمە چ زمانێکە ئەم ئەندێشەیەی بۆ بووەتە دەرەنجام و چ ئەندێشەیەکە توانای داهێنەرانەی زمان بەمشێوەیە دەتەقێنێتەوە!؟ دەرەنجامیش، ئەمە چ بێپەرواییەکی بەکارهێنانی زاراوەکانی چ بوارێکە بۆ چ مەبەستێك!؟

دووەمین شیعر، کە یەکێکە لەو شیعرانەی بەگشتی هێڵی پاشەکشێی نەهێشتووەتەوە، ئەگەرچی بە رواڵەت ئەم بەیتەی بۆنی پاشەکشێی لێوەدێت:

خۆی بە هەر سوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە، لیك
رقی زۆرم لە رەشیدی کوڕی گەووادی هەیە

بەلاّم لەدرێژەی هەجوی رەشیدی کوڕیدا، سەرلەنوێ و بە دووپاتکردنەوەی جنێوێکی ناراستەوخۆی شیعری پێشوو راستەوخۆ لێرەدا دەڵێ:

تف لە کوز داکی لەکن خۆی کوڕی هێناوەتە(١٢) دەر
گوو بە ریش بابی لەکن خۆی ئەمیش ئەولادی هەیە
ئەمە گشت باوکی سەرمەشقی لەبۆداداوە
سەربەخۆ سالیکی رەهرەو نییە، ئوستادی هەیە

ئەم بەیتەیان یەکێکە لە تەنها سێ بەیتی ئەم شیعرە شازدە بەیتییە کە وێنەی شیعرییان تێدابەدیدەکرێت و پێدەچێ کەمیی وێنە لێرەدا بۆئەوە بگەڕێتەوە کە شێخ رەزای شکستخواردوو لەڕووی دەروونییەوە، شەڕی بوون و نەبوون و سەلماندنی ناسنامە و ئازادیی بڕیار رادەگەیەنێ. شاعیر لە شوێنێکیدیکەدا بەمشێوەیە باسی خۆی دەکا:

پابەندی خەلایق نییە تەبعم، وەکو خەڵقی
بێکولفەتم و رەندم و سەییاحم و سالووك





من (خواجەیی ئەحرارم)و ئامێزشی دنیا
هێشتاکە نەمیکردووەتە(١٣) بەندەیی مەملووك

شاعیر لێرەشدا هەر دەیەوێ رایبگەیەنێ گوایە خۆی لەوە دەپارێزی کە مامی، نەك دنیا، بیکاتە بەندە و موڵکی خۆی، ئەگەرچی لە خودی ئەو شیعرەدا شانازی بەوەوە دەکات کە "لە سایەی مامە غەفوردا کیسەی پڕە **لە زەڕ** و لێرەیی مەسکووك".

یەکێك لە سێ وێنەکەی ئەم شیعرە لە هەجوی رەشیدی ئامۆزایەوە دەستپێدەکات:

رەنگی کەر، دەنگی بەقەر، هەیئەتی سەگ، خوویی چەقەڵ
چاوی کوێر، مەخزەنی کێر، مەقعەدی پڕ بادی هەیە

کۆکردنەوەی ئەم هەموو خەسڵەتە ناشیرینانە لە کەسێکدا، بەمشێوەیەی لەم بەیتەدا دەکرێ، رەنگە وێناکردنیشی زۆر سەخت بێت چ جای ئەوەی بەرجەستەبکرێت لە وێنەیەکی دیاریکراودا. جگەئەمەش، با پێکهاتەکانی ئەم وێنەیە شیبکەینەوە: رەنگ لەلایەن چاوەوە و بە بوونی سەرچاوەیەکی رووناکی، جیادەکرێتەوە. دەنگ بە گوێ و لە سایەی بوونی نێوەندێکی گونجاوی گواستنەوەی دەنگ. هەیئەت – شێواز –، بە چاو لە رێگەی بەکارهێنانی زانیارییەکانی مێشکەوە. خوو بە چاودێریی رۆژانەی رەفتار، لە رێگەی پێوەرەکانی نەریتەوە. مەخزەن، بە رەچاوکردنی شێوەی گشتیی بەکارهێنانی شت، لە رێگەی چاودێریی رۆژانەوە و.. تاد. ئەم جۆرە وێنەیە کە ئەو هەموو هەست و کات و ئەزموون و نەریت و زانیاریی کەڵەکەبوو و ئەندێشە وردبینییەی بۆبخرێتەگەڕ، بێگومان هەر لەئەنجامی رقێکی ئەستوورەوە دێتەئاراوە و دروستبوونی لە واقیعیشدا، ئەگەر مەحاڵنەبێت، نیمچە مەحاڵە.

دووەمین وێنەی شیعری هەر لە درێژەی هەجوی "رەشید"دایە کە باوکیشی لەگەڵ تێوەگلاندووە:

ئەمە گشت باوکی سەرمەشقی لەبۆداداوە
سەربەخۆ سالیکی رەهرەو نییە، ئوستادی هەیە

ئەو سێ شوێنەی هێڵیان بەژێردا راکێشراوە سێکوچکەی سێینەیەکی مەعریفی و پیادەکاریی گرنگە و لەڕووی خستنەگەڕ - التوظیف -ەوە چەواشەکارییەکی روونی تێدابەدیدەکرێت. شاعیر رەوشتی بەرانبەرەکەی، وەکو لە بەیتی پێشوودا خراوەتەڕوو بەشێوەیەکی هێندە قێزەون و ناپەسەند، لە رێگەی کۆلاجێکی رواڵەتە هەرە ناشیرین و دزێوەکاندا، دەخاتەڕوو کە وێناکردنیشی دژوارە، وا لەم بەیتەدا چەمکێکی بناغەیی زۆر تایبەتی ئەزموونێك کە خۆی لە چەندین شیعردا زۆر بەرزی راگەرتووە، بۆئەم مەبەستە خراپە بەکاردێنێ، ئەو چەمکە "سالیکی رەهرەو "ە کە بە کەسێك دەگوترێ بەکردەوە دەستیکردبێتە ئەزموونی سۆفیگەری بۆ بڕینی مەقامەکان. ئەگەرچی دوو چەمکەکەیتر گشتین، واتە تایبەتی ئەو بوارە نین، بەلاّم بەتەواوی دەکرێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی ئەو بوارە بەکاربهێنرێن. مەحوی/ی هاوچەرخی شێخ رەزا هەردوو وشەی "مەشق - نەك سەرمەشق"و "ئوستاد"ی لە بەیتێکی خاوەن دەلالەتی گرنگی ئەم ئەزموونەدا بەکارهێناوە:

دەرسی عیشقم هەر لەکن پەروانە یا بولبول بووە<br>
بیگەمێ یان نەیگەمێ، هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم<br>
"دیوانی مەحوی ١١ م ٥ ل ٢٣٤"

وێڕای هەموو ئەمانەش، داینەمیکییەتێکی سەیر لەم وێنەیەدا هەیە.. کوڕێك بەو هەموو دزێوییانەی شاعیر داویەتییە پاڵی و لێرەدا هەر بەشێکی خراوەتەڕوو ئەگەر لەم رێگەگرتنەبەر و رەفتارەیدا "سەربەخۆ" نەبوویێت و "ئەمە گشت باوکی سەرمەشق"ی دادابێ، ئایا بەڵگەی ئەوە نییە کە "باوك" دەبێ لە "کوڕ" شارەزاتر بێت و نەیەوێ پاش خۆی ئەو "وەجاخ - ئاگردان"ەی کوێرببێتەوە!؟

دوا وێنەی شاعیر لە هەجوی پاشماوەی خێزانی مامەکەیدایە کە تێکڕا مێینەن - تەنانەت بە کارەکەریشەوە -و راستەوخۆ پاش ئەو بەتە دێ:

شەو و رۆژ چەپڵە بە کوز لێدەدەن و هەڵدەپەڕن<br>
فەرجیان تابوتەبی کوورەیی حەددادی هەیە





ئەندێشەی کێ ئەوجۆرە چەپڵەلێدانە دەخولقێنێت و وێڕای ئەوەش ئەو تینوتاوەی کوورەی ئاسنگەر بۆ چ مەبەستێ خراوەتەگەڕ!؟

ئەگەر ئەم وێنەیە لەم سەردەمەشدا بیریلێبکرێتەوە، نەك لە سەردەمی فیعلیی داهێنانیدا کە ئەگەری زۆر ئەوەیە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بووبێت، هێشتا سنووربەزێنییەکی گەورەی تێدابەدیدەکرێ، تەنانەت لەڕووی ئەندێشەشەوە.

***

## پەراوێزەکان

١. ئەم بابەتە لە بناغەدا، بەپەلە بۆ "میهرەجانی شێخ رەزای تاڵەبانی" ئامادەکرا، کە ساڵی ٢٠٠٤ لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری/ی ئیدارەی ئەو سەردەمەی سلێمانی/یەوە، لە شاری سلێمانی، بەسترا. بۆیە بابەتەکە پتر کۆمەڵە سەرنجێکی خێرای نووسەر بوو کە بە بۆچوونی چەند کەسێکیدیکە پاڵپشتکرابوو. هەر ئەوکاتەش چەندین نووسەری ئامادە لەو میهرەجانەدا داوایان لە نووسەری بابەتەکە کرد کە جێی خۆیەتی لە داهاتوودا تێروتەسەلتر بکرێتەوە. ئەم کۆششەی ئێستا وەلاّمدانەوەیەکی ئەو داخوازییەی ئەو بەڕێزانەیە. ناونیشانی ئەو سەردەمەی بابەتەکە ئەمە بوو: "ئەرکی وێنەی شیعری لە هەجوی شێخ رەزادا"، بەلاّم ئەگەر بەمشێوازەی لێرەدا پەیڕەویلێکراوە، سەرجەمی هەجوەکانی شاعیر کرابایە مەبەستی لێکۆڵینەوە، بابەتەکە زۆر لەوە درێژتر دەبوو کە بۆ بلاّوکردنەوە لە گۆڤاردا بشێ، بۆیە تەنها "وێنە شیعری"یەکانی دوو هەجوی "شێخ غەفور"ی مامی شاعیر هەڵبژێردراون و لەو دوو هەجوەشدا شاعیر شەڕێکی دوو قۆناغیی لەنێوبردنی رەمزیی بەرانبەرەکەی خستووەتەڕوو بۆیە بۆ هەر قۆناغێك زەمینەیەکی لەباری خۆی هەڵبژاردووە و دەتوانرێ بە باشی رەوتی گەشەسەندنی هەڵچوونەکانی شاعیر لە رێگەی وێنەکانیەوە دیاریبکرێت.

٢. شێخ رەزا خۆی، لە بەیتێکی تایبەتیدا ئاماژە بۆ شوێنی جیاواز و تایبەتی"ئەمین فەیزی"دەکات و دەڵێ:

که تەشریفی شەریفی هات، ئەمین فەیزی، بەمیوانی<br>
لە عوهدەی شوکری دەرناچم، مەگەر خۆم کەم بە قوربانی<br>
( ٤ /٩٢)

خوێنەری بەڕێز بۆ وەدەستهێنانی زانیاریی زیاتر دربارەی شوێنی ئەمین فەیزی لە دڵ و شیعری شێخ رەزادا، دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکەی د. موکەڕەم تاڵەبانی (شێخ رەزای تاڵەبانی، ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕی و شیعری) لاپەڕەکانی (٨٥ تا ٩٢) کە چەند شیعرێکی فارسی و تورکییان لەبارەی ناوبراوەوە تێدادەبینێت لەگەڵ وەرگێڕدراوی ئەو شیعرانە بۆ کوردی.

٣. سی جەی ئەدمۆندز ( ١٨٨٩ - ١٩٧٩ Edmonds , Cecil John) سیاسەتمەدار و دیپلۆماتی

ناسراوی ئینگلیز کە لە ساڵی ١٩١٣/ەوە لە میزۆپۆتامیا و ئێراندا خزمەتی وڵاتەکەی کردووە. ساڵی ١٩١٣ یاریدەدەری فەرمانڕەوای سیاسی بووە لە میزۆپۆتامیا - وڵاتی نێوان دووڕووبار -، لە ساڵانی ١٩١٥ تا ١٩١٩ لە ئێران بووە، پاشان گەڕاوەتەوە عێراق بۆئەوەی لە ١٩١٩دا ئەرکی تایبەتی لە کوردستانی باشووردا پێبسپێردری. لە ١٩٢٢دا کراوەتە راوێژکاری کۆلۆنییەکان و چاودێری کارگێڕی لە کەرکووك و سلێمانی لە دەوڵەتی عێراقدا و ساڵی ١٩٢٤ کراوەتە فەرمانڕەوای سیاسی لەگەڵ فەرماندەی سەربازی لە کوردستاندا. لە ساڵی ١٩٢٥دا بووە ئەفسەری پەیوەندیی لەگەڵ لیژنەی تایبەتی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە مەسەلەی دیاریکردنی سنووری نێزان تورکیا و عێراق، ئەو خاڵەی بووە مایەی دابچڕاندنی ویلایەتی مووسڵ (کوردستانی باشوور) لە تورکیا و لکاندنی بە عێراق. پاشتریش، لە ساڵی ١٩٣٢دا بووە راوێژکار و نوێنەری بەریتانیا لەگەڵ لیژنەی تایبەتی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی سنووری عێراق و سووریا. لەگەڵ چەندین پۆستی گرنگ لە حکوومەتی عێراقدا، وەکو راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ و.. تاد.

٤. لە سەرجەمی ئەم نووسینەدا پڕسوودم لە هەردوو نوسخەی چاپکراوی (دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی)و (شێخ محەممەدی خاڵ، چاپەکەی سلێمانی، وەرگرتووە، کە لەم قەسیدەیەدا جیاوازیی زۆریان لەنێواندا هەیە. بەداخەوە لە مەسەلەی هەجوی کاکەییەکاندا شێخ رەزا بە رق و کینەوە مامەڵەی کردووە و ئەمەش، بە بۆچوونی بەندە، بووەتە مایەی ئەوەی خۆمان پتر لە ئاستی جنێونامەیەکدا ببینین نەك هەجوێکی هونەری. هەر بەهۆی ئەمەشەوە ئاستی هونەریی ئەو شیعرە نزمترە لە بەشی هەرەزۆری هەجووەکانی. بۆیە ئەو بۆچوونەی ئەدمۆندز بە رەوا نازانم کە ئەم شیعرە بکرێتە دیاریکردنی پایەی هەجوی شێخ رەزا لەنێو ئەدەبی گەلانیدیکەدا.

٥. ئەو کەرەستانەی بۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئامادەبکرێن، بەلایکەمەوە، بریتینلە زانیاریی مێژوویی تەواو و باوەڕپێکراو لەبارەی خودی شاعیر و سەردەمەکەی و ئەو کەسانەی هەجویکردوون، چ مەبەست شەڕەشیعر بووبێ یان دەرەنجامی هەڵچوونێکی نائاسایی، زانینی هۆکارە دەروونییەکانی شاعیر راستیی ئەو رووداوانەی بوونەتە مایەی لەدایکبوونی ئەو شیعرانە، سنوورەکانی راستی و سوعبەت لەو هەجوانەدا، پایە فەرهەنگی - ثقافي -یە راستەقینەکانی سەردەمەکە، چ فەرهەنگی کۆمەڵایەتی بێت و چ پەیوەندیی بە ئاستی خوێندەواریی شاعیر و کەسانی هەجوکراوەوە هەبێ، زانینی سنوورەکانی دەستێوەردانی دەسەڵاتە جیاوازە دەوڵەتی و تیرەگەری و بنەماڵەیی و رۆحی - ئایینی - و فەرهەنگی و سنوورەکانی ململانێی ناوخۆ و دەرەکی و کاریگەرییەکانیان، عەقڵێکی شیکاریی ورد و لەسەرخۆ و ئارام و بابەتی و چەندین کەرەستەیدیکە کە ئەرکی لێکۆڵەرەوەی ئەو بوارە گەلێك دژوارەدەکەن، ئەگەر مەحاڵنەبێت.

٦. لە نوسخە چاپکراوەکەی کوردی - مەریوانی (١٩٣٥) نووسراوە (سەبوك - سووك بە فارسی)و نوسخەکەی (شێخ عەلی تاڵەبانی) (سینگی - لاتینی Singi)، خوالێخۆشبوو (شێخ محەممەدی خاڵ) (سنەکی، بە لاتینی Sıneki)و نوسخەکەی (د. موکەڕەم تاڵەبانی) (سنگی Sıngi)، راستییەکەشی (سنك، Sınık)ە کە بریتیبووەلە دارێکی درێژ بە تەوقێکی ملی سەگەوە دەبەسترایەوە، سەگی پێناچاردەکرا بەدوای ئەو کەسەدا بروات کە سنکیکردووە و ئەویش هێندە لەو سەگەوە، بەهۆی درێژیی دارەکەوە، دووربوو کە ترسی"گلاۆبوون"ی نەبوو. بۆیە پتر لە هەمووان ئەوەی مامۆستا "خاڵ"لە راستییەکەوە نزیکە. لە بەشێکی ئەم لێکدانەوەیە





قەرزاری مامۆستا "ئەمین شوان"م.

٧. بروانە: مستەفا (شکور)، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، چ ٢، ٢٠١٠، ل ٥٠.

٨. بەپێی رەوتی گۆڕانی توندیی زمانی داشۆرین، دەبێ ئەم شیعرەی تائێستا بە لێکدانەوەیەوە خەریکین پێشتر نووسرابووبێت و ئەو شیعرەیدیکەش کە بە بەیتی "مامەکەم قەحپەژنە دەوڵەتی شەددادی هەیە تاڵعی راهبەر و بەختی خودادادی هەیە"، پاشتر نووسرا بووبێت، چونکە لەمەی دواییدا داشۆرینەکەی گەیاندووەتە ئەوپەڕی توندی و هیچ بوارێکی بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ مامی و هیچ ئەندامێکی خێزانەکەی نەهێشتووەتەوە، دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی/ش هەمان بۆچوونی هەیە ٤/١٤١ تا ١٤٤".. بۆیە ئەو ئاماژەیەی "ئەو کارە کە دەربارەی رەشیدی پسەرم کرد" نابێ ئاماژەبێت بۆ ئەمەی دوایی. رەنگە مەبەستی لەم چوارینەیە بێت کە دەڵێ:

رەشـــە رەششـاشی کــــــەری رەش بە رەشـــــــت
تا رەشـــــت ماوە رەش و ســــــوور بە رەشـــــــت
چڵ و چێــــــوی چەمی رەشـــــــنەش بە رەشـــــت
بە لەشـــــت هەم بە بەشـــــــت هـــەم بە رەشـــــت
"٦/٤٥"

٩. مامۆستا شکور مستەفا ئەو "کاری تەڕ"ە بە "تڕ" لێکدەداتەوە، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی/٥٠"، بەڵام لەلایەکەوە "تڕ" ناکرێت و لەلایەکیدیکەشەوە چۆن بە "تەڕ" وەسفدەکرێت!؟

١٠. لەڕووی زمانەوانییەوە وشەی قیاس/ی عەرەبی هەمان مەعنای "پێوان"ی کوردی دەبەخشێ، بەڵام هەرگیز گونجاونییە لەم شوێنەدا بەوشێوەیە وەربگێڕدرێتەسەر زمانی کوردی. ئەو قیاس/ەی لێرەدا مەبەستە یەکێکە لە زاراوە و چەمکە تایبەتەکانی بواری مەنتیق (Logic)ی ئەرستۆ کە بە (Syllogism)و جۆرێکە لەئەنجامگیری لە رێگەی هەڵێنجان (الإستنباط)ەوە. بەلای ئەرستۆوە قسەیەکە لە دوو قسەوە، بەپێی یاسای پێویستی - الضرورة - پێکدێت، واتە دەرەنجام لە دوو کەیسی سەرەتاوە وەدەستدەهێنرێ. قیاس/یش چەندین جۆری هەیە.

١١. هەڵێنجان (الإستنباط - Deduction) خۆگواستنەوەی مێشکە لە کەیس - قضية - یەك یان چەند کەیسێکەوە، کە سەرەتا - مقدمە -ن، بۆ کەیسێکیدیکە کە دەرەنجامە، بەپێی یاساکانی مەنتیق. ئەو خۆگواستنەوەیەش مەرج نییە لەتێکڕا - کل -یەوە بۆ پارچە - جزء - بێت، بەوشێوەیەی لە ئیستیقرا - Induction-دا بەدیدەکرێت، یان لەگشتییەوە بۆ تایبەتی. ئەمیش چەند جۆرێکی هەیە کە لەسەر بناغەی دڵنیابوون لە راستیی سەرتاکانی لە هەمووکاتێکدا، یان بەڕاستزانینیان لەکاتێکی دیاریکراودا، جیادەکرێنەوە.

١٢. لە نوسخە چاپییەکەی (خاڵ)دا نووسراوە "هێنایەدەر" کە دیارە هەم لەگەڵ سیاقی گشتیی شیعرەکە، لەڕووی زمانەوانییەوە و هەم لەگەڵ کێشی شیعرەکەشدا ناگونجێ، بروانە: "شکور مستەفا، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چ ٢، ٢٠١٠، ١٠٦ - ١٠٧".

١٣. لە نوسخەکەی (خاڵ)دا نووسراوە "کردۆتە"، کە ئەمیش لەگەڵ کێشدا ناگونجێ، هـ. س/ی پەراوێزی ژمارە( ١٢)، ل ٨٢ - ٨٣.

## سەرچاوەکان

به هۆی نەگونجانی خانەڕیزکردن (ترتیب)ی سەرچاوە کوردی و عەرەبی و تورکییەکان کە ناونیشانەکانیان بە پیتی عەرەبییە لەگەڵ سەرچاوە ئینگلیزییەکان، ناچاربووم سەرەتا ئەوانەی لای خۆمان و پاشتر ئینگلیزییەکان بنووسم و زنجیرەی ژمارەشیان هەمان شێوازی تێدارەچاوکراوە.


١. ئەدمۆندز (سی. جەی)، شێخ رەزای تاڵەبانی، شاعیری داشۆری کورد، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سەلمان عەلی، دووەمین پاشکۆی (دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی)ی شێخ محەممەدی خاڵ.

٢. الإمام (غاده)، غاستون باشلار، جماليات الصورة، التنوير للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت ط١،٢٠١٠.

٣. باشلار (غاستون)، جماليات المكان، ترجمة: غالب هلسا، المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر و التوزيع، بيروت ط٢، ١٤٠٤هـ - ١٩٨٤م.

٤. تاڵەبانی (د. موکەڕەم)، شێخ رەزای تاڵەبانی، ژیانی، بیروباوەڕی، شیعری، دەزگای چاپ و بلاْوکردنەوەی ئاراس، هەولێر چ١، ٢٠٠١ز.

٥. ترزی باشی(عطا)، کرکوکلی شیخ رضا و تورکجه شعرلری، بولوم ١ - ٣، برنجی باصقی، کرکوك، ٢٠٠٦م.

٦. خاڵ (شێخ محەممەد)، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی (کۆکردنەوە و لێکدانەوە)، بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بلاْوکردنەوە، سلێمانی چ١، ٢٠٠٤ز.

٧. رەسووڵ (پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەددین مستەفا)، شێخ رەزای تاڵەبانی، چاپخانەی (علاء)، بەغدا چ ١، ١٩٧٩ز.

٨. رۆژبەیانی (مەلا جەمیل)، چاوخشاندنێ بە چاپی تازەی دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانیدا، یەکەمین پاشکۆی (دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی)ی خاڵ.

٩. سەججادی (عەلائەدین)، مێژووی ئەدەبی کوردی

١٠. محمد (الولي)، الصورة الشعرية في الخطاب البلاغي و النقدي، المركز الثقافي العربي، بيروت ط١، ١٩٩٠.

١١. مندور (محمد)، خليل مطران، دار نهضة مصر، القاهرة.

١٢. Aristotle , Poetics , Translated by S. H. Butcher , Orange Street Press , USA , 1998.

١٣. Atchley(J. Heath) , Charles Simic`s Insomnia: Presence , Emptiness , and the Secular Divine. Literature & Theology , Vol.







17 , No. 1 , March 2003.

١٤. Casey(Edward S.) , Imagining: A Phenomenological Study , Indian University Press , Bloomington 1976.

١٥. Kearney , R. , On Paul Recoeur: The Owl of Minerva , Ashgata Publishing , England 2004.

١٦. Pietrzekoska(Anna M.) , In Search of Definition of Poetic"Image", An Overview of Literary Tradition and Modern Criticism. Zaszety Naukowe Universytetu Rzeszowskiego Filologiczna , Studia Anglica Resoviensial , Zyszet 6 \ 2006.

١٧. Ricoeur(Paul) , Creativity in Language , Philosophy Today , Vol. 17 , No. 4 , 1973.

١٨. Hermeneutics on the Human Sciences , Essays on Language , Action and Interpretation , Translated by: J. B. Thompson , Cambridge University Press , Cambridge and New York , 1981.

١٩. Imagination in Discourse and in Action , in(From Text to Action) , Essays in Hermeneutics || , Translated by: Kathleen Blamey & John B. Thompson , Northwestern University Press , Evanston , Illinois , 1991.

٢٠. Rukeyser(Muriel) , The Life of Poetry. Paris Press , Ashfield , 1996.

٢١. Whally , G. , Poetic Process , Meridian Books , Cleveland & New York , 1967.

٢٢. Zalipour(Arezou) , From Poetics to the Romantics: Conceptual History of Imagination in Poetry. The 2009 Proceedings of International Conference on Social Humanities(ICSSH 2009) , IACSII Publishing , Singapore , 2009.

٢٣. Phenomenological Studies of Imagination in Poetry: An Introduction. From(3L , The Southeast Asian Journal of English Language Studies , Vol. 16 , No. 1 , 2010.

# چەند باسو خواسیکی شیخ رەزا تاڵەبانی

## لە زاری موکەرەم تالەبانی و سەلاحی شیخ شەرەف

ئا: جەمال لولو

لە یادی سەد ساڵەی وەفاتی شاعیری گەورە شێخ رەزا، دیارە ئەم باس و بەرنامەیە ئامادەکراوە. من نامەوێ زۆر لەسەر ژیان و شیعرەکان و هەڵوێستەکانی شێخ رەزا بدوێم، چونکە زۆر مامۆستایکەش لەو باسەدا بەشدارن، بەتایبەتی ئەگەر جەنابی "دکتۆر موکەڕەم" قسەبکات، وەك عەرەب دەڵێت: (لایفتی ومالكُ فی المدینە) کە بەڕاستی ئەو چەند جیلێك لە ئێمە نزیکترە و شارەزاترە و دیراسەتی لەسەری هەیە، تەنها ئەوەندە دەڵێم شێخ رەزا یەکێك لەو شاعیرە گەورە و لەندەهۆر و بەدەسەڵات و زەبەلاحانەی کوردە کە بەڕاستی لە قۆناغێکی تایبەتیدا بووەتە سومبولی شیعری کوردی و بەتایبەتیش بووەتە رەمزێك بۆ شاری کەرکوك و دەتوانم بڵێم بووەتە هێمایەك بۆ سەلماندنی کوردبوونی کەرکوکیش، چونکە مەملەکەتێك ئەگەر نەتەوەیەك لەوێ رەسەن نەبن، زمانیان نەبێ، عادات و تەقالیدی خۆیان نەبێ، کەلتور و ئیدیۆم و مەسەلەی تایبەتی خۆیان نەبێ، زۆر زەحمەتە شاعرێك چەند زیرەکبێ چەند بەتوانابێ، بتوانێ پیاوێکی وەك شێخ رەزا بەم شیعرە گەورانەوە لێی دەرچێ. شێخ رەزا ئەگەرچی لە تەبەقەی سەرەوە بووە لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و بەدەسەڵات بووە، بەڵام خۆی وەك سەعلوکێ وەك شۆڕشگێڕ و هەڵگەڕاوەیەك لە دژی دەسەڵات و زروف و عیلاقاتی ئەو سەردەمە و کە هەر لە سوڵتانەوە هەجوی هەیە تا فەزڵی ئەعزەم و تادێتە سەر والی و تادێتە سەر شێخەکانی خۆیان و تەکیە و عادات و تەقالیدە خراپەکانیشدا.. بەڕاستی شێخ رەزا زاهیرەیەکی تایبەتییە لە شیعری کوردیدا، بەتایبەتی لە مەدرەسەی بابان و لە گەرمیانی کوردستان، لە تایبەتییە گەورەکانی شێخ رەزا ئەم هەجوانەیە کە کردوونی، چونکە شیعری هەجو زۆرن لە کوردیشدا هەنە، بەڵام کەس نەگەیوەتە شێخ رەزا، کەس ئەوانەی شێخ رەزا وتوونی نەوتراون، بۆیە من نامەوێ دیسان لەسەر ئەو باسانە درێژەپێبدەم، تەنها دەمەوێ لەسەر ئەوە بدوێم لەسەر ئەم سێ کوچکەیە کەرکوك و شێخ رەزاو کۆیە.





بەینی کەرکوك و کۆیە لە مێژووێکی کۆنەوە تێکەڵاوییەك و هاتووچۆ و هاموشۆ هەیە، دەتوانم بڵێم نزیکترین شار لە کۆیە لە شارە گەورە مێژووییەکان کەرکوك بووە، هەر لەسەردەمی کۆنەوە کە گۆتییەکان لە جنوبی عیراق گەڕاونەتەوە کەرکوك لە دەمزێی کۆیە شاریان دروستکردووە کە رەنگە کاولەکانی ساتۆقەڵای ئێرە بێت. لە هەموو سەردەمەکانیشدا تا ئەم عەسرەی ئاخریش کە کەرکوك مەرکەزی لیوای شارەزوور بووە، دیارە کۆیە سەر بە کەرکوك بووە جگەلەوەش هاموشۆی گەرمیان و کوێستانی کوردستان یان موکریان و گەرمیانی کوردستان یان بەشی ئێران و تا بەشی عەرەب و عیراق و بەغداش ئەم رێگایە لە کۆیەوە بۆ کەرکوك رۆیشتوە و لەوێشەوە بەرەوخوار رۆیشتووە، بۆیە دیارە تێکەڵاوی و هاموشۆ هاتووچۆی یەکترکردن هەبووە.

لەم دواییەش عیلاقەیەکی گەورە لە بەینی بنەماڵەی تاڵەبانی کە وەکو شێخ و خاوەن تەکیە و پیاوی خوێنەوار لەگەڵ بنەماڵەی جەلیزادەکان و لەگەڵ پیاوە گەورەکانی کۆیەدا دروستبووە. هەر لەم عیلاقەیەدا دیارە ئەگەر باسی شێخ رەزا بێنینە کایەوە شێخ رەزا بە فەقێتی هاتووەتە کۆیە لای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە خوێندوویەتی و پێموایە ئیجازەکەشی هەر لە ئەو وەرگرتووە. لەوکاتەدا کە شێخ رەزا هاتووچۆی کۆیەی کردووە کۆیە شارێکی پڕ لە هاتووبات و پیاوی گەورە و شیعر و ئەدەبیات و رۆشنبیرییەکی گەورەی لی\چبووە، لەوانە "ئەمین ئاغای ئەختەر" کە خاوەنی دیوەخانی ئەدەب و مەقام و گۆرانی بووە، لەوانە "حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە"، لەوانە شێخ "حاجی قادری" شاعیر و خاوەن بیری نەتەوایەتی کوردی و "کەیفی جوانرۆیی"و دەیان و سەدانیتر.. مەسەلەن دەرهەق بە حاجی مەلا عەبدوڵڵا دەڵێ:

((حاجی کاکە وڵڵا لە ئادەم فیلترە
با وجودی مەرتەبەی پێغەمبەری
ئەو بەسەد شەیتان لە کۆیێ دەرنەچوو
ئەو بە شەیتانێ لە جەننەت دەرپەڕی))

یان لەگەڵ دیواخانی ئەمین ئاغای ئەختەردا کە بەشی زۆری کاتی خۆی هەرچەند تەکیە و ماڵی مامی لێرە بووە هەتا ئەوکاتانەش کە بەینیان باشبووە، چونکە شێخ رەزا پیاوی دونیا و

بەزمورەزم و شیعر و گۆرانی و مەقامەت و ئەوانە بووە.. زیاتر لەگەڵ ئەمین ئاغا گونجاوە و لە دیواخانەکەی ئەو کاتیانبەسەربردووە و هەندێجار شەڕەشیعر و سوعبەتیشیان کردووە، جارێك شێخ رەزا تێکەوتووە لەسەر ئێسترەکە و دەڵێ بەلایا بڕۆی ئەمینە، ئەویش دەڵێ ئەگەر واشیلێبکەی رەزایە.

شێخ رەزاش هەندێجار نەقدیکردووەو دەڵێ:

خواستم لە کوڕی حاجی بەکر کۆنە دوکانێ
بۆ تەجرەبە نەیدێیە من و دێی بە دیانێ

و زۆر شتیتر لە بەینی ئەم دوو پیاوە هەیە، لەبەینی بنەماڵەکانیشیاندا هەیە. هەروەها لەسەر"لامع"ی شاعر کە واسیتەی بۆکردووە لای قازی لە عەسکەری بیکەنە مەلا و ناجیحیبکەن، ناجیحیاننەکردوە، شێخ رەزا ئاگرێکی لەسەر پشتی قازی کردووەتەوە و دەڵێ:

شێخ رەزا بێت و لەسەر تۆ هەجوی قازیی کۆی بکا
سەیریکە چیی پێبکا، دۆم بێ و کڵاش بۆ خۆی بکا
چونکە غەدریکرد لە "لامع" شەرتە قازی وا (...)
هەر گەنوگوویێ لە زگیایە بە جارێ رۆیبکا

لەگەڵ کەیفی جوانرۆیش شەڕەشیعریان کردووە، بەڵام دیارە کەیفی وەك شوکری فەزڵی دەرەقەتی شێخ رەزا نەهاتووە لە شەڕەشیعرەکاندا قسەیپێگوتووە بووە بە شەڕیان و دیارە شێخ رەزا غەدری لە کەیفی کردووە و لەسەر ئەوە کەیفی لە کۆیە دەرکراوە و رۆیشتووە. هەر لە دیوەخانی ئەمین ئاغای کوڕی حاجی بەکر ئاغادا، سینوزورفانەیان کردووە شەوان، شێخ رەزا لەگەڵ "سمایلی مەلا خالید" کە پێموایە خەزووری ئەمین ئاغایە شەریکبوون و دوای ماوەیەك سمایل بە سەفەر رۆیشتووە، لەو مودەتە شێخ رەزا و تاقمەکەی دۆڕاندوویانە تا شەوێك مەلا سمایل پەیدابووەتەوە ئیتر بردوویانەتەوە، جارێکیتر شێخ رەزا لە شیعرێکدا وەسفی ئەو بردنەوە و سەرکەوتنەیە دەکات و وەسفی مەلا سمایلی مەلا خالید دەکا ئەو شەوە کە یارییەکە دەبەنەوە و دەڵێت:





هاتەوە ئاشووبی دەوران، مەردی مەیدان هاتەوە
شێری یەزدان، لەندەهووری ئیبنی سەعدان هاتەوە
بۆ قڕانی لەشکری ئەعدا لەناکاو میسلی بەرق
ئاسەفی ساحێبقڕان، لەعلی خەفتان هاتەوە
هەوری میحنەت، بارەشی غەم، سەیلی ماتەم بوو تەمام
بەرقی تابان، میهری رەخشان، رەعدی غوڕڕان هاتەوە..

هەتا دوای شیعرەکەی کە بە گاڵتە و سوعبەتێکی خۆشەوە باسی سەرکەوتنی خۆیان و هاتنەوەی مەلا سمایلی دەکات.

شێخ رەزا لە عیلاقەیەکیتریدا لە کۆیە، شێخ رەزا بە هەرزەکاری لە کۆیەوە بووە دیارە سەردەمی دڵداری و ژیانی لاوێتی خۆیەتی، دیارە دڵیسووتاوە و عەشقبازی لەگەڵ کچانی کۆیەدا هەبووە و لەوەشدا کۆمەڵێك شیعری غەزەلی کە پێموابێ بەشی زۆریان لە کۆیە بووە، بۆنموونە یەکێکیان لێرە هەر بە ئاشکرا ناودەبا و دەڵێ:

شاری کۆیە کە لەبالەب لە بتی غونچە لەبە
گەر فەلەك لێیبگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەرەبە
دولبەرانی بەمەسەل هەروەکو ئەشعاری منن
کامی لێدەگەری دەبێژی ئەمەیان مونتەخەبە
غارەتی عەقڵی منی کردووە زیبا سەنەمێ
عاریزی رەشکی قەمەر، قامەتی نەخلی روتەبە
نەوزەر ئاسا و فەریدوون سیفەت و سەلم رەوش
شێرمانەند و سیاوەش وەش و خەسرەو لەقەبە..

تا ئاخرییەکەی کە دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

.. خواستی لێی ماچێ رەزا کافرە نەیدا و وتی:
ئەی خودا لەم کوڕە شێخزادەیە چەند بێئەدەبە

شیعره غەزەلییەکانی شێخ ڕەزا زیاتر لە سەردەمی کۆیەدا وتراون، لەوەیدا دەفەرمێ:

دەمکوژێ حوکمە دەزانم بەخودا دەردی حەبیب
وەرە سا بەشقی خودا دەس لە یەقەم بەردە تەبیب
وەرە دەستێ بخەمە گەردەنی بللوریت
تاوەکو سفرە لە داخا بدڕێ ورگی ڕەقیب
تالعم نەحسە دەترسم کە بە ئازاری فیراق
بمرم و ڕۆژێ نەبێ دەوڵەتی وەسڵم بە نەسیب..

پێمواب‌ێ هەمووی لە کۆیە و بۆ کچانی کۆیە وتوون کە شێخ ڕەزا هاتووەتە کۆیە جگە بۆ خوێندن و جگەلەوەی هاتووە بۆ دیواخانەکان و مەرکەزێکی ئەدەبی و هونەری و ماڵێ مامی "شێخ عەبدولغەفور" لەوێ بووە.. جارێك کە هاتووە ویستویەتی بڕوا بۆ ئەستەمبوڵ، شێخ غەفوری مامی پێیوتووە مەڕۆ و وەرە کچی خۆم مارەدەکەم لێت و ئەتۆ موعتەبەرت دەکەم، وەك لە شیعرێکا وەسفیدەکات:

ئەوڕۆژە کە تۆرام و لە کەرکوك سەفەرم کرد
مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب حەزەرم کرد
گەردوون سنگی گرتم و هێنامییە کۆیە
میوانی لەکن مامە غەفوری لەجەرم کرد
خواستم کە بڕۆم بۆ سەفەری ڕۆم بە سیاحەت
نەیهێشت دووسەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کرد
دانیشێ، نەچێ من کچی خۆم مارەدەکەملێی
ئەو تالیبی دونیایە ئەوا موعتەبەرم کرد
چورسا لەبەرم جوببە و فیسا لەسەرم فێس
نە فێسی لەسەر نام و نە جوببەی لەبەرم کرد
شەش مانگێ بەم ئەفسانە گلی دامەوە لای خۆی
نەمزانی ملم بشکێ تیاچووم، زەرەرم کرد..





تا ئاخیری شیعرەکە تووڕە دەبێت و هەجوێکی گەورەی مامی دەکات، هەر لەسەرئەوە چەند جارێ لە چەند شیعریکەیا هەجوی مامی کردووە:

چایەکەی مامە غەفورم زەردە وەك میزی نەخۆش
ئیحتیاجناکا بە ئاگر هەر بە دوو تڕ دێتەجۆش

زۆرجار کۆیش بەرکەوتوون لەسەر ئەمەی، دەڵێ:
هەرکەسێ ئەسڵ و میزاجی فیتنەیی و بەدگۆییە
دەستی حیزیشی هەبێ ئەمجا بە تەحقیق کۆییە))..

کە ئەمانە هەمووی لەداخی ئەم قەزیەیەتی کە مامی کچەکەی نەداوەتێ و هەجوێکی زۆر خراپی کردووەو دەڵێ:

مامەکەم قەحبەژنە دەوڵەتی شەددادی هەیە
تالعی ڕەهبەر و بەختێکی خودادادی هەیە
دوو سێ دێی داوەتێ سوڵتان بەپێی ئیتعامی تەعام
هەر یەکێکی بە قەدەر خەزنەیێ ئیرادی هەیە
چ فرووش و چ زورووف و چ زەیاع و چ عەقار
لە هەموو جنسێ مەتاعی سەدوهەشتا دێ هەیە
ئەم هەموو گەنج و خەزێنەی هەیە هێشتاکو تەرەس
نە هەوای جوود و نە مەیلی کەرەم و دادی هەیە
ڕەسمی ئابائی کیرامی بووە ئاساری سەخا
نە لە ئابائی حەیا و نە لە ئەجدادی هەیە
گەر سەروڕیشی پیاوانەیە باوەڕ مەکە پێی
باتینی جوولەکە و زاهیری زوهھادی هەیە
خۆی بە هەر سوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە لێی
رقی زۆرم لە ڕەشیدی کوڕی گەوادی هەیە..

دوای شیعرەکە زۆر دێتەخوارێ بەسەر حەرەمیشیدا و بە کچەکانیشیا، بەڵام لە یەکێك لە ژنە قەدیمییەکانی خۆمانم بیستووە کە ناوی ژنەکان دێنێ هی ماڵی شێخ غەفوری مامی فاتمە و عاسیمە و ئامان و پەریزادی هەیە، ناوی گوڵەخان ناهێنێ کە ئەو کچەیە شێخ رەزا بەتەمای بووە و بۆیە لە شیعرەکەدا جنێوپێنەداوە.. بۆیە جارێکیتر شێخ رەزا دەگەڕێتەوە کەرکوك و پەشیمانی نیشاندەدات و مامی لێرە موعتەبەریناکات و ئیعتباری بۆ ناکات، زیاتر ئامۆزایەکانی "شێخ رەشید"و "شێخ نوری" ئەم غەدرەیان لێیکردووە.

جا باسی شێخ رەزا دیارە دوورودرێژە و ئاسارێکی زۆریشی لە کۆیە هەیە چ لە تەکیەی تاڵەبانی لە کۆیە و چ لە دیواخانی حاجی بەکر ئاغا و لەگەڵ ماڵی جەلی زادەکاندا، لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە و هەتا مەلای گەورەش کە زۆر دژی شێخ و خەلافات بووە بەڵام لەگەڵ شێخ عەلی و شێخەکانی کەرکوکدا عیلاقاتی باشبووە.

شێخ رەزا زۆر هەڵدەگرێ لەهەر لایەنێکی ژیانی و لە هەر لایەنێکی شیعرەکانیدا، بەتایبەتی لە هەجویدا چەندین کتێب و چەندین دراسەتی لەسەر بکرێ، من پێموایە ئەو شیعرەی کە لەسەر شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی تەخمیسیکردووە لوتکەی شیعری غەزەلی شێخ رەزایە:

دڵی بردم بە ناز و عیشوە دیسان شۆخی عەییارێ
فریبیدام بە سیحری چاوی خۆی مەحبووبی سەححارێ
لە هیجرانا تەقمکرد ئەی رەفیقان کوا مەددەدکارێ
ئەمان مردم عیلاجێ، سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ
ویسال، یا قەتڵ و یا تەسکین، لە هەرسێ بۆمبکەن کارێ
بە دەوری نێرگسی مەستی کەسێ نەیماوە مەیلی مەی
لە بۆ شەهدی لەبی لەعلی دەناڵێنێ دڵم وەك نەی
لە تابی ئاتەشی عەشقی بکەم داد و فیغان تا کەی
ئەوەندە سووتام ئەسلاً تابی فەریادم نەما سا دەی
رەفیقان نیوەسووتن ئێوە، نامەرد عەرزە هاوارێ..
.. گوتم وەك سورمەیە بۆ چاوی عاشق خاکەکەی ژێرپێت
لە ئولکەی حوسندا ئەگەر لافی شایی لێبدەیت لێتدێت





گوتی مەیخانە بێداییم بە یادی چاوی مەستم جێت
سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من بپرسنلێت
بلێ کێشاویەتییە مەیخانە چاوی بێچووە عەییارێ..
.. نەماوە رەونەقی بازاڕی عەقڵ و دانیش و وردی
بە پوولێ نایکڕم لەم عەسرەدا عیلمی "ئەبی وەردی"
لە ئەشعاری رەزا پەیدێیە ئاساری جوانمەردی
دوڕ و یاقوت دەبارێ لەو کەلامەی شیرنی "کوردی"
خوا سا کوا لە دنیادا قەدرزانێ خەیردارێ

**دکتۆر موکوروك تاڵەبانی**

شێخ رەزای تاڵەبانی کوڕی شێخ عەبدورەحمان تاڵەبانییە کە ناسناوی (خالصە). شێخ عەبدورەحمان کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانە کە لە دێی قرخ و تاڵەبانی نزیك چەمچەماڵ دادەنیشت، نازناوی تاڵەبانی لەو دێیەوە وەرگرتووە. شێخ ئەحمەدی تاڵەبان کوڕی مەلا مەحمودی زەنگەنەیە کە لە مەنتیقەی زەنگەنە لەسەر ئاوەسپی دێیەك هەیە (رەمەزان مامکە)یان پێدەوت، خەڵك ئەو دێیەیە، لەو دێیە دادەنیشت. مەلا مەحمود زەنگە کوڕی یوسف ئاغای زەنگەنەیە، یوسف ئاغای زەنگەنە هەم ئامۆزای میر سمایل بوو هەمیش زاوای بوو. میرنشینی میر سمایل لە قەرەداغەوە تاکو کفری تاکو دوز و ئەو مەنتیقەیە لەژێر ئیدارەی میر سمایل بوو، عوسمانییەکان بایەخیان پێدەدا چونکە لەو وەختەیا یەکەم ڕای بابانەکان لە مەنتیقەی مەرگە سەریانبەرزەوەکرد، عوسمانییەکان ترسیانلێنیشت کە ئێرانییەکان پشتگیریاندەکەن. ئەو سنوورەی لە بەینی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران هەبوو دائیمەن هەراوهوریەی لێبوو، لەبەرئەوەی ئەمانیش پشتگیری میر سمایلیان کرد، نفوزێ زۆریان دایێ. میر سمایلیش یوسف ئاغای ئامۆزای و زاوای کردە قایمقام لە قەرداغ، مەلا مەحمود زەنگەنە لە قەرەداغ لەدایکبووە کە باپیرە گەورەی شێخ رەزایە، لەپاش ئەوەی کە بابانییەکان نفوزیان پەیداکرد نەکەوتنە ژێر نفوز ئێرانییەکانەوە، لەژێرەوە پەیوەندییان لەگەڵ عوسمانییەکانیشدا پەیداکرد، عوسمانییەکان توانیان رایانکێشنە لای خۆیان، لەو فەترەیشا میر سمایل کۆچیدواییکرد، کوڕەکانیی میر سمایلیش لەنێوان خۆیاندا رێکنەبوون، دوانیان رۆیشتن پەنایانبردە میرانی بابان، مەنتیقەی میرنشینی میرسمایلیش بەسترایە

مەنتیقەی میرنشینی بابانەکانەوە کە تاکو کفری دەڕۆیشت.
شێخ ڕەزا بە شیعرێك باس باوباپیری خۆی دەکات دەڵێت:

خودا وەختێ کە حەز بکا بەندەییێکی خۆی بکات خۆشنوود
لە ڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بەپێی خۆی شاهیدی مەقسوود

مەقسەدی شێخ ئەحمەدی هیندی لاهورییە کە لە سورداش ئێستاکە نێژراوە و مەرقەدەکەی لەوێیە، لە هیندستانەوە شەش مانگ دەگەڕێت تا خاکی کوردستان..
..خوا شێخ ئەحمەدی هیندی ڕەوانکرد بۆ مەلا مەحمود..

شێخ ئەحمەدی هیندی کوڕ شێخ عەبدورەزاق حەمەوییە، کە ئیعتباری دەکەن لە یەکێك لە ئەحفاد شێخ عەبدولقادری گەیلانی، هاتە ئەم وڵاتە لەم وڵاتەوە بەرەو سنە بڕوات، بەڵام لەم وڵاتە لە سورداش مایەوە، مەلا مەحمود زەنگەنە پەیوەندی لەگەڵ پەیداکرد و تەریقەتی قادری لە شێخ ئەحمەدی هیندی لاهورییەوە وەرگرت، شێخ ئەحمەد لاهوری و مەلا مەحمود زەنگەنە لە مەنتیقەی سورداش نفوزێ زۆریان پەیداکرد، لەبەرئەوەی بابانییەکان نەیاندەویست لەو مەنتیەقەیە یەکێك نفوز پەیدابکات، لەبەرئەوە مەلا مەحمود مەجبوربوو گەڕایەوە مەنتیقەی زەنگەنە، بەڵام لەپاشان بیستی کە شێخ ئەحمەدی هیندی لاهوری تیرۆرکراوە، گەڕایەوە لە سورداش بەخاکیسپارد.

مەلا مەحمود گەڕایەوە وڵاتی زەنگەنە، شێخ ئەحمەدی کوڕی کە نەیتوانی لە مەنتیقەی سورداش بمێنێتەوە هاتە دێی (قرخ و تاڵەبان) کە لای چەمچەماڵە، ئەو دێیە تاکوئێستەش هەر موڵکی تاڵەبانییەکانە، موڵکی ئەولاد شێخ ڕەزایە، نازناوی تاڵەبانی لەو دێیەوە وەرگرت، ناو خۆی نا "شێخ ئەحمەد تاڵەبان". هەروا هاتووە شێخانی تەریقەت تاڵەبانی لەپێش ئەوەیا ڕێگەی تەسەوف و ئەمانە بگرن ڕێگای زانستی شەریعەتی ئیسلامییان گرتووە، یەعنی بە سیلسیلە مەلا بوونە هەمیش شێخ بوونە، مەلا مەحمود زەنگەنە شێخ ئەحمەد تاڵەبان، شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخ پێکەوە لەلای "شێخ مارف نۆدێی"ی باوك کاك ئەحمەد، شەریعەتی ئیسلامی خوێندووە و تەواویکردووە، لەپاشا چووەتە بەغا لەژێر دەست "مەلا





عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی" کە یەکێك لە دانا گەورەکانی شەریعەتی ئیسلامی ئەو وەختە، شەهادەی عیلمی وەرگرتووە، شێخ ئەحمەد یانزە کوڕی هەبووە یەکێك لەوانە "شێخ عەبدوڕەحمان"ە کە باپیری ئێمەیە، یەکێك لەوانە "شێخ عەبدولغەفور"ە کە باپیری "مام جەلال"ە، "شێخ مارفی کۆسە" هەیە کە بەرزنجەیی بووە زۆر ڕەفیق شێخ ئەحمەد تاڵەبان بووە، ڕۆژێك دێ بۆلای دەڵێ یا شێخ چەند کوڕت هەیە، دەڵێ قوربان یانزە کوڕم هەیە، دەڵێ وەڵایی شێخ ئەحمەد زەکات دەکەوێتە سەرت، چونکە شێخ مارف کۆسە کوڕی نەبووە، دەڵێ قوربان عەبدوڕەحمان لەژێر دەستمە ناتوانم بتدەمێ، ئەودوایی هەمووی لە خزمەتتە، دەڵێ وەڵاهی عەبدوڕەحمانم دەوێ، ڕێکدەکەوێ لەگەڵیا شێخ عەبدوڕەحمان دەبات، بەهرەی تەسەوف لە شێخ مارف کۆسە وەردەگرێ، وەختێ کە ئەویش کۆچیدواییدەکات دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك و بۆ دێی تاڵەبان، لە دێی تاڵەبانیش لەژێر گوشاری بەرزنجییەکان و میرانی بەبە ناتوانێ لەویانە بمێنێتەوە، دەچێت ساڵێك لە دێی ساویل تەپە دەمێنێتەوە لە نزیك کەرکوك، تاکو تەکیەیەك مزگەوتێك ڕێکدەخات تا بێتە کەرکوکەوە. مەلا مەحمود کە کۆچیدواییدەکا دەیبەن لە تەکیەی کەرکوك دەینێن، ئەو وەختەش کە مزگەوت دەکەن عیبارەت بۆ مزگەوت بەسیت بووە عیبارەت بووە لە ساباتێك و جۆگە و حەوزێك ئاو ئیتر هیچیتری تیانەبووە، مەرقەدەکەی شێخ مەحمود لەوێبووە. لەپاش شێخ مەحمود، شێخ ئەحمەد تاڵەبان لەجێی دادەنیشێت، کە ئەویش کۆچیدواییدەکات دەیهێنن لای شێخ مەحمودەوە دەینێژن تائێستاکەش مەرقەدیان لەوێیە مەوجودە.

"شێخ عەبدوڕەحمان" چوار کوڕی بووە، "شێخ عەلی" کە لەپاش خۆی بووە پۆستنشینی، "شێخ عەبدولقادر" کە باوکی شێخ عیزەدین و شێخ نورەدین و شێخ فەیزوڵڵایە کە لە مەنتیقەی داوەدە دادەنیشتن و کەسوکاریان ئێستا لەوێیە، "شێخ عەبدولواحد" ئەویش کوڕی بووە لەگەڵ شێخ ڕەزا، لەم عائیلەیا تەنها هەر شێخ ڕەزا شاعیر نەبووە، شێخ عەبدوڕەحمان باوکی شاعیرێ گەورە بووە، بەڵام هەرچی شیعری هەیە شیعری تەسەوفە کە بە چوار زمان شیعری وتووە، شیعرەکانی زۆر بەرزە بە فارسی بە تورکی بە عەرەبی بە کوردی.. هەرچەنێ شیعرە کوردییەکانی ئەوەنە دەسنەکەوتووە کەمە، بەڵام تائەووەختە هەر بە لەهجەی زەنگەنە کە لەهجەیە گۆرانییە قەسەیاندەکرد، شیعرەکانیشی کوردی هەر بەو لەهجەیە بووە، شێخ عەبدوڕەحمان زۆر دۆست "مەولەوی" بووە، عیلاقاتێ ڕۆحی زۆر لە بەینیانا هەبووە، دایمەن هاتووچۆی تەکیەی تاڵەبانی کردووە لەلای شێخ عەبدوڕەحمان میوان بووە و دۆستی بووە.

لەم عائیلەیە بێجگەلـە شـێخ عەبـدورەحمان "شـێخ عەبـدولقادریش" شـاعیر بـوو، بـەڵام شیعرەکان ئەو تەنها بە زبان تورکییە چونکە خوێندنی دراسەتی لە کـەرکوك بـووە لەبەرئـەوە بـە زبان تورکی شیعری وتووە. شێخ رەزاش کە شاعیرە بەڵام شێخ رەزا لە فارسی و لـە تورکـی و لـە کوردی و لە عەرەبی دەستێ باڵای بووە لە دانانی شیعر.

ئەمە شێخ رەزایە کە کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان کوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵـەبان کـوڕی مـەلا مەحمودی زەنگەنە کوڕی یوسف ئاغای زەنگەنەیە، لە نەوەی شێخ رەزا سێ کـوڕی بـووە، "شـێخ محەمەدی تاڵەبان" کە نازناوی "خالیسی"یە، "شێخ محەمەد ئـەمین"، "شـێخ عەبـدوڵلا"، شـێخ محەمەد تاڵەبان لە وەختی خۆیا کە ئینگلیزەکان لە شەڕی یەکەمی جیهـانی عیراقیـان داگیرکـرد، مودەتێ بووە بە قایمقام (رانیە) لەپاش ئەوە بووە بە قایمقـام (کفـری)، ئـەوەی کـە زانـراوە یەکـەم قوتابخانە لە قەزای کفرییا شێخ محەمەد خالیسی کردوویەتییەوە بیناکەشی تاکو ئێستا مەوجودە، شێخ محەمەد ئەمین بە گەنجی مردووە و ئەولادی نییە. شێخ محەمەد خالیـسی دوو کـوڕی هـەبوو، "شێخ سەعید" و "شێخ سادق"، شێخ سادقیش بـە گـەنجی مـرد، شـێخ سـەعیدیش یـەك کـچی لەجێ ماوەتەوە، بەڵام شێخ عەبدوڵلای کوڕی سێ کوڕی هەبووە، "شـێخ حەسـەن" کـە مودەتـێ موتەسەریف بووە لە سلێمانی و دوای بووە وەزیر لە زەمـان عەبدولکـەریم قاسـم، "رەحمـەتوڵلا" موقەدەم بووە لە جـەیش مورافـق مـەلیك غـازی بـوو. "عـەلی" قایمقـام چەمـچەماڵ بـووە، لـە چەمچەماڵ عەمریخوایکرد. ئەمانـە لـە ئـەولادەکانی شـێخ رەزا بـوون. ئێستاکە کەسێك وایـان نەماوەتەوە چونکە شێخ حەسەن ژنی نەهێنابوو کە عەمریخوایکرد، عەلیش هەروەها، رەحمەتوڵلا یەك کچێکی شوێن مایەوە ئەویش عەمریخوایکرد.

شێخ رەزا شیعرەکانی هەر هەجوو نـەبووە لـە دەرگـای هـەموو جـۆرە شـیعرێکی داوە لـە هەمووشیا دەستێ باڵای هەبووە، بە شاعیرێکی هەجوکەر ناسراوە، بەڵام خۆی لە شیعرێکا دەڵـێ من ناسراوم بە شاعیرێکی هەجوکەر بەڵام من وا نیم، دەڵێ:

ئەوەی کە لە (...) بێ بە پەنجە شەکری بۆ وردەکەم

ئەویش لە (...) بێتە بەبەرزی دەدەم تەوقی سەریان

یـەعنی دەڵـێ ئـەوەی مـستەحەقی هـەجوە، هـەجویکردوە، نـەك هـەروا جنێوفرۆشـی و ئەمانە.. شێخ رەزا حەیاتی وابووە لە کەرکوك ژیاوە، لە قرخ و تاڵەبان لەدایکبووە، بەڵام لەئاخرا





لەگەڵ باوکیا چووەتە کەرکوك لە بەرتەکیە کە گەڕەکێك بووە، ئەوە نییە کـە هـەموو عەشـیرەتی تاڵەبان بن هەمەچیزەن، وەکو ئەوەی ئەو عایلانەی کە لەویانەیا دەڵێ:

قالە تەینالێ و ئەمین سورداشی و ئەحەی سۆفی زەنگەنە و..

لە عەشیرەتی موختەلف و مەناتیق بووەنە لەوێ هـەموو وەکـو عایلەیـەکیان لێهـاتووە. تەکیەی تاڵەبانیش وەنەبێ تـەنها جێگـەی زیکـر و عیبـادەت و ئەمـە بـێ، دیواخـانی تیـابووە. ئەوانەی کە دیواخانیان هەبووە لە کەرکوك، لەوانە شێخ رەزا کە ژوورێـك و هـەیوانێك هـەبوو تـا ئەم ئاخیرەش مابوو، ئەوە دیوەخانی شێخ رەزا بوو، شێخ محەممەد عەلیش مێوانـداری عەشـایەر و ئەمانەی دەکرد، "شێخ حەبیب تاڵەبانی" کە مودەتێك عوزو مەجلیسی تەئسیسی بوو لـە پاشـا بووە قازی دوای بووە رەئیس بەلەدییـەی کـەرکوك هـەتاوەکو تـەقاعودکرا لـەم ئاخرەیـا، ئەویـش دیواخانی هەبوو، مەئموران و پیاوماقوڵان و ناسراو ئەمانـە دەهـاتن لای ئـەو دادەنیـشت. شـێخ عەلی باوکیانیش کە برا گەورەی شێخ رەزایە ئەویش پۆستنشین بوو کە مەشـغوڵ بـوو بـە نوێـژ و تاعەت و زیکر و عیبادەت و ئەمانەوە تەکیەی تاڵەبانی دەبردبەڕێوە.

شێخ عەبدوڕەحمان لە ناحیەی موڵکایەتی هیچی بۆیان بەجێنەهێشتبوو، تەنها دێی قـرخ و تاڵەبان نەبێت، قرخ و تاڵەبان کەوتەدەست شـێخ رەزا. لـە دانیـشتن لەگـەڵ ئەوانـەی کـە لەبـەر تەکیەن و ساڵانی خوێندنی لە سلێمانی و لە کۆیە و لە سلێمانی مودەتێ لـە خزمـەت مامۆسـتا ناسراوەکان خوێندی و لە پاشا چووە کۆیە لەژێر دەست مەلا ئەسعەد جەلیزادە ئیجـازەی عیلمـی وەرگرت. تەبعەن لە کۆیە و لە سلێمانی لەگەڵ خەڵکا تێکەڵبووە. چووەتە سنە مودەتـێ لەوێـش خوێندوویەتی، لە بەغا مودەتێ، لە بەرتەکیە بووە، بەرتەکیـەش هیـچ ئیـشوکاریان نـەبووە هـەر دانیشتوونە قسەی گاڵتەوگەپو ئەمانەیان کردووە، لەویانەیا ئەو قـسانەی کـە کردوویـەتی تاکـو شـێخ عەبـدوڕەحمانی بـاوکی مـابوو هـەجوێکی وای لێنەبیـسترابوو قـسەیەك وا هەڵماراویـشی لێنەبیسترابوو، هەرچی شیعرەکانیشی هەیە گشتیـشی هـەر ئیلاهیبـات و تەسـەوف و ئەمانەیـە هەتا شیعری بەسەر عەبدولقادری گەیلانیا وتووە و کە ئێستاکەش لەسـەر دەرگاکـەی شـیعرێکی نووسراوە: ((ان بارەگاهێ حەزرەتێ غەوزێ سەقەلەین هەست))

هەجووەکەی ئەوەبووە لەگەڵ خەڵکا تێکەڵبووە، لـەو فەترەشـا دائیمـەن شـەڕە عەشـایری هەبووە لە بەین ئەو عەشایرانەیا، مەسەلەن هەجو عەشیرەت داوەی کـردووە، هـەجو عەشـیرەت

کاکەیی کردووە، هەجو عەشیرەتەکانیتری کردووە، ئەوانەی کە لەگەڵ عەشیرەت تاڵەبانیا ناکۆکی هەبووە، یان شەڕوشۆڕی عەشایری لەبەینیان بووە، مەسەلەن ئەو هەجوەی کە لە کاکەیی کردوویەتی، هەجوەکانی زۆر جنێوی هەڵماڵڕاوە، دوو سەبەبی هەیە، یەکێکی لەبەرئەوەی کاکەیی و تاڵەبانی لەسەر مەسەلەی ئەرز ناکۆکی لەبەینیانا هەبووە، چەند جارێکیش شەڕ لەبەینیانا روویدا، ئەوەکەیتری کە باس کاکەیی دەکات مەعلوماتێ وای نییە لەسەر ئەو مەزهەبەی کە کاکەییەکانی تیایە. کاکەیی فەرعێکە لە مەزهەب ئەهل حەق کە لە کوردستانا بڵاوبووەوە، ئەم بە شکلێتر تێگەیشتووە، چونکە ئەو مەزهەبە مەزهەبێ سڕی بووە لەوەختێکا بووە هۆلاکۆ هاتووەتە سەر بەغاساڵێك لە کوردستانا ماوەتەوە، لەو ساڵەیا لە کوردستانا حەرەکەتێك و مقاومەتێکی سڕی لە زد هۆلاکۆ و لەشکرەکەی بووە، ئێستاکەش ئەگەر یەکێك سڕی زۆر قایم بێ دەڵێن: سڕی ئەوەندە قایمە دەڵێی سڕی کاکەییە، چونکە ئەگەر ئەووەختە ئەو سڕە ببیسترایە لەلایەن جەیشی هۆلاکۆوە قەتلوعامیانی دەکرد، لەبەرئەوەی کە مەزهەبەکەیان سڕی بووە نازانێ مەزهەبەکەیان چییە، ئیتر گەلێ بەزموبالۆرەی پیایانەوە وتوە، بەهەرحاڵ ئەوان لەسەر مەزهەب ئەهل حەقن کتێبێکیشیان هەیە موقەدەسە لەلایان، شانامەی حەقی پێدەڵێن، ئەم مەزهەبە لە وەختی خۆیا لە قەڕنی سێیەما لە لوڕستان و ئەوناوە دەرکەوت لە پاشا نەما لە مەنتیقەی کوردستان مەنتیقەی هەمەدان و دوایی سلێمانی و کەرکوك ئەمانە لە قەڕنی حەوتەمی هیجریا بڵاوبووەوە.

لەوەوپێش نەیاندەزانی بزەبت کەی شێخ رەزا مردووە، بەڵام جەریدەیەك لەو وەختە لە نەجەف دەرچووە، ئەو رۆژەی کە عەمریخوایکردووە ئەو جەریدە باسیکردووە کە شێخ رەزا لە ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩١٠ عەمریخوایکردووە، هەر ئەو تائریخەش لەسەر قەبرەکەی نووسراوە، لەبەرئەوە هیچ شكو شوبهەیەك لەسەر ساڵ و هەتا رۆژی مردنی نییە.

❊❊❊